زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (٧٥٥)
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

www.sardem.org

## ■ نەمری

نووسینی: میلان کوندێرا
وەرگێڕانی: عەتا نەهایی
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی ناوەوە: ڕەوشت محەمەد
دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ١٠٠٠٠ دینار
چاپی یەکەم: چاپخانەی (سەردەم) ساڵی ٢٠١٥ کوردستان ـ سلێمانی
■ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٠٧٤)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

میلان کوندێرا

# نەمری

(ڕۆمان)

وەرگێڕانی: عەتا نەهایی

**سەرچاوەی وەرگێڕان:**

جاودانگی/ میلان کوندرا
ترجمة: حشمت اللەکامرانی/ نشر علمی

**بەبەراورد لەگەڵ:**
Immortality/ Milan Kundera
Translated From Czech by: Peter Kussi
HarperCollins Publishers - New York

## وتەیەکی کورت

میلان کوندێرا نووسەری گەورەی چێک بە لای خوێنەری کوردەوە ناوێکی نەناسراو نییە. لەم ساڵانەی دواییدا بەشێک لە بەرهەمەکانی کراون بە کوردی و خۆشم لە پێشەکیی ڕۆمانی «سووکیی لە تاقەت بەدەربوون»دا چەند زانیارییەکی کورت و پێویستم لەبارەی ژیانی ئەدەبی و بەرهەمەکانییەوە نووسیوەکەبە پێویستی نازانم لێرەدا دووبارەیان بکەمەوە.

لەپاش بڵاوبوونەوەی ڕۆمانەکانی «گاڵتە»، «ژیان لە شوێنێکی دیکەیە»، «ئاهەنگی ماڵاوایی»، «کتێبی پێکەنین و فەرامۆشی» و «سووکیی لە تاقەت بەدەربوون»، بە زۆربەی زمانەکان و پێشوازی کەموێنەی خوێنەران لەم بەرهەمانە، کەم نەبوون ئەو کەسانەی کە میلان کوندێرایان بەنووسەرێکی سیاسینووس و دژەکۆمۆنیست دەزانی کە سەرەکیترین سەرچاوەی ئیلهامی بۆ نووسین، ژیانی مرۆڤە لەژێر سایەی سوڵتەی سیستەمێکی تۆتالیتری سۆشیالیستیدا، بەڵام ڕۆمانی «نەمری»، بەبێ ئەو سەرچاوەی ئیلهامەش، لە هەموو بەرهەمەکانی دیکەی زیاتر پەردەی لە لایەنە شاراوەکانی بوون و پرس و کێشە سەرەکییەکانی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ هەڵداوەتەوە.

«نەمری» لە هەموو بەرهەمەکانی کوندێرا زیاتر و قووڵتر ئاوڕی لە پرسە فەلسەفی و وجوودییەکانی وەک: بوون، خودا، ژیان، مەرگ و نەمری داوەتەوە و لە ڕامانە مێژووییەکانی وەک: جەبر و ئیختیار و ژیانی پاش مردنی کۆڵیوەتەوە. هاوکاتیش لە گرینگترین کێشە هەنووکەییەکانی وەک: ئابووری، سیاسەت، فەرهەنگ، سێکس، هونەر، ژینگە و... غافڵ نەبووە.

هەندێک لەو بابەتانەکە لە «نەمری»دا ئاوڕیان لێدراوەتەوە، چ ئەو بابەتە گشتییانە کە پەیوەندییان بە بوون و شوناسی مرۆڤ، مانای ژیان، پەیوەندی، عەشق، سێکس، شەرم و گوناهەوە هەیە، چ بابەتی تایبەتیتری وەک: دەور و کاریگەریی وێنەو وێنەسازی لە ژیانی ئەمڕۆماندا، هەموویان بە شێوەیەک لە تانوپۆی چیرۆکدا چندراون و بە زمانی چیرۆک دەردەبڕدرێن کە تەنانەت خوێنەری لاساری بێزار لە خوێندنەوەی بابەتی تیۆریکی و تەجریدیش بە شوێن خۆیدا ڕادەکێشێت.

ڕەنگە هەندێک کەس بە هۆی فرەبابەتی، ساختار و فۆڕمی جیاواز و سەبک و ستایلی ئازادانەی نووسینی ئەم کتێبەوە، گومان لە ڕۆمانبوونی بکەن. بە دڵنیاییەوە «نەمری» ڕۆمانێک نییەکەبەشێوازی تەقلیدی و نەریتی، کە هەندێک خەڵک و خوێنەر پێی ڕاهاتوون، نووسرابێت. «نەمری»، تەنانەت وەک ڕۆمانی مۆدێرنیش، نەوەک هەر لەبەرهەمەکانی خودی میلان کوندێرا، بەڵکو لە زۆرێک لەو ڕۆمانانەش کەتا ئێستا خوێندوومانەتەوە و چێژمان لێ وەرگرتوون، جیاوازە. جیاوازیی ئەم ڕۆمانە، بەر لە هەموو شتێک، لەپابەندنەبوونی نووسەرەکەی بە ڕێساکانی یەکەی کردار دەردەکەوێت. «نەمری» لەو دەگمەن ڕۆمانانەیە کە ڕووداوەکان و کرداری کەسایەتییەکان پەیڕەوی لە لۆژیکی هۆ و بەرهۆیی (عیلەت و مەعلوولی) ناکەن و ڕەوتی چیرۆکەکە بەرەو ئەنجامێکی دراماتیکی نابەن. ئەم ڕۆمانە هەرچەندەخۆش دەخوێندرێتەوە، بەڵام ناگێڕدرێتەوە، وەک زۆر ڕۆمانی دیکە بۆ بوارەکانی تری داهێنانی ئەدەبی و بەتایبەت هونەری ناگوێزرێتەوە و ناکرێت بەفیلمی سینەمایی، یان درامای تەلەفزیۆنی.

کوندێرا بۆخۆی لەم ڕۆمانەدا بە ئاشکرا و ڕاشکاوانە لەم بارەیەوە دەدوێت و دەڵێ: «بەداخەوە هەموو ئەو ڕۆمانانە کە تا ئێستا نووسراون، زیاد لە پێویست پەیڕەوی لە یاسا و ڕێسای یەکەی کردار دەکەن. مەبەستم ئەوەیە کەلە کاکڵ و ناوکی ئەم ڕۆمانانەدا زنجیرێک کردار و ڕووداو هەیە کە پەیوەندییەکەیان لەسەر بنەمای هۆکار و ئەنجامە. ئەم ڕۆمانانە وەک شەقامێکی تەنگەبەرن کە نووسەر بە زەبری قامچی کەسایەتییەکانی تێیدا بەرەوپێشی دەبات». ئەو بەم شێوەلەگوتنەکەی بەردەوام دەبێت: «کێشەی دراماتیکی بەڵای ڕاستەقینەی ڕۆمانە، چونکەئەم کێشە هەموو شتێک دەگۆڕێت، تەنانەت جوانترین لاپەڕەکانی ڕۆمانیش، سەرسووڕهێنەرترین دیمەنەکانیش بەسەر چەند قۆناغێکی سادەدا دابەش دەبن و بەرەو ئەنجامێکی کۆتایی دەڕۆن؛ لەم ئەنجامە کۆتاییەدا مانای هەموو ئەو شتانە کە پێشتر باسکراون، کۆدەبنەوە. ڕۆمان لە ئاگری کێشە و گرفتەکانی خۆیدا وەک باوەشێک پووش، دەسووتێت». بە بۆچوونی کوندێرا، «لە ڕۆماندا تەنیا ئەو شتانەزاتی و جەوهەرین کە هەر بە ڕۆمان دەگێڕدرێنەوە. هەموو ئەو شتانە کە لە ڕۆمانەوە دەگوێزرێنەوە بۆ بوارەکانی دیکە، شتی ناجەوهەرین. ئەگەر کەسێک هێشتا ئەوەندە گەوج بێت کەبیەوێت ڕۆمان بنووسێت و بیشی پارێزێت، دەبێت بە شێوازێک بینووسێت کە مەجالی لێوەرگرتن و گوێزانەوەی بۆ بوارەکانی دیکە نەبێت. بە واتایەکی تر، دەبێت بە شێوازێک بینووسێت کە کەس نەتوانێت بیگێڕێتەوە».

«نەمری» ڕێک ئەو ڕۆمانەیە کە کوندێرا باسی دەکات و ئاواتی بۆ دەخوازێت. ڕۆمانێک کە چیرۆکێکی تۆکمە و دراماتیکی نییە. بەشەکانی بەپێی قۆناغەکانی ژیانی کەسایەتییەکان دابەش نەکراون.

ڕووداوەکان و کرداری کەسایەتییەکان بە لۆژیکی هۆوبەرهۆیی بەدوای یەکتردا نەهاتوون و یەکتریان تەواو نەکردووە. «نەمری» کۆمەڵێک چیرۆک، یان وا چاکەبڵێم، کۆمەڵێک ئەپیزۆدی خەیاڵی و بەڕواڵەت واقیعییە لە چەند شوێن و زەمەنی جیاوازدا کە هیچ شتێکی دیار و بەرهەست، پێکیانەوە نابەستێتەوە: چیرۆکی ئەگنێس و نزیکەکانی وەک پاول و لاورا و بریژیت، چیرۆکی عاشقانەی بێتینا و گۆتەی نووسەری ناوداری ئەڵمانی و کریستیانی هاوسەری، چیرۆکی ڕوبەنس، چیرۆکی ژنێکی بێناوی دابڕاو لە ژیان کە بەتەمایە خۆی بکوژێت... کورتی بکەمەوە، «نەمری» زیافەتێکی ئەدەبی و مەعریفیی پڕ لەخواردنی خۆشە.

لەکۆتاییدا دەبێ بڵێم کەلەمێژبوو بەئاواتەوەبووم ئەم ڕۆمانەبکەم بەکوردی. دەمزانی کارێکی دژوارە. زمانی دەقەکەهەرچەندەبەڕواڵەت سادەو سەرڕاستە، بەڵام قووڵ و پڕ پێچوپلۆچە. لەزۆر شوێندا ڕستەکان، بەلۆژیکی دەقەکەو بەشکڵ و شێوازێکی هەندێک جار چاوەڕواننەکراو، لێک تەندراون و جیاکردنەوەیان، هەرچەندەکارێکی سەخت نییە، بەڵام بەپێچەوانەی سەبک و ستایلی نووسەرەکەیە. من ئەم ڕۆمانەشم وەک «سووکیی لە تاقەت بەدەرییبوون»، وشە بە وشە و دێڕ بەدێڕ لە ڕووی دوو دەقی فارسی و ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی. بەداخەوە دەقە فارسییەکەی، وێڕای زمانی جوان و ئەدیبانەی وەرگێڕەکەی، دەیان وشە و دێڕ و پەرەگرافی بەر مەقەستی سانسۆر کەوتبوو، کە ئەو کەلێنانەم لە ڕووی دەقە ئینگلیزییەکەوە پڕکردووەتەوە. ئەوەندەی پێم کرابێت بەوەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەوەماندوو بووم و هیوادارم جێی ڕەزامەندیی خوێنەری هۆشیاری کورد بێت.

## ١

ژنێکی شەست، شەستوپێنج ساڵان بوو. لەسەر کورسییەکی حەسیری قەراغ مەلەوانگەی یانەی تەندروستی، لەنهۆمی سەرووی بینایەکی بەرز کەبەسەر هەموو شاری پاریسدا دەیڕوانی، دانیشتبووم و سەیرم دەکرد. چاوەڕێی پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" بووم کەجاروبار لەوێ یەکترمان دەبینی و پێکەوەدەدواین، بەڵام پرۆفیسۆر بەدرەنگ کەوتبوو. من سەیری ژنەکەم دەکرد. ئەو بە تەنیا لەناو مەلەوانگەکە ڕاوەستابوو، تا ناوقەدی لەئاوەکەدا بوو. لەو مەلەوانەگەنجەی دەڕوانی کەشۆرتی لەپێدا بوو و فێری مەلەی دەکرد. کابرا پێی دەگوت: دەبێ لەنزیک لێواری مەلەوانگەکەمەلەبکات و هەناسەی قووڵ هەڵمژێت. ژنەکەش بەڕاست هەوڵی دەدا بەگوێی بکات، وەک ماتۆڕێکی هەڵمیی کۆن لەقووڵایی ئاوەکەدا فسەفسی دەکرد. (ئەو دەنگەپاک و بێگەردەکەلەمێژەلە بیر چووەتەوە، دەنگێک کەبۆ ئەوانەی نەیانبیستووەلەوەچاکتر وەسف ناکرێت کەبڵێی لە فسەفسی پیرێژنێک لەناو ئاوی هەسێڵێک دەچێت). من وەک جادوو کرابێتم سەیرم دەکرد. ئەو دۆخە گاڵتەجاڕانەی بەزەیی وررووژاندبووم و سەرنجی ڕاکێشابووم (مەلەوانەکەش پێی زانیبوو، چونکەلایەکی دەمی بە حاستەم خوار بووبوو). یەکێک لەناسیاوەکانم دەستی بەقسەکرد و سەرنجی منی لە پیرێژنەکەدزییەوە. کاتێک ویستم دیسان سەیری بکەمەوە، وانەی مەلەوانی کۆتایی هاتبوو.

ژنەکەسوورپێکی بەدەوری مەلەوانگەکەدا دایەوەو بەرەو دەرگاکە چوو. بە لای مەلەوانەکەدا تێپەڕی و پاش سێ چوار هەنگاو ئاوڕی لێ دایەوە، زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و دەستی لێ ڕاوەشاند. لەو کاتەدا هەستم بەئازارێک لەدڵمدا کرد! ئەو زەردەخەنەو ئەو جوولەهی کچێکی بیست ساڵان بوو! بەئاسوودەییەکی دڵڕفێنەوەقۆلی هەڵبڕی. دەتگوت بە گاڵتەوەتۆپێکی ڕەنگاوڕەنگی شاد و ڕۆشن بۆ دڵدارەکەی فڕێ دەدات. بزە و جووڵەکەی ناسک و دڵڕفێن بوو، بەڵام ڕوومەت و لەشولاری جوان نەمابوو. دڵڕفێنی فیگەرێک بوو کەلەناحەزیی لەشیدا نوقم بووبوو. بەڵام ژنەکە، هەرچەندەدەبێ زانیبێتی کەئیتر جوان نەماوە، لەو کاتەدا لەبیری چووبووەوە. لەناخی هەمووماندا بەشێک هەیەکەلە دەرەوەی ڕەوتی زەمەن درێژەبە ژیانی دەدا. پێدەچێت ئێمەتەنیا لەهەلومەرجی تایبەتیدا ئاگامان لە تەمەنی خۆمان بێت و زۆربەی کاتەکان مرۆڤی بێتەمەن بین. هەرچۆنێک بێت، ئەو کاتەکەژنەکەئاوڕی دایەوەو زەردەخەنەی بۆ ئەو مەلەوانە گەنجەکرد (کەنەیدەتوانی بەر بەپێکەنینەکەی بگرێت) و دەستی لێ ڕاوەشاند، ئاگای لەتەمەنی خۆی نەبوو. سروشتەدڵڕفێنەکەی، سەربەخۆ لەزەمەن، بۆ ساتێک لەو ڕەفتار و فیگەرەیدا خۆی نواند و سەرنجی منی ڕاکێشا. بەشێوەیەکی سەیر کەوتبوومەبەر کاریگەریی ئەو ژنە. پاشان وشەی "ئەگنێس"م بەمێشکدا هات. ئەگنێس. هەرگیز ژنێکم بەو ناوەنەدەناسی.

## ٢

لەنێو جێدا ڕاکشاوم، بەخۆشییەوەوەنەوز دەدەم. کاتژمێر شەشی بەیانی، کاتێک بەئاگا دەبمەوە، دەست بۆ ڕادیۆ ترانزیستۆرییەبچووکەکەی لای سەرینەکەم درێژ دەکەم و هەڵی دەکەم. کاتی ڕاگەیاندنی هەواڵەکانی بەیانییە، بەڵام من بە گران دەتوانم وشەکان لێک هەڵاوێرم و دیسان خەو دەمباتەوەو ڕستەکانی بێژەر تێکەڵ خەونەکانم دەبن. ئەمەجوانترین بەشی خەو و خۆشترین ساتەوەختی ڕۆژە. بە هۆی ڕادیۆکەوەیەکەدەتوانم تامی وەنەوزدان و بەئاگابوونەوەبچێژم. هەر ئەو هاتوچووەخۆشەی نێوان خەو و بێداری بەسەبۆ ئەوەی کەلە لەدایکبوونمان پەشیمان نەبینەوە. ئایا خەون دەبینم، یان بەڕاست لە هۆڵی ئۆپەرایەکدام کەدوو پیاو بە دەنگی زیق و بەجلکی شاسوارییەوەخەریکن گۆرانی بۆ کەشوهەوا دەخوێنن؟ ئەی بۆ گۆرانیی دڵداری ناخوێنن؟ پاشان تێدەگەم کەئەوانەبێژەری ڕادیۆن، واز لە خوێندنەکە دەهێنن و بە گاڵتەوەقسەبەیەکتر دەبڕن. یەکەمیان دەڵێ:

«ئەمڕۆ ڕۆژێکی گەرم و شێدارە، ڕەنگەبارانیش ببارێت».

ئەوی دیکەیان بە نازەوەقسەکەی پێ دەبڕێت و دەڵێ:

«بەڕاست؟».

دەنگی یەکەم هەروا بەعیشوەو نازەوەوەڵامی دەداتەوە:

«بەڵێ، بێگومان. ببوورەبێزنارد، ئەمەڕوودەدا و هیچیشی لەگەڵناکرێت. ئێمەناچارین لەگەڵ ئەم کەشوهەوایەدا بگونجێین».

بێرنارد بە دەنگی بەرز پێدەکەنێ و دەڵێ:
«ئێمەلەبەر گوناهەکانمان سزا دەدرێین».
دەنگی یەکەم:
«بێرنارد، بۆ دەبێ من لە پێناوی گوناهەکانی تۆدا ئازار بکێشم؟».

لێرەدا بێرنارد بۆ ئەوەی لە هەموو گوێگرەکانی بگەیەنێت کەباسی چ جۆرەگوناهێک دەکات، زیاتر پێدەکەنێت. من تێی دەگەم: ئەمەئەو حەز و ئارەزووەقووڵەیەکەهەموومان لە ژیانماندا هەمانە. حەز دەکەین خەڵک بەگوناهکاری گەورەمان بزانن! بلا با تاوانەکانمان بەرێژنەی باران و تۆفان و کرێوەبەراورد بکەن! ئەمرۆ کاتێک فەرەنسییەکان پەرەشوتەکەیان دەکەنەوە، بلا با بەحەسرەتەوە پێکەنینەدوو پاڵووەکەی بێرناردیان وەبیر بێتەوە.

وێستگەیەکی دیکەدەگرم، چونکەهەست دەکەم خەریکەدیسان خەو دەمباتەوەو دەمەوێت بۆ خەونەکانم دیمەنی سەرنجڕاکێشتر ببینمەوە. لە وێستگەکەی پەنایدا ژنێکی بێژەر دەڵێ ئەمرۆ ڕۆژێکی گەرم و شێدارەو ڕەنگەڕێژنەبارانیش دابکات. من خۆشحاڵم کەئێمەلە فەرەنسا ئەو هەموو وێستگەمان هەیەو هەمووشیان پێکەوە، هاوکات بابەتی یەکسان لەبارەی شتی یەکسانەوەبڵاودەکەنەوە. تێکەڵەیەک لە هارمۆنیا و یەکسانی و ئازادی! مەگەر مرۆڤ لەمەچاکتر چی دەخوازێت؟ ئەوسا گێڕی ڕادیۆکەبۆ شوێنی پێشوو، بۆ ئەو شوێنەکەساتێک لەوەوپێش بێرنارد شانازیی بەگوناهەکانیەوەدەکرد، دەسووڕێنم؛ کەچی لەباتی ئەو، گوێم لەدەنگی کەسێکی دیکەدەبێت کەگۆرانی بۆ ڕیناوڵتێکی تازەدەخوێنێت. گێڕی ڕادیۆکەدەسووڕێنم و گوێم لەدەنگی کۆرسێکی ژنانەدەبێت کەبە گۆرانی ڕیکلام بۆ پێستەی گرانبەها

دەکەن. دیسان گێڕی ڕادیۆکەبەرەو وێستگەکەی بێرنارد با دەدەمەوە، گوێم لەدوو بەشی کۆتایی گۆرانییەکەی ڕێناوڵت دەبێت و خێرا دەنگی خودی بێرنارد دەبیستمەوە. بێرنارد بەڕیتمێکی یەکسان، کەلاسایی مێلۆدیای ڕوولەکزبوونی گۆرانییەکەدەکاتەوە، هەواڵی چاپ و بڵاوبوونەوەی ژیاننامەیەکی تازەی ئێرنست هەمینگوای ڕادەگەنێت. سەد و بیستوحەوتەمین ژیاننامە، کە ئەمجارەیان بەڕاست ژیاننامەیەکی گرینگە، چونکەلەوێدا دەردەکەوێت کەهەمینگوای لەهەموو ژیانیدا قسەی ڕاستی نەکردووە. ئەو بەزێدەڕۆییەوەباسی ژمارەی برینەکانی لەشی خۆی لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کردووە و خۆی بەمێبازێکی گەورەناساندووە، لە کاتێکدا ئەوەسەلماوەکەئەو لە مانگی ئووتی ١٩٤٤ و دیسان لەمانگی ژانوییەی ١٩٥٩ بەدواوەتووشی سستی سێکسی بووە. دەنگێکی دیکەبە پێکەنینەوەدەپرسێت:

«ئۆی، بەراستتە؟»

بێرناردیش بەنازەوەوەڵامی دەداتەوە:

«بەڵێ، بێگومان...»

ئەوسا جارێکی دیکەش هەموومان، هاوڕێ لەگەڵ هەمینگوای سست و لاواز، خۆمان لەسەر شانۆی نمایشی ئۆپەرایەک دەبینینەوە. پاشان لەپڕ گوێمان لەدەنگێکی بەویقار دەبێت کەباسی ئەو مەحکەمەیەدەکات وا بۆ چەند حەفتەیەفەڕەنسای بەخۆیەوەسەرقاڵ کردووە: لەکاتی نەشتەرگەرییەکی زۆر بچووکی پزیشکیدا، ژنێکی گەنج بەهۆی کەمتەرخەمی لە بێهۆشکردنەکەیدا مردووە. بەو بۆنەوەڕێکخراوێک بە ناوی «بەکاربەرەکان» کەبۆ پشتگیریکردن لەخەڵک دامەزراوە، پێشنیاری کردووەلە داهاتوودا فیلم لەهەموو نەشتەرگەرییە پزیشکییەکان بگرن و ئەرشیفیان بکەن.

«ڕێکخراوەی پشتگیری لەبەکاربەران» پێی وایەکەدادگاکان لەم ڕێگەیەوەدەتوانن تۆڵەی ئەو ژن و پیاوانەبستێننەوەکەلەسەر تەختی نەشتەرگەری دەمرن. دیسان خەوم لێدەکەوێتەوە.

کەلە کاتژمێری نزیک هەشت و نیودا بەئاگا دەبمەوە، هەوڵ دەدەم وێنای ئەگنێس بکەم. ئەویش وەک من لەسەر چەرپایەکی پان ڕاکشاوە. لای ڕاستی چەرپاکە چۆڵە. مێردی ژنەکەکێیە؟ دیارە کەسێکەکەبەیانیی ڕۆژانی شەممەزوو لەماڵ دەچێتەدەر، بۆیەئەو بەتەنیایە و بەوپەڕی خوێنشیرینیەوە بەناو خەو و بێداریدا دێت و دەچێت.

پاشان هەڵدەستێت. بەوبەرییەوەتەلەفزیۆنێک لەسەر پایەیەکی درێژ لەشێوەی حاجی لەقلەق داندراوە. جلی خەوەکەی وەک پەردەی سپیی گوڵێنگەداری شانۆ، فڕێ دەداتەسەر میلەیەک. ئەوسا لەلای چەرپاکەی ڕادەوەستێ و من بۆ یەکەم جار بەڕووتی دەیبینم: ئەگنێس، پاڵەوانی ڕۆمانەکەم. ناتوانم چاو لەم ژنەجوانەدابخەم. پێدەچێت بەسەیرکردنەکەمی زانیبێت، دەڕوات بۆ ژوورێکی دیکەتا خۆی پۆشتەبکاتەوە.

ئەگنێس کێیە؟

هەروا کە حەوا لەکەلەکەی ئادەم بووە، هەروا کەڤینۆس لە شەپۆلەکان بووە، ئەگنێسیش لە جووڵەو فیگەری ئەو ژنەشەست ساڵانەبووەکەلەقەراغ مەلەوانگەکەدەستی بۆ مەلەوانەکەڕاوەشاند و خەریکەشکڵی ڕوخساری لە مێشکم دەسڕدرێتەوە. من ئەو دەمەتووشی دڵتەنگییەکی گەورەبووم و دڵتەنگییەکەش بووەهۆی لەدایکبوونی ژنێک کەبە ئەگنێس ناوی دەبەم.

ئایا یەک کەس، یان بە واتایەکی بەربڵاوتر، یەک کەسایەتیی ڕۆمان، بەپێی هەموو پێناسەکان بوونێکی تاک و تایبەت

نییەکەلاسایی ناکرێتەوە؟ کەواتە چۆن دەکرێت جووڵەو فیگەری کەسێک، جووڵەو فیگەرێک کەهی ئەو کەسەبووەو کەسایەتیی ئەوی بەرجەستەکردووەتەوە، هاوکات ببێت بەسروشت و جەوهەری کەسێکی دیکەو سروشت و جەوهەری خەونەکانی من لەبارەی کەسێکی دیکەوە؟ پێویستە کەمێک بیری لێ بکەینەوە.

ئەگەر ئەم هەسارەی ئێمە، نزیکەی هەشتاد ملیارد کەسی بەخۆیەوەدیبێت، دژوارەوێنای ئەوەبکەین کەهەموو ژن وپیاوێک خاوەنی کۆمەڵێک جووڵەو فیگەری تایبەت بەخۆیان بن. ئەمەلە ڕوانگەی زانستی ژمێریارییەوەمەحاڵە. بەبێ هیچ گومانێک، لە دنیادا ژمارەی جووڵەو فیگەرەکان لە ژمارەی کەسەکان زۆر کەمترە. ئەم تێگەیشتنەبەرەو ئەنجامگیرییەکی داچڵەکێنەرمان دەبات: جووڵەو فیگەر، لە تاکەکانیش تاکترە. دەتوانین ئەم تێگەیشتنە بەم دەستەواژەکورتەدەرببڕین کە: خەڵکی زۆر، جووڵەو ڕەفتاری کەم.

من سەرەتا، کاتێک باسی ئەو ژنەی قەراغ مەلەوانگەکەم دەکرد، گوتم: «سروشتەدڵڕفێنەکەی، سەربەخۆ لەزەمەن، بۆ ساتێک لەو جووڵەو ڕەفتارەیدا دەرکەوت و منی داچڵەکاند»؛ ئەرێ، من ئەو کاتەئاوا بۆ بابەتەکەچووبووم کەبۆچوونێکی هەڵەبوو. ئەو جووڵەهیچ شتێکی لەسروشت و جەوهەری ژنەکەدەرنەخست، دەکرێت بڵێین ئەوەژنەکەبوو کەجوانی و دڵڕفێنیی جووڵەیەکی بۆ من ئاشکرا کرد. ناتوانین جووڵەیەک بە داهێنەر، یان دەربڕی کەسایەتیی تاکێک بزانین. (چونکەهیچ کەس ناتوانێت جووڵەیەک، یان ڕەفتار و فیگەرێک دابهێنێت کەهیچ پێشینەیەکی نەبێت و هی کەسیش نەبووبێت). تەنانەت ناکرێت جووڵەو فیگەر بەکەرەستەی کەسێک بزانین؛ بە پێچەوانەوە، ئەوەجووڵەو فیگەرەکانن کەئێمەوەک

کەرەستەی خۆیان، وەک ئامێرێک بۆ دەرکەوتنی خۆیان، بەکار دەهێنن.

ئێستا ئەگنێس بەپۆشتەیی بەرەو هۆڵەکە چوو. لەوێ ڕاوەستا و گوێی شل کرد. بەو دەنگەدەنگەبێمانایەکەلە ژوورەکەی پەنایەوەدەهات، تێگەیشت کەکچەکەی تازەلەخەو هەستاوە. بۆ ئەوەی نەیبینێت، خێرا خۆی بەڕاڕەوەکەدا کرد. لەناو مەسعەدەکەدوگمەی نهۆمی خوارەوەی لێدا. مەسعەدەکەلەباتی ئەوەبچێتەخوار، وەک کەسێک شەپڵەلێی دابێت کەوتەلەقەلەق. ئەمەیەکەم جار نەبوو کەئەگنێس لەجووڵەجووڵ و لەقەلەقی مەسعەدەکەدەترسا. جارێکی دیکەش کەویستبووی بڕواتەخوار، مەسعەدەکەچووبووەسەر. جارێکی دیکەش دەرکەکەی نەکرابووەوەو نیوسەعات لەناویدا مابووەوە. ئەگنێس هەستی دەکرد کە مەسعەدەکەبەتەمایەلەگەڵی ڕێبکەوێت و بەو شێوازەگرژ و بێدەنگ و ئاژەڵییەی شتێکی پێ بڵێت. ئەوچەند جار لە لای پاسەوانەکەشکایەتی لێ کردبوو، بەڵام چونکەمەسعەدەکە بەشێوازێکی سروشتی و شایستەهەڵسوکەوتی لەگەڵ کرێچییەکانی دیکە دەکرد، پاسەوانەکە پێی وابوو شەڕی ئەگنێس و ئەو مەسعەدەکێشەیەکی تایبەتییەلەنێوان خۆیاندا و گوێی پێ نەدەدا. ئەمجارە ئەگنێس جگەلەوەی کەلەمەسعەدەکەبێتە دەر و بەپلیکانەکاندا داگەڕێت، هیچ چارێکی دیکەی نەبوو. ڕێک ئەو کاتەکەلێی هاتە دەر و دەرکەکەی پێوەدایەوە، مەسعەدەکەبە هێمنی بەرەو خوارەوەداگەڕا.

ڕۆژانی شەممەهەمیشەبۆ ئەگنێس ڕۆژانێکی بێزارکەر بوو. مێردەکەی، پاول، بەر لەوەسەعات ببێتەحەوت لەماڵ دەرۆشتەدەر و نانی نیوەڕۆشی لەگەڵ هاوڕێیەکی دەخوارد. ئەوەلە کاتێکدا بوو

کەبۆ خۆی هەموو کاتی حەوانەوەو پشوودانی بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی ناوماڵ تەرخان دەکرد، کە لە ئەرک و وەزیفە پیشەییەکەی دژوارتر و بەئازارتر بوون: دەبوایەبچێت بۆ فەرمانگەی پۆست و نیوسەعات لەوێبمێنێتەوە، بۆ شتکڕین بچێت بۆ فرۆشگە و لەگەڵ ژنەفرۆشیارەکەدا بە شەڕ بێت و لەبەر سندووقی پارەداندا کاتەکەی بە فیڕۆ بدات. دەبوایەتەلەفۆن بۆ لوولەکێشەکەبکات و داوای لێ بکات لەکاتی خۆیدا بێت تا ناچار نەبێت بە درێژایی ئەو ڕۆژە چاوەڕێی بکات. هەوڵی دەدا دەرفەتێک بدۆزێتەوەکەبچێت بۆ ساونا و کەمێک بحەسێتەوە؛ کارێک کەبەدرێژایی حەفتەنەیدەتوانی بیکات. ئەو هەمیشەدەمەو ئێوارەتاوی دەدایەگەسکی کارەبایی و تۆزتەکێنەکەی، چونکەژنەخزمەتکارەکەڕۆژانی هەینی دەهات، جار لەدوای جار خەمساردتر دەبوو.

بەڵام ئەم شەممەلە شەممەکانی دیکەجیاواز بوو. پێنج ساڵی تەواو بەسەر مردنی باوکیدا تێپەڕیبوو. دیمەنێکی تایبەت لەپێشچاوی دەرکەوتەوە: باوکی بەسەر کۆمەڵێک ڕەسمی دڕاودا نەویوەتەوەو خوشکەکەی بەسەر باوکیدا دەنەڕێنێت: «بۆ ڕەسمەکانی دایکمت دڕاندووە!» ئەگنێس لایەنی باوکی دەگرێت و ئەو جووتەخوشکە، کەکتوپڕ تووشی ڕق و نەفرەتێکی سەیر بوون، دەست بەشەڕ و دەمەقاڵەدەکەن.

ئەگنێس سواری ئۆتۆمبێلەکەی دەبێت کەلە بەر ماڵەکەیان ڕاگیراوە.

## ٣

ئەگنێس بەسواریی مەسعەد چوو بۆ دوا نهۆمی باڵەخانەیەکی بەرز کەیانەی تەندروستی و مەلەوانگەو جەکووزی و ساونا و گەرماوی تورکی لێ بوو، بەسەر دیمەنی پاریسدا دەیڕوانی. مۆسیقای ڕۆک لەبڵیندگۆی شوێنی خۆڕووتکردنەوەکەهەرای نابووەوە. دەساڵ لەوەوپێش کەئەگنێس تازەهاتبوو بۆ ئێرە، ئەندامەکانی یانەکەکەمتر و شوێنەکەش ئارامتر بوو. لەوەودوا ساڵ لەدوای ساڵ پێشکەوتنی زیاتری بە خۆیەوەبینی: جامی زیاتر، گڵۆپی زیاتر، گوڵ و کاکتووسی دەستکردی زیاتر، بڵیندگۆی زیاتر، مۆسیقا و خەڵکی زیاتر. هەموو ئەمانەش بەهۆی ئەو ئاوێنانەوەکەبەبڕیاری بەڕێوەبەر بە دیواری یانەکەوەهەڵواسرابوون، چەند قات دەبوون.

ئەگنێس دۆڵابێکی کردەوەو جلەکانی داکەند. دوو ژن لە نزیکییەوەشەویلکەیان گەرم بووبوو، قسەیان دەکرد. دەنگگڕەکەیان، هێواش و لەسەرخۆ، گلەیی لە مێردەکەی دەکرد کەهەموو شتێک لەنێو ماڵەکەهەڵدەڕێژێت: کتێب، گۆرەوی، ڕۆژنامە، تەنانەت شقارتەو پایپیش. ئەوی دیکەش بە دەنگی زیق و دوو ئەوەندەبەرزتر دەدوا؛ وەک خووی هەموو فەڕەنسییەک کەدواهەم بڕگەی ڕستەکان ئۆکتافێک هەڵدەبڕن، قسەکردنەکەی لەقدەقدی تورەی مریشک دەچوو:

«ئەم قسانەی تۆ دایچڵەکاندم! تەواو لێت بێئومێد بووم! بە ڕاست داچڵەکیم! بەری پێ بگرە! مەهێڵەئاوا خەمسارد بێت، ئەوماڵەماڵی تۆیە! بەری پێ بگرە! مەهێڵەسواری ملت ببێت!»

ژنەکە، کە پێدەچوو لەنێوان هاوڕێیەک کەڕێزی لەدەسەڵاتی دەگرت و مێردێک کەخۆشی دەویست، گیری خواردبێت. بە خەمەوەگوتی:

«من چیم پێ دەکرێت، ئەوم پێ ناگۆڕێت! هەمیشەهەر وا بووە! لەوەتی دەیناسم شتەکان لەملاولا فڕێ دەدا».

دەنگ زیقەکەگوتی:

«هەر بۆیەدەبێ واز لەو کارانەی بهێنێت! ئەو ماڵە، ماڵی تۆیە، نابێ بێڵیت ئاوا بێدەربەست بێت! دەبێ تێی بگەیەنیت!».

ئەگنێس هەرگیز بەشداریی ئەم جۆرەوتووێژانەی نەدەکرد. هەر چەندەدەیزانی ئەوەی لەژنانی تر ناچێت، بەڵام هەرگیز بەخراپەباسی پاولی نەدەکرد. ئەو سەری بەرەو ژنەدەنگگڕەکەوەرچەرخاند. ژنێکی گەنج بوو، پرچی ڕۆشن و ڕوخساری وەک فریشتەبوو.

ژنەکەی دیکە دریژەی پێدا:

«نا، نا! بۆ خۆشت دەزانی کەحەق بەتۆیە! نابێ بێڵیت ئاوا هەڵسوکەوت بکات».

ئەگنێس تێگەیشت کەئەو ژنەلە کاتی قسەکردندا بە خێرایی سەری لەڕاستەوەبۆ چەپ و لە چەپەوەبۆ ڕاست ڕادەوەشێنێ و هاوکات شان و برۆشی بەرزدەکاتەوە. دەتگوت بەم جووڵە یرق و سەرسووڕمانی خۆی بەرامبەر بەو کەسەکەمافی ئینسانیی هاوڕێکەی پشتگوێ خستووە، نیشان دەدا. ئەگنێس ئەم جووڵەیەی دەناسی: بریژیتی کچی، ڕێک بەم شێوەسەری دەجووڵاند و برۆی هەڵدەتەکاند.

ئەگنێس جلەکانی داکەند. دەرکەی دۆلابەکەی داخست و لەدەرکەیەکی خلۆکەوەخۆی بەهۆڵێکدا کرد. هۆڵەکەکاشی کرابوو. چەند دوش لە لایەک و ساونایەکی دیوار جامیش لەلایەکی دیکەی بوو. ژنەکان پاڵ بەپاڵی یەکتر لەسەر کورسییەلاکێشەتەختەییەکان دانیشتبوون. هەندێکیان لەشیان (یان بەشێکی تایبەتی، وەک سمت و ناوقەدیان) بەوەرەقەی پلاستیکی تایبەت داپۆشیبوو، تا هەوا نەتوانێت لێی بچێتەژوور و خێرا ئارەق بکەنەوە، تا لەوەدڵنیا ببن کەزوو کێشیان دادەدەبەزێت.

ئەگنێس خۆی گەیاندە بەرزترین کورسی کەهێشتا جێی دانیشتنی مابوو. پاڵی بەدیوارەکەوە دا و چاوی لێک نا. دەنگی مۆسیقاکەنەدەگەیشتەئەوێ، بەڵام دەنگی ژنەکان کەلەناخی قورگیانەوەدەدوان، بەقەدەر دەنگی بڵیندگۆکەبەرز بوو. ژنێکی گەنجی نەناسراو خۆی بە ساوناکەدا کرد و بێ ماتڵبوون ئەمری بە ژنەکان کرد کەزیاتر پاڵ پێکەوەبدەن، پاشان سوراحییەک ئاوی هەڵگرت و بەسەر بەردەکانیدا ڕشت. هەڵمێکی گەرم کزەکز بەرزبووەوەو ڕوومەتی ئەو ژنەکەلە لای ئەگنێس دانیشتبوو لەئێشان گرژ بوو. ژنە تازەهاتووەکەپێی زانی و بە دەنگی بەرز گوتی:

«من حەزم لە هەڵمی گەرمە. تەنیا ئاوا هەست دەکەم لەساونایەکی ڕاستەقینەدام».

ئەوسا خۆی خزاندەنێوان دوو ژنی ڕووت و دەستبەجێ دەستی بە قسەکرد. باسی دیمەنە تەلەفزیۆنییەکەی دوێنێی کرد کەلە گەڵبایۆلۆژیستێکی بەناوبانگ کرابوو، کەتازەبیرەوەرییەکانی بڵاوکردبووەوە. گوتی:

«پیاوێکی سەیر بوو!».

ژنێکی دیکەبەسەرلەقاندن بۆچوونەکەی بۆ سەلماند.

«ئۆی بەڵێ. زۆر موتەوازعیش بوو!».

ژنەتازەهاتووەکەگوتی:

«موتەوازع؟! ئاگات لێ نەبوو چەندەلووتبەرزە؟ بەڵام من ئەم جۆرەلووتبەرزییەم پێ خۆشە! من مرۆڤی لووتبەرزم خۆشدەوێت!».

ئەوسا ئاوڕی لەئەگنێس دایەوە:

«تۆش پێت وایەموتەوازع بوو؟».

ئەگنێس گوتی ئەو پرۆگرامەی نەدیوە. ئەو ژنەکە پێدەچوو قسەکەی ئەگنێسی بەجۆرێک دژایەتیی شاراوەلەگەڵ خۆی لێک دابێتەوە، لە کاتێکدا ڕاستەوخۆ سەیری چاوی دەکرد، بە دەنگی بەرز دووبارەی کردەوە:

«من لە تەوازوع بێزارم! تەوازوع دوو ڕوویيە!».

ئەگنێس شانی هەڵتەکاند و ژنەکەگوتی:

«من لەساونا، حەزدەکەم هەست بەگەرمای ڕاستەقینەبکەم. دەبێ لەشم سەر ئارەق بگەڕێت و پاشان ئاوێکی سارد بەخۆمدا بکەم. ئاوێکی سارد! ئای کەحەزم لەئاوی ساردە. تەنانەت بەیانیانیش حەزدەکەم بە ئاوی سارد خۆم بشۆم. خۆشتن بە ئاوی گەرم تێکم دەدا».

زۆری نەخایاند کەگوتی ساونا مرۆڤ دەخنکێنێت؛ ئەوسا دووبارەی کردەوەکەزۆری ڕق لەئاوی گەرمە؛ پاشان ڕۆشتەدەر.

ئەگنێس کاتێک کەمنداڵ بوو، لەگەڵ باوکی دەڕۆشتنەدەر و دەگەڕان. جارێک لەباوکی پرسی: ئایا بڕوای بەخودا هەیە، یان نا؟ باوکی گوتی: «من بڕوام بەکۆمپیۆتەری خولقێنەر هەیە». ئەم وەڵامەئەوەندەسەیر و غەریب بوو کەلەیادەوەریی منداڵییدا مایەوە. وشەی کۆمپیوتەر و وشەی خولقێنەری بە لاوەسەیروسەمەرەبوو.

باوکی هەرگیز نەیدەگوت خودا، هەمیشەدەیگوت خوڵقێنەر. دەتگوت بەتەمایەبەم شێوەمانای خودا لەبازنەی چالاکییەئەندازیارییەکەیدا سنووردار بکات. کۆمپیوتەری خوڵقێنەر! باشەمرۆڤ چۆن دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ کۆمپیوتەر بگرێت؟ هەر بۆیەلە باوکی پرسی: ئایا تا ئێستا نزای کردووە؟ باوکی گوتی: «ئەمەوەک ئەوەوایەکاتێک گڵۆپێک هەڵدەکرێت، نزا بۆ ئەدیسۆن بکەین!».

ئەگنێس لای خۆی ئاوا بیری کردەوە: خوڵقێنەر، پڕۆژەیەکی تێروتەسەلی داوەبە کۆمپیوتەر و ڕۆشتووە. خودا دنیای خوڵقاندووەو پاشان بۆ ئەو مرۆڤایەتییەی بەجێهێشتووەکەتێدەکۆشێت لەبۆشاییەکدا قسەی بۆ بکات کەدەنگدانەوەی نییە. ئەمەبیرۆکەیەکی تازەنییە، بەڵام ئەوەی کەخودای پێشینیانمان وازمان لێ بێنێت شتێکە و ئەوەش کەخودای خوڵقێنەری جیهانیکی کۆمپیۆتەری جێمان بێڵێت شتێکی دیکەیە. لەغیابی ئەودا پڕۆگرام و بەرنامەیەک هەیەکەبێ ئەوەکەس بتوانێت هیچی لێ بگۆڕێت، بەردەوام و بێڕاوەستان دەسووڕێت. ئەوەکەبەرنامەیەک بە کۆمپیوتەر بدرێت، بەو مانایە نییەکەڕەنگڕێژی پاژبەپاژی داهاتووی تێدا کرابێت و قەدەری هەموو شتێک لەو «ژووریەوە» دیاری کرابێت. بۆ نموونەئەو پڕۆگرامەدیاریی نەکردووەکەساڵی ١٨١٥ شەڕێک لەنزیکی واتێرلو ڕوودەدا و فەڕەنسییەکان لەو شەڕەدا تووشی شکست دەبن، بەڵکو هەر ئەوەی دیاری کردووەکە مرۆڤ لەجەوهەری خۆیدا هێرشکار و شەڕەنگێزە و شەڕەکانی ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوەلەجاران ترسناکترن. لە دیدی خوڵقێنەرەوەشتەکانی دیکەهیچ گرینگییەکی ئەوتۆیان نییەو تەنیا گەمەیەکی جێگۆڕکەو تێکەڵبوونن لەناو پڕۆگرامێکی گشتیدا. پڕۆگرامێک کەبەشێوەی پێغەمبەرانەپێشبینیی

کاروباری دنیای نەکردووە، بەڵکو تەنیا سنووری ئیمکانەکانی دیاری کردووە و لەم سنوورەشدا هەموو هێز و دەسەڵاتی بڕیاردان بە"ڕێکەوت" سپێردراوە.
ئەم بابەتە، ئەو پڕۆژەش دەگرێتەوەکەئێمەپێی دەڵێین مرۆڤ. کۆمپیۆتەر پلانی بۆ بەڕێزان ئەگنێس و پاول دانەناوە، بەڵکو تەنیا مۆدێلێکی نموونەیی مرۆڤی چێ کردووەو خەڵکێکی بێژوماریش لەڕووی ئەو مودێلەنموونەیی و ئۆرجیناڵەوەسەریان هەڵداوە کەهیچیان خاوەنی کارەکتەر و خەسڵەتی تاکەکەسی و تایبەت بە خۆیان نین. ڕێک وەک ئۆتۆمبێلێکی ڕیناوڵت کەجەوهەر و خەسڵەتەکانی، لە دەرەوە، لەئەرشیڤی نووسینگەی ناوەندیی ئەندازیاری پارێزراوە. یەکەیەکەی ئۆتۆمبێلەکان تەنیا ژمارەی سێریاڵەکەیان لەو ئۆتۆمبێلەنموونەییەئۆرجیناڵەجیاوازە. ژمارەسێریالی مرۆڤەنموونەییەکەش ڕوومەتیەتی، واتەپێکهاتەی بەڕێکەوت و دووبارەنەبووەوەی ئەندامەکانییەتی. ڕوومەت ڕەنگدانەوەی کەسایەتی و ڕۆحی ئێمەنییە، ڕەنگدانەوەی ئەو شتەش نییەکەئێمەپێی دەڵێین «خود»، ڕوومەت تەنیا ژمارەسێریاڵی مرۆڤە.
ئەگنێس ژنەتازەهاتووەکەی بیرکەوتەوەکەبە دەنگی بەرز گوتبووی ڕقی لەخۆشتن بەئاوی گەرمە. ئەو، لەبەر ئەوە هاتبوو تا بەهەموو ژنەکانی ئەوێ ڕابگەیەنێت کە) حەزی لەساونای گەرمە. ٢) شەیدای لووتبەرزییە. ٣) ڕقی لە تەوازوعە. ٤) حەزی لەخۆشتن بەئاوی ساردە. ٥) لەخۆشتن بە ئاوی گەرم بێزارە. ئەو بەم پێنج خاڵەوێنەی خۆی کێشایەوە. بەم پێنج شتەخۆی پێناسەکرد و خودی خۆی بەهەموویان ناساند. ئەو، نەوەک بەتەوازوعەوە(چونکەگوتی لە تەوازوع بێزارە!) بەڵکو بەشێوەیەکی دوژمنانەخۆی ناساند. کۆمەڵێک فەرمانی توندوتیژی وەک «پەرستن» و «نەفرەت»ی بەکارهێنا.

دەتگوت دەیویست ئامادەیی خۆی بۆ شەڕکردن لەپێناوی هەر کام لەم پێنج خەسڵەتە و هەریەکە لەم پێنج بابەتەڕابگەیەنێت.

ئەگنێس لەخۆی پرسی، ئەم هەموو وروووژانەبۆ؟ ئەوسا بیری کردەوە: مادام ئێمەبەم شێوەکەهەین فرێ دەدرێینەئەم جیهانەوە، بەر لەهەموو شتێک ناچارین لەگەڵ فرێدرانی تایبەتیی زارەکە، لەگەڵ ئەو ڕێکەوتەکەکۆمپیۆتەرەئاسمانییەکەڕێکی خستووە، یەک بگرین (ببین بەیەک). بەسەر ئەو شۆکەدا زاڵ بین کەئەمە(واتەئەو کەسەکەلە ئاوێنەدا دەیبینین) خودی خۆمانە. ئێمەبەبێ ئەوباوەڕەکەڕوومەتمان دەربڕی خودی خۆمانە، بەبێ ئەو وەهمەسەرەتاییە، بەبێ ئەو وەهمەمەزنە، ناتوانین بژین، یان لانیکەم ناتوانین ژیان بەجیددی وەربگرین. هەر ئەوەبەس نییەکەئێمەلەگەڵ خۆماندا یەک بین، بەڵکو دەبێ بە جۆشوخرۆشەوە، تا سنووری ژیان و مردن شوێن ئەم یەکبوونەش بکەوین، چونکەهەر لەم ڕێگەیەوەدەتوانین خودی خۆمان، نەوەک کۆپییەکی ساختەی مودیلەسەرەتاییەکە، بەڵکو وەک بوونێکی خاوەن سروشت و جەوهەرێکی بێجێنشین، بهێنینەپێشچاوی خۆمان. بەم هۆیەوەئەو ژنەتازەهاتووەنەک هەر پێویستی بەوەبوو کەوێنەیەک لەخۆی بکێشێتەوە، بەڵکو دەیویست بۆ هەموانی ڕوون بکاتەوەکە لەشێوەی شتێکی تاقانەو بێجێنشینە، شتێک کەشایانی ئەوەیەلەپێناویدا بجەنگێت و تەنانەت بۆشی بمرێت.

ئەگنێس دوای ئەوەی کەچارەکەسەعاتێکی لەناو گەرمای ساوناکەتێپەڕاند، هەستا و خۆی خستەناو حەوزێکی بچووکی پڕ لەئاوی ساردەوە، پاشان لەژووری حەوانەوە، لەناو ئەو ژنانەدا کەدەوریان دابوو و قسەیان دەکرد، ڕاکشا.

ئەگنێس نەیدەزانی کۆمپیوتەرەکەپلانی چ جۆرەبوونێکی بۆ ژیانی پاش مردنی داڕشتووە. دوو ئەگەر و ئیمکانی بەبیردا هات. ئەگەر کۆمپیۆتەرەکەتەنیا لەسنووری ئەم هەسارەی ئێمەدا توانای کارکردنی ببێت، ئەگەر چارەنووسی ئێمەتەنیا بەئەوەوەبەسترابێتەوە، کەواتەپاش مردنیشمان ناتوانین جگەلەهەندێک ئاڵوگۆر لەئەزموونەکانی ژیانی پێشوماندا چاوەڕێی هیچی دیکەبکەین. ئێمەدیسان ئەم دیمەن و بوونەوەرانەی ئێستا دەبینینەوە. بە تەنیا، یان لەناو خەڵک و جەماوەردا؟ مەخابن کەئیمکانی زۆر کەمەبە تەنیا بین. ئێمەکەلە ژیانماندا دەرفەتی بەتەنیابوونمان ئەوەندەکەمە، چۆن دەتوانین لەپاش مردن چاوەڕێی تەنیایی بکەین! تازە، خۆ مردووەکان لەزیندووەکان زۆر زیاترن. کەواتەبوونی پاش مردن، لەباشترین حاڵەتدا، لەم مەودا کورتەی ئێستای دەچێت کەلەسەر کورسییەکی ڕەحەت پاڵی داوەتەوەو لەهەموو لاوەگوێی لەدەنگی چەنەبازیی ڕەگەزی مێیە: ئەبەدییەتێکی وەک چەنەبازیی بێبڕانەوە. ئەڵبەت مرۆڤ دەتوانێت وێنای دۆخی لەوەخراپتریش بکات، بەڵام بیرۆکەی بیستنی هەمیشەو بەردەوامی چەنەبازیی بێبڕانەوەی ژنان، هانی دا لەجاران زیاتر خۆی بەژیانیەوەهەڵواسیءو هەموو توانای خۆی بخاتەگەڕ تا ئەوەندەکەپێی دەکرێت پاشەکشەبە مردنی بکات.

وەلێ ئەگەرێکی دیکەش هەیە: ڕەنگەجگەلەکۆمپیوتەرەکەی هەسارەی ئێمە، کۆمپیوتەری باڵاتر لەم کۆمپیوتەرەش ببێت. لەحاڵەتێکی ئاوادا، ئیتر بە ڕاست پێویست ناکات کە"بوون" لەژیانی ڕابوردوومان بچێت و مرۆڤ دەتوانێت بەهیوایەکی تەمومژاوی و لەهەمان کاتدا مەعقولەوە ئەم دنیایەجێبهێڵێت. ئەگنێس دیمەنێکی دەهێنایەپێشچاوی خۆی کە ئەم دواییانەزۆرجار بەمێشکیدا

تێپەڕیبوو: کەسێکی غەریبەدێت و سەردانی دەکات. هاتنەکەی دۆستانەو خۆمانەیە، لەسەر کورسییەک بەرامبەر بەئەگنێس و مێردەکەی دادەنیشێ و قسەیان لەگەڵ دەکات. پاول لەبەر تیشکی سیحراویی میهرەبانییەکی تایبەت کەلەو کەسەغەریبەوەسەرهەڵدەدا، خۆشحاڵ و ڕووخۆش و سەمیمییە. ئەلبۆمی ڕەسمە خێزانییەکەیانی بۆ دەهێنێت. میوانەکەپەڕەلەئالبۆمەکەهەڵدەداتەوەو لەبینینی هەندێک لەڕەسمەکان دادەچڵەکێت. بۆ نموونەلەیەکێک لەڕەسمەکاندا ئەگنێس و بریژیت لەژێر بورجی ئیفل ڕاوەستاون، میوانەکەلێی دەپرسێت:

«ئەمەچییە؟».

پاول وەڵامی دەداتەوە:

«ئەمەئەگنێسەو ئەمەش کچەکەمان بریژیتە».

میوانەکەدەڵێت:

«دەزانم. مەبەستم ئەو بینایەیە».

پاول بەسەرسووڕمانەوەسەیری دەکات:

«دەی خۆ ئەوەش بورجی ئیفلە».

«ئەها، کەواتە ئەمەبورجی ئیفلە!».

بەلەحنێک ئەو قسەدەکات کەگوایەڕەسمی باپیرەت نیشان دابێت و ئەویش گوتبێتی:

«ئەها، کەواتەئەمەئەو باپیرەتەکەئەوەندەباست دەکرد. خۆشحاڵم کەئاخرییەکەی چاوم پێی کەوت».

پاول تووشی سەرسووڕمان دەبێت، بەڵام ئەگنێس زۆر داناچڵەکێت. ئەگنێس دەزانێ ئەم پیاوەکێیە. ئەگنێس دەزانێ ئەم پیاوەبۆچی هاتووەو بەتەمایە چییان لێ بپرسێت. بۆیەکەمێک عەسەبییە. حەز دەکات پێکەوەتەنیا بن، بەبێ پاول، بەڵام نازانێ چۆن ئەو دەرفەتەبڕەخسێنێت.

## ٤

باوکی ئەگنێس پێنج ساڵ لەوەپێش مردبوو. دایکی ساڵێک پێش مردنی باوکی کۆچی دوایی کردبوو. ئەو دەمەباوکی نەخۆش بوو، هەموو چاوەڕێی مردنی ئەو بوون. دایکی، بەپێچەوانەوە، هێشتا ساغ و سەلامەت و پڕ لەژیان بوو؛ بەڕواڵەت لەوەدەچوو کەچارەنووس قۆناغێکی بێوەژنیی دووررودرێژ و خۆشی بۆ دایکی دیاری کردبێت، بۆیەباوکی کاتێک بینی ئەو لەپڕێکدا مرد و بۆخۆی نەمرد، تا ڕادەیەک نیگەران بوو. دەتگوت لەوەنیگەرانەکەخەڵک سەرکۆنەی بکەن. مەبەست لەخەڵک خزم و کەسوکاری دایکی بوو. خزمەکانی باوکی بە هەموو دنیادا بڵاوبووبوونەوەو ئەگنێس جگەلەدوورەخزمێکی کەلەئەڵمانیا دەژیا، کەسی دیکەیانی نەدیبوو. بە پێچەوانەوە، خزمانی دایکی، هەموویان، لەو شارەدەژیان: خوشکەکانی، براکانی، کچەمامەکانی و گەلێک برازا و خوارزای. باوکی دایکی، جوتیارێکی خەڵکی ناوچەکوێستانییەکان، خۆی بۆ منداڵەکانی تەرخان کردبوو. ئەو هەموو شتێکی بۆ منداڵەکانی دابین کردبوو کە باش بخوێنن و هاوسەرێکی شایستەبۆ خۆیان هەڵبژێرن.

دایکی بەئەڤینداری شووی بەباوکی کردبوو، ئەوەش شتێکی سەیر نەبوو، چونکەئەو پیاوێکی جوانچاک بوو، لەتەمەنی سی ساڵیدا بووبوو بەمامۆستای زانکۆ کە ئەو دەمەپیشەیەکی بەڕێز بوو. دایکی خۆشحاڵ بوو کەمێردێکی ئەوەندە چاکی دەستکەوتووەکەخەڵک ئێرەیی پێدەبەن. بەپێی نەریتەگوندییەکانیش

کەئەو زۆر گرینگی پێدەدان، چێژی لەوەدەبینی کەدیارییەکی ئاوای بەبنەماڵەکەی پێشکەش کردبوو، بەڵام چونکە باوکی ئەگنێس گۆشەگیر و کەمدوێن بوو (کەس نەیزانی ئەو گۆشەگیرییەی بەهۆی شەرمنییەوەیە،یان شتی دیکە؛ ئەو کەمدوێنییەی نیشانەی تەوازوعە،یان بێدەربەستی) ئەو دیارییەی دایکی ئەگنێس لەباتی ئەوەی بنەماڵەکەخۆشحاڵبکات، نیگەرانی کردبوون.

بەتێپەڕینی کات و هەڵکشانی تەمەنی هەردووکیان، دایکی زیاتر بەرەو بنەماڵەکەی ڕاکێشرا. کاتێک باوکی بۆ هەمیشەدەرکەی ژووری کارەکەی لەسەر خۆی داخست، دایکی تینووی قسەکردن بوو؛ وەها کەبۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ خوشک و برا و منداڵەکانیان بەتەلەفۆن دەدوا و بەردەوام زیاتر بەپیر کێشەو گرفتەکانیانەوەدەچوو. ئێستا کەئەگنێس بیری لەم شتانەدەکردەوە، پێی وابوو ژیانی دایکی لەبازنەیەک چووە: لەناوەندی بازنەکەهاتووەتەدەر و بەوپەڕی بوێرییەوەبەرەوڕووی دنیایەکی تەواو جیاواز بووەتەوەو دیسان بۆ ناو بازنەکەگەڕاوەتەوە. ئەو لەگەڵمێرد و دوو کچەکەی لەڤێلایەکی پڕ لەدارودرەخت دەژیا و ساڵی چەند جار (ڕۆژانی کریسمەس و لەدایکبوونەکان) هەموو خزم و کەسەکانی بۆ بەشداربوون لە ئاهەنگە خێزانییەکان دەعوەت دەکرد. دایکی پێی وابوو لە دوای مردنی باوکی (ئەوەندەچاوەڕوانکراو بوو کەهەموویان وەک کەسێک کەکاتی مانەوەی بەسەرچووبێت، سەیریان دەکرد) خوشک و خوشکەزاکەی دێن و لەلای دەمێننەوە.

بەڵام دایکی مرد و باوکی مایەوە. کاتێک ئەگنێس و لاورای خوشکی، دوو حەفتەپاش بەخاکسپاردنی دایکیان سەردانی باوکیان

کرد، سەیریان کردن لەپشت مێزێک دانیشتووەو سەری بەسەر کۆشێک ڕەسمی دڕاودا شۆڕکردووەتەوە.

لاورا ڕەسمەدڕاوەکانی هەڵگرت و قیژاندی:

«بۆ ڕەسمەکانی دایکمت دڕاندووە؟»

ئەگنێسیش بەسەر مێزەکەدا نەوییەوەتا سەیری ڕەسمەکان بکات: نەخێر ئەوانەهەر ڕەسمی دایکی نەبوون، زۆربەیان لەڕاستیدا ڕەسمی خۆی بوون، تەنیا چەند ڕەسمێکیان دوو کەسی، یان بە تەنیا هی دایکی بوون. کابرا کاتێک لەگەڵ کچەکانی بەرەوڕوو بووەوە، بێدەنگ بوو هیچی نەگوت. ئەگنێس داوای لەخوشکەکەی کرد کەبێدەنگ بێت:

«بەسەر باوکمدا مەقیژێنە!»

بەڵام لاورا بەردەوام دەیقیژاند. باوکی هەستا، چوو بۆ ژوورەکەی ئەولا و خوشکەکان شەڕێکی بێوێنەیان لەگەڵ یەکتر کرد. بۆ دوارۆژدا لاورا چوو بۆ پاریس و ئەگنێسیش لەوێ مایەوە. لەوەدوا بوو کەباوکی بەئەگنێسی گوت ئاپارتمانێکی بچووکی لەشارۆچکەکەدیوەتەوەو بەتەمایەڤێلاکەبفرۆشێت. ئەمەش کارێکی سەیر و سەمەرەی دیکەبوو. هەموویان پێیان وابوو باوکی پیاوێکی دەستەوەستانەو کاروباری ژیانی بە دایکی سپاردووە. هەموویان پێیان وابوو باوکی بەبێ دایکی ناتوانێت بژی، نەک هەر چونکەنەیدەتوانی ئاگای لەهیچ بێت، بەڵکو چونکە لەمێژبوو هەموو دەسەلاتێکی بەژنەکەی سپاردبوو، خۆشی نەیدەزانی چی دەوێت، بەڵام کاتێک ئاوا بەکوتوپڕی و خێرا، چەند ڕۆژ پاش مردنی ژنەکەی، بڕیاری دا ماڵەکەی بگوێزێتەوە، ئەگنێس زانی کەباوکی خەریکەکارێک دەکات کەلەمێژەپلانی بۆ داناوەو چاک دەزانێت چی دەکات. ئەمەزۆر سەیر بوو، چونکەباوکی هەرگیز بیری

لەوەنەکردبووەوەکە ژنەکەی لەپێش خۆیدا بمرێت. کەواتەدەبێ کڕینی ئاپارتمانێک لەو شارۆچکە، بە لای باوکییەوەلەپلانێکی کردەیی زیاتر، خەون و ئارەزوویەک بوویێت. ئەو لەگەڵ ژنەکەی لەڤێلاکەیان ژیابوو، لەباخەکەیدا پیاسەی کردبوو، میوانداریی لەخوشک و ئامۆزاکانی کردبوو، خۆی وا دەرخستبوو کەگوایەگوێ لە قسەکانیان دەگرێت، بەڵام هەموو ئەم ماوەدڵی لەشوێنێکی دیکەبوو، لەئاپارتمانێکی بچووکی تاکەکەسی. باوکی لەپاش مەرگی دایکی چوو بۆ شوێنێک کەلەمێژبوو لەدەروونیدا لەگەڵی ژیابوو.

لەوەبەدوا بوو کەباوکی بۆ یەکەم جار لە لای ئەگنێس وەک نهێنییەک دەرکەوت. بۆ ڕەسمەکانی دڕاندووە؟ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەبیری ئاپارتمانێکی تاکەکەسیدا بووە؟ بۆ گوێی بەوەسیێتی دایکی بۆ بردنی خوشک و خوشکەزاکەی بۆ ڤێلاکەنەداوە؟ تازە، خۆ ئەمەی بۆ باشتر بوو. بە دڵنیاییەوەلەکاتی نەخۆشیدا ئەوان باشتر ئاگایان لێی دەبوو تا پەرستارێک کەدرەنگ، یان زوو دەبوایەبیگرێت. کاتێک ئەگنێس لەهۆی ماڵگوێزانەوەکەی پرسی، باوکی وەڵامێکی زۆر سادەی دایەوە:

«کەسێکی تەنیا لەماڵێکی ئەوەندە گەورەدا چی بکات؟»

ئەگنێس نەیتوانی پێشنیاری ئەوەی پێ بکات کەپوور و پوورزاکەی بهێنێت بۆ ئەوێ، چونکەدیار بوو باوکی نایەوێت ئەوەبکات، بۆیەبیری کردەوەکەباوکیشی لەبازنەیەکدایەو بۆ سەرەتاکانی خۆی دەگەڕێتەوە. دایکی، لەبنەماڵەوەبۆ شووکردن و دیسان گەڕانەوەبۆ بنەماڵە؛ باوکیشی، لە تەنیاییەوەبۆ ژنهێنان و دیسان گەڕانەوەبۆ تەنیایی.

باوکی چەند ساڵ پێش مردنی دایکی تووشی نەخۆشییەکی سەخت بوو. ئەو کاتە ئەگنێس دوو حەفتەپشووی وەرگرت تا لە لای

باوکی بمێنێتەوە، بەڵام نەیتوانی بیکات بە هی خۆی، چونکەدایکی بۆ ساتێکیش ئەو دووانەی جێنەدەهێشت. جارێک دوو کەس لەهاوکارەکانی باوکی لە زانکۆ بۆ سەردانی هاتن. ئەوان گەلێک پرسیاریان لێ کرد، بەڵام دایکی وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە. ئەگنێس بێزار بوو، گوتی:

«تکایە دایکە، تکایەبێڵەبا باوکم خۆی قسەبکات».

دایکی لێی ڕەنجا:

«بۆ نابینی کە نەخۆشە؟»

لەکۆتایی ئەو دوو حەفتەیەباوکی تا ڕادەیەک چاک بووەوە و ئاخرییەکەی ئەگنێس توانی دوو جار لەگەڵ خۆی بۆ پیاسەبیباتەدەرێ، بەڵام جاری سێهەم دیسان دایکی لەگەڵیان چوو.

باوکی ساڵێک پاش مردنی دایکی دیسان نەخۆش کەوتەوە. ئەگنێس سەردانی کرد، سێ ڕۆژ لە لای مایەوەو بۆ بەیانی ڕۆژی چوارەمدا مرد. تەنیا لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا بوو کەئەگنێس توانی بەو شێوەکەخۆی پێی خۆشەلەگەڵی بێت.

ئەگنێس بەخۆی گوت کەئەوان یەکتریان خۆش ویستووە، بەڵام بەکردەوەهەرگیز لێک حاڵی نەبوون، چونکەهەرگیز دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخساوەکەدووبەدوو پێکەوەبن. ئەوان تەنیا ئەو دەمەلێک نزیک بوونەتەوەکەئەگنێس لەتەمەنی هەشت بۆ دوازدەساڵیدا بووە و دایکی ناچار بووەخۆی بۆ لاورا بچکۆلەکەی تەرخان بکات. ئەو دەمانە، ئەوان زۆرجار پێکەوەگەشت و گوزاری دوورودرێژیان بەناو ئاواییدا دەکرد و باوکی وەڵامی گەلێک لەپرسیارەکانی دەدایەوە. ئەو دەمەبوو کەباوکی باسی کۆمپیوتەری خولقێنەر و گەلێک شتی دیکەی بۆ کرد. ئەگنێس لەوتووێژەکانی ئەو دەمەیان تەنیا چەند دەستەواژەیەکی سادەی لەبیر مابوو، ئێستاش

وەک ژنێکی گەورەهەوڵی دەدا ئەو دەستەواژانە، کە بەلەتوکوتی سواڵەتێکی پڕبەهای دەزانین، پێکەوەبلکێنێتەوە.

مردنی باوکی کۆتایی بەو سێ ڕۆژەخۆشەهێنا کەپێکەوەبوون. هەموو خزمانی دایکی لەپرسەکەیدا بەشداریان کرد، بەڵام چونکەخودی دایکی لەوێ نەبوو، کەسیش نەبوو تەدارەکی فاتیحاخوێنیی شەوانەی بۆ بگرێت، هەموویان بەپەلەڕۆشتن. جگەلەوەش، چونکەباوکی ماڵەکەی فرۆشتبوو، بۆ ژوورێکی بچووکی ئاپارتمانێک چووبوو، خزمان ئەوەیان بەنیشانەی پشتگوێخستنی خۆیان زانی. ئەوان تەنیا بیریان لەو سامانە دەکردەوەکەبەو دوو کچەدەبڕا، چونکەبێگومان ڤێلاکەزۆر گران بوو، بەڵام لەڕێگەی بەرپرسی نووسینگەی تاپۆوەزانیان کەباوکی هەموو سامانەکەی بەئەنجومەنی ماتماتیکزانەکان بەخشیوەکەخۆی یارمەتیی دامەزراندنی دابوو. بەم شێوەباوکی بۆ خزمەکانی بێگانەتر لە جاران بوو. دەتگوت بەو وەسیێتنامەیەویستبووی تکایان لێ بکات کەفەرامۆشی بکەن.

ئەگنێس ماوەیەکی کەم لەپاش مردنی باوکی زانیی کەداراییەکەی لەبانک زۆر زیادی کردووە. تازە بە هەموو شتێکی دەزانی. ئەو باوکەبەڕواڵەت گێلۆکەیان کارێکی زۆر ژیرانەی کردبوو. دەساڵ لەوەپێش، کاتێک بۆ یەکەم جار نەخۆش کەوتبوو، ئەگنێس دوو حەفتەلە لای مابووەوە. لەو ماوەدا باوکی داوای لێ کردبوو لەسویس حسێبێکی بانکی بۆ خۆی بکاتەوە. ئەو، ماوەیەکی کەم پێش مردنەکەی، هەموو پارەکەی خستبووە نێو ئەو حسێبەبانکییەوەو ئەوەشی کەمابوو، بەپێی وەسیێتەکەی بۆ ماتماتیکزانەکانی جێهێشتبوو. ئەو ئەگەر لە وەسیێتنامەکەیدا هەموو سامان و داراییەکەی بەئەگنێس بدایە، لەخۆوەدڵی کچەکەی دیکەی

دەرەنجاند و ئەگەر هەموو پارەکەشی بخستایەتەنێو حسێبی کچەکەیەوەو شتێکی کەمی بۆ ئەنجومەن دابنایە، گشت خزمانی لە ئاگری ئەو کونجکۆڵییەدا دەسووتان کەبڵێی پارەکەی چیی لێ هاتبێت.

ئەگنێس سەرەتا بیری کردەوەکە دەبێ ئەو میراتەی باوکی لەگەڵ خوشکەکەی بەش بکات. ئەو هەشت ساڵ گەورەتر بوو نەیدەتوانی هەست بەبەرپرسیاری نەکات، بەڵام لەئەنجامدا هیچی بە خوشکەکەی نەگوت. نەوەک لەبەر تەماعکاری، بەڵکو چونکەنەیدەویست خەیانەت لەباوکی بکات. باوکی بەو دیارییەویستبووی شتێکی پێ بڵێت، شتێکی پێ ڕاسپێرێت کەبەدرێژایی ژیانی نەیتوانیبوو. ئێستا ئەوەئەرکی ئەگنێس بوو کەئەو شتە، وەک نهێنییەک لە نێوان خۆی و باوکی، بپارێزێت.

# ٥

ئەگنێس ئۆتومبیلەکەی ڕاگرت، لێی دابەزی و بەرەو شەقامەکەڕۆیشت. برسی و ماندوو بوو، چونکەبەتەنیا نانخواردنی لە ڕێستۆرانت پێ خۆش نەبوو. بڕیاری دا هەر کەچاوی بەیەکەم کافەتریا کەوت، شتێکی لێ بخوات. سەردەمانێک ئەم گەڕەکەگەلێک ڕێستۆرانتی ئینگلیسیی خۆش و هەرزانی لێ بوو کەکێک و ژلەیان بە شەرابی سێوەوەدەفرۆشت، بەڵام ڕۆژێک هەموو ئەم شوێنانەون بوون و لەجێی ئەوان کۆمەڵێک بینای تازەدەرکەوتن کەشتێکی ناخۆش بە ناوی "خواردنی ئامادە"یان دەفرۆشت. ئەو بەسەر نەفرەتەکەیدا زاڵ بوو، بەرەو یەکێک لەو شوێنانە چوو. لەپشت جامخانەکەیەوەچاوی بەو خەڵکەکەوت کەلەپشت مێزەکان دانیشتبوون و بەسەر دەورییەکاغەزییەچەورەکاندا نەویبوونەوە. چاوی بەکچێکی ڕەنگپەڕیوی دەمولێوسوور کەوت. ئەو کچە، کەتازە کۆتایی بە خواردنەکەی هێنابوو، پەرداخی بەتاڵی کۆکاکۆلاکەی لادا و سەری بۆ دواوەبرد و قامکەگەورەی لە دەمی خۆی ڕۆکرد. ئەوسا لەکاتێکدا چاوی لەبنمیچەکەبڕیبوو، بۆ ماوەیەکی زۆر قامکی لەناو دەمیدا سووڕاندەوە. کابرایەک لەپشت مێزەکەی ئەولایەوەلەسەر کورسییەکەی چەمابووەوەو چاوی لەشەقامەکەبڕیبوو؛ دەمی بۆ باوێشکێک، باوێشکێکی وەک میلۆدییەکی ڤاگنەر، بێکۆتایی، داچەقیبوو: کابرا جارجار دەمی دەبەست، تەواو نا، ئەوسا زیاتر دەیکردەوە، بەڵام چاوەکانی

کەلەشەقامەکەوردبوووبوونەوە، بە پێچەوانەی ڕیتمی دەمی، بەردەوام دەکرانەوەو دەبەستران. لەڕاستیدا چەند کەسێکی دیکەش خەریکبوون باوێشکیان دەدا و ددانەکانیان، ددانەپڕکراوەکان و ددانەڕووکەشدارەکان و تاقمەکانیان پیشان دەدا و کەسیان دەستیان بەبەردەمیانەوەنەدەگرت. منداڵێک بە جلی پەمەییەوەبەنێوان مێزەکاندا هەڵدەسووڕا و قاچی ورچێکی لیستۆکی بە دەستەوەبوو. ئەویش دەمی تەواو کردبووەوە، هەرچەند پێدەچوو لەبری باوێشکدان خەریکی بانگکردنی کەسێک بێت. منداڵەکەجاروبار ورچەلیستۆکەکەی بەکەلەکەی یەکێک لە مشتەرییەکاندا دەکوتا. مێزەکان لێک نزیک بوون و تەنانەت لەپشت جامەکەشەوەدیار بوو کەمشتەرییەکان لەگەڵ خواردنەکەیان بۆنی عارەقی لەشی دراوسێکانیش قووت دەدەن. پەڵۆخی شەپۆلی دەدا (ئەگنێس بەئاشکرا وێنای تامی هەمبەرگرێکی چەوری کرد کەپڕ بوو لە ئاوی شیرین)، پەڵۆخیی بیستن و چەشتن و بۆنکردن ئەوەندە توند خۆیان بەروومەتیدا دەکوتا کەڕووی لێ وەرگێڕان و بڕیاری دا بۆ دامرکاندنی هەستی برسێتیی، بۆ شوێنێکی دیکەبچێت.

پیادەڕۆکەئەوەندە قەرەباڵغ بوو کەبەڕێداڕۆشتن پیایدا دژوار بوو. لەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا هەیکەلی دوو باکووریی سوور و قژزەرد لەپێشییەوە دیار بوو؛ ژن و پیاوێک کەسەروگەردنێک بەرزتر لەپیاوی فەڕەنسی و عەرەب بوون، هەر دووکیان کۆڵەپشتی پەمەییان بەکۆڵەوەبوو، منداڵێکیان لەباوەشدا بوو. ئەگنێس بۆ ساتێک ئەو دوانەی ون کرد و لەبری ئەوان، لە پێش خۆیەوەچاوی بەژنێک کەوت کە شەرواڵێکی هەراوی کورتی مۆدەی ئەو ساڵەی لە بەردا بوو، کەبەزەحمەت تا سەر ئەژنۆی دادەپۆشی. ئەو جلانە، بە ڕواڵەت سمت و قوونی ژنەکەیان قورستر و نزیکتر لەزەوی

دەردەخست. لاقی ڕووت و بێرەنگی وەک جووتێک گۆزەڵەی گوندی بوون، کەدەمارەڕەشەکانی وەک کۆمەڵێک شینماری ورد پەپکەیان لەسەر دابووەوەو ڕازاندبوویانەوە. ئەگنێس لەبەر خۆیەوەگوتی: ئەم ژنەدەیتوانی دەرزەنێک جل ببینێتەوەکەدەمارە شینەکانی لاقی داپۆشن و سمت و قوونی ئاوا خواروخێچ دەرنەخەن. بۆچی کاری وای نەکردووە؟ خەڵک کاتێک لەناو کەسانی دیکەدان، نەوەک هەر واز لەسەرنجراکێشبوون دەهێنن، بەڵکو تەنانەت هەوڵ نادەن کەناحەزیش دەرنەکەون.

ئەگنێس لەبەرخۆیەوە گوتی: کاتێک شالاوی ناحەزیی لە تاقەتدا نەمێنێت، ئەو دەچێت بۆ گوڵفرۆشییەک و گوڵێکی "لەبیرم مەکە"، لقێک گوڵی "لەبیرم مەکە"، لقێکی ناسک کەگوڵی وردی شینی پێوەبێت، دەکڕێت. ئەوسا لە کاتێکدا گوڵەکەلە بەرچاوی خۆی ڕادەگرێت، دەچێتەسەر شەقام و بە جەختەوەلێی ورد دەبێتەوە، تا هەر ئەو نووکەشینەجوانەی ببینێت و وەک دواشتێک کەحەز دەکات لەم دنیا ناخۆشەدا سەیری بکات، بۆ خۆی ڕای بگرێت. ئەو بەم شێوەبەشەقامەکانی پاریسدا دەسووڕێتەوە و زۆر زوو دەبێتەدیمەنێکی ئاشنا کەمنداڵ شوێنی دەکەون، پێی پێدەکەنن، شتی پێسی بۆ فڕێدەدەن و هەموو پاریس پێی دەڵێن: ئەو ژنەشێتەکەگوڵی "لەبیرم مەکە"ی پێیە...

ئەگنێس درێژەی بەڕێگەڕۆشتنەکەی دا: لافاوی مۆسیقا، زرمەزرمی ڕێکوپێکی دەنگدانەوەی ئامێرەکان کەلە دوکانەکانەوە، لەسالۆنەکانی ئارایشت و ڕازاندنەوەو ڕێستۆرانتەکانەوەدەهات، شالاویان بۆ گوێچکەی ڕاستی دەبرد. گوێچکەی چەپی دەنگەکانی جادەی دەبیست؛ ویژەی ئۆتۆمبێلەکان و خشەخشەی بەئازاری پاسێک کەلەوێستگەیەکەوەڕێ دەکەوت. پاشان دەنگی تیژی

ماتۆرسیکلێتێک ناخی ڕووشاند؛ ناچاری کرد سەرچاوەی ئەم ئازارەبدۆزێتەوە: کچێک بەجلکی جین و پرچی ڕەشی درێژیەوەکەلە دواوە دەشەکایەوە، وەک ئەوەی کە قیتوقنج لەپشت ئامێرێکی تایپکردن دانیشتبێت، لەسەر ماتۆرسیکلێتێکی بچووک دانیشتبوو. ئەگزۆزی ماتۆڕەکەی هەڵگرتبوو، ماتۆڕەکەدەنگێکی ترسناکی لێوە دەهات.

ئەگنێس بیری ئەو ژنەگەنجەکەوتەوەکەچەند سەعات لەوەپێش خۆی بەساوناکەدا کرد و بۆ ئەوەی خۆی بناسێنێ و خۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێت، هەر لەسەرەتای هاتنیەوەڕای گەیاند کەڕقی لەخۆشتن بە ئاوی گەرمە. ئەگنێس لەوەدڵنیابوو کەهەر ئەو پاڵنەرەش هانی ئەم کچەپرچڕەشەی داوەئەگزۆزی ماتۆڕەکەی هەڵبگرێت. ئەوەماتۆڕەکەنەبوو کەئەو دەنگەی لێوەدەهات، بەڵکو خودی کچەپرچڕەشەکەبوو. ئەو، بۆ ئەوەکەببیسترێت، بۆ ئەوەکە خۆی بە ناخی هوشیاریی خەڵکیدا بکات، ئەگزۆزی پڕهاڕەهاڕی ماتۆڕەکەی بەگیانی خۆیەوەبەستبوو. ئەگنێس سەیری شەپۆلی پرچی ئەو گیانە پڕهاڕەهاڕ و هەراوهاوارەی کرد و لە دڵەوەئاواتی مردنی بۆ خواست. ئەگەر لەو کاتەدا پاسێک کچەکەی ژێر بخستایەو لە خوێنی خۆیدا بیگەوزاندایەو لەسەر جادەکەفڕێی بدایە، ئەگنێس نەدەتۆقی و نەخەمبار دەبوو، بەڵکو هەستی بەئاسوودەیی دەکرد.

کوتوپڕ لەو ڕق و نەفرەتەی خۆی داچڵەکی و گوتی: دنیا لەسەر لیواری سنوورێکە، ئەگەر ئەم سنورەببڕین هەموو شتێک تووشی شێتییەتی دەبێت. خەڵک لەکاتێکدا گوڵی "لەبیرم مەکە"یان بەدەستەوەیە، یان لەشەقامەکاندا پیاسەدەکەن، یان کەچاویان بە یەکێک کەوت دەیکوژن. کەمێک، ڕەنگەتاکەدلۆپێک ئاو ببێتەهۆی سەرڕێژبوونی پیاڵۆکەکە؛ ڕەنگەئۆتۆمبێلێکی‌تر، کەسێکی‌تر، یان

تەنانەت شتێکی زۆر بچووکیش بۆ ئەو سەررپێژبوونەزۆر بێت. لەباری چەندییەوەسنوورێک هەیەکەنابێت بیبەزێنین؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس نییەئەو سنوورەبپارێزێت، ڕەنگەتەنانەت کەسیش بە سنوورێکی وا نەزانێت.

ئەگنێس بەردەوام دەڕۆشت و پیادەڕۆکەش هەروا قەرەباڵغتر دەبوو. کەس ئامادەنەبوو خۆی لەسەر ڕێگەی لابدات، بۆیەبەرەو قەراغی پیادەڕۆکە چوو. لەمەودای نێوان قەراغی پیادەڕۆکەو ئۆتۆمبێلەکان کەبەرەوڕووی دەهاتن، درێژەی بەڕۆشتنەکەی دا. ئەو لەمێژبوو بەم کارەڕاهاتبوو: خەڵک خۆیان لەسەر ڕێگەکەی لانەدەدا. ئەو دەیزانی ئەم خۆلانەدانەیان لەکڵۆڵی خۆیەوەیەو زۆرجاریش هەوڵی دەدا بەسەر ئەم کڵۆڵییەیدا زاڵ بێت. هەوڵی دەدا ئازا بێت و بوێرانەبەرەو پێش بئاژوێت. هەوڵی دەدا درێژەبەڕۆشتنەکەی بدات و ئەوانەش کەبەرەوڕووی دەهاتن ناچار بکات خۆیان لابدەن، بەڵام هەرگیز لەو هەوڵەی سەرکەوتوو نەدەبوو. ئەو هەمیشەئەم خۆتاقیکردنەوەسادەو ڕۆژانەیەی دەدوڕاند. جارێک منداڵێکی حەوت ساڵانەڕاستەوخۆ بەرەوڕووی هات، ئەگنێس ویستی خۆی لەڕێگەکەی لانەدا، بەڵام لە ترسی ئەوەی کەبەمنداڵەکەدا نەدرێت، ئاخریەکەیناچار بوو خۆی لابدات.

یادەوەرییەکی بیرکەوتەوە: کاتێک دە ساڵانەبوو لەگەڵ باوک و دایکی چووبوون بۆ کێو. هەروا کەبەڕێگەیەکی پانی ناو دارستانەکەدا بەرەوخوار شۆڕدەبوونەوە، تووشی دوو کوڕی گوندی بوون کەدەست و قاچیان بڵاوکردبووەوە؛ یەکێک لەو دوانەبۆ ئەوەی ڕێگەکەیان لێ بگرێت دارێکی هێنایەپێش و بەحاستەم لەسنگی باوکی ئەگنێسی کوتا و نەڕاندی:

«ئەم جادەتایبەتییە، دەبێ باجی بۆ بدەیت!»

ئەمەڕەنگەیارییەکی مندالانەبووبێت و دەبوایەبەحاستەم پالێک بەکوڕەکانەوەبنێن، یان ڕەنگەئەوان بەم شێوەسوالیان کردبێت و دەبوایە باوکی ئەگنێس وردەپوولێکیان بداتێ، بەلام باوکی گەڕایەوەو بەڕێگەیەکی دیکەدا ڕۆشت. لەڕاستیدا جیاوازییەکی ئەوتۆشی نەبوو، چونکە ئەوان بەبێ مەبەست دەڕۆشتن و بە لایانەوە گرینگ نەبوو بەکوێدا دەڕۆن، بەلام لەگەل ئەوەشدا دایکی لەباوکی تووڕەبوو، پێی گوت:

«تۆ تەنانەت سەر بۆ دوو مندالی دوانزەسالانەش شۆڕ دەکەیت!»

ئەگنێسیش ئەو ڕەفتارەی باوکی پێ ناخۆش بوو.

شالاوی دەنگەدەنگێکی دیکەیادەوەرییەکەی لێ تێک دا. چەند کەس بەکلاوی خۆپاراستنەوە، خەریکبوون بە جیهازێکی کۆمپرەسۆر قیرتاوەکەیان کون دەکرد. لەناو ئەم دەنگەدەنگەدا لەسەرەوە، ڕەنگەلەئاسمانەوە، دەنگی پیانۆیەک دەهات، دەنگی فووگێکی باخ بوو. پێدەچوو کەسێک لە نهۆمی سەرەوەپەنجەرەیەکی کردبێتەوەو پێچی تەسجیلەکەی تا ئاخر سووڕاندبێت، پێدەچوو ئەو جوانییەجیددییەبۆ داچلەکاندنی جیهانێک بێت کەبەلاڕێدا ڕۆشتووە. هەرچۆنێک بێت، فووگەکەی باخ دەرەقەتی دەنگی کۆمپرەسۆرەکەو ئۆتۆمبێلەکان نەدەهات. بە پێچەوانەوە، ئەوەئوتومبیلەکان و کۆمپرەسۆرەکەبوون کەباخیشیان وەک فوگەکەی داگیر کردبوو. بۆیە ئەگنێس ناچار بوو دەست بە گوێچکەیەوەبگرێت و هەر بەو شێوەش بەلێژیی شەقامەکەدا داگەڕێت.

لەو کاتەدا ڕێبوارێک بەرەوڕووی ئەگنێس هات. بەتووڕەییەوەسەیری کرد و پەنجەی بەناوچاوانی خۆیدا کێشا؛ کەئەم جوولەیەی لەزمانی نێونەتەوەییدا بەو مانایەیەکە تۆ شێت،

یان گەوج، یان بێعەقڵیت. ئەگنێس لەنەفرەتی نیگای ڕێبوارەکەگەیشت و لەناخەوە تووڕەبوو. ڕاوەستا. ویستی هەڵکوتێتەسەر کابراکەو لێی بدات، بەڵام نەیتوانی. خەڵکەکەبەرەوپێش پاڵیان پێوەنا و کەسێک شانی تێکوتا، چونکەنەدەبوایە کەس لەسێ چرکەزیاتر لەو پیادەڕۆیەڕاوەستێت.

ئەو ناچار بوو دیسان سەر ڕێ بکەوێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی واز لە بیرکردنەوەلەو پیاوەبێنێت. هەردووکیان یەک دەنگیان بیستبوو، بەڵام کابرا ویستبووی لە ئەگنێس بگەیەنێت کەنابێ، یان مافی ئەوەی نییە کەدەست بەگوێچکەیەوەبگرێت. کابرا بۆ ئەو کارەچەوتەی سەرزەنشتی کردبوو. ئەوە"یەکسانی" بوو کەنەیدەهێشت ئەگنێس ئەو کارەنەکات کەهەموو کەس دەبوایەبیکات (واتەگوێ لەو دەنگەبگرێت). ئەوەیەکسانی بوو کەڕێگەی بەئەگنێس نەدەدا دژایەتی جیهانێک بکات کەهەمووومان تیایدا دەژیین.

ئارەزووی کوشتنی ئەو پیاوە پەرچەکردارێکی کاتی نەبوو. دوای دامرکانەوەی ئەو هەیەجانەی سەرەتاش، هەر چەندەسەری لەو هەموو ڕق و نەفرەتەی خۆی سووڕمابوو، بەڵام دیسان ئارەزووەکەی مایەوە. وێنەی ئەو پیاوەکەپەنجەی بەنێوچاوانی خۆیدا کێشابوو، وەک ماسییەکی ژەهراوی لە ناخیدا مەلەی دەکرد، وەک ماسییەک کەوردەوردە دەگەنی و ئەو نەیدەتوانی بڕشێتەوەو بیهێنێتەوە.

دیسان بیری بۆ لای باوکی گەڕایەوە. لەو دەمەوەکە دیبووی باوکی لەبەرامبەر ئەو دوو کوڕەدوانزە ساڵە پاشەکشەی کردبوو، زۆرجار لەدۆخێکی ئاوادا وێنای دەکرد: باوکی لەپاپۆڕێکدایەکە خەریکەنوقم دەبێت. تەنیا چەند گەمییەی بۆ ڕزگاربوون لێیەو هەموو خەڵکەکەش جێگەیان نابێتەوە. خەڵک لەسەر پاپۆڕەکەبە

تووڕەبیەوەڕادەکەن. سەرەتا باوکیشی لەگەڵ خەڵکەکەبەرەو پێش دەڕوات، بەڵام کاتێک کەدەبینێ ئەو خەڵکەچۆن پاڵ بەیەکترەوەدەنێن و یەکتر لادەدەن، کاتێک دەبینێ ئەو خەڵکەئامادەن تەنانەت یەکتریش پێشێل بکەن و ژنێک بە چاوی دەرتۆقیوەوەمستەکۆڵەی لێدەدا، چونکەسەر ڕێگەکەی لێ گرتووە، لەناکاو ڕادەوەستێ و خۆی لادەدات. لەکۆتاییدا باوکی تەنیا سەیری گەمییەکان دەکات کە خەڵکێکی زۆر سواریان بوون و بەهەراوهاوار و جنێودانەوە، بەئارامی بەرەو شەپۆلەتووڕەکان دەڕۆن.

ئەم هەڵوێستەناوی چییە؟ ترسنۆکی؟ نا، ترسنۆکەکان لە مردن دەترسن و شەڕ بۆ مانەوەدەکەن. خانەدانی؟ بێگومان، بەو مەرجەکەبۆ ڕێزگرتن لەمرۆڤەکان بێت، بەڵام ئەگنێس پێی وا نییەباوکی لەپێناوی ڕێزگرتن لەمرۆڤەکان ئەو کارەی کردبێت. ئەی چییە؟ ئەگنێس نازانێ. ئەو تەنیا یەک شتی لا ڕوون و ئاشکرایە: لەپاپۆڕێکدا کەخەریکەنوقم دەبێت و مرۆڤ دەبێبۆ سواربوونی گەمییەیەک بجەنگێت، باوکی لەپێش هەموو کەسەوەمەحکوومەبەخنکان.

ئەرێ، بێگومان وابوو. ئێستا ئەم پرسیارەدێتەئاراوە: ئایا باوکی ئەگنێسیش بەقەد خودی ئەگنێس، کە هەم ڕقی لەماتۆڕسوارەکەیەو هەم ڕقی لەو پیاوەیەکەلەبەر گوێچکەگرتنەکەی سەرکۆنەی کردووە، ڕقی لەو کەسانەیەکەلەناو پاپۆڕەکەدان؟ نا، ئەگنێس پێی وا نییەباوکی بتوانێ ڕقی لە کەس بێت. ئەوەداوی ڕق و نەفرەتەکەئێمەبەدوژمنەکانمانەوەدەبەستێتەوە. هەموو قێزەونی شەڕ لەم دوو شتەدایە: هاوسۆزیی خوێنی ڕژاوی دوو لایەنەکە، لێکنزیکیی شەهوانیی ئەو دوو سەربازەکەچاویان لەچاوی یەکترەو سنگی یەکتر هەڵدەدڕن. ئەگنێس دڵنیا بوو کەباوکی ڕقی لەم

جۆرەنزیکایەتییەبووە. شەڕوپێکدادانی خەڵکی ناو پاپۆڕەکەئەوەندەڕقیان هەستاندووەکەخنکانەکەی بەلاوەباشتر بووە. شەڕکردن لەگەڵ ئەو خەڵکەکە مستیان لە یەکتر دەسرەواند، یەکتریان پێشێل دەکرد و یەکتریان دەکوشت، بەلای ئەوەوەزۆر خرابتر بووە لەمردنێکی بەتەنیا لەناو ئاوی پاکی دەریاکە.

یادەوەریی باوکی وردەوردە لەو نەفرەتەدەربازی کرد کەداگیری کردبوو. وردەوردە ڕوومەتی ژاراوی ئەو پیاوەی لێ ون کرد کەبەنێوچاوانی خۆیدا دەکوتا، لەباتی ئەوەئەم ڕستەی بەبیردا هات: من ناتوانم ڕقم لەئەوان بێت، چونکەهیچ شتێک من و ئەوان پێکەوەنابەستێتەوە. من هیچ شتێکی هاوبەشم لەگەڵ ئەواندا نییە.

## ٦

ئەگنێس بۆ ئاڵمانینەبوونەکەی، خۆی بە قەرزداری شکستەکەی هیتلەر لەشەڕدا دەزانێت. یەکەم جار بوو لە مێژوودا کەلایەنی تێشکاوی شەڕ شانازیی پێ نەبڕا، تەنانەت شانازیی پڕ لەمەینەت و مەرارەتی ئەو کەسانەشی پێ نەبڕا کە پاپۆڕەکەیان لەدەریادا تێکدەشکێت. لایەنی سەرکەوتوو بەسەرکەوتنەکەی ڕازی نەبوو. بڕیاری دا دۆڕاوەکانی شەڕ ڕاکێشێتەبەردەمی دادگا و گشت نەتەوەکە دادگایی بکات، بۆیە قسەکردن بە زمانی ئاڵمانی، یاخود ئاڵمانیبوونیش کارێکی ئەستەم بوو.

پێشینیانی ئەگنێس، لە دایکییەوە، ئەو جووتیارانەبوون کەلەسەر سنووری نێوان دوو بەشی ئاڵمانی و فەڕەنسیی وڵاتی سویس دەژیان؛ بەم شێوەئەوان ئەگەرچی لەلایەنی ئیدارییەوەفەڕەنسی-سویسی بوون، بەڵام بە هەردوو زمانەکەدەدوان. پێشینیانی باوکیشی لەو ئاڵمانییانەبوون کە لە مەجارستان دەژیان. باوکی، لەتافی گەنجیدا لە پاریس خوێندبووی و لەوێش فێری زمانی فەڕەنسی بووبوو، بەڵام دوای ئەوەی ژنی هێنا، بێگومان زمانی ئاڵمانی بوو بەزمانی هاوبەشی نێوان خۆی و هاوسەرەکەی. کاتێک شەڕ کۆتایی هات، دایکی بیری زمانی فەرمیی پێشینیانی خۆی کەوتەوە و ئەگنێسی بۆ قوتابخانەیەکی فەڕەنسی نارد. باوکی تەنیا حەزی لە یەک شتی ئەڵمانی دەکرد کەئەویش خوێندنەوەی شێعری گۆتەبە زمانی خۆی بۆ کچەگەورەکەی بوو.

ئەمەیەکێک لە بەناوبانگترینی ئەو شێعرانەیەکەبەزمانی ئاڵمانی گوتراوەو هەموو منداڵەئاڵمانییەک دەبێت لەبەری بکات:

ئاسوودەیی
بەژوور هەموو لووتکەکانەوەیە.
لەسەر لقی دارەکان
بە گران
هەست بەهەناسەی سروەیەک دەکەیت.
باڵندەکان لەدەوەنەکاندا بێدەنگن
سەبر بگرە! بەم زووانە
تۆش ئاسوودەدەبیت.

مانای شێعرەکەئاسانە: لەدارستان هەموو شتێک خەوتووە و تۆش دەخەوی. ئەم شێعرەبەو مەبەستەنەگوتراوەکەبەفکرێکی سەیروسەمەرەتووشی سەرسوورمانمان بکات، بەڵکو تەنیا ویستوویەتی ساتێک لەبوون وا لێبکات کەهەرگیز لە بیری نەکەین و ئەو بەهایەی پێ ببەخشێت کەدڵمان بۆی تەنگ ببێت و تاسەی بکەین.

ئەم شێعرەلە وەرگێڕانی وشەبەوشەدا هەموو شتێکی دەدۆڕێنێت. بۆخۆتان تێدەگەن کاتێک بەزمانی ئاڵمانی دەخوێندرێتەوە، چەندە جوانە.

Uber allen Gipfeln
Hsl Ruh,
In allen Wipfeln
Spuresl du
Kaum einen Hauch
Die Vogel sehweigen im walde.
Warte nur, balde
Ruhest du auch.

هەر دێڕێکی ئەم شێعرەلەچەند بڕگەی جیاواز پێکهاتووە. کێشەدوو بڕگەییەکورت و بڵێندەکان‌و کێشەسێ بڕگەییەکانیش دوابەدوای یەکتر هاتوون. دێڕی شەشەم بەئاشکرا لە دێڕەکانی دیکەبڵێندترە و هەرچەندە شێعرەکەبریتییەلە دوو چوارخشتەکی، یەکەم ڕستەی فەرمانی دەقاودەق لە دێڕی پێنجەمدا کۆتایی دێت و ڕیتمێک ساز دەکات کە پێشتر لە هیچ شێعرێکدا، جگەلەم شێعرە، نەبووە. ئەم شێعرەچەندەسادەیە، ئەوەندەش بەشکۆیە.

باوکی ئەگنێس ئەو دەمەکەهێشتا لەمەجارستان، لە قوتابخانەحکوومییە ئەڵمانییەکان دەیخوێند، فێری ئەم شێعرەبووبوو. ئەگنێسیش یەکەم جار لەتەمەنی ئەو دەمەی باوکیدا لێی بیستبوو. ئەوان بەدەم گەڕان و پیاسەکانیانەوەئەم شێعرەیان دەخوێندەوە. جەختێکی زیاد لەحەدیان لەسەر شوێنەدیاریکراوەکان دەکردەوە و هەوڵیان دەدا بە ڕیتمی شێعرەکەهەنگاو هەڵبهێننەوە. دیارەئەوەش بەهۆی کێشی نارێکی شێعرەکەوەکارێکی ئاسان نەبوو، تەنیا کاتێک لێی سەرکەوتوو دەبوون کەدەگەیشتنەدوو دێڕی کۆتاییەکەی: War-te nur–ba-lde-ru-hest-du-auch! ئەوان دواهەم وشەکەیان ئەوەندەبەرز دەخوێندەوەکەخەڵک لەچەند مایلییەوەگوێیان لێ دەبوو: auch!

باوکی، دواهەم جار، دوو سێ ڕۆژ بەر لەوەی بمرێت ئەم شێعرەی بۆ خوێندەوە. سەرەتا ئەگنێس پێی وابوو باوکی هەوڵدەدا بگەڕێتەوەبۆ تافی منداڵی و زمانی دایکیی، پاشان کەدیی بەخۆشەویستییەوەچاوی لەچاوی بڕیوە، پێی وابوو دەیەوێت بیری پیاسەو گەڕانەخۆشەکانی ڕابوردووی بخاتەوە. لەکۆتاییدا زانیی کەشێعرەکەباسی مردن دەکات. باوکی دەیویست بە کچەکەی بڵێت خەریکەدەمرێت و بۆخۆشی دەزانێت کەخەریکەدەمرێت. پێشتر

ئەگنێس بیری لەوەنەکردبووەوەکەڕەنگەئەو دێڕەسادەو خۆشانەکەبۆ منداڵەقوتابییەکان گوتراون، مانایەکی ئاواشیان ببێت. باوکی لەناو جێگەدا ڕاکشابوو، بەهۆی "تا"وەناوچاوانی سەر ئارەق نیشتبوو؛ ئەگنێس دەستی خستبووە ناو دەستی خۆی و دەیگووشی. لەگەڵ ئەوەدا کە هەوڵی دەدا بەر بە فرمێسکەکانی بگرێت، لەگەڵ باوکی دەیگوتەوە: Warte nur, balde ruhest du auch. سەبر بگرە، بەم زووانەتۆش ئاسوودە دەبیت. ئەگنێس گوێی لەدەنگی نزیکبوونەوەی مردنی باوکی بوو. ئاسوودەیی باڵندەکان لەسەر لقی دارەکان.

کەباوکی مرد ئاسوودەییش کەمەکەمەسەقامگیر بوو. ئەو ئاسوودەییەلەگیانی ئەگنێسدا بوو، جوان بوو؛ با دووبارەی بکەمەوە: ئاسوودەیی باڵندەکان لەسەر لقی دارەکان بوو. پاش ماوەیەک دواهەم پەیامی باوکی زۆر بەئاشکرا لەو بێدەنگییەدا، وەک فیکەی ڕاوچییەک کەلەقووڵایی دارستانەوەدێت، دەنگی دایەوە. باوکی بەبەخشینی دیاری دەیویست چی پێ بڵێت؟ دەیویست پێی بڵێت کەئازاد بێت، بەو شێوەبژی کەخۆی حەز دەکات، بۆ شوێنێک بچێت کەخۆی پێی خۆشە. ئەو خۆی هەرگیز نەیوێرابوو کاری وا بکات، بۆیەهەموو ئەو شتانەی بەکچەکەی دابوو کەبۆ ئازایەتی و بوێری پێویستی پێیان بوو.

ئەگنێس لەو کاتەوەشووی کرد، هەموو خۆشییەکی تەنیایی لەکیس چوو؛ لەشوێنی کارەکەی، ڕۆژی هەشت کاتژمێر لەژوورێکدا لەگەڵ دوو هاوکاری بوو، پاشان دەگەڕایەوەبۆ ماڵەوە، بۆ ئاپارتمانێکی چوار ژوورە. تەنانەت یەکێک لەو ژوورانەش هیی خۆی نەبوو. ماڵەکەهۆڵێکی گەورەی بوو کەلێی دادەنیشتن، ژوورێکی خەوتنیش بۆ خۆی و پاول، ژوورێکیش بۆ بریژیت و

ژوورێکی بچووکیش بۆ کارکردنی پاول. کەئەگنێس گلەیی دەکرد، پاول (بەو پەڕی ڕاستگۆییەوە) پێی دەگوت ژووری دانیشتنەکەش بۆ تۆ و بەڵێنی پێ دەدا کەنەخۆی و نەبریژیت لەوێ سەروداڵی نەگرن، بەڵام ئەو چۆن دەیتوانی لەو هۆڵەدا هەست بەئاسوودەیی بکات کەمێزێک و هەشت کورسیی لێ بوو و میوان نانیان لەسەر دەخوارد؟

ڕەنگەئێستا ئەوەتان بۆ ڕوون بووبێتەوەکەبۆچی ئەگنێس ئەو بەیانییەلەنێو جێگەکەیدا، کەپاول پێش لە سەعاتێک لێی چووبووەدەر، ئەوەندەخۆشحاڵ بوو، بۆ ئەوەندەهێواش و لەسەرخۆ بە هۆڵەکەدا تێپەڕی تا سەرنجی بریژیت ڕانەکێشێت. ئەو تەنانەت پێشوازیی لەو مەسعەدە وازوازییەش کرد کەبۆ چەند ساتێک ئاسوودەیی پێ دەبەخشی و چاوەڕوانی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلیش بوو، چونکەلەئۆتۆمبێلەکەدا کەس نەیدەدواند و کەس سەیری نەدەکرد. نەرێ، گرینگ ئەوەبوو کەکەس سەیری نەدەکرد. تەنیایی، غیابی شیرینی نیگاکان. جارێک هەر دوو هاوکارەکەی نەخۆش کەوتن و پشوویان وەرگرت. ئەو بۆ ماوەی دوو حەفتەی ڕەبەق لە فەرمانگەدەوامی کرد. کاتێک کەدی لەکۆتایی ڕۆژەکاندا کەمتر هەست بەماندوویی دەکات، سەری سووڕما. لەودەمەبەدواوەدەیزانی نیگای خەڵک وەک بارێکی قورسەکەبەعەرزییەوەدەنووسێنن، یان وەک ماچێکەکەهەموو توانای هەڵدەمژن. نیگای خەڵک دەرزییەک بوو کە چرچولۆچی دەخستەڕوومەتییەوە(!).

بەیانی کەبەئاگای بووەوە، لەهەواڵەکانی ڕادیۆی بیست کەژنێکی گەنج لە کاتی نەشتەرگەرییەکی سادە، بە هۆی خەمساردی لەبێهۆشکردنەکەیدا مردووە. بەو بۆنەوەسێ پزیشک دادگایی کراون و ڕێکخراوێکی پشتگیری لەبەکارهێنەرەکانیش پێشنیاری ئەوەی

کردووەکەلەداهاتوودا فیلم لەهەموو نەشتەرگەرییەکان بگرن و فیلمەکانیش ئەرشیف بکەن. دیارەخڵک پێشوازییان لەم پێشنیارەکرد. هەموو ڕۆژێک بەشفرەی هەزاران نیگا، هەنجن هەنجن دەکرێن، کەچی هێشتا پێمان کەمە. لە ئەنجامدا نیگایەکی ڕێکخراوەیی دادەمەزرێت کەواز لە ساتەکانمان ناهێنێت. لە شەقام، لە دارستان، لەسەر تەختی نەخۆشخانە، لەناو پێخەف، فیلمەکانی ژیانمان بە هەموو وردەکارییەکەوەئەرشیف دەکرێن تا هەر کاتێک کەپێویست بێت، لەدادگا، یان بۆ ورووژاندنی کونجکۆڵی گشتی، سوودیان لێ وەربگیرێت.

ئەم بیرۆکانەهەمدیسان ئارەزووی چوون بۆ سویسیان لە ئەگنێسدا بەئاگا کردەوە. لەڕاستیدا لەپاش مردنی باوکییەوەساڵی دوو سێ جار دەچوو بۆ سویس. پاول و بریژیت بەبزەیەکی چاوپۆشیکارانەوەباسی ئاتاجی ساغڵەمی و هەستیارییان دەکرد. دەیانگوت: "دەچێت بۆ ئەوێ تا گەڵا وەریوەکانی سەر گۆڕی باوکی بماڵێ و لە پەنجەرەی ئوتێلێکی سویسییەوەهەوای تازە هەڵمژێت، بەڵام ئەوان بەهەڵەچووبوون. ئەگنێس هەرچەندەلەوێ دۆستی نەبوو، بەڵام خودی چوونەکەی بۆ سویس، بە لای خۆیەوەبە مانای کردەیەکی خەیانەتکارانەی بەردەوام و قووڵ بوو کەبەرامبەر بەئەوان دەیکرد. وڵاتی سویس، دەنگی باڵندەکان بەسەر چڵی دارەکانەوە. ئەو خەونی بەڕۆژێکەوەدەبینی کەبۆ هەمیشەلەوێ بژی و هەرگیز نەگەڕێتەوە. چەند جار وا شوێن ئەو خەونەی کەوت کەویستی لەسویس ماڵێک بکڕێت، یان بە کرێی بگرێت، تەنانەت لە مێشکی خۆیدا نامەیەکیشی بۆ کچ و مێردەکەی نووسی تا پێیان بڵێت ئەگەرچی هێشتا خۆشی دەوێن، بەڵام بڕیاری داوەبەبێ ئەوان و بە تەنیا لەوێ بژی؛ هەروەها تکاشی لێ کردن کەجاروبار هەواڵی

سەلامەتیی خۆیانی بۆ بنووسن تا دڵنیا بێت هیچیان بەسەر نەهاتووە. دەربڕین و شیکردنەوەی ئەم بابەتەزۆر دژوار بوو: ئەو دەیویست ئاگای لە ژیان و گوزەرانی ئەوان بێت و لەهەمان کاتیشدا پێی خۆش نەبوو بیانبینێت، یان لەگەڵیان بژی.

ئەڵبەتەهەموو ئەمانەخەون و خەیاڵ بوون. مەگەر دەکرێ ژنێکی ژیر و عاقڵ واز لەژیانێکی هاوبەشیی خۆش و شیرین بێنێت؟ کەچی بەو حاڵەش دەنگێکی دەسخەڕۆکەر بەردەوام لەدوورەوەهەڕەشەی لەئاسوودەیی ژیانی هاوبەشیی دەکرد: ئەوەدەنگی تەنیایی بوو. ئەگنێس چاوی دەقووچاند و گوێی بۆ دەنگی فیکەی ڕاوچییەک شل دەکرد کەلە قووڵایی دارستانەدوورەکانەوەدەهات. لەو دارستانەدوورانەکۆمەڵێک ڕێچکەو ڕێباز بوون کەباوکی لەسەر یەکێکیان ڕاوەستابوو، بەزەردەخەنەوەداوای لێ دەکرد بچێت بۆ لای.

# ٧

ئەگنێس لەسەر مۆبلەکەدانیشتبوو، چاوەڕێی پاولی دەکرد. ئەوان بەتەمای خواردنێک بوون کەفەڕەنسییەکان پێی دەڵێن «خواردنی دەرەوە». ئەگنێس لەبەیانییەوەهیچی نەخواردبوو، هەستی بە ماندووبوون دەکرد. بۆ ئارامکردنەوەی ئەعسابی، پەڕەی لە گۆڤارێکی ئەستوور هەڵدەدایەوە. هێزی خوێندنەوەی نەبوو، لاپەڕەبەلاپەڕەسەیری وێنەکانی دەکرد کە هەموویان ڕەنگی بوون. ڕیپۆرتاژێک لەناوەڕاستی گۆڤارەکەدا باسی کارەساتێکی دەکرد کەلە کاتی نمایشێکی ئاسمانیدا ڕووی دابوو. فڕۆکەیەک ئاگری گرتبوو، بەسەر ئاپۆڕەی بینەرەکاندا کەوتبووەخوار. وێنەکان گەورەبوون و هەریەکە لاپەڕەیەکیان گرتبووەوە. هەموویان وێنەی کەسانێکی تۆقاو بوون کە بەجلوبەرگی خەڵووزی و پێستی سووتاو و جەستەی گڕگرتوویانەوەبەملاولادا هەڵدەهاتن. ئەگنێس نەیدەتوانی سەیری ئەو وێنانە نەکات، بیری لە خۆشحاڵیی بێسنووری وێنەگرێک دەکردەوەکەلەبینینی دیمەنەئاساییەکان ماندوو بووەو لەپڕێکدا سەیر دەکات بەخت لە ئاسمانەوە، لەشێوەی فڕۆکەیەکی سووتاو، دەکەوێتەخوار!

ئەگنێس چەند پەڕەیەکی هەڵدایەوەو چاوی بەچەند کەسێکی ڕووت لە کەناری دەریایەک کەوت. ئەم عینوانەش بە پیتی درشت لەسەر وێنەکان نووسرابوو: «ئەم وێنانە نابن بەبەشێک لە ئەلبۆمی باخی باکینگهام!». هەروەها وتارێکی کورتیش کەبەم ڕستەکۆتایی

دەهات: «... وێنەگرێک لەوێ بوو، جارێکی دیکەش شازادەخانم بەهۆی پەیوەندییەترسناکەکانییەوەخۆی خستەبەرچاو و سەرنجی خەڵک». وێنەگرێک لەوێ بوو. وێنەگرێک لەهەموو کوێیە. وێنەگرێک، کەخۆی کردووەبەسواڵکەرێکی شەل و گێژ، لەناو دەوەنەکاندا خۆی حەشارداوە. هەموو کوێیەک چاوی لێیە. هەموو کوێیەک لێنزی لێیە. ئەگنێس وەبیری هاتەوەکەبە منداڵی زۆر لەو بیرۆکە سەرسام بووە کەخودا دەیبینێت، خودا هەمیشەچاوی لێیەتی. ڕەنگەئەوەیەکەم جار بووبێت ئەو چێژ و خۆشییەسەیرەی ئەزموو‌بێت کەخەڵک کاتێک دەبیندرێن هەستی پێ دەکەن. کاتێک بەپێچەوانەی حەزی خۆیان دەبیندرێن، کاتێک لەساتەوەختەشەخسی و تایبەتییەکاندا دەبیندرێن؛ کاتێک بە چاو و نیگای ئەو کەسانەکەبەرەوڕوویان ڕاوەستاون، ئەتک دەکرێن. دایکی کەژنێکی ئیماندار بوو، پێی گوت: «خودا دەتبینێت» ئەو بەم شێوەدەیویست فێری بکات درۆزن نەبێت و نینۆکەکانی خۆی نەخوات و قامکی لە لووتی ڕۆ نەکات، بەڵام شتێکی دیکەڕووی دا: ڕێک لەو کاتانەدا کەخەریکی خووەخراپەکانی خۆی بوو، یان لە ساتەوەختە تەواو تایبەتییەکانی لەشیدا، ئەگنێس بیری خودا دەکەوتەوەو ئەم کارانەی لەبەر ئەو دەکرد.

ئەو بیری خوشکی شاژن کەوتەوە و لەبەر خۆیەوەگوتی: «ئەمڕۆ کامێرا جێگەی چاوی خودای گرتووەتەوە. چاوی کەسێک جێگەی چاوی هەموو کەسی گرتووەتەوە. ژیان بووەتەهەرزەییەکی بەربڵاو کەهەموو کەس تیایدا بەشدارە. هەموو کەس دەتوانێت ئەو شازادەخانمەئینگلیسییەببینێت کەبەڕووتی لە کەنارێکی گەرمدا جەشنی لەدایکبوونی دەگرێت. کامێرا، وەک دیارە، حەزی لەخەڵکی بەناوبانگە، بەڵام مادام فڕۆکەیەک لەنزیک تۆش بکەوێتە خوار و کراسەکەت ئاگر بگرێت، دەستبەجێ ناوبانگ دەردەکەیت و

دەچیتەڕیزی ئەو هەرزەکاری و ڕابواردنەوەکەبێگومان هیچ پەیوەندییەکی بەچێژخوازییەوەنییە، بەڵکو تەنیا بانگەوازێکی جیددییەبۆ ئەو کەسانەکەجێگەیەک شک نابەن خۆیان لێ بشارنەوە و هەموو کەسیش لە بارمتەی خەڵکی دیکەدان.

جارێک ئەگنێس لەگەڵ پیاوێک ژوانی هەبوو، لەو کاتەدا کەلە لۆبی ئوتێلێکی گەورەخەریکبوو ماچی دەکرد، کتوپڕ پیاوێکی ڕیشنی لێ دەرکەوت کەشەرواڵی جین و جاکەتی چەرمی لە بەردا بوو، پێنج توورەکەی بە شانوملیەوەبەردابووەوە. کابرا نەوییەوەو لە کامێراکەیەوەسەیری کرد. ئەگنێس دەستی بەبەر ڕوومەتییەوەگرت و لێی ڕاوەشاند، بەڵام کابراکە پێکەنی و بەئینگلیسییەکی سەقەت شتێکی پێ گوت. ئەوسا وەک کێچ بۆ دواوەفڕی و پرتەپرت ڕەسمی لێ گرت. ئەمە ڕێکەوتێکی سەیر و بێمانا بوو. لەو ئوتێلەسمینارێک بەڕێوەدەچوو، کابرایەکی وێنەگریشیان گرتبوو تا بۆ یادگاری ڕەسمی ئەو زانایانەبگرێت کەلە هەموو لایەکی دنیاوەهاتبوون و پێیان بفرۆشێتەوە، بەڵام ئەگنێس نەیدەویست لەشوێنێک بەڵگەیەک ببێت کەپەردەلەئاشنایەتی و ژوانی خۆی و ئەو پیاوەهەڵبداتەوە. ڕۆژی دوایی گەڕایەوەبۆ ئوتێلەکەو هەموو ڕەسمەکانی خۆی (ئەو ڕەسمانەکەئەوی لەلای پیاوێک پیشان دەدا کەدەستی بە بەر ڕوومەتیەوە گرتبوو) کڕی و هەوڵی دا نێگەتیڤی فیلمەکانیشیان لێ وەربگرێت، بەڵام هەموو نیگەتیڤەکانیان لە نووسینگەی وێنەگرییەکەئەرشیف کردبوو، کەس دەستی پێ نەدەگەیشت. ئەو ئەگەرچی هەستی بە هیچ هەڕەشەو مەترسییەک نەدەکرد، بەڵام نەیدەتوانی نیگەران نەبێت؛ چونکەچرکەیەک لە ژیانی، لەبری ئەوەی کەوەک هەموو چرکەکانی تر لەهیچدا بتوێتەوە، لە ڕەوتی زەمەن

دادەبڕێت و ڕەنگەبە هۆی ڕێکەوتێکی گەوجانەوە، وەک مردوویەک کەچاک دفن نەکرابێت، بگەڕێتەوەو بەردەوام سەری لێ بدات.

گۆڤارێکی دیکەی هەڵگرت کە زیاتر تایبەت بەسیاسەت و فەرهەنگ بوو. ئەو گۆڤارەهیچ بابەتێکی تایبەت بەکارەسات، یان شازادەخانمی ڕووتی کەنار دەریای تێدا نەبوو، بەڵام لەبری ئەوانەپڕ بوو لە ڕەسمی ڕوومەت. هەمووی ڕوومەت بوو، تەنانەت لەدوا لاپەڕەشیدا کە تایبەت بەلێکۆڵینەوەلەکتێبەکان بوو. لەگەڵهەموو وتارێکدا وێنەی نووسەری کتێبەکەشیان چاپ کردبوو. زۆربەی نووسەرەکان کەسی ناسراو نەبوون، بۆیەدەکرا وەک زانیاریی پێویست سەیری وێنەکانیان بکرێت، بەڵام هیچ پاساوێک بۆ دانانی پێنج وێنەی سەرۆککۆمار نەبوو کەهەموو کەس شێوەی دەم و لووت و چەناگەشیانی لەبەر بوو؛ تەنانەت لەژوور دەقی سەروتارەکەش وێنەی بچووکی نووسەرەکەیان دانابوو، کەپێدەچوو هەموو حەفتەیەک لەو شوێنەبڵاوبکرێتەوە. ئەو وتارانەش کەپەیوەندییان بەئەستێرەناسییەوەبوو، بەوێنەی بزەی ئەستێرەناسەکان ڕازابوونەوە، تەنانەت ڕیکلامەکانیش -ڕیکلام بۆ ئامێری تایپ و مێز و مۆبل و گێزەریش- هەموویان ڕوومەتیان بوو، ڕوومەتێکی زۆروزەوەند. ئەگنێس دیسان سەیری گۆڤارەکەی کردەوە، لەیەکەم لاپەڕەوەتا دواهەم لاپەڕە، نەوەدودوو وێنەی بژارد کە جگەلەڕوومەت هیچی دیکەیان تێدا نەبوو. چلویەک وێنەی ڕوومەت و لەش، نەوەد ڕوومەت لەبیستوسێ وێنەی بەکۆمەڵدا، تەنیا لە یازدەوێنەدا کەسەکان دەوری پەراوێزییان هەبوو، یان هۆشیان لای وینەگرتنەکەنەبوو. بەگشتی دووسەد و بیستوسێ (وێنەی) ڕوومەت لەگۆڤارەکەدا بوو.

پاشان، پاول گەڕایەوەبۆ ماڵ و ئەگنێس باسی ئەو ژمارانەی بۆ کرد. پاول قسەکانی بۆ سەلماند:

«بەڵێ خەڵک هەرچی زیاتر بەرامبەر بە سیاسەت و بەرژەوەندیی گشتی بێدەربەست بن، زیاتر بەدەربەستی ڕومەتی خۆیانەوەدەبن. ئەمە تاکخوازی سەردەمەکەمانە».

«تاکخوازی؟ ئەمەچ پەیوەندییەکی بە تاکخوازییەوەهەیە، ئەویش کاتێک کامێرا لە ساتەوەختی ئازاردا ڕەسمت لێ دەگرێت؟ بە پێچەوانەوە، ئەمەبەو مانایەیەکە تاکەکەس ئیتر هیی خۆی نییە، بەڵکو بووەبەموڵکی خەڵکی دیکە. دەزانی، من بیری منداڵیی خۆم دەکەومەوە. ئەو دەمانەئەگەر بتویستایەوێنەی کەسێک بگریت، دەبوایەئیجازەی لێ بخوازیت، تەنانەت ئەو دەمەکە من منداڵ بووم، گەورەکان لێیان دەپرسیم: کچۆڵەکە، من بۆم هەیە وێنەت بگرم؟ لەوەدوا ئیتر کەس ئیجازەی نەخواست. مافی کامێرا لە مافەکانی دیکەباڵاتر بوو، ئەمەش هەموو شتێکی گۆڕی؛ بەشێوەیەکی ڕەها هەموو شتێکی گۆڕی».

ئەگنێس دیسان گۆڤارەکەی کردەوەو گوتی:

«ئەگەر تۆ وێنەی دوو ڕوومەتی جیاواز لە پاڵ یەکتر دابنێیت، چاو بۆ جیاوازییەکانی نێوان دوو ڕوومەتەکەدەگێڕیت، بەڵام ئەگەر دووسەد و بیستوسێ ڕوومەت لە پاڵ یەکتر بێت، کتوپڕ وا تێدەگەی کە هەموویان یەک ڕوومەتن لە دۆخی جوراوجۆردا و ئیتر هیچ شتێک بەناوی "تاک" بوونی نامێنێت».

پاول کەلەناکاو دەنگی جیدی بووبوو، گوتی:

«ئەگنێس، ڕوومەتی تۆ لە ڕوومەتی کەسی دیکەناچێت».

ئەگنێس لەو ئیقاعەجیددییەی دەنگی پاول نەگەیشت و زەردەخەنەی کرد.

«پێمەکەنە، بەڕاستمە. ئەگەر تۆ کەسێکت خۆشبوێت، رووەمەتەکەشیت خۆشدەوێت. لەدۆخێکی ئاوادا ڕوومەتی ئەو کەسەلە ڕوومەتی هیچ کەسێکی دیکەناچێت».

«بەڵێ، تۆ من بەڕوومەتمەوەدەناسی. تۆ من وەک ڕوومەت دەناسی و هەرگیز بەجۆرێکی دیکەنەتناسیوم. کەواتەهەرگیز بە مێشکی تۆدا تێنەپەڕیوەکەڕوومەتی من خودی من نییە».

پاول بە وردبینی و تاقەتی پزیشکێکی پیرەوەوەڵامی دایەوە:

«بۆ پێت وایەڕوومەتەکەت خودی خۆت نییە. ئەی کێ لەپشت ڕوومەتی تۆوەیە؟»

«بیر لەژیان لەجیهانێکدا بکەرەوەکەئاوێنەی تێدا نەبێت. تۆ بەردەوام خەون بەڕوومەتی خۆتەوەدەبینیت و پێت وایەڕوومەتت ڕەنگدانەوەی ئەو شتانەیەکەلەناخ و دەروونتدایە، بەڵام دواتر کەتەمەنت بوو بە چل ساڵ، کەسێک بۆ یەکەم جار ئاوێنەیەکت لە بەرامبەر دەگرێت؛ بیر لەو ترس و تۆقینەی ئەو دەمەت بکەرەوە! تۆ ڕوومەتێکی نامۆ دەبینیت و بەئاشکرا پەی بە شتێک دەبەیت کە توانای قبووڵکردنیت نییە: ڕوومەتی تۆ خودی تۆ نییە».

پاول گوتی: «ئەگنێس»، ئەوسا لەسەر مۆبلەکەهەستا و لە لای ئەگنێس ڕاوەستا. ئەگنێس لە چاوەکانیدا عەشق و خۆشەویستیی بینی و لەڕوومەتیدا دایکی. پاول لە دایکی دەچوو، هەروا کە دایکیشی ڕەنگەلەباوکی چووبێت و ئەویش لەکەسێکی دیکە چووبێت.

کاتێک ئەگنێس بۆ یەکەم جار چاوی بەدایکی پاول کەوت، زۆری بەلاوەناخۆش بوو کەپاول لەئەو دەچوو. دواتر، کاتێک پاول و ئەگنێس پێکەوەجووت دەبوون و عەشقبازییان دەکرد، جۆرەپرکێشییەک ئەوی بیری لێکچوونەکەی لەگەڵ دایکی دەخستەوە و هەندێک جار پێی وابوو ئەوەدایکی پاولە کەلەسەری

ڕاکشاوەو ڕوومەتی لەشەهوەتدا خواروخێچ بووە، بەڵام پاول لەمێژبوو لەبیری چووبووەوەکەڕوخساری دایکی بەڕوومەتییەوەیە و بڕوای وابوو کەڕوومەتی هی خۆیەتی، نەک هی کەسی تر.

ئەگنێس درێژەی بەقسەکانی دا:

«ناوەکانیشمان تەنیا ڕێکەوتن. ئێمەنازانین ناوەکانمان کەی داهاتوون، یان چۆن یەکێک لە پێشینیانمان ئەو ناوەی وەرگرتووە. ئێمەلەناوی خۆمان ناگەین و بەمێژووەکەشی نازانین، کەچی بەو حاڵەش، بەوپەڕی وەفادارییەوەقبووڵی دەکەین و تێکەڵاوی دەبین، خۆشمان دەوێت و بە شێوەیەکی سەیر گاڵتەجاڕانەشانازیی پێوەدەکەین. دەڵێی خۆمان، لەساتەوەختێکی درەوشانەوەی ئیلهامدا ئەو ناوەمان داهێناوە. ڕوومەتیش هەر وەک ناو وایە. ئەوەی دەیڵێم ڕەنگەکەمێک پێش کۆتاییهاتنی تافی منداڵیم ڕووی دابێت: من ماوەیەکی زۆر ئەوەندە سەیری ئاوێنەم دەکرد تا لە ئەنجامدا بڕوام بەوەهێنا کەئەوەی دەیبینم بۆخۆمم. یادەوەرییەکانی ئەو قۆناغەی ژیانم زۆر لێ ڕوون و ئاشکرا نییە، بەڵام دەزانم کەدەبێ دۆزینەوەی 'خود' زۆر خۆش و بەکەیف بووبێت. ئەڵبەت هەندێک جاریش تۆ دەچیتەبەر ئاوێنەو لە خۆت دەپرسی: ئایا ئەمەخودی منە؟ بۆچی؟ بۆ دەبێ من لەگەڵ ئەمەدا یەک بم؟ من چیم لەم ڕوومەتەداوە؟ ئەو دەمەیەکەهەموو شتێک هەرەس دەهێنێت، هەموو شتێک دەڕووخێت».

«چی دەڕووخێت؟ چیت بەسەر هاتووە، ئەگنێس؟ تۆ ئەم ماوەچیت بەسەر هاتووە؟»

ئەگنێس سەیری کرد و سەری داخست: زۆر لە دایکی دەچێت. ئەڵبەت دواتر لەمە زیاتریش لە دایکی دەچێت. لەهەمیشەزیاتر لەو پیرێژنەدەچێت کەدایکی بووە.

پاول باوەشی بەئەگنێسدا کرد و بەرزی کردەوە. ئەگنێس سەیری کرد و پاول تازە زانیی کەچاوەکانی ئەگنێس پڕن لەفرمێسک.

ئەو ئەگنێسی بەخۆیەوەگووشی. ئەگنێس دەیزانی پاول شەیدایەتی و ئەوەش لەپڕ تووشی خەمێکی قووڵی کرد. ئەگنێس خەمبار بوو کەپاول ئەوەندەی خۆش دەویست، هەستی کرد دەیەوێت بگری. پاول گوتی:

«دەبێ جلەکانمان لە بەر بکەین. دەبێ زوو بڕۆین».

ئەگنێس لەباوەشی هاتە دەر و بەرەو گەرماوەکەهەڵات.

## ٨

لەبارەی ئەگنێسەوەدەنووسم، هەوڵ دەدەم وێنای بکەم. ڕێگەی پێ دەدەم لەسەر کورسییەلاکێشەکەی ساونا دابنیشێت، لەپاریس پیاسەبکات، لاپەڕەلە گۆڤارێک هەڵبداتەوە، لەگەڵ مێردەکەی بدوێت، بەڵام گوایەلە بیرم چووەتەوەکەهەموو ئەم شتانەلەجووڵەو فیگەری ژنێکەوەدەستی پێکردووەکەلەقەراغ مەلەوانگەیەک دەستی بۆ کەسێکی دیکەڕادەوەشاند. ئایا ئەگنێسیش بەم شێوەدەست بۆ کەس ڕادەوەشێنێت؟ نەخێر. هەرچەندە ڕەنگەسەیر بێت، بەڵام من پێم وایەئەو لەمێژەکاری وای نەکردووەوە. زۆر لەمەپێش، ئەو دەمەکەهێشتا زۆر گەنج بوو، بەڵێ، بەم شێوەدەستی ڕادەوەشاند.

ئەو دەمەئەگنێس هێشتا لەشارۆچکەیەکی سویس دەژیا کەبەلووتکەی ئەو کێوانەکەلایەکیان لەدوورەوەدیار بوو، دەوری گیرابوو، شانزە ساڵی تەمەن بوو کەلەگەڵ هاوپۆلێکی چوو بۆ سینەما. کاتێک چراکان کوژانەوە، کوڕەکەدەستی گرت. دەستبەجێ بەرەدەستیان عارەقی کردەوە، بەڵام کوڕەکە نەیوێرا ئەو دەستەی کەئازایانە گرتبووی بەری بدات، چونکەئەوە بەو مانایە بوو کەلەعارەقکردنەوەی بەرەدەستی شەرمەزارە. ئەوان بەو شێوە، بەبەرەدەستی تەڕ و پێکەوەلکاوەوەسەعات و نیوێک دانیشتن. کاتێک دەستی یەکتریان بەردا کەچراکان هەڵکران.

کوڕەکەبۆ درێژکردنەوەی ماوەی دیدارەکەیان، سەرەتا ئەگنێسی بۆ شەقامەکۆنەکانی ناوەندی شار و پاشان بۆ سەر گردێک و

حەساری سەومەعەیەکی پڕ لە توریست و گەڕیدەی برد. دیار بوو لەوەپێش بیری لە هەموو شتێک کردبووەوە، چونکەزۆر ئازایانە، بەو بیانووەوەکەدەیەوێت تابلۆیەکی شێوەکاریی پیشان بدات، بەرەو گوزەرێکی چۆڵی برد. ئەوان گەیشتنە ئەوسەری گوزەرەکە، کەچی لەبری تابلۆی شێوەکاری بەرەورووی دەرکەیەکی مۆر بوونەوەکەلەسەری نووسرابوو: "ئاودەست". کوڕە، کەنووسراوەکەی نەدیبوو، ڕاوەستا. ئەگنێس دەیزانی کەحەزی لە تابلۆ نییەو تەنیا لە شوێنێکی چۆڵ دەگەڕێت ماچی بکات. ئەو کلۆڵەشوێنێکی لەو سووچەپیسەی لای ئەو ئاودەستەباشتری نەدیبووەوە! ئەگنێس قاقا پێکەنی و بۆ ئەوەی کوڕەکەتێبگات کەبەئەو پێناکەنێت، ئاماژەی بە نووسراوەکەکرد. کوڕەکەش پێکەنی، بەڵام تووشی نائومێدییەکی سەیر بوو. خۆ نەدەکرا بەبوونی ئەو نووسراوەی پشتەوەیان باوەشی پێدا بکات و ماچی بکات (لەهەموو شتێک گرینگتر، ئەوەیەکەم ماچیان بوو کەدەبوایەهەرگیز فەرامۆشی نەکەن) بەو شێوەچارێکی نەما بێجگەلەوەی کەبەهەستی تاڵی تێکشکانەوەبگەڕێتەوە.

ئەوان بێدەنگ بەڕێگەدا دەڕۆشتن و ئەگنێس توورەبوو کە ئەو کوڕە بۆچی لەناوەڕاستی شەقامدا ماچی ناکات؟ بۆچی لەباتی ئەوەی کەلەوێ ماچی بکات، ناچار بووەلەو گوزەرەتاریکەوەبەرەو ئاودەستێکی ببات کەڕاهیبەپیر و ناحەز و قێزەونەکان، نەوەلەدوای نەوە، لەوێ خۆیان خاڵی کردووەتەوە؟ ئەو، دەستەوەستانیی کوڕەکەی پێ خۆش بوو، چونکەنیشانەی خۆشەویستی بوو، بەڵام هەر ئەوەش زیاتر توورەی دەکرد، چونکە هاوکات نیشانەی منداڵیش بوو. چوونەدەرەوەی لەگەڵ کوڕێکی ئاوا منداڵ، وەک ئەوەبوو کەخۆی بچووک کردبێتەوە. ئەو حەزی لەکوڕی گەورەتر

بوو، بەڵام ڕەنگەچونکەدەیویست ئەو کوڕەبتارێنێت و دەشیزانی کەزۆری خۆش دەوێت، هەستی دادپەروەرانەی پاڵی پێوەدەنا تا یارمەتیی هەوڵەعاشقانەکانی بدات، پشتگیری بکات و لەو دەستەوەستانییەمنداڵانەی ڕزگاری بکات. ئەگنێس بڕیاری دا ئەگەر ئەو کوڕەئازا نەبێت و ماچی نەکات، بۆخۆی دەستبەکار ببێت.

کوڕەکەبە پیاسە ئەگنێسی بەرەو ماڵەوەدەبردەوەو پلانی ئەگنێسیش ئەوەبوو کاتێک گەیشتنەوەبۆ ماڵەوەدەست بکاتەملی و ماچی بکات، کەبێگومان ئەوەکوڕەکەی سەرسام دەکرد، بەڵام ئەو لە دواساتەکاندا ئەو ئارەزووەی نەما، چونکەڕوومەتی کوڕەکەنەوەک هەر خەمبار، بەڵکو گرژ و تەنانەت ڕقاویش بوو. ئەوان دەستیان لێدایەوەو ئەگنێس لەڕێچکەی ناو دارەکانەوەبەرەو دەرکەی ماڵەوەیان چوو. هەستی کرد کوڕەکەلەدواوەڕاوەستاوەو لێی وردبووەتەوە. جارێکی دیکەش بەزەیی پیادا هاتەوەو کارێکی چاوەڕواننەکراوی کرد. ئەو بەدەم ڕۆشتنەوەئاوڕی لێدایەوە، زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و دەستی ڕاستی هەڵبڕی، سووک و ئاسان، وەک ئەوەی تۆپێکی ڕەنگاوڕەنگی بۆ بهاوێت.

ئەو ساتەکە ئەگنێس لەناکاو، بەبێ خۆئامادەکردنی پێشوەخت دەستی بۆ بەرزکردەوە، کارێکی سەیر و موعجیزەبوو. چۆن دەکرا لەئانوساتێکدا، بۆ یەکەمجار جووڵەو فیگەرێکی ئەوەندە جوان و ڕازاوەی دەست و لەشی کەشف بکات کەلە بەرهەمێکی هونەری بچێت!؟

ئەودەمانە ژنێکی تەمەن چڵ ساڵانەسەردانی باوکی دەکرد. سکرەتێری فەرمانگەبوو. نامەکانی بۆ باوکی دەهێنا تا واژۆیان بکات و نامەکانی تر بباتەوە. هەرچەندە ئەم دیدارانەهیچ مانایەکی تایبەتیان نەبوو، بەڵام جۆرەنهێنییەکیان تێدا بوو. (دایکی هەرگیز

هیچی نەدەگوت) ئەوەسەرنجی ئەگنێسی ڕادەکێشا. کاتێک سکرەتێرەکەدەڕۆشت، ئەگنێس بەرەو پەنجەرەکەهەڵدەهات تا بەدزییەوەسەیری بکات. جارێک کەژنەکەبەرەو دەرکەدەچوو (بە پێچەوانەی ئەو ڕەوتەکە دواتر ئەگنێس ڕۆشت و هاوپۆلە کلۆڵەکەی شوێنی کەوت) سکرەتێرەکەگەڕایەوە، زەردەخەنەیەکی کرد و بەجووڵەو فیگەرێکی چاوەڕواننەکراو، ئارام و جوان دەستی هەڵبڕی. ئەوەساتێکی لەبیرنەکراو بوو: ڕێگە لمەکەلەبەرامبەر تیشکی خورەتاودا وەک ڕووبارێکی زێڕین دەدرەوشایەوەو یاسەمەنەکان لەئەمبەراوبەری دەرکەکەپشکوتبوون. دەتگوت ئەو جووڵەو فیگەرەبەرەو ژوورە، دەیەوێت ڕەوتی فڕین بەم پارچەزێڕینەنیشان بدات و یاسەمەنەسپییەکانیش هەر وەک باڵ دەکرانەوە. باوکی دیار نەبوو، بەڵام جووڵەی ژنەکە ئاشکرای دەکرد کەئەو لەناو دەرکەی ڤیلاکەڕاوەستاوە و لەپشتەوەلەژنەکەوردبووەتەوە.

ئەو جووڵەهێندە جوان و لەناکاو بوو، کەوەک نەخشی برووسکەلەیادەوریی ئەگنێسدا مایەوە. ئەو جووڵەئەگنێسی بۆ قوولاییەکانی زەمەن و شوێن برد و لەناخی کچێکی شانزەساڵەدا حەزێکی شاراوەی گەورەی بەئاگا کردەوە. لەو ساتەدا کەکتوپڕ ویستی شتێکی گرینگ بەهاوپۆلەکەی قوتابخانەی بڵێت و وشەیەکی بۆ نەبیندرایەوە، ئەو جووڵەژیایەوەو لەبری ئەگنێس، ئەوەی ئەو توانای گوتنی نەبوو، گوتی.

من نازانم ئەگنێس تاکەی ئەو جووڵەی بەکارهێنا (یان وا چاکەبڵێم ئەو جووڵەتا کەی ئەگنێسی بەکارهێنا) بەڵام دڵنیام تا ئەو ڕوژەبەکاری هێنا کەسەیری کرد خوشکەبچووکەکەشی بۆ ماڵاوایی لە هاوڕێ کچەکەی دەستی ڕادەوەشاند. ئەو کاتێک بینی خوشکەکەی، کەلە منداڵیەوەئەگنێسی دەپەرست و لاسایی

دەکردەوە، هەمان جووڵەدووبارەدەکاتەوەنیگەران بوو: جووڵەی مرۆڤێکی گەورەبۆ منداڵێکی یانزەساڵان نابێت، بەڵام لەوەش گرینگتر ئەوەبوو کەئەگنێس زانیی هەموو کەس دەتوانێت ئەم جووڵەبکات و بە تەنیا هی ئەو نییە: بۆیەکاتێک دەستی ڕادەوەشاند هەستی بەدزییەتی و لاساییکردنەوەدەکرد و دواتر وازی لەو جووڵەیەهێنا (وازهێنان لەو جووڵانەکە پێیان ڕاهاتووین کارێکی دژوارە) و متمانەی بەجووڵەکان نەما. ئەو هەوڵی دا بێجگەلە جووڵەگرینگەکان هیچی دیکەدووبارە نەکاتەوە(بێجگەلەوەی کەسەری بە نیشانەی "ئەری" دانەوێنێت و بە نیشانەی "نا" بەرزی بکاتەوە و سەر بۆ ئەو شتانە هەڵبرێت کەهاوڕێکەی نەیبینیوە)، هەر ئەو جووڵانەبەکار بێنێت کەنیشانەی شێوازی دەربڕینی تایبەت بەخۆی نین. بەم شێوەبوو کە جووڵەی سیحراویی سکرەتێرەکەی باوکی کەبەرێچکەزێڕنەکەدا دەڕۆشت (ئەو جووڵەکەمنیشی، کاتێک چاوم بەو ژنەکەوت کەلەقەراغ مەلەوانگەیەک لەمەلەوانەکەدوور دەبووەوە، سیحر کردبوو) تەواو لەناخیدا خەوت.

پاشان ڕۆژێک دیسان بەئاگا بووەوە. بەر لە مردنی دایکی، ئەو دەمە کە ئەگنێس دوو حەفتەلەلای باوکەنەخۆشەکەی لە ڤێلا مایەوە، ئەوەڕووی دا. ئەگنێس کاتێک پاش دوو حەفتەماڵاوایی لەباوکی دەکرد، دەیزانی کەبۆ ماوەیەکی دووورودرێژ نایبینێتەوە. دایکی لەماڵ نەبوو، باوکی دەیویست تا بەر دەرکەی ئۆتۆمبێلەکە، کەلەشەقام ڕاگیرابوو، بەرێی بکات. ئەگنێس نەیهێشت لەوەزیاتر لەگەڵی بچێت و بە تەنیا بە جادەلمەکەدا ڕۆیشت. لە باخچەکەوە بەرەو دەرکەکەچوو. شتێک لەقوڕگیدا گلۆڵەبووبوو، زۆری حەزدەکرد شتێکی چاک بە باوکی بڵێت، شتێک کەبەوشەنەگوترێت، بۆیەبێ ئەوەبزانێت چی ڕووی داوە، لەپڕ بەدەم بزەیەکەوەئاوڕی لێ

دایەوەو ئارام و لەسەرخۆ دەستی لێ ڕاوەشاند. دەتگوت بەتەمایە پێی بڵێت کە ئەوان هێشتا تەمەنێکی زۆریان لەپێشەو زۆر جاری دیکەش یەکتر دەبیننەوە. پاشان بیری ئەو ژنەچل ساڵانەکەوتەوەکەبیستوپێنج ساڵ لەوەپێش، ڕێک لەو شوێنەڕاوەستابوو، بە هەمان شێوەدەستی لەباوکی ڕادەوەشاند. ئەم بیرەوەرییەئەگنێسی نیگەران و پەرێشان کرد. دەتگوت دوو زەمەنی دوور لە یەک لەپڕ لە ساتەوەختێکدا و دوو ژنی جیاواز لە جووڵەیەکی هاوبەشدا یەکیان گرتووەتەوە. ئەوسا بیری کردەوەکەڕەنگەباوکی لەهەموو ژیانیدا تەنیا ئەو دوو ژنەی خۆشویستبێت.

# ٩

لە هۆڵەکە، لەو شوێنە کەمیوانەکان لەپاش خواردنی نانی ئێوارەبە پەرداخی براندی و فنجانی نیوەبەتاڵی قاوەوەدانیشتبوون، یەکەم میوانی ئازا هەستایەسەر پێ و بە بزەیەکەوەکڕنۆشی بۆ خانمەخانەخوێکەبرد. ئەوانی دیکەش ئەم جووڵەیان وەک فەرمانێک لێکدایەوەو هاوڕێ لەگەڵ پاول و ئەگنێس لەسەر مۆبلەکانیان هەستان و بە پەلەبەرەو ئۆتۆمبێلەکانیان ڕۆشتن. پاول ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی و ئەگنێس لەولایەوەدانیشتبوو، سەیری هاتوچۆی بێبڕانەوەی ئۆتۆمبێل و هەڵکران و کوژانەوەی چراکان و جۆشوخرۆشی بێمانای شارێکی گەورەی دەکرد. ئەو، جارێکی دیکەش تووشی ئەو هەستەبەهێز و تایبەتەبوو کەهیچ شتێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەو بوونەوەرەدوو پێیانەنییەکەسەریان لەسەر شانیان و دەمیان بە ڕوومەتیانەوەیە. سەردەمێک ئەگنێس حەزی لەسیاسەت و زانست و داهێنانەکانیان بوو، خۆی بەبەشێکی بچووکی ڕووداوێکی گەورە دەزانی، بەڵام ڕۆژێک هەستی کرد لەئەوان نییە. ئەم هەستەی بەلاوە غەریب بوو، بەربەرەکانێی دەکرد، دەیزانی هیچوپۆچ و بێرەوشتانەیە، بەڵام لە ئەنجامدا بە خۆی گوت کەئیتر ناتوانێت بەری پێ بگرێت. ئیتر ناتوانێت بەبیرکردنەوەلە شەڕەکانیان خۆی ئازار بدات، یان لەئاهەنگەکانیاندا شاد بێت، چونکەدڵنیا بووبوو کەهیچ کام لەمانەپەیوەندییان بەئەوەوەنییە.

ئایا ئەمەبەمانای دڵڕەقی بوو؟ بێگومان نا، پەیوەندیی بە دلەوەنەبوو. هیچ کەس بەقەدەر ئەو، پارەی بەسواڵکەر نەدەدا. کاتێک بەشەقامەکاندا تێدەپەڕی نەیدەتوانی سواڵکەرەکان پشتگوێ بخات. ئەوانیش لەناو ئاپۆرەی سەدان ڕێبوار، لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا کەدەیانبینین و گوێیان لەدەنگیان بوو، خێرا ئەویان دەناسییەوە. ئەرێ، ئەوەڕاستە، ئێمەدەبێ ئەوەش بڵێین کەئەو پارەبەسواڵکەردانەی حاڵەتێکی نەرێنی و نیگەتیڤ بوو. ئەگنێس لەبەر ئەوەپارەی بەسواڵکەرەکان نەدەدا، چونکەئەوان بەشێک لە مرۆڤایەتی بوون، بەڵکو لەبەر ئەوە پارەی پێ دەدان کەبەشێک لەمرۆڤایەتی نەبوون، لە مرۆڤایەتی دابڕابوون و وەک خۆی هەستیان بەهاوخەمی و هاوبۆچوونی لەگەڵ مرۆڤایەتی نەدەکرد.

نەبوونی هاوخەمی لەگەڵ مرۆڤایەتی: ئەو ئاوا تێگەیشتبوو. تەنیا شتێک کەدەیتوانی لەم بیرۆکەی داببڕێت، عەشقێکی تایبەت بۆ کەسێکی تایبەت بوو. ئەگەر ئەو بەڕاست کەسێکی خۆش بویستایەئیتر بەرامبەر بە چارەنووسی خەڵکی دیکەش خەمسارد نەدەبوو، چونکەدڵدارەکەشی وابەستەبەو چارەنووسەبوو، دلدارەکەشی بەشێک لەو چارەنووسەبوو، ئیتر پێی وا نەدەبوو کە شەڕ و ئازارەکانی مرۆڤ پەیوەندیی بەئەوەوەنییە.

ئەگنێس لەم بیرۆکەیەی خۆی تۆقا. ئایا بەڕاست کەسی خۆش نەدەویست؟ ئەی پاول؟

ئەگنێس بیری چەند سەعات لەوەپێش، ئەو کاتەکەهێشتا بۆ خواردنی نانی ئێوارە لە ماڵ نەهاتبووەدەر، کەوتەوە. بیری ئەو کاتەکەوتەوەکەپاول باوەشی پێدا کرد. ئەرێ شتێک بەمێشکیدا تێدەپەڕی: ماوەیەک بوو ئەو بیرۆکەوازی لێ نەدەهێنا کەخۆشەویستییەکەی بۆ پاول شتێکی ئیرادییە. بۆخۆی ئیرادەی

کردووەکە پاولی خۆشبویت، ئیرادەی کردووەکەژیانێکی هاوبەشیی خۆشیان ببێت. ئەگەر ئەم ئیرادەیەتەنیا بۆ ساتێک سست ببوایە، خۆشەویستییەکەی ئەویش وەک باڵندەیەکی لە قەفەس دەربازبوو، دەفڕی و دەرباز دەبوو.

کاتژمێر یەکی نیوەشەوە، ئەگنێس و پاول خەریکن ڕووت دەبنەوە. ئەگەر لەهەر کامیان بپرسییایەکەئەوی تر لەم کاتانەدا چۆن دەجووڵێتەوەو چی دەکات، دەشڵەژا، چونکەئەوان لەمێژەسەیری یەکتریان نەکردووە. سیستەمی یادەوەرییان لەکار کەوتووەو ئیتر هیچی ئەو ساتەوەختەهاوبەشەی شەوانی پێش ڕاکشانی ناوجێگەیان تۆمار ناکات.

ناوجێگەی ژنومێردایەتی: میحرابی هاوسەرگیری. کاتێک باسی میحراب دەکەین، مەبەستمان قوربانیشە. لێرەیەکێک لە پێناوی ئەوی دیکەلە خۆی دەبووریت. هەردووکیان بۆ خەوتن دەکەونەعەزیەتەوەو بەدەنگی هەناسەی یەکتر بەئاگا دەبنەوە، بۆیەبەرەو ئەمسەر و ئەوسەری چرپاکەدەخشێن و مەودایەکی باش لێک دوور دەکەونەوە. ئەوان بەو هیوایە کەیارمەتیی خەوتنی یەکتر بدەن و بتوانن بێ ئەوەیەکتر بەئاگا بکەنەوەشانەوشان بکەن، خۆیان وا پیشان دەدەن کەگوایەخەوێکی قووڵیان لێکەوتووە. بەداخەوەکەسیان سوود لەم دەرفەتەوەرناگرن، چونکەهەر یەکەیان بەجیا خۆی وا پیشان دەدا کەخەوتووەو دەترسێ بجووڵێت.

نەخەوتن و ترسان لە جموجۆڵ، ئەمەیە ناوجێی ژنومێردایەتی.

ئەگنێس بەقەفاوەڕاکشاوە و هەندێک وێنەبە مێشکیدا تێدەپەڕێت: ئەو پیاوەغەریب و میهرەبانەدیسان سەردانیان دەکاتەوە. ئەو

ئەسەکەهەموو شتێک لەبارەی ئەوانەوەدەزانێت، بەڵام هیچ شتێکی لەبارەی بورجی ئیفلەوەنەبیستووە. ئەگنێس ئامادەیەهەموو شتێک بدات تا بتوانێت بە تەنیا بیدوێنێت، بەڵام ئەو پیاوەبە ئەنقەست کاتێک دێت کەهەر دووکیان لە ماڵەوەبن. هەوڵی ئەگنێس بۆ ئەوەی لەو کاتەدا پاول بنێرێتە دەرەوە، بێسوودە. سێیەسێ، بەسێ فنجان قاوەوە، لەپشت مێزێکی کورت دانیشتوون و پاول هەوڵ دەدا میوانەکەی سەرقاڵ بکات. ئەگنێس چاوەڕوانی ئەوەیەکە میوانەکەیان باسی هۆکاری هاتنەکەی بکات. ئەڵبەتەبۆخۆی بە هۆکاری هاتنەکەی دەزانێت، بەڵام پاول ئاگای لە هیچ نییە. لە ئەنجامدا میوانەکەقسەبەپاول دەبڕێت و دەچێتەسەر کرۆکی باسەکەی:

«من پێم وایە ئێوە بزانن کە من خەڵکی کوێم؟»

ئەگنێس دەڵێ:

«بەڵێ».

ئەو دەزانێت میوانەکەلە هەسارەیەکی دوورەوە هاتووە. هەسارەیەک کە لەگەردووندا پلەوپایەیەکی باشی هەیە. ئەو خێرا بە بزەیەکی شەرمنانەوەلێی دەپرسێت:

«ئایا ژیان لەوێ چاکترە؟»

میوانەکەشانی هەڵدەتەکێنێت:

«ئەگنێس، من دڵنیام بۆخۆتان دەزانن لە کوێ دەژین».

ئەگنێس دەڵێ:

«ڕەنگە دەبێ مردن ببێت. بەڵام ئایا هیچ ڕێگەیەکی دیکەبۆ ڕاپەڕاندی کارەکان نییە؟ ئایا بەڕاست پێویستەمرۆڤ لەشێک لەپاش

خۆی بەجێبێڵێت؟ لەشێک کەپێویستە لەژێر خاک بشاردرێتەوە، یان لەئاگردا بسووتێت؟ ئەمانە زۆر ترسناکن!»

میوانەکە دەڵێ:

«لەهەموو کوێ دەزانن کەزەوی شوێنێکی زۆر ترسناکە».

ئەوسا ئەگنێس دەڵێ:

«شتێکی دیکەش، ڕەنگەئەم پرسیارەبە لای تۆوە گەمژانەبێت، بەڵام ئایا ئەوانەی کەلە شوێنی ئێوەدەژین، ڕوومەتیان هەیە؟»

«نا، لەهیچ کوێ جگەلە ئێرەڕوومەت نییە».

«ئەی کەواتەئەوانەی کەلەوێ عاشق دەبن، چۆن لە یەکتر هەڵداوێردرێن؟»

«ئەوان، هەموویان داهاتەی خۆیانن، دەکرێ بڵێین هەر کەس خۆی دادەهێنێت، بەڵام قسەکردن لەم بارەوەزۆر دژوارە؛ ئێوەناتوانن تێی بگەن. ڕۆژێک ئێوەش تێدەگەن. من هاتووم کەپێت بڵێم لەژیانەکەی دیکەتدا ناگەڕێیتەوەبۆ سەر زەوی».

ئەڵبەت ئەگنێس پێشوەخت دەیزانی میوانەکەدەیەوێت چییان پێ بڵێت، بۆیەدانەچڵەی. بەڵام پاول سەری سووڕماوە. سەیری میوانەکەدەکات، سەیری ئەگنێس دەکات. ئەگنێس هیچ چارەیەکی نییەجگەلەوەی کەلێی بپرسێت: «ئەی پاول؟»

میوانەکەدەڵێ:

«پاولیش لێرەنامێنێتەوە. من هاتووم ئەوەتان پێ بڵێم. ئێمەهەمیشەبە خەڵک دەڵێین کە هەڵبژاردنی خۆمانمان کردووە. من تەنیا دەمەوێ شتێک لە ئێوەبپرسم: ئایا دەتانەوێ لەژیانەکەی دیکەتاندا پێکەوەبن، یان هەرگیز یەکتر نەبیننەوە؟»

ئەگنێس دەیزانی ئەم پرسیارەی لێ دەکرێت، بۆیەدەیویست لەگەڵ میوانەکە بەتەنیا بێت. ئەو دەیزانی بەبوونی پاول ناتوانێت پێی بڵێ: «ئیتر نامەوێ لەگەڵ ئەو بم». ئەگنێس نەیدەتوانی لای خۆی ئەو قسەبکات و پاولیش نەیدەتوانی. تەنانەت پێدەچوو پاولیش بیەوێت لە ژیانەکەی دیکەیدا بەبێ ئەگنێس بێت، بەڵام گوتنی ئەم قسەبە دەنگی بەرز و لە بەرچاوی یەکتر کە «ئێمە نامانەوێت لەژیانەکەی دیکەماندا پێکەوەبین»، وەک ئەوەوایەکە بڵێن «ئێمەهەرگیز یەکترمان خۆش نەویستووەو ئێستاش یەکترمان خۆش ناوێت». دیارەئەمەش شتێک نییەکەبەدەنگی بەرز بگوترێت، چونکەبەم شێوەژیانی هاوبەشیان (کە تا ئێستا بیست ساڵی لێ تێپەڕیوە) لەسەر وەهمی عەشق بونیادنراوە، وەهمێک کەهەردووکیان بە نیگەرانییەوەپاراستوویانەو پەروەردەیان کردووە. ئەو هەر کاتێک ئەم دیمەنەی دەهێنایەپێشچاوی خۆی، دەیزانی کاتێک ڕووبەڕووی پرسیاری میوانەکەببێتەوەتەسلیم دەبێت و بە پێچەوانەی ئاواتەکانی، بە پێچەوانەی حەز و ئارەزووەکانی، دەڵێ: «بەڵێ، بێگومان حەز دەکەم لەژیانەکەی دیکەشمدا پێکەوەبین».

بەڵام ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار دڵنیا بوو کە تەنانەت لە لای پاولیش دەوێرێ ئەوەی پێی خۆشەبیڵێت، واتەئەوەی کەلە دڵەوەدەیخوازێت. دڵنیابوو کە تەنانەت بە قیمەتی وێرانکردنی هەموو شتەکانی نێوانیشیان بوو بێت، دەوێرێ بیڵێت. ئەگنێس لەپاڵ خۆیدا گوێی لەهەناسەکێشانێکی بەرز بوو. پاول بەڕاست خەوی لێکەوتبوو. ئەگنێس کەدەتگوت دووبارە فیلمەکەدەخاتەوەنێو پرۆژکتۆرەکە، جارێکی دیکەش سەرلەنوێ بەهەموو دیمەنەکەدا چووەوە: ئەو

لەگەڵ میوانەکەدەدوێت، پاول بەسەرسوورمانەوەسەیریان دەکات و میوانەکەدەڵێ:

«ئایا لە ژیانەکەی دیکەتاندا دەتانەوێت پێکەوەبن، یان هەرگیز یەکتر نەبیننەوە؟»

(سەیرە: ئەگەرچی میوانەکەهەموو شتێک لەبارەی ئەوانەوەدەزانێ، بەڵام لەدەروونناسیی زەوینییەکان ناگات، لەمانای عەشق ناگات، کەواتە ناتوانێت مەزندەی ئەوەبکات کەبەو پرسیارەخۆمانەو خێرخوازانەو کردەییەی دەیانخاتەچ دۆخێکی دژوارەوە).

ئەگنێس هەموو توانای دەروونیی خۆی کۆدەکاتەوەو بە دەنگێکی بنەبڕەوەوەڵامی دەداتەوە:

«ئێمەوامان پێ باشترەکەهەرگیز یەکتر نەبینینەوە».

ئەم وشانەڕێک وەک تەقەی دەرکەیەکەکەلە وەهمی عەشق دابخرێت.

# ١

سیانزەی سێپتامبەری ١٨١١. سێهەمین حەفتەیەکەئەو جووتە گەنجە، "بێتینا برێنتانۆ" لەگەڵ مێردەکەی "ئاخیم ڤۆن ئارنیم"ی شاعیر، لەلای گۆتەلەوایمار دەژین. بێتینا بیستوشەش ساڵ، ئارنیم سی ساڵ و کریستیانی هاوسەری گۆتەچلونۆ ساڵیان تەمەنە. گۆتەشەستودوو ساڵی تەمەنەو یەک تاکەددانیشی لەناو دەمدا نەماوە. ئارنیم عاشقی ژنەگەنجەکەیەتی، کریستیان شەیدای پیاوەپیرەکەیەتی و بێتینا، تەنانەت دوای شووکردنەکشی، هێشتا لەگەڵ گۆتە مۆزەمۆز دەکات. ئەم بەیانییەگۆتەلەماڵەوەیەو کریستیان لەگەڵ ئەو ژن و مێردە گەنجەچووەبۆ سەردانی پیشانگایەکی هونەری (کە هاوڕێیەکی خیزانییان، مایەری ڕاوێژکار، ڕێکی خستووە) و کۆمەڵێک تابلۆی تێدا پیشان دەدرێت کە گۆتە ستایشی کردوون. خاتوو کریستیان هیچ لە هونەر نازانێت، بەڵام هەموو ئەو شتانەی لەبیرەکە گۆتەلەبارەی تابلۆکانەوەگوتوویەتی و دەتوانێت بە ئاسوودەییەوەبیروبۆچوونەکانی گۆتەلەباتی بیروبۆچوونی خۆی بڵێتەوە. ئارنیم گوێی لەدەنگی بەهێزی کریستیانە و سەیری چاویلکەکەی سەر لووتی بێتینا دەکات. هەرکاتێک بێتینا وەکو کەروێشک لووتی کۆدەکاتەوە، چاویلکەکەی هەڵدەکشێ و دادەکشێتەوە. ئەو ئەم نیشانەدەناسێت: بێتینا ئەوەندە

تووڕەیەکەخەریکەدەتەقێت. ئارنیم کەپێدەچێ هەستی بەنزیکبوونەوەی توفان کردبێت، بەخۆپاریزییەوەدەخزێتەژوورێکی دیکە.

لەوکاتەدا کە ئارنیم دەڕوا، بێتینا قسەکان بەکریستیان دەبڕێت و دەڵێ: «نەخێر، بێتینا لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نییە! ئەم تابلۆیانەزۆر خراپ و بێزارکەرن!»

کریستیانیش لەبەر دوو هۆ تووڕەیە: ئەم ژنەخانەدانەگەنجەئەگەرچی شووی کردووەو دووگیانە، بەڵام ئەوەندەگوستاخ و ڕووقایمەکەمۆزەمۆز لەگەڵ مێردەکەی دەکات و لەوەش خراپتر، دژایەتیی بۆچوونەکانیشی دەکات. باشەئەو چی دەوێت؟ ئایا دەیەوێت لەیەک کاتدا هەم لەڕیزی پێشەوەی لایەنگرەسەرسەختەکانی گۆتەبێت و هەم لەڕیزی پێشەوەی نەیارەکانیشی؟

هەردوو بۆچوونەکە کریستیان دەهری دەکەن، بە تایبەت چونکە هەریەکەیان ئەوی تر ڕەفز دەکەنەوە، بۆیەبە دەنگی بەرز هاوار دەکات: «قسەکەی تۆ بێزارکەرەکە دەڵێی ئەم تابلۆ گرینگانە بێزارکەرن».

بێتینا هەڵوێست وەردەگرێت و دەڵێ: «ئەم تابلۆیانەنەوەک هەر بێزارکەر، بەڵکو گاڵتەجاڕیشن! بەڵێ، ئەمانەگاڵتەجاڕین. ئەوسا بۆ سەلماندنی قسەکەی بەڵگەدەهێنێتەوە».

کریستیان گوێی لێ دەگرێ و سەیر دەکا لەو شتانەناگات کەئەو ژنەگەنجەدەیەوێت تێی بگەیەنێت. بێتینا هەرچی زیاتر تووڕە دەبێت، زیاتریش ئەو وشانەبەکار دەهێنێت کەلەخوێندکارەگەنجەکانی زانکۆ

و هاوڕێکانی بیستووه و کریستیان دەزانێت کەبێتینا بە تایبەت سوود لەم وشانەوەردەگرێت، چونکەئەو تێیان ناگات. کریستیان سەیری چاویلکەکەی بێتینا دەکات کەبەسەر لووتییەوە دەجووڵێتەوە. ئەو پێی وایەقسەبێماناکانی و چاویلکەکەی وەکو یەکن. لەڕاستیدا زۆر سەیرەکە بێتینا چاویلکەلە چاو دەکات! هەمووکەس دەزانێت کەگۆتە، چاویلکەلەچاوکردن لەناو خەڵکدا بەبەربەرەکانێکردنی سەلیقەی باش دەزانێت و وەک کارێکی سەیروسەمەرەئیدانەی دەکات! بۆیەئەگەر بێتینا وێڕای هەموو ئەمانە، لەوایمار چاویلکەلەچاو بکات، لەبەر ئەوەیەکەدەیەوێت بەوپەڕی چاوقایمییەوەخۆی وا پیشان بدات کەگوایەسەر بەنەوەی نوێیە، واتە ئەو نەوەکەگرینگترین تایبەتمەندییەکەی ڕۆمانتیسم و چاویلکەیە. ئێمەدەزانین ئەو کەسانەکەبۆ خۆنواندن و فیز و لووتبەرزی خۆیان بەگەنجان و نەوەی نوێوە هەڵدەواسن، دەیانەوێت چی بڵێن: دەیانەوێت بڵێن ئەوان زیندوون، بەڵام پیرەکان (بە لای بێتیناوە کریستیان و گۆتە) لەمێژەوەک گەمژەلە گۆڕدا خەوتوون.

بێتینا بەردەوام قسەدەکات. ئەو سات لە دوای سات زیاتر هەڵدەچێت و، لەپڕێکدا دەستی کریستیان بەرەو ڕوومەتی دەفڕێت. کریستیان لە دواهەم ساتەکاندا دەزانێت کەنابێ زللەلە میوانەکەی بدات و خێرا دەستی دەکشێنێتەوە. دەستی بەحاستەم بەر ناوچاوانی بێتینا دەکەوێت. چاویلکەکەی لەچاوی دەکەوێتەخوار و دەشکێت. خەڵکی ناو هۆڵەکەئاوڕیان لێ دەدەنەوەو بە نیگەرانییەوەسەیریان دەکەن. ئارنیمی کڵۆڵ بەپەلەلەژوورەکەدێتە دەر و چونکەهیچی

بەبیردا نایەت، دەچێتەسەرچۆک و پارچەشکاوەکانی چاویلکەکەکۆدەکاتەوە، دەڵێی بەتەمایەئەو پارچانەپێکەوەبلکێنێتەوە.

هەموویان بە نیگەرانییەوە بۆ ماوەی چەند کاتژمێر چاوەڕێی بیستنی فەتوای گۆتەدەبن. بڵێی کاتێک گۆتەکۆی ڕووداوەکەببیستێت، لایەنی کێ بگرێت؟

گۆتەلایەنی کریستیان دەگرێت و بۆ هەمیشەئەو ژن و مێردەگەنجەلەماڵەکەی دەردەکات.

کاتێک جامی شەراب دەشکێت نیشانەی بەختەوەرییە. کاتێک ئاوێنەدەشکێت، دەشێ چاوەڕوانی حەوت ساڵ کڵۆڵی و نەهامەتی بین. ئەی ئەگەر جووتێک چاویلکەبشکێت؟ ئەوەنیشانەی شەڕە. بێتینا لە هەموو هۆڵەکانی وایمار دەڵێ: «ئەو کێوەگۆشتەشێت بوو، لێی دام.» ئەو وتەی بێتینا دەماودەم دەڕوات و هەموو خەڵکی وایمار پێی پێدەکەنن. ئەو وتەئەبەدییە، ئەو پێکەنینەهەتاهەتاییەهێشتا و تا ئەم سەردەمەی ئێمەش دەنگی داوەتەوە.

## ٢

نەمری. گۆتەلەم وشەنەدەترسا. ئەو لە بەشی «شێعر و حەقیەت»ی کتێبی «لە ژیانمدا»، بەجۆشوخرۆشەوەرەخنەی لەسەر شانۆنامەیەک نووسیوەکەیەکەم جار لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا، لەتیاتری نوێی درێسدێن بینیویەتی: لە بەککگراوندی شانۆکە(من لە زمانی گۆتەوەدەیگێڕمەوە) «پەرستگای ناوبانگ»ی لێ بوو کەشانۆنامەنووسەگەورەکانی هەموو سەدەکان لە دەوری کۆبووبوونەوە. لە ناوەڕاستی شانۆکەپیاوێک بەعابایەکی سووکەوەڕاستەوخۆ بەرەو پەرستگاکەدەچوو. ئەو پیاوەکە هیچ تایبەتمەندییەکی دیاری نەبوو، پشتی لەبینەرەکان کردبوو، گوێی بەهیچ کەس نەدەدا، شەکسپیەر بوو. ئەو، بێ ئەوەی کەسی لەپێشەوەبێت، بێ ئەوەی گوێ بەڕەقیب و مونافسەکانی ڕابوردووی بدات، ڕاستەوخۆ و بە تەنیا بەرەو نەمریی هەنگاوی هەڵدەهێنایەوە».

ئەڵبەتە ئەو نەمرییەی کەگۆتەباسی دەکات، هیچ شتێکی هاوبەشی لەگەڵ بڕوای ئایینی بە ڕۆحێکی نەمر نییە. ئەو نەمرییەجیاواز و زەوینییەبۆ کەسانێکەکەلەپاش مردنیان، لەیادەوەری نەوەکانی داهاتوودا دەمێننەوە. هەرکەس دەتوانێتبە دەرەجەیەکی کەم، یان زۆر، بۆ ماوەیەکی کورت، یان درێژ بەم نەمرییە بگات. ئەم بیرۆکەلە سەرەتای گەنجێتیدا مێشکی خەڵک بەخۆیەوەمەشغووڵ دەکات. کوێخادێیەکی مۆراڤیایی بوو کە من

زۆرجار لەگەڕانەکانی تافی منداڵیمدا دەمبینی. دەیانگوت لەماڵەوەتابووتێکی هەیە، کەکاتێک زۆر خۆشحاڵەو لەژیانی خۆی ڕازییەلەناویدا ڕادەکشێت و وێنای بەخاکسپاردنی خۆی دەکات. ئەم ساتانەو خەیاڵاتی ناو تابووتەکەبۆ ئەو خۆشترین ساتەوەختی ژیانی بوون. ئەو چووبووەناو ماڵی نەمریی خۆیەوە.

سروشتییە، لەبابەت نەمرییەوە هەموو مرۆڤەکان یەکسان نین. ئێمەدەبێ لە نێوان نەمرییەکی بچووکی وەک یادەوەریی کەسێک لەزەینی ناسیاوەکانیدا (ئەو نەمرییەکە کوێخادێکەبە ئاواتی دەخواست) لەگەڵ نەمرییەکی گەورە، واتەیادەوەریی کەسێک لە زەینی کەسانێکدا کەهەرگیز لەنزیکەوەنەیانناسیوە، جیاوازی دابنێین. لەژیاندا گەلێک ڕێچکەو ڕێبازی دیار و تایبەت هەیەکە هەر لەسەرەتاوەمرۆڤ بەرەوڕووی نەمرییەکی گەورەدەکەنەوە؛ ئەوەهەرچەندەنادیار و تەنانەت مەحاڵیش بێت، بەڵام بێگومان حاشای لێ ناکرێت: ئەوەڕێچکەو ڕێبازی هونەرمەندان و حاکمانە.

لەناو هەموو حاکمەئەورووپییەکانی ئەم سەردەمەدا، پێدەچێت ئەو کەسە کەلە هەموویان زیاتر بیری لە نەمریی کردوەوەتەوە فرانسوا میتران بێت: من ئەو ئاهەنگەزۆر تایبەتییەم بیردەکەوێتەوەکەلەپاش هەڵبژاردنەکەی بەسەرۆککۆمار، لەساڵی ١٩٨١ بەرپابوو. مەیدانەکەی بەرامبەر بەبینای پانتەئۆن پڕ بوو لەخەڵکی خرۆشاو و ئەو خەریکبوو لە مەیدانەکە دەچووەدەر. میتران بە تەنیا بەپێپلیکانەیەکی گەورەدا هەڵدەگەڕا (ڕێک وەک شەکسپیر کەلەشانۆگۆڕینەکەی گۆتەدا، بەرەو پەرستگەی ناوبانگ هەنگاوی هەڵدەهێنایەوە) و سێ لق گوڵی بەدەستەوەبوو. پاشان لەچاوی جەماوەرەکەون بوو؛ بە تەنیا سەردانی گۆڕی شەستوچوار کەسی ناوداری کرد. هەرچاوی کامێرا و دەستەی کامێرامەنەکان و

چەند ملوێن فەڕەنسایی کەسەیری شاشەی تەلەفزیۆنیان دەکرد، ئەو تەنیاییەبیرمەندانەیان دەبینی و گوێیان لەخرۆشی سەمفۆنیای نۆی بتهۆڤن بوو کەلەو ناوەدا بڵاودەبووەوە. میتران سێ لقەگوڵەکەی، یەکەیەکە، لەسەر ئەو سێ گۆڕەدانا کەپێشتر دەستنیشانی کردبوو. ئەو، وەک ڕووپێوێک، ئەو سێ لقەی وەک سێ نیشانەلەناو بینای پڕشکۆی ئەبەدەییەت دانا، تا سێگۆشەیەک دیاری بکات و کۆشکی نەمریی خۆی لەناوەندی ئەو سێگۆشەیەدا بنیاد بنێت.

ڤالێری ژیسکاردستەن، کەبەر لە میتران سەرۆککۆمار بوو، کەنناسێکی بۆ کۆشکی ئێلیزەدەعوەت کرد تا ناشتای لەگەڵ بخوات. ئەمەکرداری بورژوایەکی هەستیار بوو کەحەزی لە دواندنی خەڵکی ئاسایی بوو. دەیویست وەک کەسێک لە خۆیان وەری بگرن. میتران ئەوەندەگەوج نەبوو کەبیەوێت وەک کەنناسێک دەربکەوێت (هیچ سەرۆک کۆمارێک ناتوانێت ئەم خەونەی بهێنێتەدی!). ئەو دەیویست وەک مردووەکان بێت، ئەوەزۆر ژیرانەتر بوو، چونکە مردن و نەمریی هاوڕێی لێکدانەبڕاون و کەسێک کەلەزەینی ئێمەدا ڕوومەتی لەگەڵ مردووەکان تێکەڵ دەبێت، هەر چەندە هێشتا زیندووشە، بەڵام ئیتر نەمر بووە.

من هەمیشەجیمی کارتەر، سەرۆککۆماری ئەمەریکام خۆش ویستووە، بەڵام کاتێک عاشقی بووم کەلەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بینیم. ئەو لەگەڵ دەستەیەک هاوکار و ڕاهێنەر و حیمایەیدا خەریکی غارکردن بوو، لەپڕێکدا ناوچاوانی سەر عارەق نیشت و ڕوومەتی لەبەر ئێشوئازار تێکچوو. هاوڕێکانی کەلەگەڵی غاریان دەکرد، لێی نزیک بوونەوەو ڕایانگرت. ئەو تووشی جەڵتەیەکی بچووکی دڵ بووبوو. ئەو غاردانەی بەڕواڵەت دەرفەتێک بوو تا گەنجێتیی هەمیشەیی سەرۆککۆمار پیشانی خەڵک بدات، هەر

بۆیەکامێراکانیشیان دەعوەت کردبوو، بەڵام خۆ تاوانی ئەوان نەبوو کەلەبری پیشاندانی گەنجێکی ساغڵەم، ناچار بوون پیاوێکی پیر و ئیختیاری بێبەخت پیشان بدەن.

مرۆڤێک حەز بە نەمریی دەکات و ڕۆژێک دێت کەکامێراکان دەمێکمان پیشان دەدەن کەبە دۆخێکی پڕ لەبەزەییەوەگۆڕاوە. ئەمە تەنیا شتێکی ئەو پیاوەیەکەلە یادەوەریماندا دەمێنێتەوە. تەنیا وێنەیەکی ئەوەکەوەک پشکێک لەهەموو ژیانی دەمێنێتەوە. ئەو دەچێتەنێو جۆرێک نەمرییەوەکەدەکرێت پێی بڵێین گاڵتەجارانەیە. "تیکۆ براهە" ئەستێرەناسێکی گەورەبوو، بەڵام ئەوەی کەئێمەئەمڕۆ لەو پیاوەمان لەبیر ماوەئەوەیەکەلەزیافەتێکی ناو بارەگای ئیمپراتۆر شەرمی کرد بچێت بۆ ئاودەست، بۆیەمیزەڵدانی تەقی و وەک شەهیدی شەرم و میز چووەڕیزی نەمرانی گاڵتەجاڕەوە. ئەویش وەک کریستیانی ژنی گۆتەکەبۆ هەمیشەناوبانگی بەکێوەگۆشتێکی گازگر دەرکرد، چووەڕیزی نەمرانەوە. هیچ چیرۆکنووسێک لەلای من بەڕێزتر لە"ڕۆبرت موسیل" نییە. ئەو بەیانییەک لە کاتی وەرزشی بەرزکردنەوەی هاڵتەر مرد. کاتێک بۆخۆم هاڵتەرێک بەرز دەکەمەوە، بەنیگەرانییەوەنەبزم تاقی دەکەمەوەو دەترسم بمرم، چونکەمردن بەهاڵتەر، منیش وەک ئەو نووسەرەبەرێزەدەکات بەلاساییکەرەوەیەکی سەیروسەمەرەی شێت و دەمارگرژ، تا دەستبەجێ بمخاتەڕیزی نەمرانی گاڵتەجاڕەوە.

# ٣

ئێستا بیهێننەپێشچاوی خۆتان کەلە سەردەمی ڕۆدۆلفی ئیمپراتۆریش کامێرای فیلمگرتن (لەوانەی کەجیمی کارتەریان نەمر کرد) ببوایە و فیلمی ئەو ئاهەنگەی ناو بارەگاکەیان بگرتایەکە "تیکۆ براهە" لەسەر کورسییەکەی ژانی کردبوو، ڕەنگ بەڕوویەوەنەمابوو، قاچی دەخستەسەر قاچی و دیسان هەڵی دەگرتەوەو چاوی لەبنمیچەکەدەبڕی. ئەو ئەگەر بیزانیایەچەند ملوێن کەس سەیری دەکەن ئێشوئازارەکەی زیاتریش دەبوو. قاقای ئەو پێکەنینەش کە لەدالانەکانی نەمرییدا دەنگی دەدایەوە، بڵیندتر دەبوو. ئەو کاتەبە دڵنیاییەوەخەڵک داوایان دەکرد فیلمی ئەو ئەستێرەناسەبەناوبانگەکەشەرمی لەمیستن بوو، لە سەرەتای هەموو ساڵێکدا کەخەڵک حەزدەکەن پێبکەنن و زۆرجار نازانن بەچی پێبکەنن، بڵاوبکرێتەوە.

ئەم بابەتەپرسیارێک لەمێشکمدا دەورووژێنێت: ئایا خەسڵەتی نەمریی لەسەردەمی تەسویرکردنی کامێراکاندا گۆڕاوە؟ من دەتوانم دەستبەجێ وەلامی ئەم پرسیارەبدەمەوە: بێگومان نا، چونکەلێنزی کامێرا، وەک زات و سروشتێکی نامەتریاڵ، زۆر لەپێش داهێنانیدا هەبووە. خەڵک، تەنانەت ئەو دەمانەش کەلێنزی چاوی کامێرایان لەسەر نەبووە، بەشێوەیەک هەڵسوکەوتیان کردووەکەگوایەخەریکن ڕەسمیان لێ دەگرن. گۆتەهەرگیز خێڵی وێنەگرەکانی بەدەورەوەنەبووە، بەلام تاپۆی وێنەگرەکان لە قوولایی

داهاتووەوەبە دەوریدا سووڕاونەتەوە. بۆ نموونە، ئەمەلە کاتی دیدارەبەناوبانگەکەی لەگەڵ ناپلیۆن ڕووی دا. ئیمپراتۆر، کەئەو دەمەلەترۆپکی مەزنایەتیی خۆیدا بوو، لەکۆنفرانسێک لەئێرفورت، هەموو ئەو فەرمانڕەوایانەی ئەورووپای کۆکردەوەکەقەراربوو دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان خۆی و ئیمپراتۆری ڕووسیە پەسند بکەن.

ناپلیۆن پیاوێکی فەڕەنسیی ڕاستەقینەبوو، چونکە بەبەکوشتدانی سەدان هەزار کەس ڕازی نەبوو، دەیوست نووسەرانیش ڕێزی لێ بگرن. ئەو داوای لەڕاوێژکارە فەرهەنگییەکەی خۆی کرد تا ناوی گرینگترین ڕۆشنبیرانی هاوچەرخی ئاڵمانیای پێبڵێت و زانیی کەگەورترینیان کەسێکەبەناوی جەنابی گۆتە. گۆتە؟! ناپلیۆن بەناوچاوانی خۆیدا کوتا. نووسەری "خەمەکانی وەرتەری گەنج"؟! ناپلیۆن لەکاتی لەشکرکێشییەکەی بو سەر میسر ئاگادارکرایەوەکەهەموو ئەفسەرانی سوپاکەی نوقمی خوێندنەوەی ئەو کتێبەبوون و چونکەبۆخۆی کتیبەکەی دەناسی، زۆر تووڕەبوو. ئەو ئەفسەرەکانی بۆ خوێندنەوەی ئەم قۆڕیایەهەستیارانەسەرزەنشت کرد و خوێندنەوەی هەموو جۆرەچیرۆکێکی لێ قەدەغەکردن. هەموو چیرۆکێک! با کتێبی مێژوویی بخوێننەوە، ئەوەزۆر سوودبەخشترە! هەرچۆنێک بێت، لەم هەلومەرجەی ئێستادا ئەو خۆشحاڵ بوو کە دەیزانی گۆتەکێیە و بڕیاری دا دەعوەتی بکات. لەڕاستیدا ئەو ئەم دەعوەتکردنەی زۆر پێ خۆش بوو، چونکەڕاوێژکارەفەرهەنگییەکەی گوتبووی کەگۆتەجگەلەمانە شانۆنامەنووسێکی بەناوبانگیشە. ناپلیۆن، بە پێچەوانەی ڕۆمان، حەزی لەشانۆ بوو. شانۆ شەڕی وەبیر دەهێنایەوە و چونکەبۆخۆی یەکێک لە گەورەترین نووسەران و

دەرهێنەری بێوێنەترین شەڕەکان بوو، لە ناخی خۆیدا بڕوای کردبوو کەگەورەترین شاعیری تراژیکی هەموو قۆناغەکانی مێژووشە، تەنانەت گەورەتر لە سۆفۆکل و شەکسپیریش.

ڕاوێژکارەفەرهەنگییەکەی کەسێکی شایستەبوو، بەڵام زۆرجار بابەتەکانی تێکەڵ دەکرد. ڕاستەکە گۆتەحەزی زۆر لە شانۆ بوو، بەڵام ناو و ناوبانگەکەی هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆی بەشانۆوەنەبوو. وا دیار بوو لە مێشکی ڕاوێژکارەکەی ناپلیۆندا "گۆتە"و "فریدریک شیللەر" تێکەڵ بووبێتن، چونکە"شیللەر" نێوانی لەگەڵ گۆتەخۆش بوو، تێکەڵکردنی دوو هاوڕێ لە سیمای شاعیرێکدا هەڵەیەکی گەورەنەبوو، تەنانەت ڕێی تێدەچوو کەڕاوێژکارەکە بە ئەنقەستیش ئەوەی کردبێت و بە نییەتێکی بەڕێزانەی ئەدەبی، کلاسیسیزمی ئاڵمانیی، بە قازانجی ناپلیۆن لەسیمای کەسێکدا بەناوی فریدریک یوهان گۆتشیل لیک دابێت.

کاتێک گۆتە(بێ ئەوەی ئاگای لەوەبێت کەگۆتشیلە) نامەی دەعوەتەکەی وەرگرت، زانیی دەبێ قبووڵی بکات. ئەو پەنجاونۆ ساڵی تەمەن بوو؛ لە مردن نزیک بوو، هاوڕێ لەگەڵمردنەکەی نەمرییش دەهات. (چونکەهەروا کە گوتم مەرگ و نەمریی دوانەیەکی لێکدانەبڕاون و پەیوەندییەکەیان لە پەیوەندیی نێوان مارکس و ئێنگلس، ڕۆمیۆ و ژوولێت، لۆرل و هاردی تەواوترە) گۆتە دەبوایەئەوەی لە بەرچاو بوایەکەسەردانی نەمرێکی دەکرد. ئەو ئەگەرچی ئەو کاتەسەرقاڵی تیۆری ڕەنگەکان بوو، ئەوەش بە لایەوەلەهەموو کارێکی دیکە گرینگتر بوو. وازی لە مێزی نووسینەکەی هێنا و بەرەو ئێرفۆرت چوو، تا لەوێ لە دووی ئۆکتۆبەری ١٨٠٨، دیدارێکی فەرامۆشنەکراو لەنێوان فەرماندەی نەمر و شاعیری نەمر ڕووبدات.

## ٤

گۆته، که تاپۆی بێئارامی وێنەگرەکان دەوریان گرتووە، بە پلیکانەگەورەکەدا هەڵدەگەڕێت. یاوەرەتایبەتەکەی ناپلیۆن ڕێنوێنی دەکات و بەپلیکانێکی دیکە و چەند ڕاڕەودا بەرەو هۆڵێکی گەورەی دەبات. لەو سەری هۆڵەکە، ناپلیۆن لە پشت مێزێکی خڕ دانیشتووەو خەریکەناشتا دەخوات. کەسانێک بەیۆنیفۆرمەوە بەدەوروبەریدا دەسووڕێنەوەو ڕاپۆرتەجۆراوجۆرەکانی پێ ڕادەگەیەنن و ئەویش بەدەم خواردنەوەوەڵامی کورتیان دەداتەوە. پاش تێپەڕینی چەند خولەک، ئەوسا یاوەرەتایبەتەکەی دەوێرێ گۆتەی پیشان بدات کە لە دوورەوەڕاوەستاوە. ناپلیۆن سەیرێکی دەکات و دەستی ڕاستی بۆ بن جاکەتەکەی دەخزێت، وەها کە بەرەدەستی لەپەراسووی خوارووی لای چەپی دەدرێت (جاران بەهۆی ئازاری گەدەیەوەئەوەی دەکرد، بەڵام لەوەدوا ئەم جووڵەیەی پێخۆش بوو، هەر کاتێک خۆی لە گەمارۆی وێنەگرەکاندا دەبینییەوەدەستی بۆ بن جاکەتەکەی دەبرد) ئەو خێرا پارووەکەی قووت دەدات (کاتێک ڕوومەتی پیاو بەدەم خواردنەوەخواروخێچ دەبێت، نابێ ڕەسمی لێ بگیرێت، چونکەڕۆژنامەکان بە نییەتی خراپ ئەم ڕەسمانەبڵاودەکەنەوە!)، ئەوسا وەها کە هەموان گوێیان لێ بێت، دەڵێ:

«ئەمەپیاوە».

ئەمەلەو دەستەواژانەیەکەئەمڕۆ پێیان دەگوترێت: «وشەی دەستەبژێر». سیاسەتمەدارەکان کاتێک وتاری دوورودرێژ

دەخوێننەوە، بێ ئەوەی شەرم لە کەس بکەن، شتێک دووبارەدەکەنەوە. ئەوان دەزانن کەچی دووبارەبکەنەوەو چی دووبارەنەکەنەوە. لەڕاستیدا جیاوازییەکی ئەوتۆشی نییە، چونکەخەڵک هەرگیز لەو چەند وشەزیاتر فێر نابن کەڕۆژنامەوانەکان دەیگێڕنەوە. سیاسەتمەدارەکان بۆ ئەوەی کاری ڕۆژنامەوانەکان ئاسانتر بکەن و خۆشیان سوود لەقسەکانی خۆیان وەربگرن، لەوتارەکانیاندا، کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر لەیەک دەچن، یەک دوو دەستەواژەی زیرەکانەدەڵێن کەپێشتر نەیانگوتبێت و ئەم کارەشیان ئەوەندەسەیر و کتوپڕییە، کەئەو دەستەواژانەخێرا بەناو خەڵکدا بڵاودەبنەوە. ئێستا هەموو هونەری سیاسەت لەوەدا نییەکەپۆلیس ئیدارەبکەن (ئەو بەلۆژیک و میکانیزمی تەڵخ و کۆنترۆڵنەکراوی خۆی ئیدارەدەکرێت)، بەڵکو داهێنانی وشەی دەستەبژێرەکە سیاسەتمەدارەکان لەڕێگەی ئەوانەوەدەبیسترێن و فام دەکرێن، لەڕاپرسییەکاندا هەڵدەسەنگێندرێن و لەهەڵبژاردنەکاندا دەردەچن، یان دەرناچن. گۆتەهێشتا زاراوەی «وشەی دەستەبژێر»ی نەبیستووە، بەڵام هەروا کەدەزانین شتەکان بەرلەوەی دەرکەوتبێتن و ناومان لێ نابێتن، بەپێی جەوهەر و سروشتی خۆیان هەبوون. گۆتەدەزانێت کەئەم وشانەکەئێستا ناپلیۆن دەیانڵێت، نموونەی «وشەی دەستەبژێر»ی زۆر گرینگن کەبۆ هەردووکیان بەسوود دەبن. گۆتەبەخۆشییەوە هەنگاوێک لەمیزەکەی ناپلیۆن دەچێتەپێش.

ئێوەلەبابەت نەمریی شاعیرانەوەچیتان پێ خۆشەبیڵێن، بەڵام فەرماندەکانی سوپا نەمرترن. بۆیەوا چاکەناپلیۆن پرسیار لە گۆتەبکات، نەوەک بە پێچەوانەوە. ناپلیۆن لێی دەپرسێ:

«چەند ساڵت تەمەنە؟»

گۆتە وەڵام دەداتەوە:

«شەست ساڵ».

«پێتەوەدیار نییە».

ناپلیۆن بەستایشەوەئەمەدەڵێت (ئەو بیست ساڵگەنجترە) و گۆتەخۆشحاڵ دەبێت. گۆتە لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا زۆر قەڵەو بوو، دوو چین غەبغەبەی بەردابووەوەکەزۆر خەمی لێ نەدەخوارد، بەڵام کە تەمەنی زیاتر هەڵدەکشا و زیاتر بیری لە مردن دەکردەوە، لەوەدەترسا کەبەسکێکی زۆر زلەوەبچێتەناو نەمرییەوە. بۆیەبڕیاری دا کێشی دابەزێنێت و زۆری نەخایاند بوو بەپیاوێکی لەڕ و باریک. ئەڵبەت ئیتر جوانچاک نەبوو، بەڵام لانیکەم دەیتوانی یادەوەریی جوانچاکیی جارانی خۆی بژیەنێتەوە. ناپلیۆن بەوپەڕی ڕاستگۆییەوەلێی دەپرسێت:

«ژنت هێناوە؟»

گۆتەبەسووکەکڕنۆشێکەوەوەڵامی دەداتەوە:

«بەڵێ».

«منداڵت هەیە؟»

«کوڕێک».

لەم کاتەدا ژەنەڕاڵێک بەرەو ناپلیۆن دەنەوێتەوەو هەواڵێکی گرینگی پێ ڕادەگەیەنێت. ناپلیۆن بیردەکاتەوە، دەستی لەبن یەلەکەکەی دەهێنێتە دەر، بەچنگاڵەکەی کوتێک گۆشت هەڵدەگرێت و دەیخاتە ناودەمیەوە(ئیتر وێنەی ئەم دیمەنەهەڵناگیرێت) ئەوسا بە زاری پڕەوەوەڵامی دەداتەوە. ماوەیەک دەخایەنێت تا دیسان بیری گۆتەی بکەوێتەوە؛ ئەو بەوپەڕی ڕاستگۆییەوەلێی دەپرسێت:

«ژنت هێناوە؟»

گۆتەبەسووکەکڕنۆشێکەوەوەڵامی دەداتەوە:

«بەڵێ».
«منداڵت هەیە؟»
«کوڕێک».
«باسی کارڵ ئاوگوستوسم بۆ بکە».
ناپلیۆن لەناکاو ناوی سەرۆکەکەی گۆتە، شازادەی ویلایەتی وایمار دەهێنێت و بەشێوازی ناوهێنانەکەشیدا دیارەکەئەو پیاوەی خوش ناوێت.
گۆتەنەدەتوانێت بەخراپەباسی سەرۆکەکەی بکات، نەدەتوانێت لەگەڵ نەمرێکدا جەدەل بکات، بۆیەبەخۆلێلادانێکی دیپلۆماسییانەدەڵێ کارڵ ئاوگوستوس گەلێک کاری بۆ هونەر و زانست کردووە. ئەم ئاماژەکردنەی بە هونەر و زانست دەرفەتێک بۆ فەرماندەی نەمر دەرەخسێنێت واز لە جویین بهێنێت، لەپشت مێزەکەی هەستێت، دەستی بۆ بن یەلەکەکەی ببات و چەند هەنگاو لەشاعیر نزیک بێتەوەو باسی شانۆی بۆ بکات. لەو کاتەدا دیسان خێڵی نەبیندراوی وێنەگرەکان سەرلەنوێ دەژیەنەوە، کامێراکان دەستبەکار دەبن و فەرماندە،کەبۆ ساتێک شاعیری بۆ سووچێکی هۆڵەکەبردووە، بە ناچاری دەنگی بەرزدەکاتەوەتا هەموو ئامادەبوانی هۆڵەکەبیبیستن. ئەو پێشنیار بە گۆتەدەکات کەشانۆنامەیەک لەبارەی کۆنفرانسی ئێرفورتەوەبنووسێت، کۆنفرانسێک کەهیوادارە سەردەمێکی ئاشتی و شادی بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات. ئەو بەدەنگی بەرز دەڵێ: «شانۆ دەبێ‌ببێت بەقوتابخانەی گەل!» (دووهەمین وشەی دەستەبژێری جوان بۆ ڕۆژنامەکانی سبحەینێ) ئەوسا بە دەنگێکی هێواش درێژەی پێ دەدا:
«ئەگەر ئەم شانۆنامەیەت پێشکەش بە ئیمپراتۆر ئەلیکساندر بکردایە زۆر چاک دەبوو!»

(ئەلیکساندر ئەو کەسە بوو کەکۆنفرانسی ئێرفورتی بۆ دەگیرا! ئەو کەسەکەناپلیۆن بۆ سەرکەوتن پێویستی پێی بوو!) ئەوسا، لەکاتێکدا باسی ئەدەب بۆ "گۆتشیل" دەکات، یاوەرەکانی بەراپۆرتەکانیان قسەی پێ دەبڕن و هەودای بیری دەقرتێنن. ناپلیۆن بۆ دیتنەوەی ئەم هەودایەدووجاری دیکە، بەبێ بۆنەو بەبێ دڵنیابوون، وشەی "شانۆ و قوتابخانەی گەل" دەڵێتەوە و پاشان (ئەرێ، لەئەنجامدا هەوداکەدەبینێتەوە!) ناوی "مەرگی قەیسەر" بەرهەمی ڤۆڵتەر دەبات. بە بۆچوونی ناپلیۆن ئەمەنموونەیەکەبۆ ئەوەی کە شاعیرێکی دراماتیک، چۆن ئەو دەرفەتەلەکیس خۆی دەدات کەببێت بەمامۆستای گەل. ئەو دەبوایەلەم شانۆیەدا ئەوەی پیشان بدایەکەچۆن فەرماندەی مەزن لەپێناوی خۆشگوزەرانی خەڵکدا کاری دەکرد و چۆن مەجالی کورتی ژیانی نەیهێشت بەئاواتەکەی بگات. دوا وشەکانی خەمبارانەن. فەرماندەسەیری چاوی شاعیر دەکات:

«ئەها، ئەمەبابەتیکی زۆر چاکەبۆ تۆ!»

بەڵام دیسان قسەکانی پێ دەبڕن. ئەفسەرەپلەباڵاکان دێنەناو هۆڵەکەوە، ناپلیۆن دەستی لەبن یەلەکەکەی دەردەهێنێت و دەگەڕێتەوەبۆ پشت مێزەکەی. بەچنگاڵ پلێک گۆشت هەڵدەگرێت و بەدەم گوێگرتن لەراپورتەکانەوە دەیخوات. سێبەری وێنەگرەکان لەهۆڵەکەدەسڕدرێتەوە. گۆتەسەیری دەوروبەری دەکات. وێنەکانی سەر دیوارەکەهەڵدەسەنگێنێت، پاشان لەو یاوەرەنزیک دەبێتەوەکەهێناویەتی بۆ ئەوێ و لێی دەپرسێت کەئایا دیدارەکەیان کۆتایی هاتووە؟ یاوەرەکەسەری دەلەقێنێت، چنگاڵێک پلێک گۆشت دەخاتەنێو دەمی ناپلیۆنەوە و گۆتەدەچێتەدەر.

# ٥

"بێتینا" کچی "ماکسیمیلیان لارۆش" بوو، کچی ئەو ژنە کەگۆتەلە تەمەنی بیستوسێ ساڵیدا عاشقی بووبوو. ئەگەر ئێمەچاو لەچەند ماچێک بپۆشین، ئەو عەشقەعەشقێکی ناجەستەیی و تەواو هەستیارانە بوو، کەهیچ ئەنجامێکی نەبوو جگەلەوەی کەدایکی ماکسیمیلیان خێرا کچەکەی لەبرێنتانۆ، بازرگانێکی ساماندارى ئیتالی مارەکرد. کاتێک برێنتانۆ زانیی کە ئەو شاعیرەگەنجەبەتەمایەلە ژنەکەی نزیک ببێتەوە، لە ماڵەکەی دەری کرد و ڕێگەی نەدا هەرگیز بگەڕێتەوە. ماکسیمیلیان دواتر دوازدەمنداڵی بوو (ئەو ئیتالییەبەکارەلەژیانیدا بوو بە باوکی بیست کەس) و یەکێکیانی ناو نا ئەلیزابێت، یان هەمان بێتینا.

بێتینا هەر لەسەرەتای گەنجییەوەبەرەو گۆتەڕاکێشرا. یەکەم، لەبەر ئەوەی کەگۆتەلەبەرچاوی خەڵکدا بەرەو «پەرستگای ناوبانگ» هەنگاوی دەنا و دووهەم، لەبەر ئەوەی کەبێتینا بەخۆشەویستییەکەی نێوان گۆتەو دایکی زانیبوو. بێتینا بەجۆشوخرۆشەوەنوقمی ئەو عەشقەکۆنەی ڕابردوو بوو، عەشقێک کەبە هۆی ئەو مەودا زەمەنییەوەسیحراویتر بووبوو (خودایە، ئەم عەشقە سیانزەساڵ پێش لەدایکبوونی بێتنیا سەری هەڵدابوو)، ئەوسا وردەوردەئەو هەستەلەبێتینادا سەری هەڵدا کەمافی بەسەر ئەو شاعیرەمەزنەوەهەیەو بەدەربڕینێکی خوازەیی (کێ بێ

جگەلەشاعیر خوازەبەجیددی وەربگرێت؟) خۆی بە کچی ئەو دەزانی.

ئەمەڕاستییەکی ئاشکرایەکەبەداخەوەپیاوان حەزدەکەن لەبەر ئەرکی باوکانەی خۆیان هەڵبێن و گوێ بە منداڵەکانیان نەدەن و خەرج و مەسرەفیان نەکێشن. ئەوان لاریان لەو ڕاستییەهەیەکە منداڵ شیلەی عەشقە. ئەرێ، منداڵ شیلەی هەموو عەشقێکە و هیچ جیاوازییەک لەوەدا نییەکەنوتفەی گوورابێت و لەدایک بووبێت، یان نا. لەزانستی جەبریی عەشقدا، منداڵ هێمای کۆی سیحراویی دوو بوونەوەرە؛ تەنانەت ئەگەر پیاوێک عاشقی ژنێک بووبێت و هەرگیز دەستیشی بۆ نەبردبێت، کابرا دەبێ ئەو ئەگەرەی لە پێشچاو بێت کەسیانزەساڵ پاش دوادیداری لەگەڵ دڵدارەکەی، ڕەنگەداری عەشقەکەی بەر بگرێت و منداڵەکەی پێ بنێتەناو دنیاوە. ئەمەئەو شتەبوو کەبێتینا بەر لەوەی بوێرێت بچێت بۆ وایمار و سەردانی گۆتەبکات، بە خۆی گوتبوو.

بەهاری ١٨٠٧ بوو. بێتینا بیستودوو ساڵی تەمەن بوو (لەو تەمەنەدا کەگۆتەباسی خۆشەویستییەکەی خۆی بۆ دایکی کردبوو)، بەڵام هێشتا هەستێکی منداڵانەی بوو. هەر ئەم هەستەش بە شێوەیەکی سەیر و سیحراوی دەیپاراست. دەتگوت منداڵییەکەی بۆی بووەبەقەڵغان.

خۆشاردنەوەلەپشت قەڵغانی منداڵییەوە: ئەمە فێڵی هەموو ژیانی بوو، فێڵ و لە هەمان کاتیشدا هەڵوێستێکی سروشتی. ئەو ئێستاکەش لەیارییەمنداڵانەکەیدا دەوری منداڵی دەبینی. بێتینا هەمیشەبراگەورەکەی، "کلەمانس برێنتانۆ"ی شاعیری کەمێک خۆش دەویست و چێژی لەوەدەبینی کەلەسەر کۆشی دابنیشێت. لەو کاتەدا ئەو چواردەساڵی تەمەن بوو. هاوکات لە هەر سێ چێژەکەی

منداڵبوون و خوشکبوون و ژنێکی دڵخوازبوون، دەگەیشت. ئاخر چۆن دەکرێ منداڵێک لەسەر کۆشت لاببەیت؟ تەنانەت گۆتەش توانای ئەوەی نەبوو.

ساڵی ١٨٠٧، یەکەم ڕۆژ کە یەکتریان بینی، بێتینا، ئەگەر قسەکەی بە ڕاست وەربگرین، لەسەر کۆشی گۆتەدانیشت: بێتینا، سەرەتا لەسەر کورسییەک بەرامبەر بەگۆتە دانیشت. گۆتەبەزمانێکی فەرمی و تازیەبار باسی مردنی 'دوشێز ئامالیا'ی بۆ کرد، کەچەند ڕۆژ لەوەپێش مردبوو. بێتینا ئاگای لەوەنەبوو.

گۆتەبە سەرسووڕمانەوەگوتی:

«چۆن دەکرێ؟ تۆ حەزت لەژیانی وایمار نییە؟»

بێتینا گوتی:

«من جگەلەتۆ حەزم لە هیچی دیکەنییە».

گۆتەزەردەخەنەی کرد و ئەم ڕستەچارەنووسسازەی بەو ژنەگەنجەگوت:

«تۆ منداڵێکی دڵڕفێنیت».

بێتینا کاتێک وشەی منداڵی بیست هەموو شەرمێکی وەلا نا. گوتی کەدانیشتن لەسەر کورسییەکەئازاری دەدات و هەستا. گۆتەگوتی:

«تۆ لە کوێ ئاسوودەیت، لەوێ دانیشە».

بێتینا چووەسەر کۆشی و باوەشی پێدا کرد. ئەو باوەشی گۆتەی ئەوەندەپێ خۆش بوو کەزوو خەوی لێکەوت.

کارێکی سەختەکەبڵێین ئایا ئەم شتانەلەڕاستیدا هەر بەم شێوەڕوویان داوە، یان بێتینا بۆخۆی هەڵیبەستووە. ئەڵبەتە زۆر چاکترەکەبۆخۆی هەڵیبەستبێت. ئەو، بەم شێوەپیشانمان دەدا کەچۆن سەیری بکەین و هەروەها شێوازی نزیکبوونەوەی

لەپیاوانیشمان بۆ دەگێڕێتەوە: ئەو وەک منداڵ بێشەرمانەڕاستگۆ بوو (گوتی کەمردنی دوشێزی بەلاوەگرینگ نییە و لەسەر ئەو کورسییەش کە دەیان کەس بە ئاواتەوەبوون لەسەری دابنیشن، ئاسوودەنییە) بەشێوەیەکی منداڵانە چووە سەر کۆشی و باوەشی پێدا کرد. لەوەش زیاتر، بە شێوەیەکی منداڵانەلەسەر کۆشی خەوی لێکەوت!

هیچ شتێک لەوەچاکتر نییەکەمرۆڤ خۆی منداڵ بکاتەوە: منداڵ بۆی هەیەهەرچی پێ خۆش بێت بیکات، چونکە بێگوناه و بێئەزموونە، پێویست ناکات یاسا و ڕێسای هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی بپارێزێت، چونکە هێشتا نەچووەتەناو دنیایەکەوەکەفۆرم بەسەریدا زاڵە، هەستەکانی شایستەبن، یان ناشایست، دەتوانێت پیشانیان بدات. ئەو کەسانە کەلە ناخ و دەروونی بێتینادا منداڵیان نەدەدی، دەیانگوت مێشکی تێکچووە(جارێک کەبە خۆشحاڵییەوەسەمای دەکرد، کەوت و سەری لەسووچی مێزەکەدرا)، خراپ پەروەردەکراوە(لەناو خەڵکدا لەبری کورسی لەسەر عەرزەکەدادەنیشت)، یان بە تایبەت، بەشێوەیەکی کارەساتبار ناسروشتییە، بەڵام بەو بارەی دیکەشدا، کەسانێک کەحەزیان دەکرد هەمیشەوەک منداڵ سەیری بکەن، شەیدای ئەو هەڵسوکەوتەخۆبەخۆ سروشتییەی دەبوون.

گۆتەکەوتەبەر کاریگەریی ئەو منداڵە. بێتینا ئەوی بیری گەنجێتیی خۆی دەخستەوە و کلکەوانەیەکی جوانی بەدیاری پێشکەش کرد. ئەو ئێوارەگۆتەبە تایبەتی لەدەفتەری یادەوەرییەکانیدا نووسی: خانمی برینتانۆ.

## ٦

ئەم جووتەدڵدارەبەناوبانگە، گۆتەو بێتینا، چەند جار یەکتریان بینی؟ بێتینا جارێکی دیکەش لەکۆتایی ئەو ساڵەدا، پاییزی ۱۸۰۷، سەردانی کرد و دەڕۆژ لە وایمار مایەوە. پاشان ئیتر گۆتەی نەدی، تا سێ ساڵ دواتر، کەبۆ ماوەی سێ ڕۆژ چوو بۆ سەرچاوەی ئاوی کانزایی بوهێم لەتەپلیتز. ئەو نەیدەزانی گۆتەش بۆ عیلاج بەو ئاوە شفابەخشەهاتووەبۆ ئەوێ. ساڵێک لەوەدواش، ئەو دیدارەچارەنووسسازەدوو حەفتەییەی وایمار ڕووی دا، کەلە کۆتاییەکەیدا کریستیان چاویلکەکەی بێتینای فڕێدایەسەر عەرز.

ئەی ئەو دووانەبەڕاست چەندجار دووبەدوو پێکەوەبوون؟ سێ، یان چوار جار. لەوەزیاتر ڕێی تێناچێت. ئەوان هەرچی کەمتر یەکتریان دەبینی، زیاتریان بۆ یەک دەنووسی، یان وا چاکەبڵێم بێتینا زیاتری بۆ دەنووسی. بێتینا پەنجاودوو نامەی دووروودرێژی بۆ نووسی کەلەواندا بە"تۆ" ناوی دەبرد و جگەلە عەشق باسی هیچی دیکەی بۆ نەدەکرد. هەرچۆنێک بێت، جگە لەم سێڵاوی وشانە، لەڕاستیدا هیچ شتێکی دیکەڕووی نەداوە. بۆیە دەکرێت ئەو پرسیارەلەخۆمان بکەین کەبۆچی چیرۆکی عەشقی ئەم دووانەئەوەندەبەناوبانگ بووە؟

ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارە: ئەم ناوبانگەلەبەر ئەوەیەکەلەسەرەتاوەجگەلە عەشق هیچی دیکەیان لە نێواندا نەبووە.

گۆتەزۆر زوو هەستی بەنیگەرانی کرد. یەکەم جار ئەو هەستەلەویۆەسەری هەڵدا کەبێتینا گوتی زۆر لەپێش یەکەم دیدارەکەیان لە وایمار، لەگەڵ دایکەپیرەکەی گۆتەکەئەویش لە فرانکفۆرت دەژیا، دۆستایەتییەکی نزیکی بووە. بێتینا گەلێک پرسیاری لەبارەی کوڕەکەیەوەلێ کردووە و ئەو خانمەپیرەش بەڕووی خۆش و دڵی ئاوەڵاوە، ڕۆژی دەیان یادەوەریی بۆ گێڕاوەتەوە. بێتینا پێی وابوو دۆستایەتییەکەی لەگەڵ دایکی، دەرکەی ماڵ و دەرکەی دڵی گۆتەی لێ دەکاتەوە. ئەم حسێباتەی بێتینا ڕاست دەرنەچوو. خۆشەویستییە پڕ لەستایشەکەی دایکی، بە لای گۆتەوەتا ڕادەیەک گاڵتەجاڕی بوو (ئەو هەرگیز بەبیریدا نەهات کەلە وایمارەوەسەردانی دایکی بکات)، لەو پەیوەندییەی نێوان کچێکی سەیروسەمەرەو دایکێکی ساویلکەدەترسا.

من پێم وایەکاتێک بێتینا ئەو چیرۆکانەی بۆ دەگێڕایەوەکەلەو پیرێژنەی بیستبوو، گۆتەتووشی هەندێک هەستی تێکەڵاو دەبوو. ئەڵبەت سەرەتا پێی خۆش بوو کەژنێکی گەنج خۆشی دەویست و خۆشەویستییەکەشی دەردەبڕی. چیرۆکەکانی بێتینا کۆمەڵێک بیرەوەریی خەوتوویان لەدەروونیدا بەئاگا دەکردەوەکەپێی خۆش بوو، بەڵام دواتر لەناو ئەو گێڕانەوانەدا گوێی لە هەندێک چیرۆک دەبوو کەپێدەچوو ڕوویان نەدابێت، یان ئەو لەو چیرۆکانەدا ئەوەندەگەمژەدەردەکەوت کەنەدەبوو ڕوویان دابێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو قۆناغی منداڵی و لاویەتییەی کەبێتینا دەیگێڕایەوەڕەنگ و واتایەکی وەهایان بوو کەنیگەرانی دەکرد. نەوەک لەبەر ئەوەکەبێتینا ویستبێتی بیرەوەرییەکانی منداڵیی دژ بە خۆی بەکار بهێنێت، بەڵکو لەبەر ئەوەکەمرۆڤ (نەوەک هەر گۆتە، هەموو کەسی دیکەش) پێی خۆش نییەژیانی بەڕاڤەیەکی جیاواز لە ڕاڤەی خۆی

بگێڕدرێتەوە. گۆتە بەم شێوەهەستی بەمەترسی کرد. ئەو کچەکەلەگەڵ ڕۆشنبیرە گەنجەکانی بزووتنەوەی ڕۆمانتیک (کە گۆتەلەگەڵیان هاوبیر نەبوو) هاوڕێ بوو. بەشێوەیەکی ترسناک (هەروەها بەمتمانەبەخۆبوونێکی تا ڕادەیەک بێشەرمانە) بەرزەفڕ بوو. دەتگوت لەوە دڵنیایەکەدەبێت بەنووسەر. ڕۆژێکیش بەڕاست پێی لێ نا و گوتی: بەتەمایەبەپشتبەستن بەبیرەوەرییەکانی دایکی گۆتەکتێبێک بنووسێت، کتێبێک لەبارەی ئەوەوە، لەبارەی گۆتەوە! گۆتەدەستبەجێ زانیی کەلەپشت ئەم خۆشەویستییەوەهەڕەشەی هێرشی قەڵەم خۆی حەشارداوە. هەر ئەمەش بووەهۆی ئەوەکەهۆشیاربێتەوە.

بەڵام چونکەهەمیشەلەبەرامبەر بێتینادا لەدۆخی بەرگریدا بوو، ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا کارێکی ناشایست نەکات. بێتینا لەوەترسناکتر بوو کەبیکات بەدوژمنی خۆی. ئەوەی بە لاوەچاکتر بوو کەبۆ هەمیشەبیخاتەژێر چاودێرییەکی دۆستانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کەنابێت تەنانەت لە میهرەبانیشدا زێدەڕۆیی بکات، چونکەبچووکترین جووڵەیەکیش کەبێتینا بتوانێت لێکدانەوەی عاشقانەی بۆ بکات (دیارەبێتیناش ئامادەبوو تەفسیری عاشقانەبۆ پژمینەکەشی بکات) ئەوی چاوقایمتر دەکرد.

جارێک بێتینا بۆی نووسی: «نامەکانم مەسووتێنە، مەیاندڕێنە، ڕەنگەئەو کارە ئازارت بدات، چونکەئەو عەشقەکەمن لەو نامانەدا باسی دەکەم، زۆر قورس و ڕاستەقینەو زیندوو بە تۆوەگرێ دراوە، بەڵام پیشان کەسیشیان مەدە، لەشوێنێک بیانشارەوە، وەک جوانییەکی نهێنی ڕایانبگرە». گۆتە، سەرەتا بۆ ئەو متمانەبەخۆبوونەی بێتینا کەنامەکانی وەک جوانی لێکدابووەوە، بزەیەکی سەلمێنەری هاتێ، بەڵام دواتر کەچاوی بەم ڕستەکەوت:

«بەڵام پیشان کەسیشیان مەدە» سەری سوورِما. بۆچی قسەی وای پێ گوتبوو؟ خۆ ئەو پێی خۆش نەبوو ئەو نامانەپیشان کەس بدات. بێتینا بەو دەستەواژەفەرمانییەکە گوتبووی «پیشان کەسیان مەدە!» ئاواتی شاراوەی خۆی بۆ پیشاندانی نامەکان بەخەڵکی تر ئاشکرا کردبوو. گۆتەگومانی لەوەنەبوو کەئەو نامانەکەجارجار بۆ بێتینای نووسیوە، لە ئەنجامدا خوێنەری دیکەشیان دەبێت. دەیزانی کەوەک کەسێکی تاوانبارەکەدادگا هەرِەشەی لێ دەکات و پێی دەڵێ: لەمەدوا هەر چی بڵێیت دژ بە خۆت بەکاردێت.

بۆیەهەوڵی دا رِێچکەیەک لە نێوان میهرەبانی و خۆرِاگری بدۆزێتەوە. وەڵامی بۆ نامەکانی بێتینا هەم دۆستانەو هەم خۆرِاگرانەبوو، تا ماوەیەکی زۆر لە بەرامبەر "تۆ" نووسینەکانی ئەودا، جێناوی فەرمیی "ئێوە"ی بەکار دەبرد.

ئەوان کاتێک لەشارۆچکەیەک یەکتریان بینی، گۆتەوەک باوکێکی میهرەبان لەگەڵی جووڵایەوەو دەعوەتی کرد بۆ ماڵەکەی، بەڵام پێی خۆش بوو هەمیشەخەڵکی دیکەشیان لە لا بێت.

کەواتە ئەو دووانە چییان لەنێواندا بوو؟

ساڵی ۱۸۰۹ بێتینا بۆ گۆتەی نووسی: «زۆر حەزدەکەم بۆ هەمیشەتۆم خۆش بوێت». ئەم رِستەبەرِواڵەت ئاساییە بەوردی بخوێننەوە. لە وشەی خۆشەویستی گرینگتر، وشەی "هەمیشە" و "حەزدەکەم"ە.

من لەمەزیاتر لە چاوەرِوانیدا ناتانهێڵمەوە. ئەوەی لە نێوان ئەو دووانەدا بوو خۆشەویستی نەبوو، نەمریی بوو.

# ٧

سالی ١٨١٠، لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا کەئەو دووانەپێکەوەلەتەپلیتز بوون، هەر کاتێک بەڕێکەوت پێکەوەبوونایە، بێتینا بەگۆتەی دەگوت بەم زووانە شوو بە'ئاخیم فون ئارنیم'ی شاعیر دەکات. پێدەچێت بەشڵەژاوییەوە ئەوەی پێ گوتبێت، چونکەنەیدەزانی کەئایا گۆتە شووکردنەکەی بەخەیانەت بەو عەشقەدەزانێت کەبەجۆشوخرۆشەوەباسی دەکرد، یان نا. ئەو پیاوانی ئەوەندەنەدەناسی کەبزانێت ئەم هەواڵەچەندە گۆتەخۆشحاڵ دەکات.

دوای ئەوەی کەبێتینا دەڕوات، گۆتەخێرا نامەیەک بۆ کریستیان لەوایمار دەنووسێ و ئەم هەواڵەخۆشەی پێ دەڵێ: «لەگەڵ ئارنیم، جێی گومان نییە» (MitArnim, ists Wohl gewiss) ئەو هەر لەم نامەدا خۆشحاڵی دەردەبڕێت کەبێتینا لەو دۆخەدا «بەڕاست جوانتر و شیرینتر لەجارانە» و ئێمە دەتوانین مەزندەی ئەوەبکەین کەبۆچی بەم شێوەهاتووەتەبەرچاوی: گۆتە لەوەدڵنیا بوو کەلەمەدوا بوونی مێرد دەبێت بەقەڵغانێک کە لەدوورکەوتنەوەلەمیانڕەوی دەپارێزێت؛ ئەو میانڕەوییەکەتا ئێستا نەیهێشتبوو بەبێخەم و بەڕووی خۆشەوە ستایشی دڵڕفێنییەکانی بێتینا بکات.

بۆ تێگەیشتن لەم دۆخە، نابێت ئەو بابەتەگرینگەپشتگوێ بخەین کەگۆتەهەر لە سەرەتای گەنجییەوەتا ئەو دەمەکەچاوی بە بێتینا کەوت، بۆ ماوەی چل ساڵ پیاوێکی نەزەرباز و چاوچڕێن بوو،

هەندێک حەز و ئارەزووی هەڵخەڵەتاندنی ژنانی لەدەرووندا بوو کەبەبچووکترین پاڵنەری غەریزی کارا دەبوون. ئەو تا ئێستا بەگران توانیبووی لە لای بێتینا کۆنترۆڵی ئەو هەستەی خۆی بکات، بەڵام کاتێک بەوەی زانی کە «لەگەڵ ئارنیم، جێی گومان نییە» بە دڵێکی ئاسوودەوەبە خۆی گوت ئیتر پێویست بەپارێز ناکات.

بێتینا ئەو دوانیوەڕۆیە، هەر بەو دۆخەمنداڵانەی جارانییەوە، دیسان چوو بۆ ژوورەکەی گۆتە. بەکەیف و خۆشییەوەیەک دوو حەقایەتی بۆ گێڕایەوە و، لەکاتێکدا گۆتەوەک هەمیشەلەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، ئەو لەسەر عەرز بەرەوڕووی دانیشت. گۆتەش کەبەهۆی «لەگەڵ ئارنیم، جێی گومان نییە» کەیفی ساز بوو، بەرەو بێتینا نەوییەوەو بە حاستەم، وەک چۆن ئێمەدەست بەڕوومەتی منداڵێکدا دەهێنین و دەیانلاوێنینەوە، لاواندییەوە. لەو کاتەدا منداڵەکە بێدەنگ بوو، چاوی پڕ لەداوا و تەمەنای ژنانەی، بەرەو ڕووی سووڕاند. گۆتەدەستی گرت و لەسەر عەرزەکەبەرزی کردەوە. ئەم دیمەنەتان لە بیر بێت: گۆتەدانیشتبوو، بێتینا لەبەرامبەری ڕاوەستابوو، لەودیو پەنجەرەکەوەخۆر خەریکبوو ئاوا دەبوو. بێتینا چاوی لەچاوی بڕیبوو، گۆتەش چاوی لە چاوی بڕیبوو. میکانیزمی دەستخەڕۆیی کەوتبووە گەڕ و گۆتەبەری پێ نەدەگرت. ئەو بە دەنگێکی تا ڕادەیەک هێواشتر لەدەنگی ئاسایی، لەکاتێکدا چاوی لێ نەدەترووکاند، داوای لێ کرد سنگ و بەرۆکی ڕووت بکات. بێتینا هیچی نەگوت، هیچی نەکرد، سەری بۆ بردەپێش. گۆتەلەسەر کورسییەکەی هەستا و سنگ و مەمکی بۆ ڕووت کردەوە. بێتینا هەروا لە چاوی گۆتەوردبووەوە و سووریی شەفەق لەگەڵ ئەو سوورییەکەلە پێستی تێپەڕی و لەناخی دڵی ڕۆچوو،

تێکەڵ یەک بوون. گۆتەدەستی خستەسەر سنگ و بەرۆکی و لێی پرسی:

«تا ئێستا کەس دەستی لەمەمکت داوە؟»

بێتینا وەڵامی دایەوە:

«نا، کەتۆ دەستیان لێدەدەی زۆرم بەلاوەسەیرە».

لەهەموو ئەو ماوەدا بێتینا هەروا لە چاوەکانی گۆتەورد بووبووەوە و گۆتەش، بێ ئەوەی دەست لەسەر سنگ و مەمکی هەڵبگرێت، چاوی لە چاوی بڕیبوو. ماوەیەکی زۆر بەحەز و ئیشتیاوەلە قووڵایی ئەو چاوانەدا سەیری شەرمی کچێکی دەکرد کەپێشتر دەستی هیچ کەس لەسنگ و مەمکی نەدرابوو.

ئەمەتا ڕادەیەک ئەو دیمەنەیەکەبێتینا بۆخۆی گێڕاویەتییەوەو پێناچێت ئەنجامێکی بووبێت. ئەم چیرۆکە لەوەزیاتر کەبابەتێکی شەهوانی بێت، دەربڕینی زیدەڕۆیانەی هاندانێکی سێکسییەکەگەوهەرێکی بەنرخی لەناخیدا هەڵگرتووە.

# ٨

دوای ئەوەکەلێک جودا بوونەوە، کاریگەریی ئەو ساتەوەختەسیحراوییەتا ماوەیەکی زۆر لە دەروونیاندا مایەوە. لەو نامانەدا کەلەپاش ئەم دیدارە نووسراون، گۆتەبە«ئازیزترین» (llerliebste) ناوی بردووە. لەگەڵهەموو ئەمانەشدا، ئەو دیدارەنەبووەهۆی لەبیرکردنی بابەتەسەرەکییەکە و گۆتەلەنامەی دواییدا بەبێتینای ڕاگەیاند کەبەتەمایە یادەوەرییەکانی، (شێعر و ڕاستی)، بنووسێتەوەو پێویستی بەیارمەتیی ئەو هەیە. دایکی ئیتر لەجوملەی زیندووەکاندا نەبوو، کەسی دیکەش تافی گەنجیی ئەوی لەبیر نەمابوو. بێتینا کاتێکی زۆری لەگەڵ ئەو پیرێژنەتێپەڕاندبوو، وا چاکبوو ئەوەی لەو پیرێژنەی بیستبوو، بینووسێت و بۆی بنێرێت!

ئایا گۆتەنەیدەزانی کەبێتینا بۆخۆی بەئاواتەوەیەکتێبێکی بیرەوەری لەبارەی تافی منداڵیی ئەوەوەبنووسێت؟ نەیدەزانی کەتەنانەت لە لای ناشرێکیش باسی کردووە؟ بێگومان گۆتە ئاگای لەم شتانەبوو. من دڵنیام کەئەم داوایەی بۆ ئەوەنەبوو کەپێویستی بەیارمەتیی بێتینایە، بەڵکو بۆ ئەوەبوو کەبەر بەبێتینا بگرێت تا هیچ شتێک لەبارەی ئەوەوەبڵاونەکاتەوە. بێتینا کەلە دواهەم دیدارەکەیاندا چەک کرابوو. لە ترسی ئەوەکەشووکردنەکەی بە ئارنیم، گۆتەی لێ دوورنەخاتەوە، ئەم پێشنیارەی قبووڵ کرد. گۆتەوەک چۆن بۆمبێکی کاتژمێری پووچەڵ دەکەنەوە، ئەوی دەستەوەستان و بێئازار کرد.

پاشان لەمانگی سێپتامبەری ١٨١١، بێتینا هات بۆ وایمار. ئەو دووگیان بوو، لەگەڵ مێردە گەنجەکەی هات. هیچ شتێک لەدیداری ئەو ژنە خۆشتر نییەکەسەردەمێک لێی ترساوین و ئێستا، وەک مرۆڤێکی بێچەک، هیچ مەترسییەکی بۆمان نییە، بەڵام بێتینا ئەگەرچی دووگیان بوو، ئەگەرچی شووی کردبوو، ئەگەرچی نەیدەتوانی کتێب لەبارەی گۆتەوەبنووسێت، کەچی وێڕای هەموو ئەمانەش هەستی نەدەکرد چەک کراوەو بەتەما نەبوو واز لەشەڕەکەی بهێنێت. لەمەبەستەکەم تێبگەن: نا، ئەو شەڕەشەڕی خۆشەویستی نەبوو؛ شەڕی نەمریی بوو.

ئاساییەئەگەر بڵێین گۆتەبەهۆی هەلومەرجی ژیانییەوەبیری لەنەمریی کردبێتەوە. بەڵام ئایا دەکرێت بێتیناش، ژنێکی گەنجی بێناوبانگیش، لەو تەمەنەدا بیری لە نەمریی کردبێتەوە؟ بەڵێ، بە دڵنیاییەوە. مرۆڤ هەر لە منداڵییەوەبیر لە نەمریی دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بێتینا سەر بەو نەوەڕۆمانتیکەبوو کەلەو کاتەوە چاویان بە ڕۆشنایی ڕۆژ پشکووتبوو، بەرامبەر بە مردن هەستیان بە سەرسووڕمان دەکرد. نۆڤالیس ئەوەندە نەژیا تا بگاتەتەمەنی سیساڵی و لەگەڵ ئەوەدا کەگەنج بوو، جگەلە مەرگ، ئەو مەرگەجادووگەرە، ئەو مەرگەکەبووبوو بە ئەلکۆلی شیعری، هیچ شتێکی دیکە تووشی هەژان و هەیەجانی نەدەکرد. ئەوان، هەموویان، لەترۆپکدا دەژیان. لە خۆیان تێپەڕاندبوو باوەشیان بۆ ئەو دوور دوورانە، بۆ کۆتایی ژیانی خۆیان و ئەوپەڕی ژیانی خۆیان، بۆ کەنارەکانی نەبوون دەکردەوە ، هەروا کەپێشتریش گوتوومە، لە هەر شوێنێک مردن هەیەنەمرییش هەیە. هاوڕێ ڕۆمانتیکەکانی بێتینا ئەوەندە خۆمانەلەگەڵ مەرگ دەدوان، کەبێتینا لەگەڵ گۆتە دەدوا.

سالآنی نێوان ۱۸۰۷ و ۱۸۱۱ جوانترین قۆناغی ژیانی بێتینا بوو. ئەو لەساڵی ۱۸۱۰دا چوو بۆ ڤیەنا و بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت، سەردانی بتهۆڤنی کرد. ئەو لەناکاو لەگەڵ دوو کەسی ئاڵمانی، کەنەمرترین کەس بوون، ئاشنا بوو. شاعیرێکی بەژنجوان و موزیسیەنێکی ناحەز و لەگەڵ هەردووکیشیاندا نێوانی خۆش بوو. ئەم نەمرییەدوولایەنەسەرخۆشی دەکرد. گۆتە ئیتر پیر بووبوو (ئەو دەمەپیاوێکی شەست سالآنەیان بەپیرەمێرد دەزانی) و سەری لەگوێی قەبر دەلەرزی. بەلآم بتهۆڤن، هەرچەندە هێشتا چل ساڵی تەمەن بوو، بەلآم لەڕاستییدا پێنج ساڵ لەگۆتە نزیکتر لە مردن بوو. بەم شێوەبێتینا، وەک فریشتەیەکی هێمن، لە نێوان دوو کێلەقەبری ڕەشی مەزندا بوو. ئەم دۆخەئەوەندە جوان بوو کەبێتینا ناودەمی بێدانی گۆتەی بەلاوەگرینگ نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەرچی گۆتەپیرتر دەبوو زیاتر بەرەو خۆی ڕای دەکێشا، چونکەهەرچی زیاتر لە مردن نزیک دەبووەوە، لە نەمریش نزیکتر دەبووەوە. تەنیا گۆتەیەکی مردوو بوو کەدەیتوانی دەستی بگرێت و بەرەو "پەرستگای ناوبانگی"ی ببات. هەرچی گۆتەلە مردن نزیکتر دەبووەوە، ئارەزووی بێتیناش بۆ وازلێهێنانی کەمتر دەبوو.

بۆیەلەو سیپتامبەرەچارەنووسسازەی ۱۸۱۱دا، ئەگەرچی بێتینا دووگیان و مێردیشی بوو، بەلآم هەڵسوکەوتی لە هەمیشەزیاتر و ڕەهاتر منداڵانەبوو. ئەو بە دەنگی بەرز دەدوا، لەسەر عەرز دادەنیشت، لەسەر مێز، لە لێواری مێزی ئارایشتکردن، لەسەر گوڵدانی گوڵەشەمدانییەکان دادەنیشت و بە دارەکاندا هەڵدەگەڕا. بەشێوەیەک بەڕێگەدا دەڕوشت کەدەتگوت سەما دەکات. کاتێک خەڵک سەرقاڵی وتووێژێکی جیدی بوون، ئەو گۆرانی دەخوێند. کاتێک ئەوان دەیانویست گۆرانی بخوێنن، ئەو ڕستەی پڕمانای

دەگوت و ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا تا لەگەڵ گۆتەبە تەنیا بێت، بەڵام بە درێژایی ئەو دوو حەفتە، تەنیا یەک جار دووبەدوو پێکەوەبوون کەبەقسەی خۆی ئەو جارەش ئاوا تێپەڕی:

ئێوارەبوو، هەر دووکیان لە لای پەنجەرەی ژوورەکەی گۆتەدانیشتبوون. بێتینا دەستی بە قسەکرد، سەرەتا باسی ڕۆح و دواتر باسی ئەستێرەکانی کرد. لەو کاتەدا گۆتەسەیری دەرەوەی پەنجەرەکەی کرد و ئەستێرەیەکی گەورەی پیشان دا، بەڵام بێتینا چاوی کز بوو، لەدوورەوەهیچی نەدەبینی. گۆتە تەلەسکۆپێکی دایە دەستی و گوتی: «ئێمەبەختەوەرین! ئەوەئەستێرەی ژووپیتەرە! ئەم پاییزەزۆر جوان دەدرەوشێتەوە!»

بێتینا دەیویست باسی ئەستێرەی دڵداران بکەن، نەک ئەستێرەی ئەستێرەناسەکان، بۆیەکاتێک چاوی لەتەلەسکۆپەکەکرد، بە ئەنقەست نەیویست هیچ ببینێت و گوتی ئەم تەلەسکۆپە زۆر بەهێز نییە. گۆتەبەسەبر و تاقەتەوەچوو تەلەسکۆپێکی بەهێزتری بۆ هێنا. ناچاری کرد دیسان سەیری تەلەسکۆپەکەبکاتەوەو بێتیناش بە پێداگرییەوەگوتی کەهیچی وای پێ نابینێت. ئەمەبۆ گۆتەدەرفەتێک بوو کەباسی ژووپیتەر، مارس، ئەستێرەکانی تر، خۆر و ڕێگەی شیریی بۆ بکات. ئەو بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ قسەی بۆ کرد، کاتێک لەقسەکانی بووەوە، بێتینا داوای لێبوردنی کرد و بەبێ هیچ پێداگرییەک، بەحەز و ئارەزووی خۆی چوو بخەوێت. ئەو، چەند ڕۆژ دواتر، لەپیشانگە هونەرییەکەڕایگەیاند کەهەموو تابلۆکانی پیشانگاکەبێزارکەرن و کریستیانیش چاویلکەکەی فڕێدایەسەر عەرز.

# ٩

به لای بێتیناوەڕۆژی شکانی چاویلکەکەی لەسیانزەی سێپتامبەر، شکستێکی گەورەبوو. ئەو سەرەتا هەڵوێستێکی دوژمنانەی نواند و به هەموو وایماردا بڵاوی کردەوەکەکێوەگۆشتێکی شێت، گازی لێ گرتووە، بەڵام زۆر زوو زانیی کەئەو ڕق و تووڕەییەی دەبێتەهۆی ئەوەکە ئیتر هەرگیز چاوی بەگۆتە نەکەوێتەوە و ئەمەش ئەو عەشقەمەزنەی بەنەمرێک دەکرد بەڕووداوێکی بچووک کەبێگومان زوو فەرامۆش دەکرا. بۆیە"ئارنیم"ی دڵپاکی ناچار کرد تا نامەیەک بۆ گۆتە بنووسێت و له لایەن بێتیناوەداوای لێبوردنی لێ بکات، بەڵام نامەکەبێوەڵام مایەوە. ئەو ژن و مێردەگەنجەوایماریان بەجێهێشت و دیسان له ژانویەی ١٨١٢، واته دەساڵ لەپاش دواهەم دیدارەکەیان، بێتینا گەڕایەوەبۆ وایمار و لەشەوێکدا که گۆتە میوانی بوو، نەیدەتوانی ڕێگەی ماڵەکەی نەدات، بوونی خۆی پێ ڕاگەیاند. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، گۆتە تەنانەت به یەک وشەش ئەوی نەدواند. لەدێسامبری هەمان ساڵدا بێتینا دیسان نامەیەکی بۆ نووسییەوەکە وڵامی ئەویشی دەستنەکەوتەوە.

ساڵی ١٨٢٣، ئەنجومەنی شاری فرانکفۆرت بڕیاری دا لەسەر شەرەفی گۆتەپەیکەرێکی بیرئانینی بۆ ساز بکات و پەیکەرتاشێک بەناوی "ڕاوش" بۆ ئەم کارەڕاسپێردرا. بێتینا کاتێک پەیکەرەکەی بینی بەدڵی نەبوو. دەستبەجێ پەی بەوەبرد کەچارەنووس

دەرفەتێکی بۆ ڕەخساندووەکەنابێت لەکیس خۆی بدات. ئەو هەرچەندەشارەزاییەکی ئەوتۆی لەهێلکاریدا نەبوو، بەڵام ئەو شەوەدەستبەکار بوو سکێچێکی بۆ پەیکەرەکەکێشایەوە. لەسکێچەکەی ئەودا گۆتەوەک پاڵەوانێکی کلاسیکی دانیشتبوو، چەنگێکی بەدەستەوەبوو، کچێک کەهێمای "دەروون" بوو لە مابەینی ئەژنۆکانیدا ڕاوەستابوو. قژی گۆتەلە بڵێسەی ئاگر دەچوو. بێتینا سکێچەکەی بۆ گۆتە نارد و ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا: دڵۆپێک فرمێسک لەچاوی گۆتەدا پەنگی خواردەوە! بەم شێوەلەپاش سیانزەساڵ (ژووییەی١٨٢٤ بوو، گۆتەحەفتاوپێنج ساڵ و بێتیناش سیونۆ ساڵی تەمەن بوو) گۆتەدەرکەی ماڵەکەی لێ کردەوە و هەرچەندەزۆر وشک و فەرمی، بەڵام پێی ڕاگەیاند کەلە هەموو شتێکی خۆش بووەو قۆناغی بێدەنگییەپڕئیهانەکەی کۆتایی هاتووە.

بەبۆچوونی من لەم قۆناغەی چیرۆکەکەدا، ئەم دوو پاڵەوانەی ئێمەبەهۆشیاری و خوێنساردییەوەلەدۆخەکەگەیشتبوون. هەردووکیان دەیانزانی ئەوی دیکەبەتەمای چییە و هەر کامەشیان بە جیا دەیزانی کەئەوی دیکەش دەزانێت. بێتینا بەکێشانەوەی ئەو سکێچە، بۆ یەکەم جار بە ئاشکرا ڕایگەیاندبوو کەیارییەکەیان لە سەرەتاوەلەسەر چی بووە: نەمری.

بێتینا ئەم وشەیەی بە زماندا نەهات. ئەو، بەو شێوەکەپەنجەلەسیمی ئامێرێک دەدەین و بۆ ماوەیەک بە حاستەم دەیلەرێنینەوە، تەنیا ڕایمووسی. گۆتە بیستی. سەرەتا بەشێوەیەکی گەمژانەپێی خۆش بوو، بەڵام دواتر وردەوردە (لەپاش سڕینی دڵۆپەفرمێسکەکەی) لە مانای ڕاستەقینەو ناخۆشی پەیامەکەی بێتینا گەیشت: بێتینا دەیویست ئەو بزانێت کەلەو یارییەکۆنەی بەردەوامە، کە تەسلیم نەبووە، کەتاکەکەسێکەئەو کفنەفەرمییەبۆ گۆتە دەدروێت

کەتێوەی دەپێچن و پیشانی نەوەی نوێی دەدەن؛ گۆتەش هەر چی بکات ناتوانێت بەری پێ بگرێت و ئەو بێدەنگییەقیرسیچمەشی گرینگ نییە. گۆتەشتێکی بیرکەوتەوەکە لەمێژبوو دەیزانی: بێتینا ترسناکە، کەواتەوا چاکەلەژێر چاودێریی میهرەبانانەی خۆیدا بێت.

بێتینا دەیزانی کە گۆتە بەوەی زانیوە. ئەمەلەدیدارەکەی دواتریان لەپاییزی ئەو ساڵەدا دەردەکەوێت. بێتینا، دوای ئەوەکە گۆتە ڕێگەی ماڵەکەی دەدا، نامەیەک بۆ خوشکەزاکەی دەنووسێت و بەم شێوەباسی دەکات: «گۆتەئەو شەڕەی لەگەڵ من دەست پێکرد، بەڵام دواتر بەقسەی خۆش ئاشتی کردمەوە».

چۆن دەتوانین لە گۆتە نەگەین! ئەو، زۆر چاک هەستی بەوەدەکرد کە بێتینا عەسەبیی دەکات و بۆ کۆتاییهێنان بەو سیانزەساڵ دەنگدابڕینە پڕشکۆیەی، لە دەست خۆی تووڕەبوو. بۆ ئەوەی بەجارێک هەموو سەرزەنشتەنەگوتراوەکانی بەسەردا قڵپ بکاتەوە، شەڕی لەگەڵ کرد، بەڵام زوو پەشیمان بووەوەو ددانی بە جەرگی خۆیدا گرت: بۆ دەبێ لەگەڵی ڕاستگۆ بێت؟ بۆ دەبێ پێی بڵێت کەچۆن بیردەکاتەوە؟ گرینگ ئەوەیەکەلەسەر بڕیارەکەی خۆی سوور بێت، ناکارای بکات، ئارامی بکاتەوە، بیخاتەژێر چاودێری خۆیەوە.

بێتینا دەیگێڕێتەوەکەگۆتەلە کاتی وتووێژەکەیاندا لانیکەم شەش جار بەبیانووی جۆراوجۆرەوەلەژوورەکەدەچێتەدەر و بە دزییەوەقومێک شەراب دەخواتەوە، کەگوایەئەو بەهەناسەیدا پێی دەزانێت. لەئەنجامدا بەپێکەنینەوەلێی دەپرسێت بۆچی بەدەزییەوەشەراب دەخواتەوەو ئەویش لێی دەڕەنجێت.

من ئەو ڕەفتارەی بێتینام لەشەرابخواردنەوەکەی گۆتەبە لاوەسەیرترە: بێتینا وەک من و ئێوەهەڵسوکەوتی نەکردوە، ئەگەر

ئێمەبووینایە هەر سەیرمان دەکرد و بە ئەدەبەوەبێدەنگ دەبووین. گوتنی ئەو قسانەکە هەرگیز کەس نەیوێراوەبە گۆتەی بڵێت (هەناسەت بۆنی ئەلکۆلی لێ دێت. بۆ دەخۆیتەوە؟ بۆ بە دزییەوەدەخۆیتەوە؟) بۆ ئەوەبوو کەبەخۆمانەخۆمانەلێی نزیک ببێتەوە. ئەم سەرکێشییە ئاشکرایەکەبێتینا بەبیانووی منداڵییەوە بە مافی خۆی دەزانی، لەپڕ ئەو بێتینایەی بیری گۆتەهێنایەوەکەسیانزە ساڵ لەوەوپێش بڕیاری دابوو هەرگیز نەیبینێتەوە. گۆتە بە ئارامی هەستا و بەنیشانەی ئەوەی کەدیدارەکەیان کۆتایی هاتووەو دەیەوێت میوانەکەی لەڕاڕەوە تاریکەکەوەبەرەو دەرکەبەرێ بکات، چراکەی بە دەستەوەگرت.

بێتینا لە دەوامەی نامەکەیدا دەنووسێت کەبۆ ئەوەی بەر بەچوونەدەرەوەی گۆتەلەژوورەکەی بگرێت، لەناو دەرکەکەدا بەچۆکدا دێت و دەڵێ:

«دەمەوێ بزانم ئایا دەتوانم بەرت پێ بگرم؟ ئایا تۆ، وەک مشکەکەی فاوست، ڕۆحێکی چاکیت، یان ڕۆحێکی شەیتانی و شەڕانخێو؟ من ئەم ناودەرکەیەماچ دەکەم و سوجدەی بۆ دەبەم کەهەموو ڕۆژێک مەزنترین، گەورەترین ڕۆح و مەزنترین هاوڕێم لێیەوەتێدەپەڕێت».

گۆتەچیی کرد؟ دیسان وشەبە وشەلەزمانی بێتیناوە دەیگێڕمەوە. گوایەئەو گوتوویەتی:

«من بۆ تێپەڕین، پێشێلی تۆ و خۆشەویستییەکەت ناکەم. خۆشەویستییەکەی تۆ بۆ من زۆر پیرۆزە، بەڵام بەنسبەت ڕۆحتەوە، لەپاڵیەوەتێدەپەڕم (و گۆتەبەڕاست لە پاڵ لەشەبەچۆکداهاتووەکەیەوەتێپەڕی) چونکەتۆ زۆر زیرەکی و وا چاکەمرۆڤ پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ تۆدا هەبێت.

ئەو ڕستەیە کەبێتینا دەیخاتەسەر زمانی گۆتە، بە لای منەوەشیلەی هەموو ئەو قسانەیەکەئەو، لەو دیدارەیاندا، بەبێدەنگی بەبێتینای گوتووە: بێتینا، من دەزانم سکێچەکەت بۆ ئەو پەیکەرەفێلێکی درەوشاوەبوو. من وێڕای پیری و ئیختیاریش، ڕێگەم بەخۆم دا کەبکەومەژێر کاریگەریی ئەو قژانەکەبووبوون بەبڵێسەی ئاگر (بەداخەوەئەی قژەتەنک و دڵتەزێنەکەم!)، بەڵام زوو تێگەیشتم کەئەوەی دەتویست پیشانی منی بدەی، نەوەک سکێچ، بەڵکو دەمانچەیەک بوو لە دەستتدا کە نیشانەت لەنەمریی من گرتبوو. نا، من نەمدەزانی چۆن چەکت بکەم. بۆیەشەڕم ناوێت. من ئاشتیم دەوێت، بەڵام لە ئاشتی زیاتر نا. من بە هێمنی لە پاڵ تۆوەتێدەپەڕم و دەستیشت لێ نادەم، لە باوەشت ناگرم و ماچت ناکەم. یەکەم، چونکەئارەزووی ماچم نییەو دووهەم، چونکەدەزانم هەر کارێک بکەم لە دەستی تۆدا دەبم بەگوللەیەک بۆ دەمانچەکەت.

# ١٠

پاش دوو ساڵ، دیسان بێتینا گەڕایەوەبۆ وایمار. ئەو هەموو ڕۆژێک گۆتەی (کەئەو دەمەحەفتاوحەوت ساڵی تەمەن بوو) دەبینی و بەر لەوەی ئەویّ جێبێڵێت سەرکێشییەکی خۆشی کرد و هەوڵی دا ئیجازەی چوون بۆ دەرباری کارڵ ئاوگۆست وەربگرێت. ئەوسا ڕووداوێکی سەیر و چاوەڕواننەکراو ڕووی دا: گۆتەدەهری بوو، نامەیەکی بۆ دوکی مەزن نووسی: «ئەم مێشەکەرانە بێزارکەرە کەدیاریی دایکمەو ساڵەهایەبەردەوام ئازارمان دەدات، دیسان گەڕاوەتەوەو خەریکی فرتوفێڵەکەی جارانیەتی، کەلەگەنجیەتییەکەی دەوەشایەوە؛ باسی بولبول دەکات و وەک کەناری دەجیکێنێت. ئەگەر خاوەنشکۆ ڕێگەم بدات من وەک مامێکی سەختگر ناهێڵم لەوەزیاتر تووشی عەزییەتتان بکات. ئەگەر ئەوە نەکەم بۆ هەمیشەبەمێچکەمێچک و زمانی لووس خاوەنشکۆ ئازار دەدات».

شەش ساڵ دواتر دیسان بێتینا گەڕایەوەبۆ وایمار، بەڵام گۆتەڕێگەی ماڵی خۆی نەدا. بەراوردکردنی بێتینا بەمێشەکەرانەدوا گوتەیەکە کەلەو چیرۆکەماوەتەوە.

سەیرە، کاتێک گۆتەسکێچی پەیکەرەکەی لیّ وەرگرت، بڕیاری دا لەگەڵی ئاشت ببێتەوە. هەرچەندەحەزی لە دیداری نەبوو، بەڵام هەوڵی دا ئەوەندەی بکرێت (تەنانەت بەبۆنی ئەلکۆلیشەوە) بەڕووی خۆشەوە ئەو ئێوارەیەی لەگەڵ تێپەڕێنێت. ئەی کەواتە بۆچی ئێستا بڕیاری دابوو هەموو هەوڵ و کۆششەکەی بەبا بدات؟ ئەو

کەئەوەندەهوشیار بوو بەکراسێکی چرچولۆچەوەپێ نەنێتەنەمرییەوە، بۆچی لەپڕ ئەو ڕستەترسناکەی لەبارەی مێشەکەرانەوەنووسی کە خەڵک پاش سەد، یان سێسەد ساڵی تر، واتەکاتێک «فاوست» و «خەمەکانی وەرتەری گەنج» لە بیر دەچنەوە، سەرکۆنەی بکەن؟

پێویستەلەڕووپەڕەی ژیان بگەین:

تا ماوەیەکی زۆر پێمان وایەمردنمان ئەوەندە دوورەکەخۆی پێوەسەرقاڵ ناکەین. مردن شتێکی ون و نادیارە. ئەمەیەکەم قۆناغی شادی ژیانمانە.

بەڵام پاشان، لەپڕ بەرەوڕووی مردنمان دەبینەوەو ئیتر ناتوانین بیری لێ نەکەینەوە. ئیتر مردن لەگەڵماندایە و چونکەپەیوەندیی مەرگ و نەمریش وەک پەیوەندیی لۆڕل و هاردی نەپساوەیە، کەواتە دەتوانین بڵێین نەمریش لەگەڵماندایە. ئێمە، کاتێک لەوەگەیشتین کەنەمری لەگەڵماندایە، بێعۆقرەشوێنی دەکەوین، کەوای بۆ دەدوورین، بۆینباخی تازەی بۆ دەکڕین، دەترسین نەکات خەڵکی تر جل و بۆینباخمان بۆ هەڵبژێرن و هەڵبژاردنەکەشیان خراپ بێت. ئەمەئەو کاتەیەکە گۆتە بڕیار دەدا بیرەوەرییەکانی، کتێبی بەناوبانگی «شیعر و ڕاستی» بنووسێت، ئەو کاتەیەکەبانگی "ئێکرمان"ی فیداکار دەکات و ڕێگەی پێ دەدا «وتوویژ لەگەڵ گۆتە» بنووسێتەوە (ڕێکەوتی سەیری کاتەکان: هەر ئەو ساڵە، ١٨٢٣، بێتیناش سکێچی پەیکەرەکەی بۆ دەنێرێت)، ئەو پۆرترێتەجوانەکەلەژێر کۆنترۆل و چاودێریی خۆی بەرهەم دێت.

دوابەدوای ئەم دووهەم قۆناغەی ژیان، کە مرۆڤ ناتوانێت چاو لەمردن بتروکێنێت، قۆناغێکی دیکە، کورتترین و پڕنهێنیترین قۆناغ سەرهەڵدەدات. قۆناغێک کەزۆر نەناسراوەو شتێکی ئەوتۆی

لەبارەوەنەگوتراوە. لەم قۆناغەدا تواناکان چۆڕاییان دادێت و ماندووییەکی وێرانکەر باڵبەسەر کەسەکەدا دەکێشێت. ماندوویی: پردێکی بێدەنگ کەلە کەناری ژیانەوەبۆ کەناری مردن کێشراوە. لەم قۆناغەدا مردن ئەوەندەنزیکەکەمرۆڤ لەسەیرکردنی ماندوو دەبێت. لەم قۆناغەشدا دیسان مەرگ، وەک هەموو ئەو شتانەکەزۆر نزیک و ئاشنان، ون و نادیارە. پیاوێکی ماندوو لە پەنجەرەوەسەیری دەرەوەدەکات؛ سەرتووڵی دارەکان دەبینێت و بەهێوری ناویان دەبات: شابەڕوو، سپیدار، ئافرا. ناوەکان وەک خودی دارەکان جوانن. ئافرا بەرز و بڵیندە، وەک پاڵەوانێکەدەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕیبێت، یان وەک بڵێسەیەکەکەبە حەوادا فڕیبێت و لەوێ شکڵی وەرگرتبێت. ئافرا، ئاخ ئافرا. نەمریی وەهمێکی گاڵتەجاڕییە، وشەیەکی بۆشە، داوێکە"با" ڕاوی دەکات، ئەڵبەت ئەگەر لەگەڵ جوانیی ئافراییدا بەراوردی بکەین کەپیاوێکی ماندوو لە پەنجەرەوەسەیری دەکات. نەمری ئیتر بەهیچ شێوەیەک سەرنجی پیرەمێردێکی ماندوو ڕاناکێشێت.

پیرەمێردێکی ماندوو کەسەیری داری ئەفرا دەکات، کاتێک کتوپڕ ژنێک بێت بۆ لای و بیەوێت لەسەر کورسی دابنیشێت و لەناو دەرکەبە چۆکدا بێت و بۆچوونی درۆ و ساختەدەرببڕێت، چ هەڵوێستێکی دەبێت؟ ئەو بەخۆشحاڵییەکی زۆر و ورووژانی لەناکاوی سەرخۆشییەوە پێی دەڵێ: مێشەکەرانەی بێزارکەر.

من بیر لەو کاتە دەکەمەوەکەگۆتەدەستەواژەی «مێشەکەرانەی بێزارکەر»ی نووسیوە. بیر لەو چێژەدەکەمەوەکەبەهۆی ئەو نووسینەوەچەشتوویەتی. لەو کاتەدا دەیهێنمەپێشچاوی خۆم کەبەو بۆچوونەگەیشتووە: گۆتەلە هەموو ژیانیدا هەرگیز کارێکی نەکردووەکەپێی خۆش بێت. ئەو خۆی بەسەرپەرشتی نەمرییەکەی

خۆی دەزانی و ئەم بەرپرسیاریتییەکردبووی بە پیاوێکی فەرمیی ڕەقوتەق. ئەو لەشتی سەیری لاڕێ، هەرچەندەئەو شتانەبەتوندی بەرەو خۆیان ڕایان دەکێشا، دەتۆقا. کاتێک بۆخۆی کارێکی سەیر و نائاسایی دەکرد، دواتر هەوڵی دەدا بەشێوەیەک ڕێکی بخاتەوە کەلە بازنەی ئەو هاوسەنگییەزەریفە کەجاروبار بە جوانیی دەزانی، دەرنەچێت. دەستەواژەی «مێشەکەرانەی بێزارکەر» لەگەڵ کار و ژیان و نەمرییەکەی نەدەگونجا. ئەم وشانەئازادییەکی ڕەها بوون. کەسێک دەیتوانی ئەم وشانەبنووسێت کەلە قۆناغی سێهەمی ژیانیدا بێت؛ قۆناغێک کەنەتوانێت خزمەت بەنەمرییەکەی بکات و نەمریشی بە لاوەزۆر گرینگ و جیددی نەبێت. هەموو کەس ناگاتەئەم دوورترین سنوورە، بەڵام هەر کەس بیگاتێ دەزانێت لەوێ، هەر لەوێ، ئازادیی ڕاستەقینەدەست دەکەوێت.

ئەم بیرۆکانەبە مێشکی گۆتەدا تێپەڕین، بەڵام چونکەپیر و ئیختیار و ماندوو بوو شتەکانی لە بیر دەچووەوە، خێرا فەرامۆشی کردن.

## ١١

با وەبیر خۆمانی بێنینەوەکەسەرەتا بێتینا وەک منداڵێک چوو بۆ لای گۆتە. بیستوپێنج ساڵ لەوەودوا، مارسی ١٨٣٢، کاتێک بیستی گۆتە زۆر نەخۆشە، خێرا منداڵەکەی، کوڕێکی هەژدەساڵەی شەرمن کەناوی زیگمۆند بوو، نارد بۆ لای. ئەو کوڕە، بێ ئەوەبزانێت بۆچی، شەش ڕۆژ لە وایمار مایەوە، بەڵام گۆتەدەیزانی. بێتینا ئەو بالوێزەی تەنیا بۆ ئەوەناردبوو کە تێی بگەیەنێت مردن بەبێسەبرییەوەلەپشت دەرکەچاوەڕێیەتی و ئەویش دەیەوێت نەمرییەکەی لە دەستی خۆیدا ڕابگرێت.

پاشان مردن لە دەرکەوەهاتەژوور، گۆتە پاش حەفتەیەک بەربەرەکانێکردن، لە بیستودووی مانگی مارسدا کۆچی دوایی کرد. دوای چەند ڕۆژ بێتینا نامەیەکی بۆ سەرۆک مولەر، پارێزەر و سەروەسیەتی گۆتەنووسی: «بەدڵنیاییەوەمەرگی گۆتەکاریگەرییەکی لەسەر من داناوەکەفەرامۆش ناکرێت، بەڵام ئەم کاریگەرییە خەمبارانەنییە. من ناتوانم بە وشەهەموو ڕاستییەکەدەرببڕم، بەڵام پێم وایە ئەگەر بڵێم کاریگەرییەکی پڕشکۆیە، تا ڕادەیەک لەدەربڕینی نزیک بوومەتەوە».

ئێستا بە وردی سەرنج بدەنەئەو وشانەکەبێتینا بەکاری هێناون: کاریگەرییەکی نەوەک خەمبارانە، بەڵکو پڕشکۆ.

پاش ماوەیەک بێتینا داوای لەمسەرۆک مولەرەکرد هەموو ئەو نامانەی بۆ بنێرێت کە تا ئەودەمەبۆ گۆتەی نووسیبوو. کاتێک بێتینا

نامەکانی خوێندەوە، نائومێد بوو: هەموو چیرۆکەکەی لەگەڵ گۆتەلە پلۆتێک زیاتر نەبوو، پلۆتێک ڕەنگەبۆ شاکارێک، بەڵام پلۆتێک و ئەویش پلۆتێکی ناتەواو؛ بۆیە دەبوایەدەستبەکار ببێت. سێ ساڵ خەریکی پێداچوونەوەو پێ زیادکردن و نووسینەوەی نامەکان بوو. ئەو لە نامەکانی خۆی ڕازی نەبوو. بە نامەکانی گۆتەش دڵخۆش نەبوو. ئێستا کە دیسان دەیخوێندنەوە، لەو هەموو کەموکورتی و خۆپارێزی و تەنانەت هەندێک جاریش بێسەروبەرییەی نامەکان دەڕەنجا. گۆتەهەندێک جار بەشێوەیەک نامەی بۆ نووسیبوو کەپێدەچوو ئەو دەمامکەمندالانەی ئەوی قبووڵ کردبێت؛ لەوەدەچوو کۆمەڵێک وانەی ئاسانی بۆ کچەقوتابییەک نووسیبێت. بۆیەبێتینا ناچاربوو لەحن و ئیقاعی نامەکان بگۆڕێت: لەهەر کوێ گۆتەبە «دۆستی ئازیزم» ناوی بردبوو، کردی بە «ئازیزی دڵەکەم» و سەرزەنشتەکانیشی بەمەدح و ستایشی ژێرنامەکان خاو کردەوە و هەندێک ڕستەشی پێ زیاد کردن کەپەردەیان لەدەوری بێتینا وەک سەرچاوەیەکی ئیلهام بۆ شاعیرێکی عاشق، هەڵدەدایەوە.

ئەڵبەت بێتینا نامەکانی خۆی زیاتر گۆڕی. نەخێر، لەحن و ئیقاعی نامەکانی نەگۆڕی. لەحنی نامەکان لەجێی خۆیاندا بوون. ئەو، بۆ نموونە(بۆ سڕینەوەی مەودای زۆری نێوان نامەنووسینەکانیان، کەپێدەچوو بەردەوامبوونی خۆشەویستییەکەیان ڕەت بکاتەوە) بەروارەکانی گۆڕی. زۆر ڕستەی نەشیاوی لەنامەکان سڕیەوە(وەک ئەو ڕستەکەداوای لە گۆتە کردبوو نامەکانی پیشان کەس نەدات)، هەندێک ڕستەی دیکەی لێ زیاد کردن، بارودۆخەجۆراوجۆرەکانی دراماتیزەکرد، بۆچوونی لەسەر سیاسەت، هونەر، بە تایبەت مۆسیقا و بتهۆڤن، قوول و بەربڵاوتر کرد.

بیتینا ساڵی ١٨٣٥ کتێبەکەی تەواو کرد و بەناوی «نامەگۆڕینەوەی گۆتەلەگەڵ منداڵێک» بڵاوی کردنەوە. هیچ کەس تا ساڵی ١٩٢٠ کەئەسڵی نامەکان دۆزرانەوەو بڵاوکرانەوە، گومانی لەڕاستیی نامەکان نەکرد.

بەداخەوە! بۆچی لە کاتی خۆیدا ئەو نامانەی نەسووتاند؟

خۆتان بخەنەجێی ئەو: سووتاندنی ئەو بەڵگەو داکیۆمێنتە تایبەتییانەکەبە لاتانەوەبەرێزن کارێکی ئاسان نییە، وەک ئەوەوایەکە دڵنیابیت زۆر لێرەنامێنیتەوەو ڕەنگەسبحەینێ بمریت؛ بۆیەتۆ فەوتاندنی ئەو بەڵگانەلەئەمڕۆوەبۆ ڕۆژێکی تر دوادەخەیت و پاشان ئەو ڕۆژە دێت کە ئیتر زۆر درەنگ بووە.

مرۆڤ حسێب بۆ نەمریی دەکاتەوە، بەڵام فەرامۆشی دەکات کەحسێب بۆ مردنیش بکاتەوە.

# ١٢

ڕەنگەئێستا کەکۆتایی ئەم سەدەیە دیمەنێکی لەبارمان دەخاتەپێشچاو، بتوانین بەخۆمان بڵێین: گۆتەئەو کەسەیەکەلەناوەندی مێژووی ئەورووپادا ڕاوەستاوە. گۆتە: ناوەندی مەزن. ناوەند نەک بەمانای ئەو خاڵەترسنۆکەکەخۆی لەزێدەڕۆیی و کەمتەرخی دەپارێزێت، نا، ناوەندێک کەزێدەڕۆیی و خەمساردی لەهاوکێشییەکی ئەوەندەسەیردا ڕادەگرێت کەئەورووپا هەرگیز بەخۆیەوەنەیبینیوە. گۆتەلەتافی گەنجیدا کیمیاگەریی خوێندووەو پاشان بووەبەیەکێک لەزانا هەرەگەورەمۆدێرنەکان.

گۆتەمەزنترین کەسی ئاڵمان و لەهەمان کاتیشدا پیاوێکی ئەورووپی و دژی نیشتمانپەروەری بوو. گۆتەپیاوێکی ئەنترناسیۆناڵ بوو کەلە هەموو ژیانیدا بەدەگمەن لەزێدەکەی، وایماری بچووک، چووبووە دەر. گۆتەپیاوی سروشت و پیاوی مێژوو بوو. لە عەشق و خۆشەویستیشدا وەک ڕۆمانتیکەکان بێپەروا و زۆر شتی دیکەش بوو.

جا با بگەڕێینەوە بۆ لای ئەگنێس لەناو مەسعەدە شەپڵە لێدراوەکە. ئەو ئەگەرچی پسپۆڕی سایبرنێتیک بوو، بەڵام هیچ شتێکی لەچۆنییەتی کارکردنی ئەو مەکینە نەدەزانی. میکانزمی ئەو مەکینەشی وەک هەموو شتەکانی دیکە کەبەردەوام کاری پێ دەکردن، هەر لە کۆمپیوتەرە بچووکەکەی لای تەلەفۆنەکە وەبگرەتا قاپشۆرە کارەباییەکە، بە لاوە سەیر و غەریب بوو.

بە پێچەوانەوە، گۆتەلەو مەودا کورتەی مێژوودا ژیا کەهەرچەندەتەکنۆلۆژیا تا ئاستێک ژیانی خەڵکی ئاسان کردبوو، بەڵام

کەسێکی خوێندەوار هێشتا دەیتوانی ئەو ئامێرانەبناسێت کەبەکاری دەهێنان. گۆتەدەیزانی ماڵەکەی چۆن و بەچ کەرەسەیەک سازکراوە، دەیزانی چرا نەوتییەکەی چۆن و بۆچی ماڵەکەی ڕووناک دەکاتەوە، ئەو ئاگاداری بنەمای ئەو تەلەسکۆپەبوو کەخۆی و بێتینا لەوێوەسەیری ئەستێرەی ژووپیتەریان دەکرد. هەرچەندەخۆی نەیدەتوانی نەشتەرگەری بکات، بەڵام بەشداریی چەند نەشتەرگەرییەکی کردبوو، کاتێکیش نەخۆش دەکەوت دەیتوانی بەو وشانەبدوێت کەدوکتۆر، یان کەسێکی تایبەتمەندی بواری پزیشکی پێی دەدوان. دنیای ئامێرەتەکنەلۆژییەکان بۆ ئەو کراوەبوو، تێی دەگەیشت. ئەمە دەرفەتی گەورەی گۆتەبوو لەناوەندی مێژووی ئەوروپادا، دەرفەتێک کەهاواری حەسرەت و دڵتەنگیی غوربەتی کەسێکی بەرز کردبووەوەکەلەلەقەلەقی توندی مەسعەدێکدا گیری خواردبوو.

کاری بیتهۆڤن ئەو کاتەدەست پێدەکات کەناوەندییەتی گۆتەکۆتایی دێت. ئەمە دەرفەتێکی کورتەکە دنیا خەریکەوردەوردە زەلالی و شەفافیی خۆی دەدۆڕێنێت، تەڵخ و تاریک دەبێت، لەجاران زیاتر دەکەوێتە تەمومژەوەو لە ناخی نهێنییەکان ڕۆدەچێت. لەکاتێکدا مرۆڤ، کە دنیا خەیانەتی لێکردووە، بەرەو خودی خۆی، بەرەو ونبووەکەی، بەرەو خەونەکانی، بەرەو ڕاسانەکانی هەڵدێت و ڕێگە بەدەنگەدەروونییەکانی خۆی دەدا کە ڕی بکەن تا دەنگەدەرەکییەکان نەبیستێت. ئەو هەراوهاواری دەروونە، بە لای گۆتەوەوەک دەنگێکی بێزارکەرە. گۆتەلەهەراوهاوار بێزار بوو. ئەمەڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە. ئەو تەنانەت تاقەتی بیستنی سەگوەڕینی ناو باخێکی دووریشی نەبوو. دەڵێن گوایەڕقی لە مۆسیقا بووە. ئەوەڕاست نییە، ئەو ڕقی لەئۆرکێسترا بوو. "باخ"ی

پێ خۆش بووە، چونکەباخ هێشتا مۆسیقای بە لێکدانی شەفافی نۆتەسەربەخۆکان دەزانی کەبە سانایی لێک جودادەکرانەوە، بەڵام لەسەمفۆنیاکانی بتهۆڤندا دەنگی ئامێرەتاکەکان لەتێکەڵەی هەراوهاوار و شیوەندا دەتوانەوە. گۆتەتاقەتی گوێگرتن لەگرمەگرمەی ئۆرکسترای نەبوو، هەروا کە لەدەنگەدەنگی شیوەنی رۆحیش بێزار بوو. هاورێکانی بێتینا کەسەر بەنەوەی نوێ بوون، چاویان لەگۆتەیەکی ئاسمانی بوو کەهەردوو گوێچکەی خۆی گرتووەو بەناچاری سەیریان دەکات. ئەوان نەیاندەتوانی لەم کارەی خۆش ببن، بۆیەوەک دوژمنی رۆح و راسان و هەستیاری، هێرشیان دەکردەسەر. بێتینا خوشکی برینتانۆی شاعیر و هاوسەری ئارنیمی شاعیر بوو، رێزی لەبتهۆڤن دەگرت. ئەو سەر بە نەوەی رۆمانتیک و هاوکاتیش دۆستی گۆتەبوو. کەس لەهەلومەرجێکی ئاوادا نەبوو: ئەو وەک شاژنێک بوو کەحوکمڕانیی بەسەر دوو قەڵەمڕەودا دەکرد.

کتێبەکەی بێتینا رێزلێنانێکی بەشکۆیەلەگۆتە. نامەکانی گۆرانیی عەشق و خۆشەویستین بۆ ئەو. ئەوەراستە، بەڵام لەبەر ئەوەکەهەموو کەس ئاگاداری ئەو رووداوەن کەخانمەکەی گۆتەچاویلکەکەی فرێداوەتەسەر عەرز و شکاندوویەتی و بەچیرۆکی ئەو خەیانەتە قێزەونەدەزانن کە گۆتە لەپێناوی ئەو کیوەگۆشتەدا بەو منداڵە خۆشەویستەی کردووە، ئەو کتێبە، هاوکات (تا رادەیەکی زۆر) وانەیەکی قوتابخانەی خۆشەویستیشەکە پێشکەش بەشاعیرێکی مردوو کراوە. بەشاعیرێک کەکاتێک بەرەورووی ئەو جۆشوخرۆشە مەزنە دەبێتەوە، وەک ناپیاوێکی خۆشگوزەران دەجوولێتەوە و لەبەر پێی ئاسوودەیی بێنرخی ژیانی ژنومێردایەتیدا، عەشق دەکات بەقوربانی. کتێبەکەی بێتینا هەم رێزلێنانەو هەم بێرێزی.

## ١٣

ئەو ساڵەکەگۆتە مرد، بێتینا نامەیەکی بۆ "کۆنت هێرمان ڤۆنپوکلەر موسکاو"ی هاوڕێی نووسی و ئەو ڕووداوەی بەوردی بۆ گێڕایەوەکەهاوینی بیستودوو ساڵ لەوەوپێش ڕووی دابوو. بێتینا گوتی ڕاستەوخۆ ئەو چیرۆکەلە زمانی بتهۆڤنەوەدەگێڕێتەوە. ساڵی ١٨١٢ (دەمانگ دوای ڕۆژانی ڕەشی چاویلکەشکاوەکە) بتهۆڤن بۆ چەند ڕوژێک چوو بۆ سەرچاوەی ئاوەکانزاییەکەی "تەپلیتز" و لەوێ بۆ یەکەمجار چاوی بەگۆتەکەوت. ئەوان ڕۆژێک پێکەوەڕۆشتنەدەر، بەشەقامێکدا پیاسەیان دەکرد کەلەناکاو لەگەڵ شازادەخانم و بنەماڵەو هاوڕێکانی بەرەوڕوو بوونەوە. گۆتەهەر کەچاوی بەئەوان کەوت ئیتر گویی لەقسەکانی بتهۆڤن نەگرت، بەرەو قەراغی جادەکەڕۆیشت و بەڕێزەوەکڵاوەکەی لەسەر هەڵگرت، بەڵام بتهۆڤن، بەپێچەوانەوە، کڵاوەکەی زیاتر بۆ ناوچاوانی داکێشا، خێسەیەکی وەهای کرد کەبرۆ پڕەکانی پێنج سانتیمەتر هەڵکشان و بێ ئەوەهەنگاوی شلتر بکاتەوە، لەڕۆشتنەکەی بەردەوام بوو. ئێستا نۆبەی شازادەخانم و هاوڕێکانی بوو کە ڕاوەستن و بەڕێزەوەخۆیان لابدەن. بتهۆڤن کاتێک کەلە پێشیانەوەتێپەڕی، ئاوڕی دایەوەو چاوەڕێی گۆتەی کرد. پاشان پێی گوت کەچۆن بیر لەو ڕەفتارەنۆکەرانەو ماستاوچییانەی دەکاتەوە. بتهۆڤن وەک قوتابییەکی چەتوون سەرکۆنەی کرد.

ئایا ئەمەبەڕاست ڕووی دابوو؟ ئایا بتهۆڤن بۆخۆی ئەمەی هەڵبەستبوو؟ یان هەر کەمێک ئاو و خوێکەی زیاد کردبوو؟ یان

بێتینا ئاو و خوێکەی زیاد کردبوو؟ یان بێتینا هەر هەمووی هەڵبەستبوو؟ کەس هەرگیز بەمانەنازانێت، بەڵام شتێک تەواو ڕوون و ئاشکرایە: کاتێک بێتینا نامەی بۆ پوکلەر موسکاو نووسی، دەیزانی ئەمەنمایشێکی زۆر بەنرخە. تەنیا ئەم چیرۆکەدەتوانێتماناى ڕاستەقینەی خۆشەویستییەکەی بۆ گۆتە ئاشکرا بکات، بەڵام چۆن دەکرێ پیشانی بدات؟ بێتینا لە هێرمان پوکلەر موساوی پرسی:

«تۆ ئەم چیرۆکەت پێخۆشە؟ Kannstu du Sie Brauchen دەتوانی سوودی لێ وەربگریت؟؟»

کۆنت بەتەما نەبوو سوودی لێ وەربگرێت، بۆیەبێتینا بیری لە ئیمکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی نامەکانیان کردەوە، بەڵام دواتر شتێکی زۆر چاکتری بۆ ڕێکەوت: ساڵی ١٨٣٩ بێتینا نامەیەکی لەگۆڤاری "ئاتەنائوم"دا بڵاوکردەوەکەخودی بتهۆڤن ئەم چیرۆکەدەگێڕێتەوە! نوسخەی ئەسڵی ئەو نامەیەلەبەرواری ١٨١٢، هەرگیز نەبیندراوەتەوە. تەنیا شتێک کەماوەتەوەئەو نوسخەیە کەبەدەسخەتی بێتینا نووسراوە. ئەم نامەهەندێک وردەکاری تێدایە(وەک بەروارەکەی) کەنیشانی دەدا بتهۆڤن هەرگیز ئەوەی نەنووسیوە، یان لانیکەم بەو شێوەنەینووسیوەکە بێتینا نوسخەی لەبەر هەڵگرتووەتەوە. هەرچۆنێک بێت، ئەو نامە ساختەبێت، یان نا، هەموو کەس چیرۆکەکەی پێ خۆش بوو، ناوبانگی دەرکرد. پاشان لەپڕێکدا هەموو شتێک ئاشکرا بوو: ئەوەبەڕێکەوت نەبوو کەگۆتەلەپێناوی ئەو کێوەگۆشتەدا وازی لەو عەشقەگەورەی هێنابوو: کاتێک بتهۆڤن وەک یاخییەک کڵاوەکەی بۆ سەر ناوچاونی داکێشابوو، دەستی خستبووەپشتی و بە شەقاوی بڵند بەرەو پێش دەچوو، گۆتەخزمەتکارێک بوو کەلە قەراغ جادەکەبە داماوییەوەکڕنۆشی دەبرد.

## ١٤

بێتینا مۆسیقای دەخوێند. ئەو تەنانەت چەند پارچەئاوازی دانابوو، خاوەنی ژێرخانێکی مۆسیقایی وەهاش بوو کەلەشتەجوان و تازەکانی مۆسیقای بتهۆڤن تێبگات. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، من ئەم پرسیارە دەکەم: ئایا ئەوەمۆسیقای بتهۆڤن و ئاوازەکانی ئەو بوون کەبێتینایان سیحر کردبوو، یان شتێک کە ئەم مۆسیقایەدەیناساند؟ یان بەدەربڕینێکی تر، نزیکیی شاراوەی لەو چەمک و ئارەزووانەکەچەمک و ئارەزووی بێتینا و جیلەکەی بوو؟ ئایا عەشق بەهونەر بەڕاست بووە، یان هەیە؟ ئایا ئەم عەشقە تەنیا وەهمێک نییە؟ کاتێک لێنین ڕایگەیاند کەسۆناتای "ئاپاسیۆناتا"ی لەهەموو شتێک زیاتر پێ خۆشە، بەڕاست چیی پێ خۆش بوو؟ ئەو چیی دەبیست؟ مۆسیقا؟ یان دەنگێکی پڕشکۆ کەئەوی بیری هەڵچوونەبەهەیبەتەکەی ڕۆحی خۆی دەخستەوە. داوای خوێن، برایەتی، ئیعدام، دادپەروەری و بابەتی موتڵەق و ڕەها؟ ئایا ئەو لە بیستنی خودی نەغمەو ئاوازەکان شاد دەبوو، یان لەو بیرۆکانەکەبەهۆی ئەو نەغمانەوە چێ دەبوون، کەبێگومان هیچ پەیوەندییەکیان بە هونەر و جوانییەوەنییە؟ با بگەڕێینەوەبۆ چیرۆکەکەی بێتینا. ئایا بێتینا بتهۆڤنی موزیسیەنی خۆش دەویست، یان بتهۆڤنی نەیاری گۆتە؟ ئایا خۆشەویستیی ئەو بۆ مۆسیقای بتهۆڤن لەو جۆرەخۆشەویستییەهێمنەیەکەبەرەو خوازەیەکی جادوویی، یان هارمۆنیای نێوان دوو ڕەنگ لە تابلۆیەکدا ڕامان

دەکێشێت؟ یان لەو جۆرەپر جۆشوخرۆش و هەژانەتوندوتیژەیەکەبەرەو چوون بۆ ناو حیزبەسیاسییەکانمان دەبات؟ هەرچی بوو (ئێمەهەرگیز لەڕاستییەکەناگەین) بێتینا وێنەیەکی بتهۆڤنی پێشانی دنیا دا کەکڵاوەکەی تا خوار ناوچاوانی داکێشاوەو بەرەو پێشەوەهەنگاو دەنێت و ئەم وێنەش لەهەموو سەدەکاندا بەردەوام بەرەو پێش دەچێت.

ساڵی ١٩٢٧، سەد ساڵ پاش مەرگی بتهۆڤن، گۆڤاری بەناوبانگی ئاڵمانی،Die Literarische Welt لە مۆزیسیەنەناودارەکانی ئەم سەردەمەی پرسی کەڕایان بەرامبەر بتهۆڤن چییە؟ سەرنووسەرەکان بیریان لەوەنەکردبووەوەکەئەم پرسیارەبۆ پیاوێک کەکڵاوەکەی بۆ ناوچاوانی داکێشاوە، وەک ئەوەیەکەلەپاش مردنی بکوژرێت. "ئاوریک"، یەکێک لەو شەش مۆزیسیەنەی پاریس، لەبری هەموو نەوەکەی گوتی: ئەوان ئەوەندە گوێ بە بتهۆڤن نادەن کە تەنانەت بەشایانی ڕەخنەلێگرتنیشی بزانن. ئایا دەکرێ ڕۆژێک ئەویش، وەکو "باخ" لەسەد ساڵی ڕابوردوودا، دیسانەوەکەشف بکرێت و هەڵسەنگێندرێت؟ ئەمەپرسیارێکی نابەجێ و گاڵتەجارییە! "یاناچێک"یش ددانی بەوەدا نا کە هەرگیز بەهۆی کارەکانی بتهۆڤنەوە تووشی هەیەجان نەبووە. هەروەها کۆی قسەکانی "ڕاڤل"یش ئەمەبوو کەگوتی: ئەویش بتهۆڤنی خۆش ناوێت، چونکەناوبانگەکەی هیچ پەیوەندییەکی بە مۆسیقاکەیەوەنییەکەبێگومان ناتەواوە، بەڵکو پەیوەندیی بەو ئەفسانەئەدەبییەوەهەیەکەبۆ ژیانی خۆی سازکراوە.

ئەفسانەی ئەدەبی. بەبۆچوونی ئێمە، ئەم ئەفسانەپەیوەندیی بە دوو کڵاوەوەهەیە: یەکێک لەم کڵاوانە،تا سەر ناوچاوان و برۆ پەرەکانی خۆی داکێشراوە، کڵاوەکەی دیکەش بە دەست

کەسێکەوەیەکەتا ئەژنۆ بە چۆکدا هاتووە. تەڕدەستەکان حەزدەکەن یاری بەکڵاو بکەن؛ ئەوان هەندێک شت لەکڵاودا دەشارنەوە، یان پۆلێک کۆتر لەناو کڵاوەوەدەفڕێنن. بێتینا لە کڵاوەکەی گۆتەدا هەندێک باڵندەی ناحەزی فڕ دا و لەکڵاوەکەی بتهۆڤندا (حەتمەن بەهۆی بێئاگاییەوە) مۆسیقاکەی ئەوی ون کرد. بێتینا شتێکی بۆ گۆتە فەراهەم کرد کەبە "تیکۆبراهە"درا و بە "جیمی کارتەر"یش دەدرێت: "نەمریی گاڵتەجاڕی". بەڵام نەمریی گاڵتەجاڕی لە بۆسەی هەموو کەسێکدایە. بە بۆچوونی "ڕاڤل"، بتهۆڤن بەکڵاوی داکێشراوەوەبۆ سەر ناوچاوانی، لەگۆتەگاڵتەجاڕترەکەکڕنۆشی بردووە.

بەرەنجامی ئەم قسانەئەوەیەکەهەرچەندەکەسەکان دەتوانن پێشوەخت گەلاڵەبۆ نەمریی خۆیان دابڕێژن و ئیدارەی بکەن، بەڵام ئەم نەمرییەهەرگیز بەو شێوەنییەکەبۆخۆیان دەیانەوێت. کڵاوەکەی بتهۆڤن نەمر بوو. ئەوەپلانێکی سەرکەوتوو بوو، بەڵام کەس ناتوانێت پێشوەخت ئەوەدیاری بکات کەکڵاوی نەمر لەداهاتوودا چ مانایەکی دەبێت.

## ١٥

هەمینگوای گوتی:

«دەزانی یوهان، ئەوان دەیانەوێت بوختان بۆ منیش بکەن. ئەوان لەبری ئەوەی کتێبەکانم بخوێننەوە، خەریکن کتێبم لەسەر دەنووسن. دەڵێن گوایەمن ژنەکانم خۆش نەویستووە، ئەوەندەی پێویستە گرینگیم بەکوڕەکەم نەداوە، مستم لە دەمی ڕەخنەگرێک سرەواندووە. دەڵێن من درۆم کردووە، پیاوێکی ڕاستگۆ نەبووم، لووتبەرز و لەخۆڕازی بووم. پیاوسالار بووم. دەڵێن من گوتوومەدووسەد و سی برینی شەڕم بەلەشەوەیە، لە کاتێکدا ڕاستییەکەی دووسەد و دە برینە. دەڵێن من خۆم فەوتاندووە، گوێم بەقسەی دایکم نەداوە».

گۆتەگوتی:

«ئەمە نەمرییە. نەمری بەمانای دادگایی ئەبەدییە».

«ئەگەر بە مانای دادگایی ئەبەدییە، کەواتە دەبێ دادوەرێکی شایستەش بێت، نەک ژنەمامۆستایەکی بێمێشک کەشووڵێکی بە دەستەوەیە».

«شووڵێک بەدەست ژنەمامۆستایەکی بێمێشکی گوندییەوە! ئەوەیەدادگایی ئەبەدی. بۆ تۆ چاوەڕێی چیت دەکرد، ئێرنست؟»

«من چاوەڕێی هیچم نەدەکرد. هیوادار بووم لانیکەم لەدوای مردنەکەم بە ئاسوودەیی بژیم».

«تۆ بۆ ئەوەی نەمر بێت، هەرچیت پێ دەکرا کردت».

«قسەیەکی بێمانایە. من بێجگە لەکتێبنووسین هیچی دیکەم نەکردووە».

گۆتە پێکەنی:

«بەڵێ ڕاستە، تۆ هەر کتێبت نووسیوە!»

«من ئەوەم پێ ناخۆش نییەکەکتێبەکانم نەمر بن. من کتێبەکانم بەشێوازێک نووسیوەکەکەس ناتوانێت یەک وشەیان لێ بگۆڕێت و لەبەرامبەر هەموو جۆرەدوژمنایەتییەک بەرگری لەخۆیان دەکەن، بەڵام بۆخۆم، وەک مرۆڤێک بە ناوی ئێرنست هەمینگوای، بەقەدەر پوولێکیش بەهام بەنەمری نەداوە!»

«من چاک لە قسەکانت دەگەم، ئێرنست، بەڵام دەبوایە بەزیندوویی لەوەزیاتر ئاگات لە خۆت بوایە، ئێستا ئیتر درەنگ بووە».

«ئاگام لە خۆم بوایە؟ تۆ خەریکی ئاماژەبە فشەکانم دەکەیت؟ من ئەوەت بۆ دەسەلمێنم کەبەگەنجی زۆرم مەدحی خۆم کردووە. حەزم دەکرد لە لای خەڵک خۆم هەڵکێشم. چێژم لەو چیرۆکانەوەردەگرت کەلەبارەی منەوەدەگوتران، بەڵام بڕوا بکەمن ئەوەندەپیاوێکی سەیر نەبووم کەئەو فشانەبۆ نەمری بکەم! ئەگەر ڕۆژێک بمزانیایەهەموو ئەم شتانەبۆ نەمری بووە، دەتۆقام. لەوەودوا دەبوایەهەزاران جار بەخەڵک بڵێم کە واز لەژیانی من بێنن، بەڵام هەرچی زیاتر دەپاڕامەوە، خراپتر دەبوو. من چووم بۆ کوبا تا خۆمیان لێ بشارمەوە. کاتێک خەڵاتی نۆبێلیان پێ دام، نەچووم بۆ ستۆکهۆڵم. بڕوا کەمن بەقەدەر پوولێکی ڕەش بەهام بەنەمری نەداوە. ئێستا شتێکی دیکەشت پێ دەڵێم: ئەو ڕۆژەکەزانیم کەوتوومەتەچنگی نەمرییەوە، ئەوەلە خودی مردنیش زیاتر تۆقاندمی. پیاو دەتوانێت کۆتایی بەژیانی خۆی بێنێت، بەڵام ناتوانێت

کۆتایی به نەمرییەکەشی بێنێت. کاتێک نەمری سوار پاپۆڕەکەیت بکات، ئیتر ناتوانی لێی دابەزیت، تەنانەت ئەگەر بەگوللەش خۆت بکوژیت، دیسان هەر لەسەر پاپۆڕەکەدەمێنیتەوەو ئەمەش زۆر ترسناکە. زۆر ترسناکەیوهان. من لەسەر پاپۆڕەکە مردبووم و چاوم لە چوار ژنەکەم بوو کەلە دەورم کۆبووبوونەوەو ئەو شتانەیان یادداشت دەکرد کەلەسەر من دەیانزانی. کوڕەکەشم لە پشتیانەوەڕاوەستابوو، ئەویش هەر شتی دەنووسی. ئەو خانمەپیرە، 'گێرترود ستاین'یش لەوێ بوو، دەینووسی. هەموو هاوڕێکانیشم لەوێ بوون و ئەو نهێنی و بوختانانەیان ئاشکرا دەکرد کەلەبارەی منەوەبیستبوویان. لەپشت هەمووشیانەوە، سەد ڕۆژنامەوان بە مایکەکانیانەوەپاڵیان بە یەکرتەوە دەنا و خێڵی مامۆستایانی زانکۆش لەهەموو ئەمریکا سەرقاڵی ئەوەبوون کەلەکتێبەکانیاندا پۆلێنبەندی و شیکاریی ئەم شتانەبکەن.

## ١٦

هەمینگوای هەڵەرزی و گۆتە قۆڵی گرت:

«لەسەرخۆ بە، ئێرنست! لەسەرخۆ بە هاوڕێ گیان! من لە تۆ دەگەم. ئەم قسانەت خەونێکم بیردەخەنەوە. ئەوە دواهەم خەونم بوو، لەوەودوا ئیتر خەونم نەدی و ئەگەر دیبێتیشم ئەوەندەتێکەڵوپێکەڵ بوو کەنەمتوانی لە ڕاستییەکان جودای بکەمەوە. نواندنێکی بچووکی بووکەڵەیی بهێنەپێشچاوی خۆت. من لەپشت دیمەنەکەم، کۆنترۆڵی بووکەڵەکان دەکەم و دەقەکەدەخوێنمەوە. نواندنەکەشانۆی فاوستە؛ فاوستەکەی من. ئایا تۆ دەتزانی ئەگەر فاوست بە نواندنێکی بووکەڵەی بپیشان بدرێت دەگاتەترۆپکی جوانیی خۆی؟ هەر بۆیەمن زۆر خۆشحاڵ بووم کە هیچ ئەکتەرێکی لێ نەبوو. بە تەنیا دەقەکەم دەخوێندەوەکە ئەو ڕۆژەلەجاران خۆشتر بوو. لەپڕ چاوم بە کورسییەکان کەوت و دیتم هۆڵی نواندنەکە تەواو چۆڵە. سەیرم هاتێ. ئەی بینەرەکان لە کوێن؟ ئایا فاوستەکەی من ئەوەندەبێزارکەر بووەکە خەڵک وازیان لەبینینی هێناوەو گەڕاونەتەوەبۆ ماڵەکانیان؟ ئایا من تەنانەت ئەوەندەشم نەهێناوەکە بەهوولێکردن بێڕێزیم پێ بکەن؟ بەسەرسووڕمانەوەگەڕامەوەو لەپڕێکدا لە جێی خۆم وشک بووم: من چاوەڕێ بووم خەڵکەکە لەناو هۆڵەکەدا بن، بەڵام ئەوان لەپشت شانۆکەبوون و بە چاوی دەرتۆقیوی فزوولەوە سەیری منیان دەکرد. کە نیگامان لێک هەڵەنگوت، چەپڵەیان بۆ لێدام. ئەوسا زانیم

ئەوان حەزیان لەفاوستەکەی من نییە و ئەوەی کە بەتەما بوون ببینن بووکەڵەکان نەبووە، بەڵکو خۆم بووم! فاوست نەبووە، گۆتەبووە! پاشان لەپڕ هەستی تۆقین، ئەو هەستەکە تۆ ساتێک لەوەوپێش باست کرد، بەسەر مندا زاڵ بوو. هەستم کرد ئەوان بەتەمان شتێک بڵێم، بەڵام من نەمدەتوانی. قوڕگم وشک بووبوو. بووکەڵەکانم دانا و لەسەر تەختەی ڕووناکی شانۆکە، کە کەس سەیری نەدەکرد، فڕێم دان. هەوڵم دا بە ویقار دەربکەوم. ئارام بەرەو شوێنی جلەکان، کە کڵاوەکەمی لێ هەڵواسرابوو، چووم. کڵاوەکەم لەسەر کرد و بەبێ سەیرکردنی ئەو هەمووەداواکارەی سەرقاڵی، لە شانۆکە ڕۆشتمەدەر و بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە. هەوڵم دەدا سەیری ڕاست و چەپ و بە تایبەت پشتەوەی خۆم نەکەم، چونکەدەمزانی خەریکن بە دوامدا دێن. چرایەکی نەوتیم دۆزییەوە و هەڵم کرد. بە دەستی لەرزۆکەوەچراکەم هەڵگرت و بەرەو ژووری کارەکەم چووم. هیوادار بووم کۆمەڵەبەردەکانم یارمەتیم بدەن ئەو ڕووداوەلە بیر بکەم. بەڵام بەر لەوەی دەرفەتم ببێت چراکەلەسەر مێزەکەدابنێم، چاوم بە پەنجەرەکەکەوت. ئەوان ڕوومەتیان بە شیشەکەوەنووساندبوو. ئەوسا زانیم کە من هەرگیز لە چنگی ئەوان ڕزگار نابم، هەرگیز، هەرگیز. زانیم چراکەتیشکی لەڕوومەتم گرتووە، بەچاوەدەرتۆقیوەکانیاندا زانیم کەلە من وردبوونەتەوە. چراکەم کووژاندەوە. دەمزانی کەنەدەبوایەئەوەبکەم، ئێستا ئەوان تێگەیشتبوون کەهەوڵ دەدەم خۆم لەچاویان بشارمەوە، کەمن لەوان دەترسم و ئەمەش زیاتر هانی دەدان. ئێستا لە خۆم زیاتر دەترسام. بەرەو ژووری خەوتنەکەم هەڵاتم. مەلافەی سەر جێوبانەکەم کۆکردەوەو بەسەر خۆمدا دا. لە سووچی ژوورەکە ڕاوەستام و خۆم بە دیوارەکەوە نووساند.

## ١٧

هەمینگوای و گۆتەخەریکن بە جادەکانی ئەو دنیادا دەگەڕێنەوەبۆ دواوەو ئێوەلێم دەپرسن مەبەستم چی بوو کەئەم دوانەم پێکەوەهێنا. ڕاستە، ئەم دووانە هیچ پەیوەندی و شتێکی هاوبەشیان پێکەوەنییە! کەواتەبۆ؟ باشەئێوەپێتان وایە گۆتە لەو دنیایەی دیکە پێی خۆشەلەگەڵ کێ کات بەسەر ببات؟ لەگەڵ "هێردر"، لەگەڵ "هۆلدەرلین"، لەگەڵ "بێتینا"، یان "ئاکرمان"؟ ئێستا بیر لە ئەگنێس بکەنەوە، بیر لەو ترس و تۆقینەی بکەنەوەکەپێی وابوو ڕەنگەجارێکی دیکەش زەنازەنای دەنگی ئەو ژنانە ببیستێتەوەکەڕۆژانی شەممەلەساونا دەیبیست! ئەو حەزی نەدەکرد لەپاش مردنی لەگەڵ پاول، یان بریژیت بێت. ئەی کەواتەبۆچی دەبێ گۆتەحەزبکات لەگەڵ هێردەر بێت؟ من، ئەگەرچی بوختانیشە، پێتان دەڵێم کە ئەو تەنانەت پێی خۆش نییەلەگەڵ "شیللەر"یش بێت. ئەو دەمەکەهێشتا زیندوو بوو، شتی ئاوای پێ خۆش نەبوو، چونکەئەم ئەنجامە خەمبارەی لێ دەکەوتەوەکەلەژیانیدا هاوڕێیەکی گەورەی نەبووە. بێگومان شیللەر بۆ ئەو ئازیزترین کەس بوو، بەڵام وشەی "ئازیزترین" تەنیا بەو مانایەیەکەئەو بە لایەوەلەخەڵکی دیکەئازیزتر بووە. ئەگەر بە ئاشکرا بدوێین، خەڵکی دیکەهەرگیز ئەوەندەبۆی ئازیز نەبوون. ئەوان هاوسەردەمی بوون، بەڵام بۆخۆی ئەوانی هەڵنەبژاردبوو. ئەو تەنانەت "شیللەر"یشی هەڵنەبژاردبوو. ئەو کاتێک زانیی کەلەهەموو ژیانیدا ئەوان بە دەوروبەریەوەدەبن، نیگەران بوو.

هیچی پێ نەدەکرا. دەبوایەلەگەڵیان ڕابێت، بەڵام بۆ دەبێ لەپاش مردنیشی لەگەڵ ئەوان بێت؟

کەواتەمن تەنیا لەبەر خۆشەویستیی ڕاستگۆیانەم بۆ گۆتە، بەخەیاڵ کەسێکم لەلای داناوە کەزۆری خۆشدەویست. (ئەگەر لەبیرتان چووەتەوە، دیسان وەبیرتان دێنمەوەکە گۆتە لە هەموو ژیانیدا شەیدای ئەمەریکا بوو)، کەسێک کەوەک گرووپی ڕۆمانتیکەڕەنگپەڕیوەکان نەبوو کەبەر لەمردنەکەی خەریکبوون بەسەر ئاڵماندا زاڵ دەبوون. هەمینگوای گوتی:

«دەزانی یوهان، من بەختەوەرم کە دەتوانم لەگەڵ تۆ بم. تۆ لای خەڵک ئەوەندەبەڕێزیت کەلەبەرامبەرت هەڵدەلەرزن. تەنانەت ژنەکانی من و "گێرترود ستاین"ی پیریش کە چاویان بە تۆ دەکەوێت لەڕێگەکەیان لا دەدەن (بەرەر ڕووت دێن)».

پاشان قاقا پێکەنی.

«ڕەنگە لەبەر ئەم جلوبەرگەسەیروسەمەرەت بێت کەوەک داهۆڵە!»

بۆ ئەوەی لە قسەکردنەکەی هەمینگوای تێبگەن، ناچارم بڵێم کە نەمرەکان لە گەشت و گەڕانەکانی ئەو دنیایەی دیکەیاندا دەتوانن شکڵ و شێوەی هەر سەردەمێکی ژیانی ئەم دنیایەیان پێ خۆش بێت، هەڵبژێرن. گۆتە شکڵ و شێوەی دوا ساڵەکانی ژیانی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. جگەلەوانەی کەلەهەموو کەس زیاتر لێی نزیک بوون، کەس ئەوی بەم بیچمەوە نەدەناسییەوە. لەبەر ئەوەکە چاوی لە ئاست ڕووناکایی هەستوک بووبوو، ساباتێکی بچووکی سەوزی بەدەزوو بە ناوچاوانییەوەبەستبوو، نەعلی لەپێدا بوو، لە ترسی هەڵامەتیش ملپێچێکی خوریی ئەستووری لە ملی ئاڵاندبوو.

قسەکەی هەمینگوای لەبارەی سەروسیمای وەک داهۆلی گۆتە، ئەوی هێنایەپێکەنین. دەتگوت هەمینگوای ستایشی کردووە. گۆتەبەرەو ئەو نەوییەوەو بە ئارامی گوتی:

«من ئەم جلانەم لەبەر "بێتینا" پۆشیوە. ئەو، بۆ هەر کوێ دەچێت باسی ئەو عەشقەگەورەدەکات کەبەنسبەت منەوەهەیەتی. من دەمەوێت بەم شێوەخەڵک بە ئاشکرا بابەتی ئەو عەشقەگەورەی ببینن! بێتینا کاتێک لەدوورەوەچاوی بەمن دەکەوێت، بۆ ئەوەخۆی ڕزگار بکات هەڵدێت و من دەزانم بەرقەوەپێی بە زەویدا دەکوتێت، چونکەمنیش بەم شێوە، بەسەری کەچەڵ و بەبێ ددان و بەم ساباتە گاڵتەجارییەی ژوور چاومەوە، بەڕێگەدا دەڕۆم.

## خوشکەکان

ئەو وێستگەڕادیۆییەکە من گوێی لێ دەگرم دەوڵەتییە، بۆیەڕیکلامی نییەو لەپاش هەواڵەکان گۆرانییە بەناوبانگەکان بڵاودەکاتەوە. وێستگەکەی پەنای لەسەر مینا و ڕووپەڕەی ڕادیۆکە، وێستگەیەکی تایبەتییەو لەباتی مۆسیقا ڕیکلام بڵاودەکاتەوە. بەڵام ئەو ڕیکلامانەش لە دواهەم گۆرانییە بەناوبانگەکان دەچن و ئەم لێکچوونەش ئەوەندە زۆرەکەنازانم گوێ لە کاموێستگە دەگرم، بە تایبەت چونکەبەردەوام وەنەوز دەدەم، دڵنیا نیم. بەدەم خەوەوەتێدەگەم کەلە سەردەمی شەڕ بەملاوەدوو ملوێن کەس لە جادەکانی ئەورووپادا کوژراون. هەر لە فەڕەنسا، ڕووداوەکانی ناو جادەهەموو ساڵێک نزیکەی دەهەزار کوژراو و سێسەد هەزار برینداری لێ دەکەوێتەوە، ئەمە واتە خێڵێک مرۆڤی بێ قاچ و دەست و بێ چاو و گوێ.

"بێرتراند بێرتراند"ی نوێنەر (ناوێکی وەک لایلایەخۆش و جوان)، کە بەهۆی ئەم ئامارە ترسناکانەوەتووڕەبووبوو، کارێکی سەرنجڕاکێشی کرد، بەڵام لێرەدا خەوم لێکەوت و پاش نیو سەعات کەئەم هەواڵە دیسان دووبارە بووەوە، بە چیرۆکەکەم زانی: بێرتراند بێرتراندی نوێنەر، ئەو ناوە وەک لایلایەخۆش و جوانە، لە پارلەمان پێشنیاری کرد کەپێویستەبەر بەڕیکلامکردن بۆ بیرەبگیرێت. ئەمە لە"ئەنجومەنی نەتەوەیی" هەرایەکی زۆری نایەوە. زۆربەی نوێنەرەکان لەگەڵ ئەم بیرۆکەیەنەبوون. نوێنەری ڕادیۆ و

تەلەفزیۆنەکانیش کەبەهۆی ئەم پێشنیارەوەهیچ پارەیەکیان دەست نەدەکەوت، پشتگیری نوێنەرەکانی ئەنجومەنی نەتەوەییان کرد. پاشان دەنگی خودی بێرتراند بڵاوبووەوە. ئەو باسی شەڕ لەگەڵ مەرگ، شەڕ لەپێناوی ژیانی دەکرد. لە ماوەی ئەو وتارە کورتەیدا لانیکەم پێنج جار وشەی شەڕ دووبارە بووەوەو ئەمەش منی خستەوەبیری وڵاتەکەم، واتەپراگ. منی خستەوەبیری ئاڵاکان، پۆستەرەکان، شەڕ بۆ ئاشتی، شەڕ بۆبەختەوەری، شەڕ بۆ دادپەروەری، شەڕ بۆ داهاتوو، شەڕ بۆ ئاشتی. خەڵکی چێکیش زۆر ژیرانەئەمەی لێ زیاد دەکەن: شەڕ بۆ ئاشتی کەبە تیاچوونی هەموان بە دەستی هەموان کۆتایی دێت؛ بەڵام ئێستا من هەمدیسان دەخەومەوە(هەموو جارێک کەکەسێک ناوی بێرتراند بێرتراندی بە زماندا دێت من خەوێکی قووڵم لێدەکەوێت). کاتێک بەئاگا دەبمەوەهەندێک شت لەبارەی باخەوانییەوەدەبیستم، بۆیەخێرا پێچی ڕادیۆکەبەرەو وێستگەیەکی دیکەدەسوورێنم. لێرەش گوێم لەڕاپۆرتێک لەبارەی بێرتراند بێرتراندی نوێنەر و پێشنیارەکەی بۆ قەدەغەکردنی ڕیکلام بۆ بیرەدەبێت. وردەوردە لە پەیوەندییەلۆژیکییەکان دەگەم. خەڵک وەک لە مەیدانی شەڕدا بن، لە جادەکان دەکوژرێن، بەڵام خۆ ناکرێت ئۆتۆمبێلەکان قەدەغە بکرێن، چونکەئەوانەشانازیی مرۆڤی ئەم سەردەمەن. لەسەدا شتێکی ڕووداوەکانی هاتوچوو بە هۆی شۆفێرەسەرخۆشەکانەوەیە، بەڵام خۆ ناکرێت شەرابیش قەدەغەبکرێت، چونکەشەراب شانازیی فەڕەنسایەو بە درێژایی مێژوو ڕێزی لێ گیراوە. دیارەبەشێک لەسەرخۆشییەکان بەهۆی بیرەوەیە، بەڵام ناشکرێت بیرەمەنع بکەین، چونکە سەرپێچیکردنەلە هەموو سەرکەوتنەکانی تەجارەتی ئازادیی نێونەتەوەیی. لە سەدا شتێکی ئەو خەڵکانەش کەبیرە

دەخۆنەوەبەهۆی ڕیکلامەکانەوەدەیخۆنەوە و خاڵی لاوازی دوژمنیش لێرەدایە، ئێرەئەو خاڵەیەکەنوێنەری ئازای ئەنجومەنی نەتەوەیی، بڕیار دەدا بیکوتێت! من لەبەر خۆمەوەدەڵێم بژی بێرتراند بێرتراند، بەڵام چونکە ئەم ناوەوەک لایلایەکارم تێدەکات، دەستبەجێ خەوم لێ دەکەوێتەوە و دواتر بە دەنگێکی نەرم و دڵڕفێن بەئاگا دەبمەوە؛ ئەرێ، ئەوە دەنگی بێرناردی بێژەرەکەپێدەچێ جگەلەڕووداوی هاتوچووی ناو جادەکان، باسی هیچ هەواڵێکی دیکە نەکات. ئەو، ئەم هەواڵەبڵاودەکاتەوە: "شەوی ڕابوردوو کچێک، لەسەر یەکێک لەجادەسەرەکییەکان، پشتی کردە ئەو ئۆتۆمبێلانەکە بەرەو ڕووی دەهاتن و دانیشت. ئۆتۆمبێلەکان سیان بوون کەیەک لەدوای یەکتر دەهاتن. ئەوان لە دوا ساتەکاندا توانییان خۆیان لەو کچەلابدەن و هەموویان کەوتنەناو چاڵێکەوە. هەر سێ ئۆتۆمبێلەکە، بەژمارەیەک کوژراو و بریندارەوە، پلیشانەوە. ئەو کچەکە بەتەمای خۆکوشتن بوو، کاتێک بەشکستەی خۆی زانی، ئەو شوێنەی بەجێهێشت و تەنیا بریندارەکان شایەتییان بۆ ئەوەدا کەلەوێ‌بووە. ئەم هەواڵەکاریگەرییەکی ئەوەندە ترسناک لەسەر من دادەنێت کە ئیتر ناتوانم بخەومەوە. ناچار دەبم هەستم، نانی بەیانی بخۆم و لەپشت مێزی کارەکەم دانیشم، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر نەمتوانی تەرکیز لەسەر هیچ بکەم. ئەو کچەم دەدی کەلەسەر جادەیەکی تاریک بە دانیشتنانەوەکۆم بووەتەوەو ناوچاوانی لەئەژنۆی هەڵدەسوێت. هەروەها هاوارێکیشم دەبیست کەلەناو چاڵەکەوە دەهات. مەجبوور بووم ئەم بیرکردنەوانەلە خۆم بتارێنم تا بتوانم درێژە بە نووسینی چیرۆکەکەم بدەم، کەئەگەر لە بیرتان مابێت کاتێک دەستم پێکرد کەلە لای مەلەوانگەکە چاوەڕێی پرۆفیسۆر ئاڤێناریۆس بووم و ژنێکی نەناسراوم دی کەدەستی بۆ

مەلەوانەکەڕادەوەشاند. ئێمەئەم جووڵەی دەستەمان جارێکی دیکەش، ئەو کاتەکەئەگنێس لەبەر ماڵەکەیان ڕاوەستابوو ماڵاوایی لە هاوپۆلەشەرمنەکەی دەکرد، بینی. ئەگنێس، هەموو جارێک کەکوڕێک لەپاش گەڕانەوەیان لەژوان تا بەردەرکەی باخەکەدەیهێنایەوە، ئەم جووڵەی بەکار دەهێنا. خوشکەبچووکەکەی، "لۆرا"، لەپشت پنچکێکەوەخۆی دەشاردەوەو چاوەڕوان دەبوو تا ئەگنێس بگەڕێتەوەبۆ ماڵەوە. ئەو دەیویست سەیری ماچکردن بکات و لە هاتنەوەی خوشکەکەی بەرەو دەرکەی باخەکەوردببێتەوە. ئەو چاوەڕێی ئەو ساتەبوو کە ئەگنێس دەگەڕایەوەو دەستی بەرز دەکردەوە. ئەم جووڵەبیرۆکەیەکی لێڵ و تەمومژاویی لە عەشق و خۆشەویستی لە ناخیدا دەورووژاند، کە"لۆرا" هیچی لەبارەوەنەدەزانی، بەڵام پەیوەندییەکی هەمیشەیی لەگەڵ وێنەی خوشکەدڵڕفێنەکەی، خوشکەمیهرەبانەکەی بوو.

کاتێک ئەگنێس بەوەی زانی کەلۆرا لەکاتی ماڵاواییکردن لەهاوڕێکانی، لاسایی دەکاتەوەو دەستی ڕادەوەشێنێت، نیگەران بوو. هەروا کە خۆشمان دەزانین، ئەو لەوەودوا بە هۆشیاری و بەبێ خۆنواندن ماڵاوایی لەهاوڕێکانی دەکرد. لەم کورتەمێژووەی فیگەر و جووڵەدا، دەتوانین ئەو میکانیزمەببینینەوەکەپەیوەندیی دوو خۆشک دیاری دەکەن: گەنجترەکەلاسایی گەورەترەکەی دەکردەوەو دەستی بۆ درێژ دەکرد، بەڵام لە دواهەم ساتدا ئەگنێس هەمیشەهەڵدەهات.

ئەگنێس لەپاش دەرچوونی لە قوتابخانە، بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی لە زانکۆ چوو بۆ پاریس. لۆرا لەبەر جێهێشتنی گوندە خۆشەویستەکەیان خوشکەکەی سەرزەنشت دەکرد، بەڵام ئەویش دوای تەواوکردنی قوتابخانەبۆ درێژەدان بە خوێندن چوو بۆ پاریس. ئەگنێس ماتماتیکی هەڵبژارد، لەدوای وەرگرتنی دیپلۆم،

هەموو کەس پیشەیەکی زانستیی زۆر چاکی بۆ پێشبینی دەکرد، کەچی لەباتی ئەوەی درێژەبە توێژینەوەکانی بدات شووی بەپاول کرد و پیشەیەکی ئاسایی هەڵبژارد کەهەرچەندەهیچ شانازییەکی بۆ داهاتووی تێدا نەبوو، بەڵام مووچەکەی زۆر باش بوو. لاورا ئەوەی پێ ناخۆش بوو. ئەو کاتێک چووەناو کۆنسرڤاتواری پاریسەوەبڕیاری دا قەرەبووی سەرنەکەوتنی خوشکەکەی بکاتەوە و لەباتی ئەو ببێتە کەسێکی بەناوبانگ.

ڕۆژێک ئەگنێس ئەوی بەپاول ناساند. لاورا هەر کەچاوی بە پاول کەوت گویی لێ بوو کە کەسێکی نادیار پێی دەڵێ: «ئەمە پیاوە! پیاوێکی ڕاستەقینە. پیاوێکی تاقانە. پیاوێکی لەمەچاکتر لە دنیادا نییە». ئەم کەسە نادیارە کێ بوو؟ بڵێی خودی ئەگنێس بووبێت؟ ئەرێ. ئەگنێس بوو کەڕێگەی پیشان خوشکەکەی دەدا و هاوکات ئەو ڕێگەیەی بۆ خۆشی دەپاراست.

ئەگنێس و پاول ئەوەندەبە میهرەبانییەوەلەگەڵ لاورا دەجووڵانەوەو ئەوەندەهۆشیان پێوەی بوو کەلە پاریسیش وەک شارۆچکەکەی خۆیان هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد، بەڵام ئەو هەستەخۆشەی ناو باوەشی بنەماڵەبەوەتەڵخ و تاریک دەبوو کەبەوپەڕی نیگەرانییەوەدەیزانی تاقەپیاوێک کە دەتوانێت خۆشی بوێت، ئەو پیاوەیەکەهەرگیز نابێت هەوڵ بدات بەدەستی بێنێت. لاورا کاتێک لەگەڵ ئەم ژن و میردەبوایە، هەستی خۆشی و خەمباری یەک لەدوای یەک بەرۆکیان پێ دەگرت. ئەو بێدەنگ دەبوو، چاوی لە شوێنێکی نادیار دەبڕی، ئەوسا ئەگنێس دەستی دەگرت و دەیگوت:

«ئەوەچی بووەلاورا، چی بووە خوشکەبچکۆلانەکەم؟»

پاولیش جارجار لەم دۆخەدا، وەک ئەگنێس دەستی دەگرت و هەرسێکیان بە خۆشییەوەلەو دەریای چێژە، کەڕووباری هەستێکی خوشکانەو خۆشەویستانەو بەسۆز و شەهوانی دەڕژایەناوی، نوقم دەبوون.

پاشان لاورا شووی کرد. بریژیت، کچەکەی ئەگنێس، دەساڵانەبوو کەلاورا بڕیاری دا خوشکەزایەکی بچووک بۆ ئەگنێس بێنێت. ئەو داوای لە مێردەکەی کرد سکی پڕ بکات و ئەوەش خێرا ڕووی دا، بەڵام ئەنجامێکی خەمباری بوو. لاورا منداڵەکەی لەبارچوو، پزیشکەکان پێیان ڕاگەیاند کە ئیتر هەرگیز ناتوانێت بەبێ نەشتەرگرییەکی ترسناک منداڵی ببێت.

# چاویلکەی ڕەش

ئەگنێس ئەو کاتە حەزی لەچاویلکەی ڕەش کرد کە هێشتا لە "ناوەندی" دەیخوێند. چاویلکەی ڕەش لەڕاستیدا بۆ پاراستنی چاوەکانی لەتیشکی خۆرەتاو نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوەبوو کەهەستی دەکرد بەو چاویلکەوەجوان و ڕەمزاوی دەبێت. لەچاوکردنی چاویلکەی ڕەش بەلای ئەوەوەجۆرەسەرقاڵییەک بوو. هەروا کەهەندێک پیاو کەنتۆرێک بۆینباخیان هەیە، هەروا کە هەندێک ژن دەرزەنێک ئەنگوستیلەدەکڕن، ئەگنێسیش کۆگایەک چاویلکەی ڕەشی بوو.

چاویلکەی ڕەش لەژیانی لاوراشدا، پاش لەبارچوونی منداڵەکەی، دەورێکی گرینگی گێڕا. ئەو هەمیشەلەم چاویلکانەی لەچاو دەکرد، ئەوسا داوای لێبوردنی لە هاوڕێکانی دەکرد و دەیگوت: «بمبوورن کەچاویلکەی ڕەشم لەچاودایە، بەڵام چونکەزۆر دەگریم ناتوانم بەبێ ئەم چاویلکەڕوومەتم پیشان خەڵک بدەم.» لەو دەمەوەچاویلکەی ڕەش بوو بە نیشانەی خەمەکەی. ئەو، چاویلکەی ڕەشی بۆ ئەوە لەچاو نەدەکرد کەگریانەکەی وەشارێتەوە، بەڵکو دەیویست خەڵک بزانن کە دەگری. چاویلکەی ڕەش جێی فرمێسکی بۆ گرتەوە و بەپێچەوانەی فرمێسکی ڕاستەقینەپێڵووەکانی ئازار نەدەدا، سوور نەدەبوونەوە، نەدەماسین و زۆریش شیاو بوو.

ئەم حەز لە چاویلکەکردنەی لاورا، ئەمجارەش وەک هەموو جارەکانی پێشوو، لە خوشکەکەیەوەپێی گەیشت، بەڵام چیرۆکی ئەم چاویلکە ئاشکرای دەکات کە ناتوانین پەیوەندیی ئەو

جووتەخوشکەتا ئەو ئاستەدابەزێنین کە بڵێین گەنجترەکەلاسایی گەورەترەکەدەکاتەوە. ئەرێ، ئەو لاسایی کردەوە، بەڵام لەگەڵئەوەدا چاکیشی کرد: ئەو مانایەکی قووڵتری بەچاویلکەی ڕەش بەخشی، مانایەکی جوانتر، وەها کە چاویلکەڕەشەکانی ئەگنێس لەئاست چاویلکەکەی لاورا ئەوەندەسووک بوون کەدەبوایەلەشەرمان سوور هەڵگەڕێن. کاتێک لاورا بەچاویلکەی ڕەشەوەدەردەکەوت، بەو مانایەبوو کە ئەو ئازار دەکێشێت و ئەگنێسیش ناچار دەبوو لەشەرم و نەزاکەتی خۆی چاویلکەکەی هەڵبگرێت.

ئەم چیرۆکی چاویلکەی ڕەشە شتێکی دیکەش ئاشکرا دەکات: ئەگنێس ئەو خوشکەیەکەچارەنووس ڕووی خۆشی پیشان داوە و لاوراش ئەو کەسەیەکە چارەنووس پشتی تێ کردووە. هەر دوو خوشکەکەبڕوایان بەوەکردبوو کەلە بەختدا هاوسان نین و ڕەنگەئەمەش بۆ ئەگنێس دژوارتر بووبێت تا بۆ لاورا. ئەگنێس دەیگوت: «خوشکێکی ئازیزم هەیەکەمنی خوش دەوێت و لەژیانیدا جگەلە کڵۆڵی هیچی دیکەی پێ نەبڕاوە»، بۆیەخۆشحاڵ بوو کەلاورای هێناوەبۆ پاریس، خۆشحاڵ بوو کەئەوی بەپاول ناساندووەو داوای لێ کردووەلەگەڵیدا میهرەبان بێت، بۆیەبە ئەرکی خۆی دەزانی ئاپارتمانێکی خۆشی بۆ ببینێتەوە. ئەو هەرکاتێک هەستی بەخەمباریی لاورا بکردایەدەعوەتی دەکرد بۆ ماڵەکەی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو کارانەش کە ئەگنێس دەیکرد، بۆخۆی هێشتا ئەو کەسەبوو کە چارەنووس ڕووی خۆشی پیشان دابوو، لاوراش ئەو کەسەبوو کەچارەنووس پشتی تێ کردبوو.

لاورا بەهرەیەکی زۆری لەمۆسیقادا هەبوو، زۆر چاک پیانۆی دەژەند، بەڵام لە کۆنسرڤاتوار بڕیاری دابوو فێری گۆرانیخوێندن ببێت. «کاتێک پیانۆ دەژەنم هەست دەکەم بەرامبەر بە شتێکی

دەرەکی و نەیار دادەنیشم، ئەو مۆسیقایەهی من نییە، بەڵکو هی ئەو ئامێرەڕەشەیەکەبەرامبەرم داندراوە، بەڵام کاتێک گۆرانی دەخوێنم، لەشم دەبێت بەپیانۆ و خۆشم دەبم بە موسیقا». بۆ ئەو دەنگەکز و نزمەشی کەهەموو شتێکی تێک دەدا، تاوانبار نەبوو: ئەو نەبوو بەژەنیارێک کەبە تەنیا پیانۆ بژەنێت (سۆلۆیست)، هەموو چالاکییەمۆسیقاییەکەی ژیانی ئەوەبوو کەئەندامی کۆرسێک بوو کەحەفتەی دوو جار پرۆڤەی لەگەڵ دەکردن و ساڵی چەند جاریش بۆ کۆنسێرتەکان بەشداری دەکردن.

هاوسەرگیرییەکەشی، وێڕای ئەو هەموو سۆز و خۆشەویستییەکەبۆی تەرخان کردبوو، دوای شەش ساڵ بەرەوڕووی شکست بووەوە. ئەڵبەت مێردەساماندارەکەی ناچاربوو ئاپارتمانێکی جوان و نەفەقەیەکی ئێجگار زۆری بداتێ، تا لاورا بتوانێت فرۆشگەیەکی جوان بۆ فرۆشتنی پێستەبکاتەوە. لاورا بۆ کاروباری فرۆشگەکەی بەهرەیەکی تیجاریی وەهای بوو کەهەموویانی تووشی سەرسووڕمان کرد، بەڵام هەر چۆنێک بێت، ئەم سەرکەوتنەئاسایی و تیجارییەنەیتوانی قەرەبووی ئەو بێدادییەسۆزدار و ڕۆحییەی بۆ بکاتەوەکەدەرحەق بەئەو کرابوو.

لاورای بێوەژن گەلێک پیاوی تاقی کردەوە، ناوبانگی بەعاشقێکی تووڕەو توندمەزاج دەرکردبوو، وای دەنواند کە دۆست و دڵدارەکانی وەک خاچێکن بەسەر شانییەوە. زۆرجار دەیگوت: «گەلێک پیاوم دیوە» و ئەوەندە خەمبار ئەوەی دەگوت کە پێدەچوو شکایەت لە چارەنووسی خۆی بکات. ئەگنێس وەڵامی دەدایەوە:

«من ئێرەییت پێ دەبەم».

ئەوسا لاورا چاویلکەڕەشەکەی وەک نیشانەی خەم و مەینەت لەچاو دەکرد.

ئەو هەستی ستایشکردنەکەلاورا لەمنداڵییەوەبەرامبەر بە ئەگنێس بووی، واتە لەو کاتەوەکەچاوی لێ بوو ئەگنێس لەبەر دەرکەی باخەکەیان ماڵاوایی لەکوڕێک دەکات، هەرگیز وازی لێ نەهێنا و کاتێک زانیی خوشکەکەی پیشەیەکی زانستیی گەورەی نابێت، نەیتوانی بێئومێدییەکەی وەشارێت. ئەگنێس بۆ بەرگریکردن لە خۆی گوتی:

«بۆ سەرزەنشتی من دەکەیت؟ تۆ لەبری گۆرانیخوێندن لەئۆپەرا، خەریکی پێستەدەفرۆشیت و منیش لەبری چوون بۆ کۆنفرانسەنێونەتەوەییەکان، پیشەیەکی بێمانای خۆشم لە کۆمپانیایەکی کۆمپیوتەر هەیە».

«بەڵێ، بەڵام من ئەوەی لەتوانامدا بوو کردم تا ببم بەگۆرانیبێژ. کەچی تۆ بە خواستی خۆت وازت لەژیانی زانستی هێنا. من سەرکەوتوو نەبووم، بەڵام تۆ بۆخۆت وازت هێنا».

«باشەبۆ دەبێ من پیشەی زانستیم ببێت؟»

«ئەگنێس! ئێمەتەنیا یەک جار دەژین! تۆ دەبێ‌ئەو ژیانەپڕ بکەیتەوە! ئێمە دەمانەوێ شتێک لەخۆمان جێبێڵین».

ئەگنێس داچڵەکی و بەسەرسووڕمانێکی گوماناوییەوە گوتی:

«شتێک لەخۆمان جێبێڵین؟!»

لاورا بە دەنگێکی پڕ لەئازاری ناتەباییەوەوەڵامی دایەوە:

«ئەگنێس، تۆ خەریکی دەبی بەمرۆڤێکی نەرێنی و نیگەتیڤ!»

لاورا زۆرجار لەدڵی خۆیدا بەم قسەسەرکۆنەی خوشکەکەی دەکرد. ئەو، تەنیا دوو، یان سێ جار ئەم سەرکۆنەکردنەی دەربڕی. دواهەم جار لەپاش مردنی دایکی بوو. کاتێک چاوی بە باوکی کەوت کەلەپشت مێزەکە دانیشتبوو، خەریکبوو ڕەسمەکانی دەدڕاند. ئەو، ئەمکارەی باوکی پێ قبووڵنەکرا. باوکی خەریکبوو پارچەیەک

لەژیانی، پارچەیەک لە ژیانی هاوبەشیی خۆی و دایکی دەفەوتاند. ئەو خەریکبوو ڕەسمەکانی دەدڕاند، ئەو یادەوەرییانەی دەدڕاند کەبە تەنیا هی خۆی نەبوون، بەڵکو هی هەموو خێزانەکەی بوون، بە تایبەت هی کچەکان. ئەو خەریکبوو کارێکی دەکرد کەمافی کردنی نەبوو. لاورا بەسەر باوکیدا نەڕاندی و ئەگنێس لەسەر باوکی هەڵقڕا. کاتێک ئەو دوو خوشکەپێکەوەتەنیا بوون، بۆ یەکەم جار لەژیانیاندا لەگەڵ یەکتر بەشەڕ هاتن، شەڕێکی قورس و بێبەزەییانە. لاورا بەسەر ئەگنێسدا دەیقیژاند:

«تۆ خەریکە دەبی بەمرۆڤێکی نیگەتیڤ! خەریکی نیگەتیڤ دەبی!»

پاشان چاویلکەڕەشەکەی لە چاو کرد و بە تووڕەیی و گریانەوەلەوێ ڕۆیشت.

## لەش

"سالڤادۆر دالی" شێوەکاری بەناوبانگ و "گالا"ی هاوسەری، کاتێک تەواو پیر بووبوون، کەروێشکێکیان ڕاگرتبوو کەلەگەڵیان دەژیا و بۆ هەموو کوێ شوێنیان دەکەوت. ئەوان، جارێک ویستیان سەفەرێکی دوور بکەن و تا نیوەشەو باسی ئەوەیان کرد کە چی لەو کەروێشکەبکەن. بردنی ئەو کەروێشکەلەگەڵ خۆیان کارێکی دژوار و سپاردنیشی بە کەسێکی دیکەسەخت بوو، چونکەکەروێشکەکەلە لای خەڵکی نەناسیاو نەدەحەوایەوە. بۆ سبحەینێدا "گالا" خواردنی نیوەڕۆی ئامادەکرد. "دالی" لەکاتێکدا کەخەریکبوو چێژی لەو خواردنەخۆشەدەبرد، زانیی کەخەریکەگۆشتی کەروێشکەکەدەخوات. ئەو لەپشت مێزەکەهەستا و بە پەلەچوو بۆ دەستشۆرکەکە و لەوێ ئەو کەروێشکەجوانەو هاوڕێ بەوەفایەی تافی پیریی هێنایەوە. "گالا" بەپێچەوانەی "دالی"، خوشحاڵ بوو کەئەو شتەخۆشەویستەی بەناوسک و هەناوی خۆی سپاردووە. ئەو شتەدڵ و گەدەی دەلاواندەوەو دەبوو بەبەشێک لەلەشی کەیبانووەکەی. بە لای ئەوەوەهیچ خۆشەویستییەک لەوەتێر و تەواوتر نەبوو کەخۆشەویستەکەی بخوات. بەم پێودانگە، بەلای ئەوەوەجووتبوون و عەشقبازیکردن ختیلکەیەکی گاڵتەجاڕی بوو.

لاورا وەک گالا بوو، ئەگنێسیش وەکو دالی. ئەگنێس گەلێک کەسی، چ ژن چ پیاو، خوشدەویست؛ بەڵام بەپێی ئەو پەندەسەیرەکەدەگوترا مەرجی دۆستایەتی ئەوەیەئاگات لە لووتی

دۆستەکانت بێت و بەردەوام بۆیان خاوێن بکەیتەوە، وای پێ باش بوو بەبێ دۆست بژی. لاورا کە بەم وازوازیبوونەی خوشکەکەی دەزانی، بەتوانجەوەپێی دەگوت: «کاتێک کەسێک دڵت دەبات، مانای چییە؟ چۆن دەتوانی لەش لەم هەستەجودا بکەیتەوە؟ ئایا ئەو مرۆڤەکە تۆ لەشی دەسڕیتەوە، دیسان مرۆڤە؟»

ئەرێ، لاورا وەک گالا بوو. وەک چۆن لەماڵێکی ڕازاوەدا هەستی بەئاسوودەیی دەکرد، ئاواش هەموو شوناسی خۆی بەلەشیەوەگرێ دابوو. بە لای ئەوەوەلەش لەوەزیاتر بوو کەلە ئاوێنەدا دەبیندرا، بەبایەخترین بەشی لەش لە ناوەوەبوو. هەر بۆیەلەقسەکانیدا حەزی دەکرد ئاماژەبۆ ئەندامەکانی لەش و ئەرکەکانیان بکات. ئەگەر بیویستایە بڵێت دڵدارەکەی شەوی ڕابوردوو جاڕزی کردووە، دەیگوت: «کاتێک ئەو ڕۆیشت ناچار بووم بڕشێمەوە». هەر چەندەلاورا زۆرجار باسی ڕشانەوەی دەکرد، ئەگنێس نەیدەزانی ئایا خوشکەکەی تا ئێستا ڕشاوەتەوە،یان نا. ڕشانەوەحەقیقەتی لاورا نەبوو، بەڵکو شیعری بوو. خوازەیەک، وێنەیەکی غینایی لەنەفرەت و ئازار.

جارێک کە ئەو دوو خوشکەپێکەوەچووبوون بۆ فرۆشگەیەکی جلی ژێرەوە، ئەگنێس چاوی لێ بوو کەئەو بە ئارامی دەستی بەو مەمکدانەدا دەهێنا کە خانمەفرۆشیارەکەپیشانی دابوو. ئەوەیەکێک لەو ساتانە بوو کەئەگنێس پەی بە جیاوازیی خۆی و خوشکەکەی دەبرد. بە لای ئەگنێسەوەمەمکدان لەو شتانەبوو کەبۆ چاککردنەوەی نوقسانییەکی لەش ساز کراون، وەک لەفافی برینپێچ، تاقمی ددان، وەک چاویلکە، یان ملپێچیک کەگەردنی ئازاردراوی پێ دەبەستن. کەواتەمەمکدانیش بۆ ڕاگرتنی شتێکەکە بە هۆی هەڵەیەکی شکڵییەوە، لەوەقورسترەکەدەبوایەببێت، بۆیەدەبێ ڕابگیرێت، وەک

هەیوانی بینایەکی سەقەت کە دەبێ کۆڵەکەی بەر بدرێت تا نەڕووخێت. بەگوتنێکی دیکە: مەمکدان سروشتی تەکنیکاڵی ئەندامێکی مێینەئاشکرا دەکات.

ئەگنێس ئێرەیی بە پاول دەبرد کەدەیتوانی بەبێ ئەوەی بەردەوام ئاگای لەلەشی خۆی بێت، بژی. پاول هەناسەی هەڵدەمژی و سییەکانی وەک دەمی ئوتوماتیکی ئاسنگەرخانەکاری دەکرد، بۆیەبەم شێوە لەلەشی گەیشتبوو: ئەو بە خۆشییەوەلەشی پشتگوێ خستبوو. هەرگیز باسی کێشەو گرفتی لەشی خۆی نەدەکرد، نەوەک چونکەپیاوێکی متەوازع بوو، بەڵکو چونکەئارەزوویەکی بێهوودەی بۆ جوانی و تەندروستی بوو. ئەو ناساغی و نەخۆشیی بەخەسارێک دەزانی کەشەرمەزاری دەکرد. ساڵانێکی زۆر بە هۆی برینی گەدەیەوەئازاری دەکێشا، بەڵام ئەگنێس پێی نەدەزانی؛ تا ئەوەی ڕۆژێک، پاش بەرگرییەکی ئازایانەلەدادگایی تۆمەتبارێک، ئامبولانسێکیان هێنا و بردیان بۆ نەخۆشخانە. ئەوەبێگومان غرووڕێکی گەوجانەبوو، بەڵام بە لای ئەگنێسەوەجوان بوو، تا ڕادەیەک ئێرەیی پێ دەبرد.

ئەگنێس بەخۆی دەگوت هەر چەندەپێدەچێت پاول پیاوێکی بەغروور و لووتبەرز بێت، بەڵام ئەم دید و بۆچوونەی پەردەلەسەر جیاوازییەکی نێوان ژن و پیاو هەڵدەداتەوە: ژن کاتێکی زیاتر بۆ قسەکردن لەسەر کێشەکانی لەشی تەرخان دەکات. قەدەری ژن لەوەدا نییەکەلەشی پشتگوێ بخات. ئەمەبەشۆکی یەکەم سووڕی مانگانەیەوەدەست پێدەکات. لەش لەناکاو دەردەکەوێت و ژن وەک فیتەرێکی کلۆڵ کەناچار بێت کارگەیەک ئیدارەبکات، بەرەوڕووی دەبێتەوە: هەموو مانگێک لەفاف دەگۆڕێت، حەب دەخوات، مەمکدان دەبەستێت و خۆی بۆ بەرهەمهێنان ئامادەدەکات. ئەگنێس

بەئێرەییەوەسەیری پیرەمێردەکانی دەکرد؛ پێی وابوو ئەوان بە جورێکی دیکە پیر دەبن: لەشی باوکی وردەوردە وەکو سێبەرەکەی لێهات، تایبەتمەندییەمادییەکانی تیاچوو، هەر وەک ڕۆحێکی بەرجەستەی بێدەربەست لەدنیادا مایەوە. بەپێچەوانەوە، لەشی ژن هەرچی زیاتر بێکەڵک دەبێت، زیاتریش لەشە: قورس و بەکێشە؛ وەک کارگەیەکی کۆنە کە دەبێ بفەوتێت، دەبێ ژنەکەش تا کۆتایی، وەک سەرپەرشتێک ئاگای لێی بێت. چی دەیتوانی پەیوەندیی ئەگنێس لەگەڵ لەشی خۆی بگۆڕێت؟ تەنیا ساتێک هەیەجان. هەیەجان واتە ڕزگاریی کاتیی لەش.

بەڵام لاورا تەنانەت لەگەڵ ئەوەش تەبا نەبوو: ساتێک ڕزگاری؟ بۆچی تەنیا ساتێک؟ بە لای ئەوەوەلەش هەر لە سەرەتاوەسروشتێکی سێکسیی بوو، لە سەرەتاوە، بەردەوام و تەواو سێکسی. بە لای ئەوەوە خۆشویستنی کەسێک بەو مانایەبوو کەلەشی خۆتی بۆ ببەیت، لەشی خۆتی بدەیتێ، بە هەموو شتێکییەوە، بەناوەوەو دەرەوەی، تەنانەت بەو زەمەنەشەوەکەبە هێمنی و بەشیرینی دەیڕزێنێت.

لەش بە لای ئەگنێسەوە سێکسی نەبوو. هەر لەو کاتەتایبەتییانەدا کەساتێک هەڵچوون و ئاڵۆش بە نوورێکی ناواقیعی ڕۆشنی دەکرد، جوان و دڵڕفێنی دەکرد، سێکسی دەبوو. پێدەچێت بۆ ئەوەبوو‌بێت (هەر چەندەکەس ئەمەی لەبارەی ئەگنێسەوەنەدەزانی) کەهەموو بیر و هۆشی لە لای عەشقی جەستەیی بوو، بەتوندی پێوەی دەنووسا، چونکە بەبێ ئەوەهیچ ڕێگەیەک بۆ دەربازبوون لە نەگبەتی و نەهامەتیی لەش نەبوو، هەموو شتێک دەفەوتا. ئەو، لەناو جێدا هەمیشەچاوی کراوەبوو، ئەگەر ئاوێنەی لێ نزیک بوایە سەیری خۆی دەکرد: لەو ساتەدا پێی وابوو لەشی نوقمی ڕۆشنایی بووە.

## پێزیادکردن و لێکەمکردنەوە

لەم دنیای ئێمەدا کەژمارەیەکی ئێجگار زۆر ڕوومەتی تێدایەکەئێجگار زۆر لەیەکتر دەچن، کارێکی سەخت و دژوارەتاکەکان بتوانن پەرەبەڕەسەنایەتیی خۆیان بدەن و لەتاکبوونی بێوێنەی خۆیان دڵنیا ببن. بۆ پەروەردەکردنی تاکبوونی خود، دوو شێواز هەیە: شێوازی پێزیادکردن و شێوازی لێکەمکردنەوە. ئەگنێس هەموو شتەدەرەکی و وەرگیراوەکان لە خودی خۆی کەم دەکاتەوە، تا لەزات و سروشتی بێخەوش و پەتیی خۆی نزیک ببێتەوە(تەنانەت بەملدان بەو مەترسییەش کەئەنجامی ئەو کەمکردنەوەیە ببێتە سفر)، بەڵام شێوازی لاورا تەواو بەپێچەوانەوەیە: ئەو، بەو مەبەستەکەخودی خۆی زیاتر لە بەرچاو بێت، فام بکرێت، وەربگیرێت و گەورە ببێت، بەردەوام تایبەتمەندیی دیکەی پێ زیاد دەکات و تێدەکۆشێت بەوانەوەبناسرێتەوە(تەنانەت بەملدان بەو مەترسییەش کە زات و سروشتی خودی خۆی لەژێر کۆگای ئەم تایبەتمەندییانەدا ون ببێت).

بۆ نموونەبا باسی پشیلەکەی بکەین. لاورا لەپاش جیابوونەوەلەمێردەکەی، لە ئاپارتمانێکی گەورەدا بە تەنیا مایەوەو هەستی بەتەنیایی کرد. ئەو لە ئاژەڵێکی جوان دەگەڕا کەبیکاتەهاوبەشی تەنیاییەکەی. سەرەتا بیری لەڕاگرتنی سەگێک کردەوە، بەڵام زۆر زوو زانیی کە سەگ پێویستی بە سەرپەرشتی و خزمەتێکی زۆرەکە بەئەو ناکرێت. بۆیەپشیلەیەکی هێنا. پشیلەیەکی

سیامی گەورەو جوان و بەدخوو. لاورا لەگەڵ پشیلەکەدا دەژیا و گەلێک چیرۆکی خۆشی ئەو پشیلەیەی بۆ هاوڕێکانی دەگێڕایەوە، کەکەیفیان پێ دەکرد. ئەو ئاژەڵەکە لاورا تا ڕادەیەک بە ڕێکەوت هەڵیبژاردبوو، بەبێ هیچ پێویستییەک (چونکەیەکەم بژاردەکەی سەگ بوو) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بۆی گرینگتر دەبوو: ئەو دەستی بەپەسن و ستایشی پشیلەکەکرد و هاوڕێکانیشی ناچارکرد کەبەبالآیدا هەڵبڵێن. لاورا لەو پشیلەدا سەربەخۆییەکی شاز، لووتبەرزی، ئازادیی کردار و دڵڕفێنییەکی بەردەوامی دەدی (دڵڕفێنییەکی گەلێک جیاوازتر لەدڵڕفێنیی مرۆڤ کە هەمیشەگرژی و توندوتیژی دەیشێواند). لاورا لەو پشیلەدا نموونەیەکی وەک خۆی دەدی. ئەو لەو پشیلەدا خۆی دەدی.

ئەوەکەئایا سروشتی لاورا لە پشیلە دەچوو، یان نا، گرینگ نییە؛ گرینگ ئەوەیەکەلاورا پشیلەکەی کردبوو بەبەشێک لە نیشانەی گەورەیی خۆی و پشیلەکەش (خۆشویستنی پشیلەکە، پاراستنی پشیلەکە) بووبوو بە تایبەتمەندییەکی خودی خۆی. سەرەتا زۆر کەس لە هاوڕێکانی لاورا لەم ئاژەڵەشەڕانی و خۆپەرستە کەلیکی دەڕشت و شووخاڵی دەگرت، تووڕەبوون. ئەو پشیلەوەک سەنگی مەحەکی دەسەلاتی لاورای لێ هاتبوو. دەتگوت دەیەوێت بە هەموو کەس بڵێ: تۆ دەتوانی منت ببێت، بەلآم منی ڕاستەقینەئەمەیەکەهەم، بەم پشیلەوە. پشیلەکەوەک ڕەسمی ڕۆحی لاورای لێهات و ئەگەر دڵدارێک بیویستایەببێتەخاوەنی لەشی، دەبوو ڕۆحیشی وەربگرێت.

شێوازی پێزیادکردن، ئەگەر پێزیادکردنی هەندێک شتی وەک پشیلە، سەگ، گۆشتی بەرازی برژاو، خۆشەویستیی دەریا، حەمامی ئاوی سارد بە خۆی بێت، زۆر جوانیشە، بەلآم ئەگەر کەسەکە بڕیار بدات خۆشویستنی کۆمۆنیزم، نیشتمان، موسۆلینی، کاتۆلیسیزم،

ئاتەئیزم، فاشیزم، یان دژەفاشیزم بە خۆی زیاد بکات، ئیتر شتەکەئەوەندەش جوان نییە. بۆ هەردوو لایەنەکەشێوازێکی یەکسان هەیە. کەسێک کەبەپێداگرییەوەلایەنگری لەوەدەکات کە پشیلەلەئاژەڵی دیکە چاکترە، ڕێک وەک ئەو کەسەیەکەپێی وایەمۆسولینی تاکەکەسێک بوو کەدەیتوانی ئیتالیا ڕزگار بکات. ئەو شانازی بەم تایبەتمەندییەی خۆیەوەدەکات و هەوڵدەدا خەڵکی دیکەش ئەم تایبەتمەندییەی (پشیلە، یان موسولینی) وەربگرن و خۆشیان بوێت.

ئەو دژوازی و پارادۆکسەسەیرەکەبەرۆکی ئەو کەسانەدەگرێت وا خۆیان بە شێوازی پێزیادکردن پەروەردەدەکەن، لێرەدا خۆی شاردووەتەوە. ئەوان بەو هۆیەوەسوود لەم شێوازی پێزیادکردنە وەردەگرن، تا خودێکی تاک و بێوێنەبخوڵقێنن، بەڵام چونکەبەشێوەیەکی ئوتوماتیکی دەبن بەکەسێک کەپڕوپاگەندەبۆ سفەت و تایبەتمەندییەپێزیادکراوەکانیان دەکەن، هەموو توانای خۆیان دەخەنە گەڕ تا خەڵکانێکی زیاتر وەک خۆیان لێبکەن. بۆیەلە ئەنجامی ئەم کارەیاندا، تاکبوونەکەیان (کەبەرهەمی ڕەنج و ئازارێکی زۆرە) دەستبەجێ دەفەوتێت.

دەشێت لەخۆمان بپرسین بۆچی ئەو کەسەکەپشیلە(یان موسولینی)ی خۆش دەوێت، بەوەقایل نابێت کەئەو خۆشەویستییەی بۆ خۆی ڕابگرێت و حەز دەکات بەسەر خەڵکی دیکەشدا بیسەپێنێت؟ ئێستا ئێمە، بە وەبیرهێنانەوەی ئەو ژنە گەنجەی ناو ساوناکەکە بەشەڕەنگێزییەوەدەیگوت حەزی لەخۆشتن بە ئاوی سارده، وەڵامی ئەم پرسیارەدەبینینەوە. ئەو بەم قسەتوانیی خۆی

لەنیوەی مرۆڤەکان، واتە ئەو کەسانەکەحەزیان لەخۆشتن بە ئاوی گەرمە، جیابکاتەوە. بەداخەوە ئەو نیوەی دیکەش ئێستا زۆر لەئەو دەچن. مەخابن ئەم بابەتەزۆر ناخۆشە! خەڵکێکی زۆر و بیرۆکەی کەم. کەواتە ئێمەچۆن دەتوانین خۆمان لەیەکتر جیابکەینەوە؟ ئەو ژنەگەنجەبۆ ئەوەی بەسەر هەلومەرجی ناهەمواری لێکچوونی لەگەڵ ئەو خەڵکەزۆرەدا زاڵ بێت کەحەزیان لەخۆشتن بە ئاوی ساردە، تەنیا یەک ڕێگەی دزانی: ئەو دەبوایەکەهاتە ژووری ساوناکەڕایبگەیەنێت کە: «من حەزم لە خۆشتن بەئاوی ساردە!» و ئەوەندەش پێداگر بێت کەملوێنەها ژنی دیکە، کەئەوانیش حەزیان لە خۆشتن بە ئاوی سارد بوو، وەک لاساییکەرەوەی ئەویان لێ بێت. ڕێگەم بدەن بەجۆرێکی دیکەبیڵێم: حەزێکی (سادەو بێگەرد) لە خۆشتن بەئاوی سارد، تەنیا بەو مەرجەدەبێت بەتایبەتمەندییەک بۆ خۆمان، کەهەموو خەڵکی دنیا بزانن ئامادەین لەپێناویدا شەڕ بکەین.

کەسێک کەخۆشویستنی موسۆلینی وەک تایبەتمەندی و سفەتێک بۆ خودی خۆی هەڵدەبژێرێت، تێکۆشەرێکی سیاسییە، بەڵام کەسی لایەنگری پشیلەو مۆسیقا و مێز و کورسیی کۆن، دیاری بەکەسانی دەوربەری دەدات.

با وای دانێین کەهاوڕێیەکتان هەیەحەزی لە"شومان"ەو ڕقی لە"شوبێرت"ە، لەکاتێکدا بۆخۆتان شەیدای "شوبێرت"ن و لە"شومان" بێزارن. ئێوە، بۆ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی ئەو هاوڕێیەتان چ شتێکی پێشکەش دەکەن؟ مۆسیقای شومان کەئەو پێیخۆشە، یان مۆسیقای شوبێرت کە خۆتان حەزی لێ دەکەن؟ بێگومان شوبێرت. ئێوەئەگەر قەوانێکی شومانی پێشکەش بکەن، ئەو هەستەناخۆشەتان

لەلا دروست دەبێت کەدیارییەکەتان بەڕاست نییەو لەبەرتیلێک دەچێت بۆ پێخۆشبوونی ئەو. بێجگەلەوەش، ئێوەکاتێک دیارییەک بەکەسێک دەدەن، بە حەزەوەئەوەدەکەن و دەتانەوێت بەشێک لە خۆتان، بەشێک لە دڵی خۆتانی پێشکەش بکەن! بۆیەسەمفۆنیای ناتەواوی شوبێرتی دەدەنێ، بەڵام کاتێک لە ماڵەکەی دەچنەدەر، ئەو تف لەقەوانەکەدەکات، دەستکێشێکی لاسیق لەدەست دەکات و بە پارێزەوەهەڵی دەگرێت و فڕێی دەداتەناو تەنەکەی خۆڵەکەوە.

لاورا لەماوەی چەند ساڵدا هەندێک دیاریی پێشکەش بەخوشک و زاوەکەی کرد، هەندێک دیاری وەک تاقمێک دەوری، تاقمێکی چاخواردنەوە، سەبەتێکی میوە، چرایەک، کورسییەکی نیئۆن، پێنج تەپڵەک، ڕووکەشێکی مێز و لەهەموو ئەمانەش گرینگتر، پیانۆیەک کەدوو پیاوی کەتەی بەهێز بۆیان هێنایە ژوور. لاورا وەک گوڵ گەشابووەوە، گوتی: «دەمەوێ شتێکتان پێشکەش بکەم کەناچار بن تەنانەت ئەو کاتەش کەلەلاتان نیم، لە بیرم نەکەن».

لاورا لەپاش جیابوونەوەلە مێردەکەی هەموو کاتی پشوودانی لەماڵی خوشکی بوو. ئەو کاتەکەی بۆ بریژیت، وەک ئەوەکەکچی خۆی بێت، تەرخان دەکرد. هۆی سەرەکیی کڕینی ئەو پیانۆیەش بۆ خوشکەکەی ئەوەبوو کەدەیویست خوشکەزاکەی فێری پیانۆژەنین بکات، بەڵام بریژیت ڕقی لەپیانۆ بوو. ئەگنێس دەترسا ئەو نەفرەتەهەستی لاورا بڕووشێنێت، بۆیەتکای لە کچەکەی کرد بەقەدەر توانای هەوڵ بدات وا بنوێنێت کە حەزی لەو کلیلەڕەش و سپییانەیە، بەڵام بریژیت ڕازی نەبوو. گوتی: «ئایا من دەبێ لەبەر دڵی ئەو فێری پیانۆژەنین ببم؟»

ئاوا بوو کەئەو چیرۆکەئەنجامێکی خراپی لێ کەوتەوە. پاش چەند مانگ پیانۆکەبوو بەشتێکی دیکۆری، شتێکی بێکەڵک، یادەوەریی دڵتەزێنی شکستێک، شتێکی گەورەی سپی (بەڵێ پیانۆکەسپی بوو!) کە هیچکەس نەیدەویست.

ڕاستتان بوێت، ئەگنێس نەئەو تاقمی چاخۆرییەی بەدڵ بوو، نەئەو کورسییەنیۆنەو نەپیانۆکەش. مەبەستم ئەوەنییەکە دیارییەکان بەبێسەلیقەیی کڕدرابوون، بەڵکو سەیر ئەوەبوو کەهیچیان لەگەڵ حەز و ئارەزووی ئەگنێس نەدەگونجان، بۆیە(دوای ئەوەکەپیانۆکەبۆ ماوەی شەش ساڵ بەبێ ئەوەدەستی لێ درابێت، لەماڵەکەیاندا کەوت) کاتێک لاورا لەگەڵ بێرنارد، هاوڕێیەکی گەنجی پاول ئاشنا بوو، ئەگنێس لە دڵەوەخۆشحاڵ بوو؛ پشوویەکی ئاسوودەی دا. ئەو پێی وابوو ئەگەر کەسێک عاشق ببێت، زۆر کاری چاکتری لەهەڵڕشتنی دیاری بەسەر خوشکەکەیدا و هەوڵدان بۆ فێرکردنی پیانۆژەنین بەخوشکەزاکەی پێ دەکرێت.

## ژنی بەتەمەنتر، پیاوی گەنجتر

کاتێک لاورا باسی دواهەم خۆشەویستییەکەی بۆ پاول کرد، پاول گوتی: «هەواڵێکی ئێجگار خۆشە»، ئەوسا هەر دوو خوشکەکەی بۆ خواردنی نانی ئێوارەدەعوەت کرد. ئەو زۆر خۆشحاڵ بوو کە لاورا و بێرنارد، ئەو دوو کەسە کە زۆری خۆش دەویستن، عاشقی یەکتر بووبوون، بۆیەداوای دوو بتڵ شەرابی زۆر گرانی کرد و بەلاورای گوت: «تۆ لەگەڵ کوڕی یەکێک لەگرینگترین بنەماڵەکانی فەڕەنسا پەیوەندیت گرتووە. دەزانی باوکی بێرنارد کێیە؟»

لاورا گوتی:

«بێگومان! ئەو نوێنەری پارلەمانە»

پاول گوتی:

«کەواتەهیچ نازانی. بێرتراند بێرتراند نوێنەری پارلەمان، کوڕی ئارتور بێرتراندی نوێنەری پارلەمانە. ئارتور زۆر شانازی بەناوی دووهەمییەوەدەکرد و دەیویست کوڕەکەی بەناوبانگتری بکات. ئەو بیری لەوەکردبووەوەکەچ ناوێک بۆ کوڕەکەی هەڵبژێرێت و لەپڕ ئەو بیرەدرەوشاوەی بەمێشکدا هاتبوو کەناوی بنێت بێرتراند. کەس ناتوانێت ئەم ناوەدوانەیەپشتگوێ بخات و فەرامۆشی بکات! گوتنی بێرتراند بێرتراند خۆی لەخۆیدا وەک ڕێزلێنانە، بۆیە ناوبانگ دەردەکات: بێرتراند! بێرتراند! بێرتراند! بێرتراند! بێرتراند!»

پاول كه دەتگوت بەم وشانەسڵاو لەڕابەرێكی خۆشەویست دەكات و بەخۆشی ئەوەوە دەخواتەوە، پەرداخەكەی بەرزكردەوە. پاشان بەڕاست قومێكیشی خواردەوەو گوتی:

«شەرابێكی زۆر چاكە».

ئەوسا درێژەی بەقسەكانی دا:

«هەمووممان بەشێوەیەكی ڕەمزاوی لەژێر كاریگەریی ناوەكانماندابن و بێرتراند بێرتراندیش، كەڕۆژی چەند جار گوێی لەو ناوەخۆشەی دەبوو، وەک كەسێک كەناوبانگی خەیاڵیی ئەو چوار بڕگەخۆشە، سیحری كردبێت، ژیا. ئەو كاتێک لەدواهەم تاقیكردنەوەی قوتابخانەدەرنەچوو، ئەم شكستەی، لەهاوپۆلەكانی بە لایەوەدژوارتر بوو. پێدەچوو ناوەدوانەكەی هەستی بەرپرسایەتیشی
١ دوو قات كردبێت. ئەوەندەمتەوازع بوو كەتوانیی بەرگەی ئەو شەرمەزارییەبگرێت، بەڵام نەیتوانی بۆ شەرمەزاركردنی ناوەكەی لەخۆی ببوورێت. ئەو لەتەمەنی بیست ساڵیدا سوێندی بەو ناوەناودارەی خوارد هەموو ژیانی بۆ شەڕ لەپێناوی چاكەدا تەرخان بكات، بەڵام زۆر زوو زانیی كەلێكهەڵاواردنی كاری چاک لەكاری خراپ ئاسان نییە. بۆ نموونە، باوكی لەگەڵ زۆرینەی پارلەمان دەنگیان بەڕێكەوتنەكەی مونیخ دا. ئەو دەیویست ئاشتی بپارێزێت، چونكە كەس گومانی لەچاكبوونی ئاشتی نییە، بەڵام دواتر بۆی دەركەوت كەڕێكەوتننامەكەی مونیخ ڕێگەی بۆ شەڕ، كە بێگومان كارێكی خراپە، خۆش كردووە. كوڕەكەدەیویست خۆی لە هەڵەكانی باوكی دوور ڕابگرێت، بۆیەتەنیا تاوی دایەگرینگترین و حاشاهەڵنەگرترین بابەتەكان. ئەو هەرگیز بۆچوونی خۆی بەرامبەر بەفەلەستینییەكان، ئیسرائیلییەكان، شۆڕشی ئۆكتۆبەر، فیدڵ كاسترۆ و تەنانەت تیرۆریستەكانیش دەرنەدەبڕی، چونكەدەیزانی سنوورێک

هەیەکەئەگەر ببیەزێنێت ئیتر کوشتن، کوشتن نییە، بەڵکو نیشانەی پاڵەوانیەتییە و ئەو هەرگیز نازانێت ئەو سنوورەبەڕاست لەکوێیە. لەبەر ئەوە بوو کە بە جۆشوخرۆشەوەدژ بە هیتلەر و نازیسم و کوورەکانی مرۆڤسووتاندن دەدوا و تا ڕادەیەکیش پێی ناخۆش بوو کەهیتلەر لەکەلاوەکەی شوێنی حەوانەوەیدا ون بووبوو، چونکەلەو دەمەبەدواوەچەمکی چاکەو خراپەتەواو ڕێژەیی بووبوو. بۆیەهەوڵی دا هەر پشت بەچاکەببەستێت، ئەویش لەڕاستترین شکڵی خۆیدا کەسیاسەت نەیگۆڕیبێت. دروشمەکەشی ئەمەبوو: «ژیان چاکە»، بەم شێوەخەبات دژی لەباربردنی منداڵ، دژی کوشتن بەهۆی بەزەییەوە، دژی خۆکوشتن، بوو بەمەبەستی سەرەکیی ژیانی.

لاورا بە پێکەنینەوەبەرپەرچی قسەکەی دایەوە:

«تۆ بەجۆرێک باسی دەکەیت کەدەڵێی پیاوێکی گەوج بووە!»

پاول بە ئەگنێسی گوت:

«چاوت لێیە؟ هەر لە ئێستاوەخەریکەلایەنی یارەکەی دەگرێت. ئەمەشایانی ستایشکردنە، ڕێک وەک ئەم شەرابە، کەدەبێ بۆ هەڵبژاردنی، ستایشی من بکەن!»

لەیەکێک لەو پرۆگرامانەی دوایی کەبۆ دژایەتیکردنی کوشتن بەهۆی بەزەییەوەبوو، بێرتراند بێرتراند کارێکی کردبوو کەلەپاڵ تەختی نەخۆشێکی کوێردا کەزمانیان بڕیبوو نەیدەتوانی بجووڵێت و بەردەوام ئازاری دەکێشا، فیلمی لێ هەڵبگرن. کامێراکەبێرتراندی پیشان دەدا کەبەسەر تەختی نەخۆشەکەدا نەوییبووەوەو باسی هیوا بەدوارۆژی بۆ دەکرد. ڕێک لەو کاتەدا کە بۆ سێهەم جار وشەی «هیوا»ی بە زماندا هات، لەپڕ نەخۆشەکەتووشی هەژان و هەڵچوون بوو، دەنگێکی ترسناکی وەک دەنگی ئاژەڵی لێ بەرز بووەوە؛ دەنگێکی وەک دەنگی مانگا، یان ئەسپ، یان فیل، یان

هەرسێکیان پێکەوە. بێرتراند بێرتراند تۆقا. نەیتوانی درێژەبەقسەکانی بدات. ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا تا زەردەخەنەکەی بەسەر لێویەوەبپارێزێت و کامێراکەش بەردەوام فیلمی لەو زەردەخەنە ڕچیوەی پارلەمانتارەتۆقاوەکەو ڕوومەتی دەم بەهاواری نەخۆشەکەهەڵدەگرت، بەڵام من نامەوێت باسی ئەم شتانەبکەم؛ تەنیا دەمویست بڵێم ئەو کاتێک ناوی بۆ کوڕەکەی هەڵبژارد، کارەکەی تێکدا. ئەو لەپێشدا دەیویست کوڕەکەشی ناوێکی وەک ناوی خۆی ببێت، بەڵام دواتر تێگەیشت کەبوونی دوو بێرتراند بێرتراند لەدنیادا وەک کارەساتێکی سەیرە، چونکەخەڵک سەریان لێ دەشێوێت کەئایا ئەمانە دوو کەسن، یان چوار کەس. کەچی بەو حاڵەش نەیدەتوانی واز لەچێژی بیستنی دەنگدانەوەی ناوی خۆی لەناوی کوڕەکەیدا بهێنێت، بۆیەبیری کردەوەناوی بنێت بێرنارد. گرفتەکەلەوەدایەکەبێرنارد بێرتراند نەوەک ڕێزلێنانە، نەناوبانگی بەدواوەیە، بەڵکو وەک هەتەڵەیەکی زمانییە؛ تەنانەت لەوەش زیاتر، وەک ڕاهێنانێکی فۆنەتیکییەبۆ ئەکتەرەکان، یان بێژەرەکانی ڕادیۆ کە دەیانەوێت فێریان بکەن توند و ڕەوان بدوێن. هەروا کە گوتم ناوەکان بە شێوەیەکی سەیر کارمان تێدەکەن و تەنانەت بێرناردیش، هەر لەمنداڵی و لەناو لانکەوە، ناوەکەی بەو شێوە چارەنووسی دیاری کردبوو کەقسەکانی لەگەڵ شەپۆلەکاندا بڵاو ببنەوە.

پاول بۆیەئەو قسەهیچوپووچانەی دەکرد، چونکەنەیدەوێرا باسی ئەو بابەتەبکات کەلەمێشکیدا بوو. ئەو، لەوەتۆقابوو کەلاورا هەشت ساڵ لەبێرنارد بەتەمەنتر بوو! چونکەبۆخۆی یادەوەرییەکی سەیری لەگەڵ ژنێک هەبوو کەپازدەساڵ لەخۆی گەورەتر بوو. ئەو کاتێک بیستوپێنج ساڵی تەمەن بوو پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئەو ژنەهەبوو. پاول دەیویست باسی ئەوەی بۆ بکات؛ دەیویست پێی

بلێت کەدەبێ لەژیانی هەموو پیاوێکدا پەیوەندییەکی عاشقانەلەگەڵ ژنێکی بەتەمنتر ببێت و ئەم پەیوەندییەش جوانترین یادەوەریی هەموو پیاوێکە. ئەو، لە کاتی بەرزکردنەوەی پەرداخەکەیدا ویستی پێی بڵێت «ژنێکی بەتەمنتر لەژیانی پیاودا وەک گەوهەر وایە» بەڵام بەری بەم ڕەفتارەبەپەلەیەی خۆی گرت و بەئارامی بیری لەو عەشقەکۆنەی خۆی کردەوە. بیری لەوەکردەوەکە ئەو ژنەکلیلی ئاپارتمانەکەی خۆی پێ دابوو تا هەر کاتێک خۆی حەز بکات بچێت بۆ ئەوێ و چیی پێ خۆشەبیکات. ئەو دەمەئەوەی زۆر پێ خۆش بوو، چونکەنێوانی لەگەڵ باوکی خۆش نەبوو، حەزی دەکرد لەماڵەوەدوور بێت. ئەو ژنەهەرگیز داوای لەپاول نەدەکرد کەبەشەو سەردانی بکات. پاول هەر کاتێک کاری نەبوایەدەچوو بۆ لای و کاتێکیش کاری بوایە، مەجبوور نەبوو هیچ بۆ ژنەکەشی بکاتەوە. ژنەکەهەرگیز داوای لێ نەدەکرد لەگەڵ خۆی بیباتەدەر و کاتێکیش پێکەوەلەناو خەڵکدا دەردەکەوتن، وەک پوورێکی میهرەبان لەگەڵبرازا جوانچاکەکەی دەجووڵایەوە. کاتێک پاول ژنی هێنا، ژنەکەدیارییەکی گرانی بۆ نارد کەهەمیشەوەکو ڕازێک لە لای ئەگنیس مایەوە.

بەڵام زۆر دژوار بوو بەلاورا بڵێت: «خۆشحاڵم کەهاوڕێکەم ژنێکی بەتەمەن و بەئەزموونی خۆش دەوێت کەوەک پوورێکی میهرەبان لەگەڵ برازا جوانچاکەکەی دەجووڵێتەوە». تازە، بەر لەوەی پاول دەرفەتی گوتنی هیچی ببێت، لاورا بۆخۆی دەستی بە قسەکرد:

«ئەوەزۆر خۆشەکەبەهۆی پەیوەندییەکەم لەگەڵ بێرنارد دەساڵ گەنجتر بوومەتەوە. بە لوتفی ئەوەوەدەتا پازدە ساڵی خراپی ژیانم

سرپوەتەوەو هەست دەکەم تازەلە سویس گەڕاومەتەوەبۆ پاریس و ئەوم دیوە».

ئەم قسانەمەجالی ئەوەی لەپاول سەندەوەکەبە دەنگی بەرز باسی یادەوەرییەکانی گەوهەری ژیانی بکات، بۆیەلەبێدەنگیدا بیری لەیادەوەرییەکانی دەکردەوە. نمنم شەرابی دەنۆشی و ئیتر گوێی لە قسەکانی لاورا نەدەگرت. پاش ماوەیەک، بۆ ئەوەی بەشداریی وتووێژەکەیان بکات، پرسیی:

«بێرنارد لەبارەی باوکییەوەچیی پێ گوتی؟»

لاورا گوتی:

«هیچ. دڵنیابەباسی باوکی ناکەین. دەزانم کەلەخێزانێکی گرینگە، بەڵام خۆ تۆ دەزانی من چۆن بیر لە خێزانەگرینگەکان دەکەمەوە».

«کونجکۆڵ نیت؟»

لاورا بە خۆشییەوەپێکەنی:

«نا».

«وا چاکەنەبیت. بێرتراند بێرتراند گەورەترین کێشەی بێرنارد بێرتراندە».

لاورا کە دڵنیا بوو بۆخۆی گەورەترین کێشەی بێرناردە، گوتی:

«گومانم هەیەوا بێت».

پاول پرسیی:

«دەزانی بێرتراند خەریکبوو پلانی کارێکی سیاسیی بۆ بێرنارد دادەنا؟»

لاورا بەدەم هەڵتەکاندنی شانییەوەگوتی:

«نا».

«لەم خێزانەدا پیشەی سیاسیش وەک بینا و عەمارەت میراتێکەکەلەباوکەوەبەکوڕی دەگات». بێرتراند بێرتراند پێی وابوو

ڕۆژێک لەباتی ئەو کوڕەکەی خۆی بۆ هەڵبژاردنی پارلەمان دەپاڵێوێت، بەڵام بێرنارد کاتێک بیست ساڵی تەمەن بوو، لە پرۆگرامی هەواڵەکاندا گوێی لەم ڕستەیەبوو: «بەربوونەوەی فڕۆکەلەئاسمانی ئاتلانتیکەوەمەرگی سەدوسی کەس، بۆ نموونەحەوت منداڵ و چوار ڕۆژنامەوانی، لێکەوتەوە». ئێمەلەمێژەبەو بیرۆکەیەڕاهاتووین کەلەم جۆرەڕاپۆرتانەدا منداڵەکان، وەک نەوعییەتێکی تایبەت و پڕ بایەخی مرۆڤایەتی، جودا بکەینەوە، بەڵام بێژەری ئەم ڕاپۆرتە،ڕۆژنامەوانەکانیشی لەڕیزی منداڵەکان دانا و بێرنارد لەپڕێکدا چاوی بە ڕۆشنایی کەوت. ئەو کەدەیدی سیاسەتمەدارەکان لەم سەردەمەی ئێمەدا کەسایەتییەکی گاڵتەجاڕین، بڕیاری دا ببێت بەڕۆژنامەوان. ئەودەمەمن بەڕێکەوت لەسمینارێکی کۆلێژی ماف وانەم دەگوتەوەکەئەویش تیایدا بەشدار بوو. بۆ دواجار لەوێ پشتی لە سیاسەت و لەباوکی کرد. ڕەنگە بێرنارد پێشتر ئەوەی بۆ باس کردبێتی».

لاورا گوتی:

«بەڵێ، ئەو تۆ دەپەرستێ».

لەم کاتەدا پیاوێکی ڕەش بەسەبەتێک گوڵەوەهاتە ژوور. لاورا بەدەست ئیشارەتی بۆ کرد. کابرا دانەسپی و جوانەکانی پیشان دا و لاورا چەپکێک (پێنج لق) گوڵەمیخەکی سیسبووی لەسەبەتەکەهەڵگرت و دای بەپاول:

«بۆ ئەم هەموو خۆشحاڵییەم، خۆم بەقەرزداری تۆ دەزانم».

پاولیش دەستی بۆ سەبەتەکەدرێژکرد و چەپکێک گوڵەمیخەکی هەڵگرت و بەئەوی دا. گوتی:

«ئێمەئەم ئاهەنگەمان لەبەر تۆ سازکردووە، نەک من!»

ئەگنێس سێهەم چەپکی لەسەبەتەکەهەڵگرت و گوتی:

«بەڵێ، ئاهەنگی ئەمڕۆمان بۆ لاورایە».

چاوەکانی لاورا تەڕ بووبوون. گوتی: «ئای کە هەست بە خۆشی دەکەم، ئای کەلەگەڵئێوەهەست بەخۆشی دەکەم».

ئەوسا هەستا. هەردوو چەپکەگوڵەکەی لەلای کابرای ڕەش، کەوەک سوڵتانێک ڕاوەستابوو، بەسنگییەوەنووساند. هەموو پیاوەڕەشەکان لە پاشا دەچن. ئەمەیان وەک 'ئۆتێللۆ' بوو بەرلەوەی گومان لە 'دەزدیمۆنا' بکات. لەکاتێکدا کەلاورا وەک 'دەزدیمونا' بوو کەشەیدای ئاغاکەیەتی. پاول دەیزانی دواتر چی ڕوودەدا. کاتێک لاورا سەرخۆش دەبوو دەستی بەگۆرانیخوێندن دەکرد. ئارەزووی گۆرانیخوێندن لە ناخییەوەسەری هەڵدا و ئەوەندەتوند گەیشتەقوڕگی کەچەند پیاو لەسەر مێزەکەی ئەولایانەوە، ئاوڕیان لێ دایەوەو بەسەرسووڕمانەوەسەیریان کرد. پاول بەگوێچکەیدا چرپاندی:

«لاورا، کەس لەم ڕیستورانتەمەدحی مالەری تۆ ناکات!»

لاورا کە دەتگوت لەسەر تەختەی شانۆ ڕاوەستاوە، چەپکێک گوڵی لەئاست سنگی ڕاگرت. سەری قامکەکانی لەسنگی دەدرا کەپڕ بوو لەئاوازی مۆسیقا. داواکەی پاول وەک هەمیشەبە لایەوەوەک فەرمان بوو. ملی بە قسەکەی پاول دا و بەداخەوەگوتی:

«زۆر حەز دەکەم کارێک بکەم».

لەم کاتەدا کابرا ڕەشەکەبە جووڵەی ناسکی شاهانە، دوو چەپکەمیخەکەسیسبووەکەی لە سەبەتەکەدەرهێنا و پێشکەش بەلاورای کرد. لاورا بە ئەگنێسی گوت: «ئەگنێس، ئەگنێسی ئازیزم، من بەبێ تۆ هەرگیز نەدەهاتم بۆ پاریس، بەبێ تۆ پاولم نەدەبینی و بەبێ پاولیش بێرناردم نەدەناسی».

ئەوسا هەرچوار چەپکەگوڵەکەی لەسەر مێزەکەبەرامبەر بە ئەگنێس دانا.

## یازدەهەمین فەرمان

سەردەمانێک ڕۆژنامەوانی بەهۆی ناوی گەورەی "ئێرنست هەمینگوای"ەوەناوبانگی دەرکردبوو. سەرچاوەی بەرهەمەکانی، کورتی و پوختی نووسینەکانی، ستایلی واقیعی و ڕاشکاوانەی، ئەو ڕاپۆرتانەبوون کەبە گەنجی بۆ ڕۆژنامەکانی "کانزاس سیتی"ی دەنارد. ئەو دەمەڕۆژنامەوانی بە مانای نزیکبوونەوەو لێکۆڵینەوە و ڕاموسینی لایەنی شاراوەی واقیع بوو. هەمینگوای بۆ ئەوەکەکتێبەکانی ئەوەندەلەعەرد نزیک و لەئاسمانی هونەردا بەرز و بڵیند بوون، شانازی بە خۆیەوەدەکرد.

بەڵام کاتێک بێرنارد لای خۆی وشەی "ڕۆژنامەوان" دەڵێتەوە(و ئەمڕۆ لە فەڕەنسا ئەم وشەیەئەدیتۆرەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و تەنانەت وێنەگری ڕۆژنامەکانیش دەگرێتەوە)، بیر لەهەمینگوای ناکاتەوە و ئەو فۆڕمەئەدەبییەش کەبەهیوایەتیایدا ببێتەپێشەنگ، ڕاپۆرتنووسین نییە. ئەو زیاتر بەهیوایە سەروتار بۆ گۆڤارەحەفتانەکان بنووسێت کەلەشێی هاوکارانی باوکی بێننەلەرزین، یان دیمانەو وتووێژیان لەگەڵ بکات. بەم پێودانگە، کەواتەدیارترین ڕۆژنامەوانی ئەم سەردەمەی دوایی کێیە؟ دیارترین ڕۆژنامەوان نە"هەمینگوای"ەکەئەزموونەکانی ناو خەندەقی دەنووسی، نە"جۆرج ئۆروێل"ە کەساڵێک لەژیانی خۆی لەگەڵ هەژارانی پاریس تێپەڕاند، نە "ئیگۆن ئەروین کیش"ی کارناسی سۆزانیخانەکانی پراگە، بەڵکو "ئۆریانا فالاچی"یە کە لەمیانەی ساڵەکانی ١٩٦٩ تا ١٩٧٢

لەرۆژنامەی ئیتالیی "ئەورۆپۆ"دا زنجیرەیەک چاوپێکەوتنی لەگەڵ ناسراوترین سیاسییەکانی سەردەم بڵاوکردەوە. ئەم دیمانانەزۆر لەوتوویژێکی سادەزیاتر بوون، ئەوانەشەڕ و ململانێ بوون. بەرلەوەی کەسیاسییەدەسەڵاتدارەکان لەوەتێبگەن کەلە دۆخێکی نایەکساندا دەجەنگن (چونکەفالاچی مافی پرسیاری هەبوو، ئەوان نەیانبوو) لەناو ڕینگی بۆکسێنەکەدا درێژ بووبوون.

ئەم شەڕانەنیشانەی سەردەمی ئێمەبوون. هەلومەرجەکەگۆڕابوو. ڕۆژنامەوانەکان لەوەگەیشتبوون کەپرسیارکردن تەنیا ئەرکێکی پیشەیی و کردەیی بۆ ئەو ڕۆژنامەوانە شەرمنانەنییە کە بەقەڵەم و دەفتەرێکەوە خەریکی کۆکردنەوەی زانیارین، بەڵکو ئامێرێکەبۆ سەپاندنی دەسەڵات. ڕۆژنامەوان تەنیا ئەو کەسەنییەکە پرسیار دەکات، بەڵکو کەسێکە کەخاوەنی مافی پیرۆزی پرسیارکردنەو دەتوانێت لەهەرکەس هەرچیی پێ خۆش بێت، بپرسێت، بەڵام ئایا هەمووومان ئەم مافەمان نییە؟ ئایا پرسیار پردێکی لێکحاڵیبوون نییەکەلە مرۆڤێکەوەبۆ مرۆڤێکی تر دەکێشرێت؟ ڕەنگەوا بێت. با مەبەستەکەم زیاتر ڕوون بکەمەوە: دەسەڵاتی ڕۆژنامەوان لەسەر بنەمای مافی پرسیارکردن نییە، بەڵکو لەسەر بنەمای داواکردنی وەلامە.

تکایەلەوەوردببنەوەکەحەزرەتی مووسا ڕستەی «نابێ درۆ بکەیت!»ی لە ڕیزی دەفەرمانەکەی خودادا نەهێناوە. ئەمەڕێکەوت نییە! چونکە کەسێک کەدەڵێ «درۆ مەکە» سەرەتا دەبێ بڵێت «وەڵام بدەرەوە!» و خوداش ئەو مافەی بە کەس نەداوەتا داوای وەڵام لەخەڵکی دیکەبکات. ڕستەگەلێکی وەک «درۆ مەکە» و «ڕاستییەکەی بڵێ!» لەو ڕستانەن کەتا ئەو دەمەکەسێک لەگەڵ خۆمان بەیەکسان بزانین نابێت پێی بڵێین. ڕەنگە تەنیا خودا ئەم

مافەی ببێت، بەڵام خوداش پێویستی بەوە نییەکەئەم مافەی بەکار بهێنێت، چونکەبۆخۆی هەموو شتێک دەزانێت و پێویستی بە وەلامدانەوەی ئێمەنییە.

نایەکسانی لە نێوان ئەو کەسەکە فەرمان دەدات و ئەو کەسەکەدەبێ ملکەچی فەرمانەکەی بێت، بەقەدەر نایەکسانی نێوان ئەو کەسەکەمافی داواکردنی وەلامی هەیەو ئەو کەسەش کەئەرکی وەڵامدانەوەی پێ سپێردراوە، بنەڕەتی نییە، بۆیەلەسەردەمانی زۆر کۆنەوە، مافی داواکردنی وەڵام تەنیا لە هەلومەرجێکی تایبەت و ڕێزپەڕدا بەخەڵک دراوە؛ بۆ نموونەبە دادوەرێک کەلێکۆڵینەوەلە تاوانێک دەکات. لەم سەدەی ئێمەدا حکوومەتەفاشیستی و کۆمۆنیستییەکان نەوەک هەر لەهەلومەرجە تایبەتی و ڕیزپەڕەکاندا، بەڵکو هەمیشەئەو مافەبەخۆیان ڕەوا دەبینن. هاووڵاتیانی ئەم وڵاتانەدەزانن لەهەر کات و ساتێکدا ئەگەری ئەوەهەیەکە بۆ وەڵامدانەوەبەهەندێک پرسیار بانگهێشت بکرێن. بۆ نموونە دوێنێک هچییان کردووە؟ لە دڵی خۆیاندا بیر لە چی دەکەنەوە؟ کاتێک لەگەڵ "ئا" چی دەڵێن؟ ئایا لەگەڵ "ب" زۆر دۆست و نزیکن، یان نا؟ ئەم فەرمانی پیرۆزی «ڕاست بڵێ!»یە، ئەم یازدەهەمین فەرمانەبوو کەخەڵک نەیانتوانی خۆیان لەبەرامبەریدا ڕابگرن و وەک کۆمەڵە منداڵێکی بچووکی نابالغی داماویان لێهات. ئەڵبەتەجاروبار کەسێک دەردەکەوت کەبەسەرسەختییەوەملی بەئاشکراکردنی ناوەڕۆکی قسەکانی لەگەڵ "ئا" نەدەدا و وەک سەرکێشییەک (ئەمە تاکە ڕێگای سەرکێشیکردن بوو) لەبری ئەوەی ڕاستیەکی بڵێت، درۆی دەکرد، بەڵام پۆلیس بەوەشی دەزانی و بەدزییەوە ئامێری گوێگرتنی لەماڵەکەیدا دادەنا. ئاشکرایە کە پۆلیس بە هاندەری بەدرەوشتانەئەوەی نەدەکرد، بەڵکو دەیویست لەو ڕاستییەبگات

کە'ب'ێی درۆزن دەیشاردەوە. ئەوان تەنیا جەختیان لەسەر مافی داواکردنی وەلام دەکردەوە.

لەولاتەدیموکراتییەکاندا هەمووکەس دەتوانێت جرت بۆ ئەو پۆلیسەلێبدات کەدەویرێ لێی بپرسێت 'ئا' باسی چیی کردووە، یان لەگەڵ'ب' دۆستە، یان نا، بەلام بەو حالەش، لێرەش دەسەلاتی 'یازدەهەمین فەرمان' تەواو لەگەڕدایە. هەرچۆنێک بێت، خەڵک لەم سەدەیەی ئێمەشدا پێویستیان بەفەرمانێکە، کەئەگەر دەفەرمانی خودا فەرامۆش بوو، حوکمیان بەسەردا بکات! هەموو بونیادی ئەخلاقیی ئەم سەردەمەلەیازدەهەمین فەرمانەوەسەری هەڵداوەو ڕۆژنامەوانیش لەوەگەیشتووەکەبەهیممەتی هەلومەرجی ڕەمزاویی مێژووەوە، بۆخۆی ئیدارەی مێژوو دەکات و دەبێتەخاوەنی دەسەلاتێک کەهەمینگوای و ئۆروێل بەخەیالیشیاندا نەهاتووە.

ئەم دیاردەیەئەو کاتە سەلمێندرا و ئیسبات بوو کەڕۆژنامەوانە ئەمەریکییەکان، 'کارل بێرنشتاین' و 'بۆب وودوارد' ، پەردەیان لەسەر ئەو کارەقێزەونەی 'پرێزیدنت نیکسۆن' لەهەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا هەڵدایەوە. ئەو کاتە ئێمە، هەموومان، ستایشی ئەو کارەیانمان کرد، چونکەکارێکی دادپەروەرانەبوو. 'پاول' لەهەموو کەس زیاتر ستایشی کردن، چونکەئەو ڕووداوەی بەنیشانەی گواستنەوەیەکی مێژوویی گەورە، ڕێنوێنێک، ساتێکی لەبیرنەکراوەو گۆڕانی چاودێر دەزانی. دەسەلاتێکی تازە دەرکەوتبوو، تاکە دەسەلاتێک کە دەیتوانی سیاسەتمەدارەکان، واتەدەلالەکانی دەسەلاتی پێشوو، بڕووخێنێت؛ ئەری بیانڕووخێنێت، نەک بە چەکوچۆل و پیلان، بەڵکو بە هێزی پرسیار.

ڕۆژنامەوان دەڵێ: «ڕاستم پێ بڵێ» و بێگومان ئێمە دەتوانین بپرسین کەوشەی 'ڕاستی' بۆ بەڕێوەبەری 'یازدەهەمین فەرمان'

بەچ مانایەکە. بۆ ئەوەی بەهەڵەتێنەگەین، دەبێ پێ لەسەر ئەوەدابگرین کەئەم ڕاستییە، ئەو "ڕاستییەئیلاهییە" نییەکە"جان هوس" لەپێناویدا کوژرا و ئەو "ڕاستییەزانستی و فکرییە"ش نییەکە"جیۆردانۆ برۆنۆ" لە پێناویدا سووتێندرا. ئەو ڕاستییەکەدەسکەوتی "یازدەهەمین فەرمانە" هیچ پەیوەندییەکی بەئایین و فەلسەفەوەنییە، ئەوەڕاستییەکەلەنزمترین پلەی بووناسیدا، ئەوەڕاستییەکی واقیعیانەی پۆزیتیڤیستییە؛ "ب" دوێنێکە چیی کرد؟ ئەو لە دڵی خۆیدا چۆن بیر دەکاتەوە؟ ئایا "ب" پەیوەندیی دۆستانەی هەیە،یان نا؟ وێڕای ئەمانەش، ئەم ڕاستییەهەرچەندەلەنزمترین پلەی بووناسیدایە، بەڵام ڕاستیی سەردەمی ئێمەیەو هەر ئەو هێزی تەقینەوەی هەیەکەڕاستییەکەی "جان هوس" و "جیۆردانۆ برۆنۆ" بوویانە. ڕۆژنامەوان دەپرسێت: ئایا پەیوەندیی دۆستانەت لەگەڵ "ب" بوو؟ "پ" درۆ دەکات و جەخت لەوەدەکاتەوەکەگوایە"ب" ناناسێت. ڕۆژنامەوان لە دڵی خۆیدا پێی پێدەکەنێت، چونکەوێنەگری ڕۆژنامەکەلەوەوپێش ڕەسمی "ب"ێی بەڕووتی لەباوەشی "پ"دا گرتووەو ئێستا ئیتر بە دەست خۆیەتی کەئەو ڕەسمەڕیسواکەرەو قسەکانی "پ"ێی درۆزن و ترسنۆک، کەبە بێشەرمییەوەگوتوویەتی "ب" ناناسێت، بۆ هەموو خەڵک بڵاوبکاتەوە، یان نا.

کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنە، سیاسەتمەدار لەم فڕۆکەوەبۆ ئەو هەلیکۆپتەر و لەو هەلیکۆپتەرەوەبۆ ئەم ئۆتۆمبێل، لەهەوڵ و تەقەلادایە. ئەو عارەق دەڕێژێت، نانی نیوەڕۆی بەدەم ڕۆشتنەوە دەخوات، لە مایکرۆفۆنەکاندا دەنەڕێنێت، دوو سەعات وتار دەبێژێت، بەڵام لەئەنجامدا ئەوە"برێنشتاین"، یان "وودوارد"ەکانن کەبڕیار دەدەن لەو پەنجا هەزار ڕستەکە گوتوویەتی کامیان لەڕۆژنامە،یان

ڕادیۆکانەوەبڵاوبکەنەوە. بۆیەسیاسەتمەدار وای پێ چاکترەکەڕاستەوخۆ لەڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە قسەبۆ گوێگرەکانی بکات، بەڵام ئەوەش هەر بەناوبژیوانیی "ئۆریانا فالاچی" دەکرێت کەڕێسای میدیاکان دادەڕێژێت و پرسیار دەکات. سیاسەتمەدار بەتەمایەسوود لەو کاتانەوەربگرێت کەهەموو خەڵک دەیبینن و چی پێ باشە پێیان بڵێت، بەڵام "وودوارد" پرسیاری وای لێ دەکات کەبە مێشکی سیاسەتمەداردا نەهاتووەو حەزیش ناکات لەو بارەوەبدوێت. بەم شێوەسیاسەتمەدار خۆی وەک منداڵێکی قوتابی دەبینێتەوەکەبۆ لای تەختەڕەشەکەبانگ کراوە و بە هیوای فرتوفێڵی قوتابییانەیە. ئەو وا خۆی پیشان دەدا کەگوایەخەریکەوەڵام دەداتەوە، بەڵام لەڕاستیدا خەریکەئەو شتانە دەڵێت کە لەماڵەوەبۆ بڵاوکردنەوەلە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن ئامادەی کردوون. ڕەنگەئەم فرتوفێڵەلەمامۆستای قوتابخانەکان بکردرایە، بەڵام لە"برێنشتان" ناکرێت کەپێی دەڵێ: «تۆ وەڵامی پرسیارەکەت نەدامەوە».

ئێستا کێ دەیەوێت ببێت بەسیاسەتمەدار؟ کێ دەیەوێت هەموو تەمەنی لەپاڵ ئەو تەختەڕەشەوەڵامی پرسیار بداتەوە؟ بە دڵنیاییەوەئەو کەسەکوڕی "بێرتراند بێرتراند"ی پارلەمانتار نییە.

## ئیماگۆلۆژی

سیاسییەکان وابەستەبە ڕۆژنامەوانەکانن. ئەی ڕۆژنامەوانەکان وابەستەبەکێن؟ بەو کەسانە کەپارەیان دەدەنێ. ئەوانەش کەپارەیان دەدەنێ کۆمپانیاکانی ڕیکلامن کەجێ لەڕۆژنامەکان و کات لەڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان دەکڕن. لەسەرەتادا وا دیارەکەکۆمپانیاکان خێرا دەچن بۆ لای ئەو ڕۆژنامانەکەتیراژیان زۆرەو توانای زیادکردنی فرۆشی بەرهەمەکانیان هەیە، بەڵام ئەمەدیدێکی سادەو ساویلکانەیە. فرۆشی بەرهەمەکان ئەوەندەگرینگ نییەکەئێمەپێمان وایە. سەیری وڵاتەکۆمۆنیستییەکان بکەن، ملوێنەها ڕەسمی لینین بەهەموو کوێدا بڵاوبووەتەوە، بەڵام ئەمانەخۆشویستنی زیاتری لینینی لێ ناکەوێتەوە. کۆمپانیاکانی ڕیکلامی حیزبی کۆمۆنیست (بەشەکانی بە ناو پرۆپاگەندەو گەشەپێدان) لەمێژەمەبەستی چالاکییەکردەییەکەی خۆیان (کەخۆشەویستکردنی سیستەمی کۆمۆنیستییە) لەبیر کردووە و خۆیان بوون بە مەبەست بۆ خۆیان. ئەوانەزمانی خۆیان، ڕێساکانی خۆیان، ستاتیکای خۆیان (سەرانی ئەم کۆمپانییانەسەردەمێک لەوڵاتەکەیان سوڵتەی تەواویان بەسەر هونەردا بوو) و بیرۆکەی خۆیان بۆ شێوازێکی شایستەی ژیان داهێناوە. کۆمپانیاکان ئەم شتانەپەروەردەدەکەن، بڵاوی دەکەنەوەو بەسەر خەڵکەداماوەکەی خۆیاندا دەیسەپێنن.

ئایا ئێوەلەوەبەگلەیین کەگوایەناکرێت ڕیکلام و پرۆپاگەندە، کەیەکەمیان لە خزمەتی تیجارەت و ئەوی دیکەیان لەخزمەتی ئایدیۆلۆژیدایە، پێکەوەبەراورد بکرێت؟ ئەگەر وایەهیچ نازانن. نزیکەی

سەد ساڵ لەمەوپێش، لەڕووسیا، ئەو مارکسیستانەکەبە نهێنی دەژیان، لەدەستەی بچووک بچووکدا کۆدەبوونەوەو مانیفیستی مارکسیان دەخوێندەوە. ئەوان ناوەڕۆکی ئەم بیرۆکەسادەیان، بۆ بڵاوکردنەوەلەناو دەستەکانی دیکەدا سادەتر دەکردەوە. ئەندامانی ئەم دەستانەش ئەم بیرۆکەئایدیۆلۆژیکییەسادەی سادەکراوەیان، دیسان سادەتر دەکردەوەو هەروا دەستاودەست دەیانگێڕا. کاتێک ناوبانگی مارکسیست بەهەموو دنیادا بڵاوبووەوەو بەهێز بوو، ئەوەی لە ئەنجامدا لەم بیرۆکەمایەوەشەش، یان حەوت دروشم بوو کە ئەوەندە هەژارانەلێکدرابوون بە گران دەکرا پێی بگوترێت ئایدیۆلۆژی؛ بۆیەئەوەی ئێستا لەمارکس ماوەتەوەسیستەمێکی لۆژیکیی بیرۆکەکان نییە، بەڵکو زنجیرەیەک وێنەو دروشمی پێشنیازکراوی وەک کرێکارێکی دەم بەبزەی چەکوش بەدەست، کۆمەڵەپیاوێکی ڕەش و سپی و زەرد کەوەک برا دەستی یەکترییان گرتووە، کۆتری ئاشتی کەبەئاسماندا هەڵدەفڕێت و... هتد. ئێستا ئێمەدەتوانین بەڕاست باسی گۆڕانی بەکاوەخۆ و گشتی و هەسارەیی ئایدیۆلۆژی بۆ ئیماگۆلۆژی بکەین.

ئیماگۆلۆژی! کێ بۆ یەکەم جار بیری لە ڕۆنانی ئەم وشەسەرنجڕاکێشەکردووەتەوە؟ "پاول"، یان من؟ گرینگ نییە. گرینگ ئەوەیەکە بەم وشەیە دەتوانین ئەو شتە بخەینەژێر سەقفێکەوەکەکۆمەڵێک ناوی زۆر وەردەگرێت. وەک: کۆمپانیاکانی ڕیکلامکردن، بەڕێوەبەرەکانی هەڵمەتی هەڵبژاردن، ئەو دیزاینەرانەکەهەموو شتێک، لە ئۆتومبێلەوەبگرەتا ئامێرەکانی ژیمناستیک دیزاین دەکەن، دیزاینەرەکانی فەشن، ڕازێنەرەکان، ئەستێرەی نمایشەتیجارییەکان کەنۆڕمەکانی جوانیی لەش، ئەو

نۆرمانەکە هەموو لقەکانی ئیماگۆلۆژی پەیڕەوییان لێدەکەن، دیاری دەکەن.

ئەڵبەت ئیماگۆلۆگەکان ماوەیەکی زۆر لەپێش دامەزراندنی ئەو دامودەزگا بەهێزانەکەئەمڕۆ ئێمەدەیانناسین، بوون؛ تەنانەت هیتلەریش ئیماگۆلۆگی تایبەت بەخۆی هەبووەکەبەرامبەری ڕاوەستاوە و بەوپەڕی سەبر و تاقەتەوەئەو جووڵانەی فێرکردووەکەدەبوایەلە ماوەی وتاربێژییەکانیدا، بۆ سیحرکردنی جەماوەر بیانکات. بەڵام ئەگەر ئەم ئیماگۆلۆگە، بۆ سەرقاڵکردنی ئاڵمانییەکان، لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیدا بیگوتایە، هیتلەر تەنانەت ناتوانێت دەستیشی بجووڵێنێت، چەند سەعات دوای ئەم ناپارێزییەی سەریان بە گۆمدا دەکرد، بەڵام ئەمڕۆ ئەم ئیماگۆلۆگەنەک هەر هەوڵ بۆ شاردنەوەی کارەکەی نادات، بەڵکو زۆرجار لەبری مشتەرییەسیاسییەکەشی دەدوێت. ئەو بەخەڵک دەڵێت کەسیاسییەکانی فێرکردووەچی بکەن و چی نەکەن، دەبێ چۆن هەڵسوکەوت بکەن، پەیڕەوی لە کام یاسا و ڕێسا بکەن و چ بۆینباخێک ببەستن. پێویست ناکات بەم متمانەبەخۆبوونەیان داچڵەکێین. لەم چەند دە ساڵەی دواییدا ئیماگۆلۆژی لەبەرامبەر ئایدیۆلۆژی سەرکەوتنێکی مێژوویی بەدەست هێناوە.

هەموو ئایدیۆلۆژییەکان شکستیان خواردووە. لەکۆتاییدا پەردەکانی وەهم لەسەر حوکمەدۆگماکانی ئایدیۆلۆژی هەڵدراونەتەوەو ئیتر خەڵک بەجیددی وەریان ناگرێت. بۆ نموونە کۆمۆنیستەکان پێیان وابوو پرۆلیتاریا لەڕەوتی پێشکەوتنی بورژوازیدا وردەوردە هەژار و هەژارتر دەبێت، بەڵام کاتێک کەدەرکەوت کرێکارەکان لە هەموو ئەوروپادا بەئۆتۆمبێلی خۆیان دەچنەسەر کار، ویستیان هاوار بکەن کەڕاستییەکان خەریکەفریویان

دەدات. ڕاستییەکان لە ئایدیۆلۆژی بەهێزتر بوون و ئەمەش بەمانای پێشکەوتنەوەی ئیماگۆلۆژی لەئایدیۆلۆژییە. ئیماگۆلۆژی لەڕاستیش بەهێزترە، لەو ڕاستییەکە لەمێژە ئەوەنەماوە کە دایەگەورەم پێی وابوو. دایەگەورەم لە گوندێکی مۆراڤیایی دەژیا و هەموو شتێکی لەڕێگەی تاقیکردنەوەی خۆیەوەدەناسی: نان چۆن دەکرێت، خانوو چۆن سازدەکرێت، چۆن بەراز سەردەبڕن و گۆشتەکەی دووکەڵ دەدەن، لێفەلەچی سازدەکەن، قەشەو مامۆستای قوتابخانەچۆن بیر لە دنیا دەکەنەوە. ئەو، هەموو ڕۆژێک خەڵکی گوندەکەی دەبینی و دەیزانی لە دەساڵی ڕابوردوودا چەند کەسیان لێ کوژراوە. دەکرێ بڵێین ئەو ڕاستەوخۆ چاودێریی ڕاستییەکانی دەکرد و کەس نەیدەتوانی فریوی بدات و لەکاتێکدا خەڵک هیچیان بۆ خواردن شک نەدەبرد، پێی بڵێت کشتوکاڵ لەموراڤیا لەگەشەسەندندایە. لە پاریس، دراوسێکەم لەئیدارەئیش دەکات، ئەو هەشت سەعات بەرەوڕووی هاوکارێکی دادەنیشێت، پاشان سواری ئۆتۆمبێلەکەی دەبێت و دەڕواتەوەبۆ ماڵەوە، تەلەفزیۆنەکەی هەڵدەکات، کاتێک بێژەرەکەپێی ڕادەگەیەنێت کەلە دواهەم ڕاپرسیی گشتیدا زۆربەی فەڕەنسییەکان وڵاتەکەی خۆیان بەئەمنترین وڵاتی ئەوروپا دەزانن (من لەم دواییانەدا ڕاپۆرتێکی لەم شێوەم خوێندەوە) خۆشحاڵ دەبێت و بێ ئەوەهەرگیز بزانێت کەلەو ڕۆژەدا لەشەقامەکەی خۆیان سێ دزی و دوو پیاوکوژی ڕووی داوە، بتلێک شامپانی هەڵدەپچڕێت.

ڕاپرسییەگشتییەکان ئامێرێکی گرینگی دەسەڵاتی ئیماگۆلۆژین، چونکەئەو دەرفەتەبۆ ئیماگۆلۆژی دەڕەخسێنن کەلەگەڵ خەڵک لەهاواهەنگییەکی ڕەهادا بن. ئیماگۆلۆگەکان بەردەوام ئەم پرسیارانە لە خەڵک دەکەن: ئابووریی فەڕەنسا چۆن لەپێشکەوتندایە؟ ئایا لەفەڕەنسا ڕەگەزپەرستی هەیە؟ ڕەگەزپەرستی چاکە، یان خراپ؟

گەورەترین نووسەری هەموو سەردەمەکان کێیە؟ ئایا هەنگاریا لە ئەورووپایە،یان لەپۆلێنزیا؟ لەسیاسییەکانی دنیا کامیان لە هەموویان سێکسیترە؟ هەروەها، چونکەواقیع بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمەهەرێمێکەکەدرەنگ درەنگ سەردانی دەکات و پێشی خۆش نییە، ئەنجامەکانی ڕاپرسی، بوون بەجۆرێک واقیعی باڵا. بە گوتنێکی دیکە، ئەوانەبوون بە ڕاستی. ڕاپرسیی گشتی مەجلیسێکەکە هەمیشەهەیەو ئەرکەکەشی دروستکردنی ڕاستییەکانە، ئەویش دێمۆکراتیترین ڕاستییەک کە تا ئێستا هەبووە. لەبەر ئەوەی کەدەسەڵاتی ئیماگۆلۆگەکان هەرگیز دژایەتییەکی لەگەڵ پارلەمانی ڕاستی نابێت، دەسەڵاتی ئیماگۆلۆگەکان هەمیشەلەڕاستییدا دەژی و هەر چەندەدەزانم هیچ شتێکی ئینسانی تا سەر نییە، بەڵام ناتوانم وێنای شتێک بکەم کەبتوانێت ئەم دەسەڵاتەتێکبشکێنێت.

من دەمەوێ شتێکی دیکەش بەبەراوردی نێوان ئایدیۆلۆژی و ئیماگۆلۆژی زیاد بکەم: ئایدیۆلۆژی وەک کۆمەڵە چەرخێکی مەزنەکەلەپشت دیمەنەکەوەدەسوورێت و بەو سوورانەی دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی شەڕ و شۆڕش و چاکسازییەکان. چەرخەکانی ئیماگۆلۆژی بەبێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەک لەسەر مێژوو دابنێن، دەسوورێن. ئایدیۆلۆژییەکان لەگەڵ یەکتر بەشەڕ هاتن و هەرکامەیان توانیان کۆی سەردەمێک بەفکری خۆیان پڕبکەنەوە. ئیماگۆلۆژی، بە خۆشییەوە، جێگرتنەوەی ئاشتیخوازانەی سیستەمەکانی خۆی لەگەڵ ڕیتمی گۆڕانی وەرزەکان ڕێک دەخات. بە گوتەی پاول: ئایدیۆلۆژی شتێکی مێژووییە، بەڵام سەڵتەنەتی ئیماگۆلۆژی لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کەمێژوو کۆتایی دێت.

وشەی گۆڕان کەبە لای ئەورووپییەکانەوەزۆر بەڕێزە، ئێستا ئیدی مانایەکی تازەی هەیە: ئیدی گۆڕان (بەو شێوەکەڤیکۆ، هێگل،

یان مارکس تێی دەگەیشتن) بە مانای قۆناغێکی نوێی پەرەسەندن نییە، بەڵکو گۆڕانێکەلەلایەکەوەبۆ لایەکی دیکە، لەپێشەوەبۆ دواوە، لە دواوەبۆ لای چەپ، لەچەپەوەبۆ پێشەوە(وەک تێگەیشتنی دیزاینەرەکان کە جلوبەرگی وەرزەکەی دیکەش دیزاین دەکەن). ئیماگۆلۆگەکان بڕیاریان دا هەموو دیوارەکانی ئەو یانەی تەندروستییەکە"ئەگنێس" دەچوو بۆ ئەوێ، بەئاوێنەی گەورەداپۆشن. ئەم کارەیان بۆ ئەوەنەکرد کەژیمناستەکان دەیانویست لەکاتی وەرزشکردنندا سەیری لەشی خۆیان بکەن، بەڵکو بۆ ئەوەیان کرد کەئەمجارەنۆرەبەختی ئاوێنەبوو. ئەگەر ئەو کاتەکەمن ئەم لاپەڕانەم دەنووسی هەموو کەس بڕیاری بدایە"مارتین هایدگەر" بەپیاوێکی ساختەچی و زۆڵ بزانێت، لەبەر ئەوەنەبوو کەفەیلەسووفەکانی تر ئەفکاری ئەویان تێپەڕاندووە، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کەئەمجارەلە چەرخی ئیماگۆلۆژیدا، بیتاقەی بێبەختی بۆ ئەو دەرچووە و تا ئاستی دژەئایدیالێک دابەزیوە. ئیماگۆلۆگەکان سیستەمی ئایدیالی و دژەئایدیالی چێ دەکەن، سیستەمی کورتخایەن کەزوو جێگەی خۆیان بەسیستەمی دیکەدەدەن، ئەو سیستەمانەکە کار دەکەنەسەر ڕەفتارمان، بیروباوەڕی سیاسیمان، سەلیقەی ستاتیکیمان، ڕەنگی فەرشەکانمان و هەڵبژاردنی کتێبەکانمان؛ ڕێک بەو شێوەکەلە ڕابوردوودا لەژێر کاریگەریی سیستەمەئایدیۆلۆژییەکاندا بووین.

دوای ئەم قسانەدەتوانم بگەڕێمەوەبۆ سەرەتای باسەکەمان. سیاسییەکان وابەستەبەڕۆژنامەوانەکانن. ئەی ڕۆژنامەوانەکان وابەستەبەکێن؟ ئەوانیش وابەستەبە ئیماگۆلۆگەکانن. ئیماگۆلۆگ کەسێکی خاوەن بیروباوەڕ و مەبدەئییە. ئەو داوا لەڕۆژنامەوان دەکات کەڕۆژنامەکەی (یان کەناڵی تەلەفزیۆن و وێستگەی ڕادیۆکەی)، سیستەمی ئیماگۆلوژیکیی ساتەوەختێکی دیاریکراو بنوێنێتەوە. ئەمە

ئەو کارەیەکە ئیماگۆلۆگەکان، کاتێک دەیانەوێت بڕیار لە پشتیوانیکردنی ڕۆژنامەیەک بدەن، جاروبار بەم شێوەتاقیی دەکەنەوە. ڕۆژێک ئەوان سەرنجیان بەرەو ئەو وێستگەی ڕادیۆیەڕاکێشرا کە"بێرنارد" لەوێ ڕاڤەکار بوو، "پاول"یش ڕۆژانی شەممە پڕۆگرامەتایبەتییەکەی خۆی، "ماف و یاسا"ی لێ بڵاودەکردەوە. ئەوان بەڵێنیان دا کەڕیکلامێکی زۆریان بدەنێ و بەبڵاوکردنەوەی پۆستەر لەهەموو فەڕەنسادا پڕۆپاگەندەیان بۆ بکەن، بەڵام بۆ ئەو پشتیوانیکردنە کۆمەڵێک مەرجی تایبەتیان بوو کە بەڕێوەبەری پڕۆگرامەکان، کەبە ورچ ناسرابوو، ناچاربوو بەقسەیان بکات. ئەو وردە وردە، بۆ ئەوەی بیسەرەکان لەو قسەوباسەدووورودرێژانەماندوو نەبن، دەستی بەکورتکردنەوەی ڕاڤەکان کرد. ئەو ڕێگەی دا لەپێناوی ڕەخساندنی هەلومەرجی وتووێژ، ئەو پێنج خولەک تاکبێژییەی ڕاڤەکارەکەش بقرتێنن کەپرسیاری ئاڕاستەی وێستگەیەکی دیکە دەکرد. ئەو مۆسیقایەکی زیاتری خستەناو پڕۆگرامەکەوە، تەنانەت زۆرجار لەباکگراوندی قسەکاندا مۆسیقای بڵاودەکردەوەهەرکەس دەچووەپشت مایکرۆفۆنەکەداوای لێ دەکرد بەحاڵەتێکی ئاسوودەی گەنجانەو بێدەربەستانەوەبدوێت، ئەو حاڵەتەکە خەونی بەیانیانی من پڕ دەکات لەخۆشی و هەواڵەکانی کەشوهەواش وەک ئۆپەرایەکی کۆمێدی بڵاودەکاتەوە. جا چونکەبەڕێوەبەر بەلایەوەگرینگ بوو کەفەرمانبەرەکانی وەک هەمیشەبەورچێکی بەهێزی بزانن، ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا کەهاوکارەکانی نانبڕاو نەکات. ئەو تەنیا جارێک تەسلیم بوو؛ ئەویش کاتێک ئیماگۆلۆگەکان پڕۆگرامی "ماف و یاسا"یان ئەوەندەبەلاوەبێزارکەر بوو کەبێجگەلە تیزەبزەیەک هیچ قسەیەکیان لەسەر نەکرد، کاکی ورچ وەعدی پێدان ئەو پڕۆگرامە دابخات، بەڵام چونکەپاول هاوڕێی بوو، دواتر لەو تەسلیمبوونەی شەرمەزار بوو.

## هاوڕێی ئازیزی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆی

بەبەڕێوەبەری پرۆگرامەکەیان دەگوت "ورچ"، چونکەهەر ئەو ناوەی لێ دەوەشایەوە. ئەو کەسێکی زەبەلاحی خاووخلیچک بوو. هەرچەندە دڵپاک بوو، بەلام هەموویان دەیانزانی لەکاتی تووڕەبووندا دەتوانێت دەستیش بوەشێنێت. کاتێک ئیماگۆلۆگەکان ئەوەندەپێیان لێ ڕاکێشا کەپێی بڵێن چۆن کارەکەی بکات، دوا دڵۆپی چاکییەکەیان هەڵمژی. ئەو لە کافەتریای ڕادیۆکە، لەناو چەند هاوکارێکیدا دانیشت و گوتی:

«ئەو دزانەی کۆمپانیای ڕیکلام لەمرۆڤی هەسارەی مەریخ دەچن. ئەوان وەک خەڵکی ئاسایی هەڵسوکەوت ناکەن. کاتێک بەرەوڕووی خۆت قسەی ناخۆشت پێ دەڵێن، چاوەکانیان دەبریسکێتەوە. کۆی وشەکانیان لەپەنجا وشەتێناپەڕێت و ڕستەکانیشیان لەچوار وشەزیاتر نییە. ئەوەی دەیڵێن تێکەڵەیەکەلەسێ زاراوەی تەکنیکی کە من تێی ناگەم و یەک دوو بیرۆکەی ئاسایی ترسناک. ئەوان شەرم لەوە ناکەن کە خۆیان بن و بچووکترین گرێی خۆبەکەمزانینیشیان نییە. هەر ئەوەش هۆکاری سەرەکیی هێز و دەسەلاتەکەیانە».

لەم کاتەدا پاول خۆی بەکافەترياکەدا کرد. هاوڕێکانی کە چاویان پێی کەوت تێکچوون، چونکەئەو زۆر خۆشحاڵ بوو. کووپێک قاوەی هەڵگرت و چوو بۆ لایان.

ورچ لە لای پاول هەستی بەئاسوودەیی نەدەکرد. شەرمەزار بوو کەفرێی دابووەبەر دەمی ئەو گورگانەو ئێستاش نەیدەوێرا بەرەورووی خۆی پێی بڵێت. شەپۆلێکی تازەی ڕق و نەفرەت لەئیماگۆلۆگەکان هەموو گیانی داگیر کرد و گوتی:

«من ئامادەم لەکاتی خۆیدا تەسلیمی ئەم گێل و نوقستانانە ببم و هەواڵەکانی کەشوهەوا بەشێوەی وتووێژی نێوان دوو گەمژەی گاڵتەجار بڵاوبکەمەوە، بەڵام کێشەکەلەوەدایەکەڕێک لەدوای ئەم هەواڵانە، ڕەنگەبێرنارد باسی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەیەک بکات کەسەد کەسی تێدا کوژراوە. من ڕەنگەبمەوێت بۆ سەرقاڵکردنی هاوولاتییەفەڕەنسییەکانم خۆم فیدا بکەم، بەڵام خۆ گاڵتە بە هەواڵەکان ناکرێت!»

هەموویان، جگەلە پاول، وەها سەیریان کرد کەدەتگوت قسەکانی بۆ دەسەلمێنن، بەڵام پاول وەک کەسێک کەبە تەمای هاندانی ئەوانی تر بێت، بەخۆشییەوەپێکەنی و گوتی:

«ورچی ئازیز! ئیماگۆلۆگەکان ڕاست دەکەن! تۆ هەواڵەکانت لەگەڵ وانەگوتنەوەی قوتابخانەلێ تێکچووە!».

ورچ بیری کەوتەوەئەو کاتانەکەڕاڤەکانی پاول زۆر ژیرانەبوون بە هەمان ئەندازەش ئاڵۆز و پڕ لەوشەی سەیر و نائاسایی بوون و هاوکارەکانی بۆ ئەوەی تێی بگەن دەبوایەبە دزییەوەسەیری قاموس بکەن، بەڵام ئێستا پێی خۆش نەبوو باسی ئەوەبکات و بەویقارەوەگوتی:

«من هەمیشەبڕوای تەواوم بەڕۆژنامەوانی هەبووەو نامەوێت لەدەستی بدەم».

پاول گوتی:

«گوێگرتن لەهەواڵەکان وەک ئەوەیەجگەرەیەک بکێشین و لەتەپڵەکێکدا بیکووژێنینەوە».

ورچ گوتی:

«هەر بۆیەقبووڵکردنی شتی وا بۆ من زۆر دژوارە».

پاول پێکەنی:

«بەڵام خۆ تۆ لەمێژەجگەرەدەکێشیت! ئەی بۆ بەلاتەوەسەختەکەبڵێم هەواڵ وەک جگەرەیە؟ جگەرەبۆ تەندروستی خراپە، بەڵام هەواڵ نەک هەر زیانێکی بۆت نییە، بەڵکو بەر لە دەستپێکردنی ڕۆژێکی درێژ، سەرقاڵییەکی خۆشیشە».

ورچ کەخۆشەویستییەکەی بۆ پاول وردەوردە تێکەڵ بەتووڕەیی دەبوو، لێی پرسی:

«شەڕی نێوان ئێران و عیراق سەرقاڵییە؟ کارەساتەکانی ئەمڕۆ، لەهێڵلادانی ئەو شەمەنەفەرە، ئەمانەبۆ تۆ سەرقاڵین؟»

پاول کە دیاربوو ئەم بەیانییەبەخۆشییەوەلەخەو هەستاوە، گوتی:

«تۆش وەک هەموو ئەو کەسانەکەپێیان وایەمردن کارەساتە، بەهەڵەداچوویت».

ورچ بەلەحنێکی سارد گوتی:

«ئەوەڕاستەکەمن هەمیشەمردنم بە کارەسات زانیوە».

پاول گوتی:

«بەهەڵەدا چوویت. لەهێڵدەرچوونی شەمەندەفەر تەنیا بۆ ئەو کەسەترسناکەکەبۆخۆی، یان کوڕەکەی لەناو شەمەندەفەرەکەدایە، بەڵام مردن لەهەواڵەکاندا، لە مردنی ناو چیرۆکەکانی "ئاگاتا کریستی" دەچێت، کەبێگومان گەورەترین سیحربازی هەموو سەردەمەکانیشە، چونکەدەیزانی چۆن کوژرانی مرۆڤ بکات بەبابەتێک بۆ سەرقاڵکردن؛ ئەویش نەک کوژرانی تاکەکەسێک، بەڵکو

کوژرانی دەیان و سەدان کەس. زنجیرەکوژرانێک کەلە پێناوی سەرقاڵکردنی ئێمەلەکەمپی مەرگی چیرۆکەکانی ئەودا ڕوودەدەن. ئێستا کەمپەکەی ئاشویتس لە بیر چووەتەوە، بەڵام کوورەی مرۆڤسووتاندنی چیرۆکەکانی "ئاگاتا کریستی" بەردەوام دووکەڵی بەرەو ئاسمان دەچێت و تەنیا کەسێکی ساویلکەئەم دووکەڵەبەکارەسات دەزانێت».

ورچ بیری کەوتەوەکەپاول بەسوودوەرگرتن لەم جۆرە پارادۆکسانە بوو کە ماوەیەکی زۆر لەژووری هەواڵەکان هاوکارەکانی دەخستەژێر کاریگەریی خۆیەوە. بۆیەکاتێک فەرمانبەرەکان کەوتنەبەر لێکۆڵینەوەی وردی ئیماگۆلۆگەکان، نەیانتوانی یارمەتییەکی ئەوتۆی سەرۆکەکەیان بدەن، چونکەهەموویان لە ناخی خۆیاندا بۆچوونەکانی ئەویان بەکۆن دەزانی. ورچ لەتەسلیمبوونەکەی خۆی شەرمەزار بوو، بەڵام دەیزانی هیچ چارێکی دیکەی نەبووە. ئێمە ناتوانین خۆمان لەم ڕێکەوتنەناچارییەلەگەڵ ڕۆحی سەردەمەکە، هەر چەندەسادەو ئاساییش بێت، دەرباز بکەین. مەگەر ئەوەی کە داوای مانگرتنی بەکۆمەڵ لەهەموو ئەو کەسانەبکەین کە ئەم سەدەیەیان خۆش ناوێت، بەڵام بەنیسبەت پاولەوەناکرێت بڵێین ڕێکەوتنێکی ناچاری بوو. ئەو دەیویست خۆبەخشانە، بە حەز و خواستی خۆی و بەپێی ئارەزووی ورچ، عەقڵ و هۆشی تەسلیمی سەدەکەی بکات. بۆیەورچ بە لەحنێکی لەجاران ساردتر وەڵامی دایەوە:

«منیش کاتێک ماندوو دەبم، کاتێک حەز دەکەم منداڵ ببمەوە، ئاگاتا کریستی دەخوێنمەوە! بەڵام ئەگەر هەموو ژیانمان ببێت بەیارییەکی منداڵانە، ڕوژێک دنیا بەهەراهەرا و لیقەلیقی پێکەنینی منداڵانەی ئێمە دەمرێت».

پاول گوتی:

«من ئەوەم پێ چاکترە کە بە هەراهەرا و لیقەلیقی منداڵان بمرم، نەک بەدەنگی مارشی شینگێڕی شۆپن. حەزدەکەم ئەوەشت پێ بڵێم کەهەموو خراپەی دنیا لەو مارشە شینگێڕییەدایەکەڕێز لەمردن دەگرێت. ئەگەر مارشە شینگێڕییەکان کەمتر بوونایە، ڕەنگە خەڵکێکی کەمتریش بمردنایە. تێبگەدەمەوێ چیت پێ بڵێم: ڕێزگرتن لەکارەسات لەبێفکری و لیقەلیقی منداڵان ترسناکترە. تۆ دەزانی پێشمەرجی هەمیشەیی کارەسات چییە؟ بوونی ئەو ئایدیالانەیە کەکارەساتیان بەلاوە لەژیانی مرۆڤ بەڕێزترە. ئەی پێشمەرجی مردن چییە؟ هەر ئەوەیەکە گوتم. ئەوان بەرەو مردن پاڵت پێوەدەنێن، چونکەپێیان وایەشتێکی گەورەتر لەژیانی تۆ هەیە. شەڕ تەنیا دەتوانێت لەدنیای تراژدیا و کارەساتدا ببێت، مرۆڤ لەسەرەتای مێژووەوەتەنیا دنیای کارەسات و تراژدیای ناسیوەو نەیتوانیوەلێی تێپەڕ بێت. سەردەمی تراژدیا تەنیا بەشۆڕشی سووکی و بێهوودەیی کۆتایی دێت. ئێستا ئیتر خەڵک لەڕێگەی کۆنسێرتەکانەوەپەی بەسەمفۆنیای نۆی بتهۆڤن نابەن، بەڵکو بەچوار دێڕ سروودی شادی پەی پێدەبەن کەهەموو ڕۆژێک لەڕیکلام بۆ بۆنی بێلا گوێیان لێ دەبێت. ئەمەمن ناترسێنێت. کارەسات وەک ئەکتەرێکی پیری ناحەز کە دەست بەسنگییەوەدەگرێت و شاتوشووت دەکات، لەم دنیایە دەردەکرێت. سووکی و پووچی خواردنێکی بونیادییەبۆ دابەزاندنی کێش. شتەکان لەسەدا نەوەدی ماناکانیان دەدۆڕێنن و سووک دەبن. لەژینگەیەکی ئاوا بێکێشدا، دەمارگرژی ون دەبێت و ئەگەری شەڕیش نامێنێت.

ورچ گوتی:

«خۆشحاڵم کەئاخرییەکەی ڕێگەیەکت بۆ نەهێشتنی شەڕ دۆزیوەتەوە».

«ئایا دەتوانی وێنای ئەوەبکەیت کەئەمڕۆ گەنجێکی فەڕەنسی بەجۆشوخرۆشەوەشەڕ بۆ وڵاتەکەی بکات؟ ورچی ئازیز، ئێستا ئیتر لە ئەورووپا بیر لەشەڕ ناکرێتەوە. لە لایەنی سیاسییەوەنا، لە ڕوانگەی خەڵکناسانەوەبیری لێ ناکرێتەوە. خەڵکی ئەورووپا ئیتر توانای بەرپاکردنی شەڕیان نییە».

پێم مەڵێن دوو کەس کەتەواو بەپێچەوانەی یەکتر بیر دەکەنەوە، هێشتا دەتوانن یەکتریان خۆشبوێت. ئەمەلە ئەفسانە دەچێت. ئەوان ئەگەر بۆچوونەکانی خۆیان نەدەرکاندایە، یان بە گاڵتەوەباسیان بکردایەو بەو شێوەلەگرینگیی بۆچوونەکانیان کەم بکردایەتەوە، ڕەنگەیەکتریان خۆش بویستایە(لەڕاستیدا ئەمەئەو شێوازەبوو کەتا ئێستا ورچ و پاول پێکەوەدوابوون)، بەڵام کاتێک ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند، ئیتر زۆر درەنگە؛ نەک چونکەبڕوای تەواویان بەبۆچوونی خۆیان هەیە، نا، چونکەتەحەمولی ئەوەناکەن حەق بە خۆیان نەبێت. هەر سەیری ئەم دوو کەسەبکەن؛ لەگەڵ ئەوەدا کەشەڕ و دەمەقاڵەکەیان هیچ ناگۆڕێت، هیچ بڕیارێکی لێ ناکەوێتەوە، هیچ کاریگەرییەک لەسەر ڕووداوەکان دانانێت، تەواو بێسوود و ناپێویستە، تا ژنەخزمەتکارەکەپەنجەرەکان نەکاتەوەلەهەوای ناو کافەتریاکەدەرناچێت، بەڵام سەیری لێوردبوونەوەی قووڵی کەسەکانی دەوروبەریان بکەن! هەموویان بێدەنگ بوون، بەوردی گوێیان گرتووە، تەنانەت لە بیریان چووەتەوەقاوەکانیان بخۆنەوە. ئێستا ئیتر ئەم دوو ڕەقیب و مونافسەتەنیا بیر لەیەک شت دەکەنەوە: بەبۆچوونی ئەو چەند کەسەی دەوروبەریان، حەق بەکامەیانەو کامەیان ڕاست دەکەن؟

چونکە هەڵەبوونی هەرکامەیان وەک تیاچوونی شەرفیان، یان تیاچوونی بەشێک لە خودی خۆیانە. ئەوان ئەو بۆچوونانەیان زۆر بەلاوە گرینگ نییە کەپێی لەسەر دادەگرن، بەڵام مادام ئەو بۆچوونانەیان کردووەبەتایبەتمەندی و سفەتێک بۆ خودی خۆیان، کەواتەهەر هێرشێک بۆ سەر بۆچوونەکەیان وەک چەقۆیەکە کەلەپارچەیەکی لەشیان دەدرێت.

ورچ بۆ ئەوەکەئیتر پاول نەیدەتوانی ئەو ڕاڤەئاڵۆز و ناڕەسەنانەی دەرببڕێت، لە قووڵایی دڵیەوەهەستی بەئاسوودەیی دەکرد. دەنگی تەژی غرووریکی ورچانە، ئارامتر و ساردتر دەبوو. لەولاترەوەپاولیش هەروا بەرز و بڵیند دەدواو، بۆچوونەکانی بەردەوام زێدەڕویانەتر و هاندەرانەتر دەبوون. ئەو گوتی:

«فەرهەنگی باڵا هیچ نییەجگەلەمنداڵیی ئەو لادانەئەوروپییەکەپێی دەگوترێت مێژوو. وەسواسێکەکە بەهۆی بەرەوپێش چوونەوەتووشی بووین، بەهۆی ئەوەوەکەبەردەوامیی نەوەکانمان وەک کێبەرکێی غاردان دێتە پێشچاو کە هەموو کەس هەوڵدەدات پێش کەسەکەی بەر لەخۆی بکەوێتەوە، تا کەسەکەی دواشییەوەپێش خۆی بکەوێتەوە. بەبێ ئەم کێبەرکێی غاردانەکەپێی دەگوترێت مێژوو، هیچ شتێک بەناوی هونەری ئەوروپی و تایبەتمەندییەکانی، کەبریتین لە ئارەزووی داهێنان و ئارەزووی گۆڕان، بوونی نامێنێت. "ڕۆبسپیەر"، "ناپلیۆن"، "ستالین"، "پیکاسۆ"، هەموویان لەم کێبەرکێی غاردانەدان؛ هەموویان ئەندامانی یانەیەکن».

ورچ بەتەوسێکی ساردەوەپرسیی:

«جا بۆ مەگەر بتهۆڤن و ستالین هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوەهەیە؟»

«بێگومان. گرینگ نییەتۆ چەندەسەرت سووڕدەمێنێت. شەڕ و فەرهەنگ دوو جەمسەری ئەوروپان. بەهەشت و دۆزەخەکەیان، شانازی و نەنگییەکەیان لێک جودا ناکرێتەوە. کاتێک یەکێکیان کۆتایی دێت، ئەوی دیکەشیان کۆتایی دێت و یەکێکیان ناتوانێت بەبێ ئەوی دیکەیان کۆتایی بێت. ئەوەکە لەپەنجا ساڵی ڕابوردوودا هیچ شەڕێک لە ئەوروپا ڕووی نەداوە، بەشێوەیەکی سەمبولیک پەیوەندیی بەم ڕاستییەوەهەیەکەلەماوەی ئەم پەنجا ساڵەدا هیچ پیکاسۆیەکی تازەش دەرنەکەوتووە».

ورچ بەدەنگێکی لەسەرخۆ، وەها کەمستەکۆڵەی قورسی بۆ زەربەتێکی توند بەرز بکاتەوە، گوتی:

«بێڵەبا شتێکت پێ بڵێم پاول: ئەگەر فەرهەنگی باڵا خەریکەکۆتایی دێت، هاوکات بەمانای کۆتاییهاتنی تۆ و بیرۆکە دژوازەکانیشتە، چونکەئەم جۆرەدژوازی و پارادوکسانەهی فەرهەنگی باڵان، نەک فرەوێژیی منداڵانە. تۆ ئەو پیاوەگەنجانەم بیر دەهێنێتەوەکەنەوەک لەبەر ترسنۆکی، یان هەلپەرستی، بەڵکو بەوپەڕی تێفکرینەوە دەبوون بەنازی، یان کۆمۆنیست. ئاخر هیچ شتێک بەقەدەر بەڵگەهێنانەوەبۆ پاساوی بێفکری، پێویستی بەفکر نییە. من لەپاش شەڕ، کاتێک ڕۆشنبیران و هونەرمەندان وەک ڕانەمەڕ چوونەناو حیزبەوە و پاش ماوەیەک بەشێوەیەکی سیستەماتیک و بەخۆشییەوەهەموویان فەوتاندن، بەچاو و گوێی خۆم ئەمەم ئەزموو. تۆش هەر وەک ئەوان دەکەیت. تۆش هاوڕێی ئازیزی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆتی.

## کەرێکی تەواو

دەنگی ئاشنای "بێرنارد" لەو ڕادیۆ ترانزیستۆرییەوەکەلەنزیک سەریان بوو، بڵاودەبووەوە. ئەو لەگەڵ ئەکتەرێک کەقەراربوو فیلمەکەی نمایش بکرێت، وتووێژی دەکرد. ئەکتەرەکەدەنگی بەرزکردەوەو ئەو دوانەی لەخەوەسووکەکەیان بەئاگا کردەوە:

«من هاتووم باسی فیلمەکەمتان بۆ بکەم، نەک کوڕەکەم».

دەنگی بێرنارد دەیگوت:

«نیگەران مەبە، فریای فیلمەکەش دەکەوین، بەڵام سەرەتا چەند پرسیارێکت لەبارەی ڕووداوەکانی ئەم دواییانەلێ دەکەم. بیستوومەکەدەڵێن تۆش لەکارەکانی کوڕەکەتدا دەورت هەبووە».

«کاتێک بۆ ئەم وتووێژەلە منت گیڕایەوە، بە ئاشکرا پێت گوتم بەتەمای پرسیاری فیلمەکەم لێ بکەیت. کەواتەبا باسی فیلمەکەبکەین، نەک ژیانی تایبەتیی خۆم».

«تۆ کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتیت و من ئەو شتانەت لێ دەپرسم کەخەڵک حەزدەکەن بیزانن. من بەئەرکی هەواڵنێریی خۆم هەستاوم».

«من ئامادەم وەڵامی ئەو پرسیارانەت بدەمەوەکەپەیوەندییان بەفیلمەکەوەهەیە».

«تۆ چیت پێ خۆشەبا وا بێت، بەڵام گوێگرەکانمان پێیان سەیر دەبێت کەبۆچی خۆت لەوەڵامدانەوە دەدزییەوە».

ئەگنێس لەناو جێگەکەی هاتە دەر. چارەکەسەعاتێک دوای ڕۆشتنی ئەگنێس بۆ سەر کارەکەی، پاولیش هەستا؛ جلەکانی لە بەر کرد و بۆ هەڵگرتنی نامەکانی ڕۆشتەخوار. یەکێک لە نامەکان لە لایەن ورچەوەبوو. ئەو زۆر شتی بۆ نووسیبوو، داوای لێبوردنەکەی تێکەڵ بەجەفەنگێکی تاڵ کردبوو، تا ئەو شتانەی پێ بڵێت کەئێمەپێشتر دەمانزانی: ئەوەی کەئیتر پێویست ناکات لە ڕادیۆ کار بکات.

پاول چوار جار نامەکەی خوێندەوە، پاشان نامەکەی فڕێ دا و چوو بۆ نووسینگە، بەڵام لەوێش هیچ کارێکی پێ نەکرا. نەیدەتوانی بیر لە شتێکی جگەلەو نامەیەبکاتەوە. ئایا ئەو زەربەتەی زۆر بەلاوە قورس بوو؟ لەباری کردەییەوەنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئازاری دەدا. ئەو ساڵانێکی زۆر هەوڵی بۆ ئەوە دابوو کە لەکۆمپانیای مافناسەکان بێتە دەر: لەوەخۆشحاڵ بوو کە توانیبووی سمینارێک لەزانکۆ بەڕێوەببات و لەڕادیۆش پرۆگرامی ببێت. ئەمەبەو مانایەنەبوو کە کاری یاسایی پێ خۆش نەبێت، بەپێچەوانەوە، مشتەرییەکانی خۆشدەویست، دەیویست بەتاوانەکەیان بزانێت و پاساویان بۆ ببینێتەوە. بە گاڵتەوەدەیگوت: «من پارێزەر نیم! من شاعیری پاراستنم!» ئەو بەئەنقەست لایەنی تاوانبار و پێشێلکارانی یاسای دەگرت، لەدنیایەک یاسای دژەمرۆیی کەلە کتێبە گەورەکاندا کۆبووبوونەوە و ئەو وەک کەسێکی پسپووڕی بێزار لەشادی، بە دەستییەوەدەگرتن، بەبێ هیچ تەوازوعێک، خۆی بەخائین، بەتابووری پێنج و شەڕڤان دەزانی. بەپرکێشییەوەپەیوەندیی لەگەڵ خەڵکانی دەرەوەی دادگا، لەگەڵ خوێندکارەکان، کەسایەتییەئەدەبی و میدیاییەکان دەگرت، تا دڵنیا ببێت (نەک تووشی وەهم ببێت) کە یەکێکەلەئەوان. پاول خۆی بەیەکێک لەئەوان دەزانی و ئێستا

لەوەنیگەران بوو کەنامەکەی ورچ، دیسان بۆ دادگا و فەرمانگەی دەناردەوە.

بەڵام شتێکی دیکەش ئەوی ئازار دەدا. دوێنێکە، کاتێک ورچ نازناوی "هاوڕێی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆی" پێ بەخشی، ئەو ئەم نازناوەی وەک تانەیەکی ناسکی بێ بنەما لێکدایەوە. نازناوی "گۆڕهەڵکەنەکان" هیچ مانا و گرینگییەکی تایبەتیی بۆی نەبوو. ئەو دەمە هیچی لەبارەی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆیەوە نەدەزانی، بەڵام ئەمڕۆ، دوای وەرگرتنی نامەکەی ورچ، لەپڕ بۆی ڕوون بووەوەکە گۆڕهەڵکەنەکان هەن و لە بۆسەیدا دانیشتوون و چاوەڕێی دەکەن.

پاول خێرا لەوەتێگەیشت کەخەڵک بەو شێوەسەیری ناکەن کەبۆخۆی سەیری خۆی دەکات و پێی وایەخەڵکیش بەو شێوەسەیری دەکەن. ئەو، لەناو هاوکارەکانی ڕادیۆیدا تاکەکەسێک بوو کەهەرچەندەورچ پشتگیریی دەکرد (گومانی لەو پشتگیرییەش نەبوو)، ناچاربوو کەلەوێ بڕوات. ئەو چی بوو کەڕیکلامچییەکانی ئاوا نیگەران کردبوو؟ ئەوەساویلکانەبوو ئەگەر پێی وا بوایە هەر ئەوان ئەویان قبووڵ نییە. حەتمەن خەڵکی دیکەش ئەویان قبووڵ نەبوو. بێ ئەوەخۆی پێی زانیبێت، دەبێ بەڵایەک بەسەر وێنەکەیدا هاتبێت. دەبێ شتێک ڕووی دابێت کەئەو نازانێت چییەو هەرگیزیش تێی ناگات، چونکەئەم کێشەنەک هەر بۆ ئەو، بەڵکو بۆ هەموو کەسی دیکەش وایە. ئێمەهەرگیز لەوەناگەین کەبۆچی خەڵک لێمان تووڕەو بێزار دەبن؟ لە چیی ئێمەئاوا تووڕەو بێزار دەبن؟ چیی ئێمەئازاریان دەدا؟ چ شتێکی ئێمەیان پێ خۆشەو چیی ئێمەیان پێ مەسخەرەو گاڵتەجاڕییە؟ وێنەی خۆمان بۆ خۆشمان گەورەترین نهێنییە.

پاول کە دەیزانی ئەو ڕۆژەئیتر ناتوانێت بیر لەهیچی دیکە بکاتەوە، تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ، بێرناردی بۆ ڕیستورانتێک دەعوەت کرد.

ئەوان بەرەوڕووی یەکتر دانیشتن. پاول زۆری حەزدەکرد باسی نامەکەی ورچی بۆ بکات، بەڵام چونکەوەک کەسێکی بەئەدەب و ڕێکوپێک بارهاتبوو، سەرەتا گوتی:

«ئەم بەیانییەگوێم لەقسەکانت گرتبوو، ئەو ئەکتەرەت وەکو کەروێشک خستبووەناو داوەوە».

بێرنارد گوتی:

«دەزانم. ڕەنگەزێدەڕۆییم کردبێت، بەڵام حاڵم باش نەبوو. دوێنێ شتێکم بینی کەهەرگیز لە بیرم ناچێتەوە. کەسێکی نەناسیاو هات بۆ لام. پیاوێکی لەخۆم باڵابەرزتر و زۆر سکزل بوو. خۆی پێ ناساندم. بەمیهرەبانییەکی ترسناکەوەزەردەخەنەی بۆ کردم و گوتی: «جێی شانازییەبۆ من کەئەم دیپلۆمەت پێشکەش بکەم»، پاشان لوولەیەکی مەقەبایی گەورەی دایە· دەستم و جەختی لێ کردم کەلەلای خۆی بیکەمەوە. ئەو لوولەمەقەباییەدیپلۆمێکی تێدا بوو؛ دیپلۆمێکی ڕەنگی. خوێندمەوە. نووسرابوو: بەپێی ئەم ڕاگەیەندراوە، بێرنارد بێرتراند کەرێکی تەواوە».

«چی؟»

پاول قاقا پێکەنی، بەڵام کەدی بێرنارد زۆر جیددییەو هیچ نیشانەیەکی گاڵتە و شۆخیی پێوەدیار نییە، بەری بە پێکەنینەکەی گرت. بێرنارد بەدەنگێکی خەمبارەوەدووبارەی کردەوە:

«نازناوی کەرێکی تەواوم وەرگرتووە».

«لەلایەن کێوە؟ ئایا ناوی ڕێکخراوەیەکی پێوەبوو؟»

«نا، هەر واژۆیەکی پێوەبوو کە ئەویش نەدەخوێندرایەوە».

بێرنارد چەند جاری دیکەش هەموو ڕووداوەکەی گێڕایەوەو پاشان گوتی:

«سەرەتا نەمدەتوانی بڕوا بەوەبکەم کە دیبووم. هەستم دەکرد بووم بە قوربانیی هێرشێک. دەمویست هاوار بکەم و پۆلیس ئاگادار بکەمەوە، بەڵام دواتر زانیم کەهیچم پێ ناکرێت. کابرا بە زەردەخەنەوەدەستی بۆ درێژ کردم:

«ڕێگەم بدە با پیرۆزباییت لێ بکەم».

پاول کەبەگران بەری بەپێکەنینەکەی گرتبوو، گوتی:

تەوقەت لەگەڵی کرد؟ هەر بەڕاست سوپاسیشت کرد؟!»

«کاتێک زانیم کە ناتوانم ئەو پیاوەبەگرتن بدەم، ویستم خۆم وا پیشان بدەم کەکەسێکی خۆڕاگرم و بە شێوەیەک ڕەفتار بکەم کەگوایە ئەو ڕووداوە شتێکی ئاساییەو هیچ کاریگەرییەکی خراپی لەسەر من نەبووە».

پاول گوتی:

«دەبێ وا بێت. کاتێک نازناوی کەر بە کەسێک بدەن، وەکو کەریش ڕەفتار دەکات!»

«بەداخەوە، وایە».

«تۆ هەر نەتزانی ئەو پیاوەکێ بوو؟ خۆی پێ ناساندی؟»

«من ئەوەندەپەشۆکابووم کەدەستبەجێ ناوەکەیم لە بیر چووەوە».

پاول دیسان نەیتوانی بەر بەپێکەنینەکەی خۆی بگرێت. بێرنارد گوتی:

«بەڵێ، دەزانم، تۆ دەڵێی هەموو ئەمانەگاڵتەو جەفەنگ بووە. بەڵێ، تۆ ڕاست دەکەیت، گاڵتەبوو، بەڵام من نەمدەتوانی بەری پێ

بگرم. لەو کاتەوەتا ئێستا خەریکم بیری لێ دەکەمەوەو ناتوانم بیر لە هیچی دیکەبکەمەوە».

پاول وازی لەپێکەنین هێنا، چونکەزانیی کەبێرنارد ڕاست دەکات. بێگومان ئەو لەدوێنێکەوەتا ئێستا بیری لەهیچی دیکەنەکردبووەوە. ئەگەر پاول دیپلۆمێکی ئاوای وەربگرتایەهەڵوێستی چۆن دەبوو؟ ڕێک وەک بێرناردی دەکرد. ئەگەر ئێوەنازناوی "کەرێکی تەواو" وەربگرن، بەو مانایەیەکە لانیکەم کەسێک بەکەرتان دەبینێت و دەیەوێت ئێوەش بزانن. ئەمەلە خۆیدا زۆر ناخۆشە. ڕەنگەئەمە کاری یەک کەسیش نەبێت، بەڵکو کاری دەیان کەس بێت. هەروەها ڕەنگەئەو کەسانەئێستا خەریکی کارێکی دیکەش بن. ڕەنگەخەریکی ناردنی بابەتێک بۆ ڕۆژنامەکان بن و لەلۆمۆندی بەیانیدا، لەبەشی پرسە، یان زەماوەند، یان شانازییەکان، ڕاگەیاندراوێک چاپ بکرێت کە بێرنارد نازناوی کەرێکی تەواوی وەرگرتووە.

پاشان بێرنارد بە گوێچکەی پاولیدا چرپاند (پاول نەیدەزانی پێی پێبکەنێت، یان بۆی بگری)، هەر ئەو ڕۆژەکە ئەو پیاوە نەناسیاوەدیپلۆمەکەی پێداوە، ئەو پیشانی هەموو ئەو کەسانەی داوەکە بینیویەتی. ئەو نەیدەویست لەو شەرمەزارییەیدا بەتەنیا بێت، بۆیەهەوڵی دا خەڵکی دیکەش هاوبەشی شەرمەزارییەکەی خۆی بکات و بەم شێوەبەهەموو کەسی ڕاگەیاند کەئەم هێرشەتەنیا هێرش بۆ سەر ئەو نییە:

«ئەگەر ئەم هێرشەتەنیا بۆ سەر من بوایە، دەیانهێنا بۆ ماڵەکەی خۆم، بەناونیشانی خۆمیان دەنارد، بەڵام بەپێچەوانەوەهێنایان بۆ وێستگەی ڕادیۆ! کەواتە ئەمەهێرشێکەبۆ سەر من وەک کەسێکی ڕۆژنامەوان! هێرشێکە بۆ سەر هەموومان!»

پاول کوتێکی لەگۆشتی سەر دەورییەکەی بڕی، قومێک شەرابی خواردەوەو بە خوی گوت: لێرە دوو هاوڕێ دانیشتوون، یەکێکیان نازناوی "کەرێکی تەواو" و ئەوی دیکەشیان نازناوی "هاوڕێی ئازیزی گوڕهەڵکەنەکانی خۆی" وەرگرتووە. پاول (لەکاتێکدا بە سۆزێکی زیاتر و تاڵترەوەهاوخەمیی هاوڕێ گەنجەکەی دەکرد) زانیی کەلەمەبەدواوە لە دڵی خۆیدا هەرگیز نەوەک بیرنارد، بەڵکو وەک کەرێکی تەواو بیری لێ دەکاتەوە، ئەویش نەلەبەر ئەوەکەپیاوێکی بەد و خراپە، بەڵکو، چونکەکەس ناتوانێت لەبەرامبەر ناوێکی ئەوەندەجوان ددان بەجەرگی خۆیدا بگرێت، هەروەها هیچکام لەوانەش کەبێرنارد بە پەلەدیپلۆمەکەی پیشان داون، بە هیچ ناوێکی دیکەی جگەلەو ناوە، بیری لێ ناکەنەوەو نایناسنەوە.

ئەوسا بەبیریدا هات کەئەگەر ورچیش لەوتووێژێکی دووکەسیی نێوان خۆیاندا پێی بگوتایە"هاوڕێی ئازیزی گوڕهەڵکەنەکانی خۆی"، زۆر باشتر بوو، بەڵام ئەگەر ئەویش لەسەر نامەی دیپلۆمێکی بچووک بینووسیایە، زۆر خراپ بوو. بەم شێوەخەمەکەی بێرنارد بووەهۆی ئەوەکەپاول نیگەرانییەکەی خۆی لە بیر بکات. بۆیەکاتێک بێرنارد گوتی: «هەرچۆنێک بێت، وا دیارەتۆش شتێکی خراپت لێ قەوماوە»، پاول تەنیا دەستی ڕاوەشاند و گوتی: «ڕووداوێکی بچووک بوو». بێرناردیش قبووڵی کرد. گوتی: «من لای خۆم بیرم کردەوەکەئەوەنابێت تۆی زۆر ئازار دابێت. تۆ دەتوانی هەزار کاری دیکەبکەیت، هەزار کاری لەوەچاکتر!»

کاتێک "بێرنارد"، "پاول"ی تا لای ئۆتۆمبێلەکەی بەڕێ کرد، پاول بەخەمەوەگوتی:

«ورچ هەڵەدەکات، ئیماگۆلۆگەکان ڕاست دەکەن. کەسەکان جگەلە وێنەکانیان هیچی تر نین. فەیلەسووفەکان دەتوانن پێمان بڵێن

گرینگ نییەکە دنیا چۆن بیر لە ئێمەدەکاتەوە، گرینگ ئەوەیەکەئێمەبەڕاست چیین، بەڵام فەیلەسووفەکان لەهیچ ناگەن. تا ئەو کاتە کە لەناو خەڵکدا دەژین، ئێمەهەر ئەو شتەین کەخەڵک بەو شێوەدەمانبینێت. بیرکردنەوەلەوەکە خەڵکیتر چۆنمان دەبینێت و هەوڵدان بۆ ئەوەکەوێنەکەمان لانیکەم سەرنجڕاکێش بێت، جۆرێک فێڵ و فریوە، بەڵام ئایا لە نێوان خودی ئێمەو خودی خەڵکی، بێجگەلەچاو هیچ ناوبژیوانێکی ڕاستەوخۆی‌دیکەهەیە؟ ئایا دەکرێت عاشق بین و گوێ بەوەنەدەین کەوێنەکەمان لەزەینی دڵدارەکەماندا چۆنە؟ مادام ئێمەنیگەرانی ئەوەنەبین کە دڵدارەکەمان لە چاوی خۆیەوەچۆن سەیرمان دەکات، بەو مانایەیەکەعاشق نین».

بێرنارد بەخەمەوەگوتی:

«زۆر ڕاستە».

«ئەگەر بڕوامان وا بێت وێنەکەمان وەهمێکەکەخودی ئێمە، وەک گەوهەرێکی سەربەخۆ، لەچاوی خەڵک دەشارێتەوە، دیارەزۆر سادەو ساویلکەین. ئیماگۆلۆگەکان بەزێدەڕۆییەکی ڕەشبینانەوە دەریانخستووەکەپێچەوانەکەی ڕاستە، خۆدی ئێمەشتێکی وەهمییەکەنەکەس تێی دەگات و نەکەسیش دەتوانێت دەریببڕێت. تاکەشتێکی ڕاستەقینەکەهەموو کەس تێی ددگات و پێی دەگوترێت، وێنەکەمانەلەچاوی خەڵکی دیکەدا، بەڵام ئەوەناخۆشەکە تۆ خاوەنی ئەو وێنەیەنیت. سەرەتا هەوڵدەدەی ڕەنگی بکەیت، پاشان بە تەمای لانیکەم کاریگەریی لەسەر دابنێیت و چاودێریی بکەیت، بەڵام بێسوودە، دەستەواژەیەکی خراپ بەسەبۆ ئەوەی کەبۆ هەمیشە تۆ بکات بەکاریکاتێرێکی کلۆڵ و بێنرخ».

ئەوان لەلای ئۆتۆمبێلەکە ڕاوەستان و پاول سەیری ڕوومەتی نیگەران و ڕەنگپەڕیوی بێرناردی کرد. تا ماوەیەک لەمەوپێش

گرینگترین ئاواتی پاول ئەوەبوو کەهاورێکەی شاد بکات و ئێستا دەیدی بەقسەکانی ئازاری دەدا. ئەوەی زۆر پێ ناخۆش بوو کە لەبری ئەوەی بیر لە بێرنارد بکاتەوە، بیری لەخۆی و هەلومەرجی خۆی دەکردەوەو لەخەیالاتی خۆی ڕۆ دەچوو، بەلام ئێستا ئەوەشی پێ نەدەکرا. ئەوان لەیەکتر جودا بوونەوەو بێرنارد بەلەحنێکی گوماناوی کە بە لای پاولەوەداچلەکێنەر بوو، گوتی:

«تکات لێ دەکەم لەلای لاورا باسی مەکە. تەنانەت هیچیش بەئەگنێس مەڵێ».

پاول توند دەستی هاوڕێکەی گرت و گوتی:

«دڵنیا بە».

ئەو گەڕایەوەبۆ نووسینگەکەی و دەستی بەکارەکانی کردەوە. ئەو دیدارەی لەگەڵ بێرنارد کاریگەرییەکی باشی لەسەر دانابوو، ئێستا لەبەیانی چاکتر بوو. دەمەوئێوارە گەڕایەوەبۆ ماڵەوە. باسی نامەکەی بۆ ئەگنێس کرد و خێراش جەختی لەوەکردەوەکەبە لایەوەگرینگ نییە. ویستی بە پێکەنینەوەئەوەی پێ بڵێت، بەلام ئەگنێس ئاگای لێ بوو کەلەمیانەی قسەو پێکەنینەکەیدا دەکۆکی. ئەگنێس ئەم کۆکەی دەناسی. پاول کاتێک تووشی شتێکی ناخۆش بوایە، دەیزانی چۆن خۆی کۆنتڕۆڵ بکات، بەلام ئەو کۆکەکورت و شپرزە، کەخۆشی ئاگای لێی نەبوو، هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد.

ئەگنێس گوتی: «ویستوویانەپرۆگرامەکەخۆشتر بکەن!»

ڕووی توانجەکەی لەو کەسانەبوو کەپرۆگرامەکەی "پاول"یان نەهێشتبوو. پاشان دەستی بە قژی پاولدا هێنا، بەلام نەدەبوو ئەو کارانەبکات. پاول لە چاوی ئەگنێسدا وێنەی خۆی دی: وێنەی پیاوێکی سووکایەتی پێکراو، کەخەڵک نەبە گەنجی دەزانن و نەبەو کەسە کەبتوانێت خەڵک سەرقاڵ بکات.

## پشیله

هەر کام لەئێمەحەز دەکەین سنووری پەیمان و ڕێککەوتنە شەهوانییەکان و تابۆ عەشقییەکان ببەزێنین و بەخۆشی و گەشکەوەسەر بەقەڵەمڕەوە یاساخەکاندا بکەین، هەر کامەشمان بۆ ئەو کارەغیرەتێکی کەممان هەیە... خۆشەویستی و جووتبوون لەگەڵ ژنێکی بەتەمەنتر، یان پیاوێکی گەنج تر لەخۆمان، سادەترین و ئاسانترین پێشنیارەبۆ چێژبردن لەیاساخەکان. لاورا بۆ یەکەم جار لەژیانیدا پیاوێکی گەنجتر لەخۆی دەست کەوتبوو، بێرناردیش بۆ یەکەم جار ژنێکی بەتەمەنتری دۆزیبووەوەو هەر دووکیشیان ئەوەیان بەگوناهێکی هاوبەشی ورووژێنەر دەزانی.

ماوەیەک لەوەوپێش کەلاورا بە پاولی گوت هەر جارێک کە لەگەڵ بێرنارد دەبێت هەست دەکات دەساڵ گەنجتر بووەتەوە، ڕاستی دەگوت؛ شەپۆلێک وزە دەڕژایە گیانییەوە، بەڵام ئەم شەپۆلەلە بێرنارد گەنجتری نەدەکرد! بە پێچەوانەوە، لاورا چێژ و لەزەتێکی دەچەشت کەلەوەوپێش نەیچەشتبوو، چێژی بوونی دۆستێکی گەنجتر کەخۆی لە ئەو بە لاوازتر دەزانی و لەبەر ئەوە کە پێی وابوو ئەو ژنێکی بەئەزموونەکەبەدۆستەکانی پێشوی بەراوردی دەکات، دەشڵەژا. جووتبوون لەسەما دەچێت، یەکێک ئەوی دیکەبەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت. لاورا بۆ یەکەم جار لەژیانیدا پیاوێکی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا و ئەوەش بەقەدەر بێرنارد سەرخۆشی دەکرد.

ژنێکی بەتەمەنتر، جگەلەهەموو شتێکی دیکە، ئەو دڵنیاییەش بە پیاوی گەنجتر دەبەخشێت کە خۆشەویستییەکەیان ناکەوێتەداوی هاوسەرگیرییەوە، چونکەبە دڵنیاییەوەکەس چاوەڕێی ئەوەناکات پیاوێکی گەنج، کەژیانێکی پڕ لە سەرکەوتنی لەپێشە، ژنێک بخوازێت کەهەشت ساڵ لەخۆی گەورەترە. لەم لایەنەوە، بێرنارد لاورای بەهەمان شێوەدەبینی کە پاول ئەو ژنەی بینیبوو کەوەک گەوهەری ژیانی ستایشی دەکرد. بێرنارد پێی وابوو دۆستەکەی لەوەدەگات کەدەبێتڕۆژێک بە خواستی خۆی، جێ بۆ ژنێکی گەنجتر چۆڵ بکات، ژنێک کەبێرنارد بتوانێت بەبێ داڵغەبە بنەماڵەکەی بناسێنێت. بڕوای بێرنارد بەعەقڵی دایکانەی لاورا، تەنانەت ڕێگەی پێ دابوو بیر لەوەش بکاتەوەکەلاورا لەزەماوەندەکەیدا دەبێتبە یەکێک لەشایەتەکان و بێرنارد ئەوەلە ژنەکەی دەشارێتەوەکەسەردەمێک ئەو دۆست و ماشووقەی بووە(یان ڕەنگەهەر ماشووقەی بێت، بۆچی نا؟).

پەیوەندیی ئەوان بە خۆشی و شادییەوەدوو ساڵی خایاند. پاشان بێرنارد بە کەرێکی تەواو ناسراو، لەوەودوا بێدەنگ بوو. لاورا ئاگای لەو دیپلۆمەنەبوو (پاول بەڵێنەکەی بردبووە سەر) چونکەهەرگیز پرسیاری لەکاروباری بێرنارد نەدەکرد و بەو کێشانەی نەدەزانی کەبێرنارد (هەروا کە هەمووماں دەزانین کلۆڵی، کلۆلیی دیکەبەشوێن خۆیدا ڕادەکێشێت) لەوێستگەی ڕادیۆ بەرەوڕوویان دەبووەوە. لاورا بێدەنگییەکەی ئەوی وەها لێکدایەوەکە گوایەئیتر بێرنارد خۆشی ناوێت. ئەو چەند جارێک ئاگای لێ بوو کەبێرنارد گوێی لەقسەکانی نەدەگرت و دڵنیا بوو لەو کاتانەدا خەریکەبیر لەژنێکی دیکەدەکاتەوە. مەخابن لە دڵداریدا شتێکی بچووک دەتوانێت مرۆڤ تەواو بێئومێد بکات.

ڕۆژێک کەبێرنارد چوو بۆ سەردانی لاورا، ئەو دیسان لەو بیرکردنەوەتاریکەیدا نوقم بووبوو. لاورا بۆ گۆڕینی جلەکانی چوو بۆ ژوورێکی دیکەو بێرنارد لەگەڵ پشیلەسیامییەکەی لەهۆڵەکەدا مایەوە. ئەو حەزی لە پشیلەنەبوو، دەشیزانی لاورا ئەوەی زۆر پێ ناخۆشە. بێرنارد لەسەر مۆبلەکە دانیشت و نوقمی خەیاڵاتی خۆی بوو. ئەو، بێ ئەوەئاگای لە خۆی بێت، بەتەمای لاواندنەوەی پشیلەکە دەستی بۆ درێژکرد، بەڵام پشیلەکەمرخەیەکی کرد و قەپی لەدەستی گرت. ئەو قەپگرتنەی پشیلەکەلەپڕ چووەڕیزی زنجیرێک ڕووداوی ناخۆشەوەکەبەدرێژایی ئەو حەفتەوازیان لێ نەهێنابوو، سووک و ترۆیان کردبوو، بۆیە بێرنارد زۆر تووڕەبوو، لەسەر مۆبلەکە هەڵبەزییەوەو مستێکی لەپشیلەکە سرەواند. پشیلەکەهەڵاتەسووچێک، پشتی کۆم کرد و بە شێوەیەکی ترسناک مرخاندی. بێرنارد ئاوڕی دایەوەو چاوی بەلاورا کەوت. لاورا لەناو دەرکەکەڕاوەستابوو، دیاربوو هەموو شتێکی دیبوو. گوتی:

«نا، نا، نابێ پشیلەکەتەمێ بکەیت. حەق بەئەو بوو».

بێرنارد بەسەرسووڕمانەوەسەیری کرد. جێگەی قەپی پشیلەکەبەئازار بوو. چاوەڕوان بوو دڵدارەکەی مادام لایەنیشی ناگرێت، لانیکەم تۆزێک بەویژدان بێت. بێرنارد زۆری حەزدەکرد بەرەو پشیلەکەبچێت و شەقێکی وەهای تێ هەڵبدات کەلەبنمیچی هۆڵەکەشڵپەی بێت. زۆری هەوڵدا تا توانیی بەر بە خۆی بگرێت و ئەو کارە نەکات.

لاورا کەپێی لەسەر یەکەیەکەی وشەکانی دادەگرت، گوتی:

«ئەو دەیەوێت هەرکەس کە دەیلاوێنێتەوە، هەموو هۆش و هەواسیشی لەلای بێت. بۆخۆشم کاتێک کەسێکم لەلایەکەهوشی لەشوێنێکی دیکەیە، زۆر تووڕەدەبم».

کاتێک لاورا سەیری بێرناردی کرد کەچۆن دەستی بەپشیلەکەدا هێنا و پشیلەکەش لەداخی هۆشپەرتییەکەی بەرقەوەقەپی لێ گرت، هەستی بەهاوخەمی لەگەڵ ئەو ئاژەڵەکرد. بێرنارد لەچەند حەفتەی ڕابوردوودا بەو شێوەلەگەڵ ئەویش جوولابووەوە. ئەو دەیلاواندەوە، بەڵام هۆشی لەلایەکی دیکەبوو. وای دەنواند کە لەگەڵ ئەوە، بەڵام لاورا دەیزانی کە گوێ بەقسەکانی نادات.

کاتێک پشیلەکەقەپی لەبێرنارد گرت، لاورا هەستی کرد خودەکەی دیکەی، خودەهێمایی و پڕ لەنهێنییەکەی، واتەپشیلەکەی، هەوڵدەدا ئازایەتیی پێ ببەخشێت، پیشانی بدا کەچی بکات و چۆن لاسایی بکاتەوە. لاورا بەخۆی گوت: هەندێک جار پێویستەمرۆڤ چنگ و ددان بپیشان بدات، بڕیاری دا کاتێک بۆ خواردنی نانی ئێوارەدەچن بۆ ڕیستۆرانت، هەموو هێزی کۆبکاتەوەو کارێکی ئازایانەبکات.

لەم میانەدا، من دەبێ‌ڕاشکاوانەبیڵێم کەئەو بڕیارەی لاورا ئەوپەڕی گەوجانەبوو، چونکەئەوەی کە ئەو دەیویست بیکات، بە پێچەوانەی بەرژەوەندیی خۆیەوە بوو. دەبێ‌ئەوەش بڵێم کەبەدرێژایی ئەو دوو ساڵ پەیوەندییەیان، بێرنارد زۆر لەگەڵیدا خۆشحاڵ بوو، ڕەنگەلەوەش خۆشحاڵتر بوو کە لاورا بیری لێ کردبووەوە. بەلای بێرناردەوە لاورا هێمای هەلاتن لەو ژیانەبوو کە"بێرتراند"ی دەنگ خۆش، لەمنداڵییەوەبۆی دیاری کردبوو. ئەو لە ئەنجامدا توانیبووی بەئازادی و بەئارەزووی خۆی بژی، توانیبووی شوێنێکی نهێنیی ببێت کەهیچکام لە ئەندامانی بنەماڵەکەی پێی نەزانن، شوێنێک کەدەیتوانی بەدڵی خۆی لێی بحەوێتەوە: بێرنارد ئەو جۆرە ژیانەدەرویشانەی لاورا، ئەو پیانۆیەکەجاروبار دەیژەند، ئەو کۆنسێرتانەکەلەگەڵ خۆی دەیبرد، ئەو حاڵەتانە و ئەو کارەسەیروسەمەرانەی ئەوی پێ خۆش بوو.

بێرنارد لەلای لاورا، لەدۆستانی دەوڵەمەند و بێزارکەری باوکی دوور بوو. ئەڵبەت ئەو خۆشی و شادییەی ئەوانیش بەمەرجێک بوو کە هاوسەرگیری نەکەن. ئەگەر ئەوان ببوونایەبە ژن و مێرد، دەستبەجێ هەموو شتێک دەگۆڕا. هاوسەرگیری ئەوان دەستبەجێ لە لایەن بنەماڵەوەڕووبەرووی هەموو جۆرەدەستتێوەردانێک دەبووەوە، عەشقەکەیان نەک هەر دڵڕفێن نەدەما، بەڵکو بێماناش دەبوو. ئەوسا لاورا هەموو نفووزی خۆی لەسەر بێرنارد لەدەست دەدا.

کەواتەچۆن دەبوو ئەو، بەپێچەوانەی هەموو بەرژەوەندییەکانی خۆی، بڕیارێکی ئاوا گەوجانە بدات؟ ئایا پیاوی نەدەناسی؟ ئایا زانیارییەکی کەمی لەبارەی بێرناردەوە بوو؟

ئەرێ، ئەگەرچی ئەمەزۆر سەیرە، بەڵام لاورا بێرناردی نەدەناسی و تێی نەدەگەیشت. ئەو تەنانەت شانازی بەوەوەدەکرد کە جگەلەخۆشەویستییەکەی، هیچ شتێکی دیکەی بێرنارد سەرنجی ڕاناکێشێت. لاورا هەرگیز لەبارەی باوکی بێرناردەوەپرسیاری لێ نەدەکرد. ئەو هیچی لەبنەماڵەی بێرنارد نەدەزانی. کاتێک بێرنارد دەیویست باسی باوک و بنەماڵەکەی بۆ بکات، بە ئاشکرا بێزار دەبوو، دەیگوت لەباتی ئەوەی کاتەکەیان بەم شتانەبەفیڕۆ بدەن، پێی خۆشە دەستەملان ببن. لەمەش سەیرتر ئەوە بوو کە بێرنارد لەماوەی بێدەنگییەکەی پاش ڕووداوی دیپلۆمەکەش، بەردەوام بەهۆی گرفتارییەوە داوای لێبوردنی لێ دەکرد. لاورا دەیگوت: «بەڵێ دەزانم، دەزانم گرفتاری چۆنە». بەڵام هەرگیز سادەترین پرسیاری ئاساییشی لێ نەدەکرد: «کام گرفتاری؟ چی ڕووی داوە؟ پێم بڵێ چی تۆی ئاوا نیگەران کردووە!»

سەیر ئەوەبوو کەلاورا ئێجگار خۆشی دەویست، کەچی گوێی بەکاروبارەکەی نەدەدا. تەنانەت دەتوانم بڵێم: لاورا تەواو عاشقی بوو، بەڵام هەر بەو بۆنەشەوەگوێی بەکاروبارەکەی نەدەدا. ئەگەر کەسێک بۆ ئەو گوێپێنەدان و بێدەربەستییەسەرکۆنەی بکردایەو تاوانی نەناسینی دۆستەکەی بدایەتەپاڵ، لاورا لەقسەکەی نەدەگەیشت، چونکەئەو نەیدەزانی ناسینی کەسێک یانی چی. لەم لایەنەوەلەو کچانەدەچوو کەپێیان وایەئەگەر کوڕێک زۆر ببینن منداڵیان لێی دەبێت. ئەو، ئەم دواییانەبەردەوام بیری لەبێرنارد دەکردەوە، بیری لە لەش و ڕوومەتی دەکردەوە، هەستی دەکرد هەمیشەلەگەڵیدایەو لێی تەژییە، بۆیەلەوەدڵنیا بوو کەتەواو بێرنارد دەناسێت و کەس تا ئێستا بەقەدەر ئەو نەیناسیوە. هەستی عەشق هەمووومان تووشی ئەم وەهمەگومڕاکەرەدەکات کەدڵدارەکەمان دەناسین.

پاش ئەم شەرح و لێدوانە، ئێستا دەکرێت بڕوا بەو قسەیەبکەین کەلەکاتی خواردنەوەدا لاورا پێی گوت. (ئەڵبەت دەبێ وەک پاساوهێنانەوەئەوەش بڵێم کەئەوان بتڵێک شەراب و دوو بتڵ براندیان خورادبووەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوەئەگەر لاورا تەواو هوشیاریش بوایەدیسان هەر ئەوەی پێ دەگوت)«بێرنارد مارەم بکە».

## نارەزایەتی دەربڕین دژ بەپێشێلکردنی مافی مرۆڤ

بریژیت کەبڕیاری دابوو کۆتایی بەخوێندنی زمان بهێنێت، وازی لە وانەی زمانی ئاڵمانی هێنا. یەکەم چونکە پێی وا نەبوو فێربوونی زمانی گۆتەسوودی بۆی ببێت (دایکی ناچار بەفێربوونی زمانی ئاڵمانی کردبوو)، دووهەمیش چونکەزۆری ڕق لەزمانی ئاڵمانی بوو. ئەم زمانەنالۆژیکییەتووڕەی دەکرد. ئەمڕۆ بەڕاست تووڕەی کرد: ئامرازی پەیوەندیی ohne (بەبێ) دۆخی بەرکاری ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە وەردەگرێت. ئامرازی پەیوەندیی mit (لەگەڵ) دۆخی بەرکاری ناڕاستەوخۆ وەردەگرێت. بۆچی؟ جگە لەوەش، دوو ئامرازی پەیوەندی، دەلالەت لەلایەنی ئەرێنی و نەرێنی یەک پەیوەندی دەکەن و بەو بۆنەشەوەدەبێت هەر بەو بابەتەوەگرێدرابێتن. بریژیت لەلای مامۆستاکەی، کەگەنجێکی ئاڵمانی بوو، نارەزایەتیی دەربڕی و ئەویش دەستبەجێ شلەژا و هەستی بەتاوانباری کرد. مامۆستاکە پیاوێکی جوانچاکی هەستیار بوو، لەوەنیگەران بوو کوڕی نەتەوەیەکەکەسەردەمێک هیتلەر حوکمی بەسەردا کردووە. ئەو کە ئامادەبوو بۆ ئەگەری هەر خەتایەک وڵاتەکەی بەتاوانبار بزانێت، خێرا بڕوای کرد کەهیچ هۆکارێکی عاقڵانەبۆ ئەوەنییەکەئامرازی پەیوەندیی ohne و mit پەیوەندییان بە دوو دۆخی جیاوازەوەببێت. دەتگوت تکا لەو ژنە گەنجەفەڕەنسییەدەکات لەگەڵ ئەو زمانەدا میهرەبان بێت کەمێژوو تاونباری کردووە. گوتی:

«دەزانم لۆژیکی نییە، بەڵام بە درێژایی سەدان ساڵ وەک نەریتێکی لێ هاتووە».

بریژیت گوتی:

«خۆشحاڵم تۆش پێ لەوەدەنێیت کەئەم زمانەلۆژیکی نییە، بەڵام زمان دەبێ لۆژیکی بێت».

گەنجەئاڵمانییەکەپێمل بوو:

«بەداخەوەئێمەدیکارتمان نییە. نەبوونی دیکارت کەلێنێکەلەمێژووی ئێمەدا کەناکرێت چاوپۆشیی لێ بکەین. ئاڵمان لەنەریتی عەقڵ و ئاشکرایی بێبەشە، ئەم وڵاتەپڕەلەتەمومژی میتافیزیکی و مۆسیقای ڤاگنەری. دەزانی کێ لەهەموو کەس زیاتر ستایشی ڤاگنەری کردووە؟ هیتلەر!»

بریژیت نەحەزی لەڤاگنەر بوو، نەلە هیتلەر. ئەو بەدوای فکری خۆیەوەبوو:

«زمانێک کەلۆژیکی نەبێت منداڵ دەتوانێت فێری ببێت، چونکە منداڵ بیرناکاتەوە، بەڵام کەسی گەورەناتوانێت فێری ببێت، بۆیەمن پێم وایەئاڵمانی زمانێکی جیهانی نییە».

کابرای ئاڵمانی گوتی:

«تۆ ڕاست دەکەیت».

ئەوسا بە ئارامی درێژەی پێ دا:

«ئێستا خەریکی لەگەوجانەبوونی ئاواتی ئاڵمانییەکان، بۆ سوڵتەبەسەر دنیادا دەگەیت».

بریژیت کە لەو هەڵوێستەی خۆی ڕازی بوو، سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو، بۆ کڕینی شووشەیەک شەراب بەرەو فرۆشگەی فاوشۆن چوو. ئەو دەیویست ئۆتۆمبێلەکەی لەشوێنێک ڕابگرێت، بەڵام نەدەکرا. ئۆتۆمبێلەکان بەڕیز، یەک لەدوای یەک، بە مەودای

نیو مایل له قەراغ شەقامەکەڕاگیرابوون. پاش ئەوەی کە چارەکەسەعاتێک بەردەوام دەوری دایەوەو جێگەپارکێکی دەست نەکەوت، سەری سوورما و تووڕەبوو؛ ئوتومبیلەکەی لەپیادەڕۆکەڕاگرت و لێی دابەزی و بەرەو فرۆشگەکەچوو. هێشتا نەگەیشتبووە ئەوێ کەبەنائاساییبوونی دۆخەکەی زانی. کاتێک نزیک بووەوەتێگەیشت چی ڕووی داوە. "فاوشۆن" فرۆشگەیەکی بەناوبانگی خواردمەنی بوو کەهەموو شتەکانی دەقات لەشوێنی دیکە گرانتر بوون، بۆیەهەر ئەو کەسانەدەچوون بۆ ئەوێ کەلەخواردنەکەزیاتر چێژیان لە پارەدانی زۆر دەبینی. ئەو فرۆشگەیەئێستا کەوتبووەبەر پەلاماری نزیکەی سەد کەسی هەژار و بێکار. ئەوان دەوریان دابوو، بەتەمابوون بڕۆنەژوور. نارەزایەتی دەربڕینێکی سەیر بوو. ئەو بێکار و هەژارانەبۆ ئەوەنەهاتبوون کەشتێک بشکێنن، هەڕەشە لەکەسێک بکەن، یان دروشم بدەن، بەڵکو بۆ ئەوەهاتبوون کەدەوڵەمەندەکان بێزار بکەن و ئارەزووی خواردنەوەی شەراب و خواردنی خاویاریان نەمێنێت. فرۆشیار و فەرمانبەرانی فرۆشگەکەبەبێزارییەوەزەردەخەنەیان دەکرد و هیچیان بۆ نەدەفرۆشرا.

بریژیت بەپاڵەپەستۆ ڕۆشتەژوور. ئەو، نەکاری ئەو هەژار و بێکارانەی پێ ناخۆش بوو، نەڕقی لەو ژنانەبوو کەپاڵتۆی پێستەیان لە بەردا بوو. بە دەنگی بەرز داوای بتڵێک شەرابی بۆردیوی کرد. بڕشتی دەنگ و پرکێشیی بریژیت ژنەفرۆشیارەکەی توشی سەرسووڕمان کرد، لەپڕ زانیی کەنابێت بوونی ئەو بێکارە ئاشتیخوازانەلەوێ، بەر بە خزمەتکردن بەم مشتەرییەگەنجەبگرێت. بریژیت پارەی شەرابەکەی دا و بەرەو ئۆتۆمبێلەکەی گەڕایەوە. دوو پۆلیس چاوەڕوانی بوون تا لەبەر ڕاگرتنی ئۆتۆمبێلەکەی سزای

بدەن. کاتێک پۆلیسەکان گوتیان ئۆتۆمبێلەکەی لەشوێنێکی خراپ ڕاگرتووەو سەر ڕێگەی خەڵکی گرتووە، بریژیت تووڕەبوو؛ ئاماژەی بەڕیزی ئەو ئۆتۆمبێلانەکرد کەلەپشتەسەری یەکترەوەڕاگیرابوون و هاواری کرد:

«دەکرێ پێم بڵێن دەبوایەلە کوێ ڕای بگرم؟ ئەگەر خەڵک مافی ئەوەیان هەیەکەئۆتۆمبێل بکڕن، دەبێ شوێنێکیش بۆ ڕاگرتنی ببێت، وا نییە؟ دەبێ لۆژیکی بن».

من ئەم ڕووداوەم هەر لەبەر گوتنی ئەم کێشەبچووکەگێڕایەوە: کاتێک بریژیت بەسەر پۆلیسەکاندا دەینەڕاند، خۆپیشاندەرەبێکارەکانی 'فاوشۆن'ی بیرکەوتەوەو هەستی بەهاوخەمییەکی قووڵ لەگەڵ ئەوان کرد. هەستی کرد لەشەڕێکی هاوبەشدا هاوپەیمانی ئەوانە. ئەمەغیرەتێکی زیاتری پێ بەخشی و دەنگی بەرزتر کردەوە. پۆلیسەکان (وەک ئەو ژنەپاڵتۆ پێستە لەبەرانە کەلەبەرچاوی بێکارەکاندا دڕدۆنگ بوون) بە ڕەفتارێکی بێبڕشت و گەوجانەوەبەردەوام هەندێک وشەی وەک یاساخ، قەدەغە، تەکووزی و دیسیپلینیان دووبارەدەکردەوە و لە ئەنجامدا بێ ئەوەی بریژیت سزا بدەن وازیان لێ هێنا.

لەکاتی دەمەقاڵەکەدا بریژیت خێرا خێرا سەری لەڕاستەوەبۆ چەپ و لەچەپەوەبۆ ڕاست ڕادوەشاند و شان و برۆی هەڵدەتەکاند. ئەو، کاتێک لەماڵەوەئەم ڕووداوەی بۆ باوکی دەگێڕایەوە، دیسان ئەم جووڵانەی دووبارەکردەوە. ئێمەپێشتر ئەم جووڵەمان بینیوە. ئەوە نیشانەی سەرسووڕمان و تووڕەبوونەلەبەرامبەر ئەوانەدا کەدەیانەوێت ئاساییترین مافەکانمان پێشێل بکەن؛ کەواتەبا ناوی «ناڕەزایەتیدەربڕین دژ بەپێشێلکردنی مافی مرۆڤ»ی لێ بنێین.

چەمکی مافی مرۆڤ دەگەڕێتەوەبۆ دووسەد ساڵ لەمەوپێش، بەڵام لەنیوەی دووهەمی دەهەی ١٩٧٠ گەیشتە لووتکەی شانازی. "ئەلیکساندر سولژێنستاین" کە تازە لەوڵاتەکەی دوورخرابووەوە و ریش و دەستبەند ڕوخسارەسەرنجراکێشەکەیان ڕازاندبووەوە، ڕوشنبیرانی ڕۆژاوای هیپنۆتیزم کرد. ئەو ڕۆشنبیرانە کەئاواتیان بۆ ئەو چارەنووسەگەورەدەخواست کەلێی بێبەش بوون. بە هۆی ئەوەوەبوو کەئەو ڕۆشنبیرانە، پاش پەنجا ساڵ، وردە وردەبڕوایان بەوەکرد کەلەڕووسیای کۆمۆنیستدا کەمپی کاری زۆرەملەهەیە. تەنانەت کەسانی پێشکەوتووش ئێستا پێی لێ دەنێن کەنابێت کەس لەپێناوی بیروبڕوایدا بگیرێت. بۆ ئەم بۆچوونەتازەشیان پاساوێکی چاکیان دیوەتەوە: "کۆمۆنیستەکانی ڕووسیا، وێڕای ڕاگەیاندنی شکۆمەندانەی مافی مرۆڤ لەلایەن شۆڕشی فەڕەنساوە، ئەم مافانە پێشێل دەکەن!"

بەم شێوە، بە هیمەتی "سولژێنستاین"، وشەی "مافی مرۆڤ" جارێکی دیکەش لەناو وشەکانی سەردەمی ئێمەدا جێگەی بۆ خۆی کردەوە. من هیچ سیاسەتمەدارێک ناناسم کەڕۆژی دەجار باسی "خەبات بۆ مافی مرۆڤ"، یان "پێشیلکردنی مافی مرۆڤ" نەکات، بەڵام چونکەخەڵکی ڕۆژاوا ترسیان لەکەمپی کاری زۆرەملەنییەو چییان پێ خۆش بێت دەتوانن بیڵێن و بینووسن، خەبات لە پێناوی مافی مرۆڤدا چەندەگشتگیرتر بێت، بە هەمان ئەندازەش ناوەڕۆکەدیار و بەرهەستەکەی زیاتر دەدۆڕێنێت و وەک ڕەفتاری هەموو خەڵک بەرامبەر بە هەموو شتێک، دەبێتەهێزێک کەهەموو ئاواتەکانی مرۆڤ دەکات بە ماف. جیهان بە گشتی دەبێت بەمافێک بۆ مرۆڤ و هەموو شتەکانی جیهانیش یەکەیەکەدەبن بەماف. بۆ نموونە: ئارەزووی عەشق دەبێت بە مافی عەشق، ئارەزووی

حەوانەوەدەبێت بە مافی حەوانەوە، ئاواتی هاوڕێیەتی دەبێت بەمافی هاوڕێیەتی، ئاواتی شادی دەبێت بەمافی شادی، ئاواتی بڵاوکردنەوەی کتێب دەبێت بە مافی بڵاوکردنەوی کتێب، ئاواتی هاوارکردن بەنیوەشەو لەنێو شەقام دەبێت بەمافی هاوارکردن بەنیوەشەو لەنێو شەقام. بێکارەکان مافیان هەیەفرۆشگەیەکی گرانجانی خواردەمەنی داگیر بکەن، ژنانی پاڵتۆپێستەپۆش مافیان هەیەخاویار بکڕن، بریژێت مافی هەیەلەپیادەڕۆ ئۆتۆمبێلەکەی ڕابگرێت و هەموان، بێکارەکان، ژنانی پاڵتۆپێستەپۆش و بریژێت دەبن بەبەشێک لەسوپای خەباتکارانی مافی مرۆڤ.

پاول لەسەر مۆبلەکەبەرامبەر بە بریژێت دانیشت و بە خۆشەویستییەوەسەیری سەری کچەکەی کرد کەبە هێز و بە هێمنی خێرا خێرا بەرەو پێش و دواوە دەجووڵا. پاول دەیزانی کەکچەکەی خۆشی دەوێت و ئەمەی لەخۆشەویستیی ئەگنێسیش بەلاوە گرینگتر بوو. چاوی پڕ لەستایشی کچەکەی، شتێکی پێ دەبەخشی کەئەگنێس نەیدەتوانی پێی ببەخشێت: ئەو چاوانەبەپاولیان دەسەلماند کەهێشتا قۆناغی گەنجییەتی تێنەپەڕاندووەو هێشتا گەنجە. هێشتا دوو سەعات لەو کاتە تێنەپەڕیبوو کەئەگنێس بەهۆی کۆکەترسناکەکەی پاولەوەدەستی بەقژیدا هێنا و لاواندییەوە. بە لای پاولەوەجووڵەی سەری کچەکەی لەو لاواندنەوەپڕ لەسووکایەتییەی ئەگنێس گرینگتر بوو! بوونی بریژێت وەک ژەنەراتۆرێک بوو کەوزەو توانای لێ وەردەگرت.

## نوێخوازبوونی ڕەها

ئاخ، ئەی پاولی ئازیز! پاول بۆ تووڕەکردن و ئازاردانی ورچ دەیویست خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر مێژوو، بەسەر ناوی بتهۆڤن و پیکاسۆدا بهێنێت. ئەو لە زیهنی مندا لەگەڵ بیچم و ڕوخساری "یارۆمیل"، پاڵەوانی ئەو ڕۆمانەکەبیست ساڵلەمەوپێش نووسیومەو لەدوابەشی ئەم کتێبەدا، لەکافەیەکی بولواری "مۆنت پارناس" بۆ پرۆفیسۆر "ئاڤەناریۆسی" جێدێلم، تێکەڵ دەبێت.

ئێمەلە پراگین، ساڵی ١٩٤٨یەو "یارۆمیل"ی هەژدە ساڵەشێتانەشەیدای شیعری نوێیە، شەیدای "برێتۆن"، "ئێلوار"، "دەسنۆس" و "نەزڤاڵە"و ئەوانی کردووەبەنموونەبۆ خۆی و لایەنگری لەم گوتەی "ڕیمباو" لەکتێبی "وەرزێک لەدۆزەخ" دەکات: پێویستە بە ڕەهایی نوێخواز بیت، بەڵام ئەوەی کەلە پراگی ١٩٤٨دا بە مانای نوێخوازبوونی ڕەها بوو، شۆڕشی سۆشیالیستی بوو کەدەستبەجێ و بەوپەڕی توندوتیژییەوە وازی لەهونەری نوێ هێنا کە یارۆمیل شێتانەعاشقی بوو. ئەوسا پاڵەوانەکەی من، لەگەڵ هەندێک لە هاوڕێکانی (کە وەک خۆی شەیدای هونەری نوێ بوون) لەبەر ئەوەی کەنەیدەویست خەیانەت لەفەرمانی گەورەی "نوێخوازبوونی ڕەها" بکات، بەتەوس و قسەی بەتوێکڵ، کۆی ئەو شتانەی ڕەتکردەوەکەبەڕاست و لەدڵەوەخۆشی دەویستن. ئەو ئینکار و ڕەتکردنەوەی تەژیی بوو لە ڕق و نەفرەت و جۆشوخرۆشی مێرمنداڵێک کە بەتەمابوو بەکاری توندوتیژییەوە پێ

بنێتەناو دنیای گەورەبوونەوە. هاوڕێکانی بە بینینی ڕەتکردنەوەی ئەو شتانە کەزۆری خۆشدەویستن و بۆیان دەژیا و بۆیان ژیابوو، بەبینینی ڕەتکردنەوەی "کووبیسم" و "سوریالیسم"، "پیکاسۆ" و "دالی"، "بریتۆن" و "ریمباو" و ئینکاری هەموو ئەمانەبە ناوی "لینین" و "سوپای سوور"ەوە(کە ئەو دەمەبە ترۆپکی هەموو جۆرەنوێخوازییەکیان دەزانی) نیگەران بوون. ئەوان سەرەتا تووشی شۆک بوون، پاشان پێیان ناخۆش بوو، لە کۆتاییدا تۆقان. دیمەنی ئەو مێرمنداڵەکە نەوەک لەترسان و لەپێناوی بەرژەوەندی، یان وەرگرتنی پێشەیەک، بەڵکو ئازایانەو وەک کەسێک کەئامادەبێت بە ئێش و ئازارەوەهەموو شتەخۆشەویستەکانی ژیانی فیدا بکات، دیمەنێکی ترسناک بوو (جاڕی ئەو ترسەی دەدا کەبەرایی دەرکەوتبوو، ترس لە لێپێچینەوەو گیران). ڕەنگەهەندێک لەو کەسانە کە ئەودەمە سەیرییان دەکرد، لەلای خۆیانەوە بیریان لەوەکردبێتەوەکە«یارۆمیل هاوپەیمانی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆیەتی».

ئەڵبەتە پاول و یارۆمیل وەکو یەک نین. تاکەخاڵی هاوبەشی نێوان ئەو دووانە، بڕوای وروژێنەریانەبەوەی کە «پێویستەبە شێوەیەکی ڕەها نوێخواز بین». «نوێخوازبوونی ڕەها» چەمکێکەکەمانا و مەغزایەکی نەگۆڕ و پێناسەبۆکراوی نییە. ریمباو لەساڵی ١٨٧٢دا نەیدەتوانی وێنای ئەوەبکات کەئەم وشانەبەمانای ملوێنەها پەیکەری "لینین" و "ستالین"ن. نەیدەتوانی وێنای فیلمەریکلامییەکان و ڕەسمی ڕەنگاوڕەنگی گۆڤارەکان و ڕوومەتی شێتانەی گۆرانیبێژەکانی جاز بکات، بەڵام ئەوەبابەتێکی گرینگ نییە، چونکەنوێخوازبوونی ڕەها بەو مانایەیەکەنابێتپرسیار لەناوەڕۆکی نوێخوازی بکەیت، بەڵکو دەبێت بەبێ گومان و دوودڵی، بەڕەهایی خزمەتی پێ بکەیت.

پاولیش وەک یارۆمیل دەیزانی کەنوێخوازبوونی ئەمڕۆ لەنوێخوازبوونی دوێنێ جیاوازە و لەبەر پێویستبوونی بەردەوامی نوێخوازی، مرۆڤ دەبێت ئامادەبێت خەیانەت لەناوەڕۆکەقابیلی گۆڕانەکەی بکات. دەبێت لەپێناوی بیروباوەڕی خودی "ڕیمباو"، خەیانەت لەشێعری "ڕیمباو" بکات. ساڵی ١٩٦١، خوێندکارەکانی پاریس کە ئەم تێرمەیان بەمانایەکی ڕادیکاڵتر لەیارۆمیلی ساڵی ١٩٤٨ لە پڕاگ بەکار دەهێنا، دنیایان بەو شێوەکەبوو، واتەدنیای بێمانایی، ئاسوودەیی، تیجارەت، پڕۆپاگاندە، فەرهەنگی گەوجانەی ڕەشۆکی کە چیرۆکەمیلۆدراماکانی بەردەوام بەسەر خەڵکدا دەسەپێندرا، دنیای پەیماننامەکان و دنیای باوکەکانیان ڕەتکردەوە. ئەودەمەپاول چەند شەوی لەسەنگەردا تێپەڕاند و بەو دەنگەبەبڕشت و بنەبڕەیەوەقسەی کرد کەیارومیل بیست ساڵ لەوەوپێش قسەی پێ کردبوو. ئەو بێباک لەهەموو شتێک، بە پشتیوانیی باسکی بەهێزی ڕاپەڕینی خوێندکارەکان، دنیای باوکی بەجێهێشت تا لەئەنجامدا، لەتەمەنی سی، یان سیوپێنج ساڵیدا گەورەببێت.

بەڵام زەمەن تێپەڕی و کچەکەی کە گەورەبووبوو، لەم دنیایەدا، هەر بەم شێوەکەهەیەهەستی بەئاسوودەیی دەکرد، واتە لە دنیای تەلەفیزیۆن، جاز، پڕۆپاگاندە، فەرهەنگی ڕەشۆکی و میلۆدراماکانی، دنیای گۆرانیبێژەکان، ئۆتۆمبێلەکان، فەشن، فرۆشگەکانی خواردنی فانتزی و خاوەنەتەڕپۆشەکانی پیشەسازی کەدەبوون بەئەکتەری تەلەفیزیۆن. پاول دەیتوانی بەوپەڕی پرکێشییەوەلەبەرامبەر دادوەرەکان، پۆلیس، دەڵاڵەکان و پیاوانی حکوومەت، بەرگری لەبیروباوەڕی خۆی بکات، بەڵام نەیدەتوانی لەلای کچەکەی بەرگریی لێ بکات. کچەکەی لەسەر ئەژنۆی دانیشتبوو، پەلەی نەبوو دنیای ماڵەوەیان جێبێڵێت و گەورەببێت؛ بە پێچەوانەوە، دەیویست

زیاتر لەلای باوکی کە پیاوێکی بەسەبر و نەرمونیان بوو و ڕێگەی دەدا شەوانی شەممەلەگەڵ هاوڕێ کوڕەکەی لەژوورێکدا دەرکەلەخویان دابخەن، بمێنێتەوە.

"نوێخوازبوونی ڕەها" بەچ مانایەکەکاتێک مرۆڤ ئیتر گەنج نییەو کچەکەشی لە سەردەمی گەنجێتیی خۆی زۆر جیاوازە؟ پاول بە ئاسانی وەڵامێکی بۆ بینییەوە: لەوەها دۆخێکدا نوێخوازبوونی ڕەها بەمانای هاوشوناسییەلەگەڵ کچەکەی.

دەیهێنمەپێشچاوی خۆم کەپاول لەگەڵ ئەگنیس و بریژیت لەسەر مێزی خواردنی نانی ئێوارەدانیشتووە. بریژیت لاشان دانیشتووەو بەدەم خواردنەوەسەیری تەلەفزیۆن دەکات. هەر سێکیان بێدەنگن، چونکەدەنگی تەلەفزیۆنەکەبەرزە. هێشتا بۆچوونەناخۆشەکەی ورچ، کەگوایە پاول هاوڕێی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆیەتی، لە مێشکیدا دەخولێتەوە. پێکەنینی بەرزی کچەکەی، هەودای بیری دەپسێنێت: لە پرۆگرامێکی ڕیکلامدا منداڵێکی یەکساڵەی ڕووت لەسەر لەگانەکەی هەڵدەستێت و کوتێک کاغەزی سپی تەواڵێت، وەک تۆڕی بووکێکی بەشکۆ، بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت. لەم کاتەدا پاول بیری دەکەوێتەوەماوەیەکەسەری لەوەسووڕماوەکەبریژیت هەرگیز شیعرێکی "ڕیمباو"ی نەخوێندووەتەوە، چونکەپاول بۆخۆی لەو تەمەنەدا شەیدای شیعری "ڕیمباو" بوو، کەواتەدەتوانێت بریژیت بەگۆڕهەڵکەنی خۆی بزانێت.

ئەوەبۆ پاول زۆر ناخۆشەو هەست بەخەمباری دەکات کاتێک دەبینێت کچەکەی، کەتا ئێستا شیعری شاعیرەخۆشەویستەکەی ئەوی نەخوێندووەتەوە، بەسەیرکردنی پرۆگرامێکی بێمانای تەلەفزیۆن لەدڵەوە پێدەکەنێت. ئەو دواتر لەخۆی دەپرسێت: باشەبەڕاست بۆ ئەوەندە"ڕیمباو"ی خۆشدەویست؟ بۆچی ئاوا

شەیدای بووبوو؟ ئایا ئەو هەستەی لەخۆشویستنی شێعرەوەسەرەی هەڵدابوو؟ نا. ئەو دەمانە"ڕیمباو"، ئەفکاری شۆڕشگێڕانەی تێکەڵ بە"ترۆتسکی"، "بریتۆن"، "سوریالی"یەکان، "مائۆ" و "کاسترۆ" کردبوو. یەکەم شتێکی "ڕیمباو" کەکاری تێکرد، ئەو دروشمەی بوو کەکەوتبووەسەر زاری خەڵک: "گۆڕینی ژیان". (دەتگوت فرموولێکی ئەوەندە سادەو ساکار پێویستی بەنبوغێکی شاعیرانەیە!) بەڵێ، ئەوەڕاست بوو کەپاول دواتر شێعرەکانی "ڕیمباو"ی خوێندەوەو هەندێکیانی لەبەر کرد و شەیدایان بوو، بەڵام ئەو هەرگیز هەموو شێعرەکانی ئەوی نەخوێندەوە و هەر ئەو شێعرانەی پێ خۆش بوو کەهاوڕێکانی باسیان دەکرد. ئەوانیش بۆیەباسیان دەکرد، چونکەهاوڕێکانی خۆیان ئامۆژگارییان کردبوون. کەواتەخۆشەویستیی ئەو بۆ "ڕیمباو"، عەشقێکی ستاتیکی نەبوو. ڕەنگەئەو هەرگیز عەشقێکی ستاتیکیشی نەبووبێت. ئەو چووبووەژێر سێبەری "ڕیمباو"ەوە، هەروا کەخەڵک دەچنەژێر سێبەری ئاڵایەک، یان لەدەوری حیزبێکی سیاسی، یان تیپێکی فوتبۆڵ کۆدەبنەوە. کەواتەشێعرەکانی ڕیمباو بەڕاست چییان بەئەو بەخشیوە؟ هەر ئەو هەست بە شانازیکردنەکەگوایە ئەویش لە جوملەی عاشقانی شێعری "ڕیمباو"ە.

پاول بەردەوام بیری قسەکانی ئەم دواییەی لەگەڵ "ورچ" دەکەوتەوە: ئەرێ، ئەو زێدەڕۆیی کردبوو، ئەو خۆی بەدژوازییەکان سپاردبوو، ورچ و هەر کەسێکی دیکەی تووڕەکردبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا، ئایا قسەکانی ڕاست نەبوون؟ ئایا ئەوەی کەورچ بە ڕێزەوەپێی دەڵێت "فەرهەنگ" جۆرێک خۆفریودان نییە، کە هەر

چەندەزۆر جوان و گرینگیشە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەندەبەنرخ نییەکەئێمەپێمان وایە.

ئەو، چەند ڕۆژ لەوەوپێش باسی ئەو ئەفکارەی بۆ بریژیت کرد کەورچی توورەو دەهری کردبوو، هەوڵی دا ئەو وشانەش بەکار بێنێت کەلەلای ئەو بەکاری بردبوو. پاول دەیوست بزانێت بریژیت چ هەڵوێستێکی دەبێت. بریژیت نەک هەر لەو فۆرمولەهاندەرانەی پاول نیگەران نەبوو، بەڵکو ئامادەبوو ئەوانەش تێپەڕێنێت. ئەمەبۆ پاول زۆر گرینگ بوو، چونکەلەم ساڵانەی دواییدا لەجاران زیاتر گرینگی بەکچەکەی دەدا و بۆ زۆر بابەتی گرینگ ڕاوێژی پێدەکرد. پاول سەرەتا بە بیانووی پەروەردەییەوە، بۆ ئەوەی ناچاری بکات بیر لەبابەتەگرینگەکان بکاتەوە، ئەوەی دەکرد، بەڵام ئەو دەورانەزۆر زوو گۆڕانیان بەسەر هات: ئیتر ئەو مامۆستا نەما، بەڵکو بوو بەپیاوێکی دڕدۆنگ و بەگومان کەبۆ ڕاوێژکردن دەچوو بۆ لای کەسێکی غەیبزان.

ئێمەچاوەڕوانی ئەوە نیین کەغەیبزان قسەی عاقڵانەمان بۆ بکات (پاول لەبابەت بەهرەو شێوازی پەروەردەی کچەکەیەوەزێدەڕۆیی نەدەکرد)، بەڵکو پێی وابوو ئەو بە تاڵەدەزوویەکی نادیارەوە پەیوەندیی بەسەرچاوەیەکی ئاوەز، لەدەرەوەی خۆیەوە هەیە، بۆیە بە دڵنیاییەوەبۆچوونەکانی وەردەگرت.

ئەگنێس هەستا، قاپەکانی کۆکردەوەو بۆ چێشتخانەکەی بردن. بریژیت ڕووی بەرەو تەلەفزیۆنەکەسووڕاند و پاول بە تەنیا لەپشت مێزەکەمایەوە. بیری ئەو یارییەی کەوتەوەکەدایکوباوکی لەگەڵمیوانەکانیان دەیانکرد: دە کەس لەبازنەیەکدا، بەدەوری

دەکورسییەوەدەسووڕانەوە و بە داوایەک هەموویان دەبوایەدابنیشن. هەر کورسییەک نووسراوێکی لەسەر بوو. ئێستا ئەو کورسییەکەبۆ ئەو مابووەوەلەسەری نووسرابوو "هاوڕێی ئازیزی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆی". پاول دەیزانی یارییەکەتەواو بووە و ئەو بۆ هەتاهەتایەلەسەر ئەو کورسییەدەمێنێتەوە.

دەبێ چی بکات؟ هیچ. هەرچۆنێک بێت، بۆچی نابێت مرۆڤ ببێت بەهاوڕێی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆی؟ ئایا دەبێت ناچاریان بکات شەڕی لەگەڵ بکەن؟ لەکاتێکدا تەنیا ئەنجامی ئەو شەڕەئەوەدەبێتکە گۆڕهەڵکەنەکان تف لەتابووتەکەی بکەن؟

ئەو دیسان گوێی لەدەنگی پێکەنینی بریژیت بوو، لەو کاتەدا پێناسێکی تازەی بە مێشکدا هات کە دژوازترین و ڕادیکاڵترین پێناسەبوو. ئەوەندەئەم پێناسەیەی بەلاوەخۆش بوو کەتا ڕادەیەک خەمەکەی لەبیر چووەوە. ئەو پێناسەتازەئەمەبوو: "نوێخوازبوونی ڕەها بەو مانایەیەکەکسێک هاوڕێی گۆڕهەڵکەنەکانی خۆی بێت".

## قوربانیی ناوبانگی خۆبوون

هەرچۆنێک بێت، ئەوە کەبەبیرناردی گوت: «مارەم بکە» لەخۆیدا هەڵەیەکی گەورە بوو، بەڵام لە دوای ئەوەی کەنازناوی کەرێکی تەواویان دابوویە، هەڵەیەک بوو بەگەورەیی لووتکەی "مۆنت بلان"، چونکەئێمەدەبێ حسێب بۆ ئەو شتەش بکەین کەهەر چەندەلە سەرتادا بڕواپێکردنی سەختە، بەڵام بۆ ناسینی بێرنارد پێویستە: بێرنارد جگەلەوەی کە بەمنداڵی تووشی تای مێکوتک بووبوو، ئیتر نەخۆش نەکەوتبوو. جگەلەمردنی سەگەڕاوچییەکەی باوکی، هیچ مردنێکی دیکەی بەچاوی خۆی نەدیبوو. جگەلەچەند نمرەی خراپ کەلە قوتابخانەوەریگرتبوو، هیچ شکستێکی تاقی نەکردبووەوە. ئەو بەو باوەڕەنەگۆڕەوە دەژیا کەپیاوێکی بەختیارەو هەموو کەس خۆشی دەوێت. نازناوی "کەر" یەکەم خەساری گەورەی ژیانی بوو.

ئەمەلەمیانەی زنجیرێک ڕووداوی سەیر و هاوکاتدا ڕووی دا. لەو کاتانەدا ئیماگۆلۆگەکان بە نوێنەرایەتیی ڕادیۆ بزووتنەوەیەکیان ڕێکخستبوو، پۆستەری گەورەی دەستەی بەڕێوەبەرەکانیان بە هەموو فەڕەنسەدا بڵاودەکردەوە. ئەندامانی دەستەکەلەو پۆستەرانەدا کراسی سپییان لە بەر کردبوو، قۆڵەکانییان هەڵدابووەوە و لەزەمینەی ئاسمانی شیندا ڕاوەستابوون. دەمیان کردبووەوەو پێدەکەنین. ئەو سەرەتا بەغرور و لووتبەرزییەوەبە شەقامەکانی پاریسدا دەسووڕایەوە، بەڵام یەک دوو حەفتەپاش ئەو ناوبانگەسادەیە، دێوەزمەیەکی سکزل هاتبوو بۆلای و

بەزەردەخەنەوەلوولەیەکی مەقەبایی دابووەدەستی کە دیپلۆمێکی تێدا بوو. ئەگەر ئەو ڕووداوەلەپێش بڵاوبوونەوەی ڕەسمەگەورەکەی ڕووی بدایەکە عالەم دیبووی، ڕەنگە ئاسانتر وەری بگرتایە، بەڵام ناوبانگی ڕەسمەکان، شەرمەزاریی ئەو دیپلۆمەیان زیاتر کرد: شەرمەکەچەند قات بوو.

ئەگەر ڕۆژنامەی "لۆمۆند" ڕاگەیندراوێکی چاپ بکردایەکەگوایەکەسێک بەناوی "بێرنارد بێرتراند" نازناوی "کەرێکی تەواوی" وەرگرتووە، شتێک زۆر سەیر نەبوو، بەڵام ئەم ڕاگەیاندراوەبۆ کەسێک کەڕەسمەکەی بە هەموو شەقامەکاندا بڵاوبووەتەوە، کێشەکەی تەواو جیاواز دەکرد. لەهەلومەرجێکی ئاوادا مرۆڤ هەر شتێکی بەسەر بێت، بەهۆی ناو و ناوبانگییەوەسەد ئەوەندەدەنگ دەداتەوە و زۆر ناخۆشەبەم دەنگدانەوانەوەبەدنیادا بسووڕێتەوە. بێرنارد زۆر زوو پەی بەلاوازیی خۆی برد و بەخۆی گوت ناوبانگ شتێکەکەهەرگیز بە لایەوەگرینگ نەبووە. بێگومان دەیویست سەرکەوتوو بێت، بەڵام سەرکەوتن و ناوبانگ دوو شتی تەواو جیاوازن. ناوبانگ واتەخەڵکێکی زۆر تۆ دەناسن کەتۆ ئەوان ناناسیت و پێشیان وایە هەقیان بەسەرتەوەهەیە. ئەوان بەتەمان بەهەموو شتێکی تۆ بزانن و بە شێوەیەک هەڵسوکەوت دەکەن کەگوایە خاوەنی تۆن. پێدەچێت ئەکتەرەکان، گۆرانیبێژەکان و سیاسەتمەدارەکان ئەم ناسراوییەیان پێ خۆش بێت، بەڵام بێرنارد پێی خۆش نەبوو. ماوەیەک لەوەوپێش، کاتێک چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەکتەرێک کرد کەکوڕەکەی لەڕووداوێکی ناخۆش تێوەگلابوو، بەوەی زانی کەچۆن ناوبانگ، وەک پاژنەی ئاخیل و خاڵی لاواز، بووەبەکلکێک کەئەو دەتوانێ ڕایکێشێت، هەڵیسووڕێنێت، یان گرێی بدات. بیرنارد هەمیشە پێی خۆش بوو

ئەو کەسەبێت کەپرسیار دەکات، نەک ئەو کەسەکەدەبێت وەڵام بداتەوە. ناوبانگ هی ئەو کەسەیەکە دەبێت وەڵام بداتەوە، نەک ئەو کەسەکەدەپرسێت. پرۆژکتۆر تیشک لەڕوخساری وەڵامدەرەوەکەدەگرێت، بەڵام خاوەنی پرسیارەکان لەدواوە پیشان دەدا. ئەوەی لە بەرچاوی هەمواندایە"نیکسۆن"ە، نەک "باب وودوارد". بێرنارد هەرگیز ئاواتەخواز نەبوو ببێت بەو کەسەکەچراکان تیشکیان لەڕوخساری گرتووە، بەڵکو دەیویست هێزی ئەو کەسەی ببێت کەلە تاریکیدایە. ئەو، هێزی ئەو ڕاوچییەی دەویست کەڕاوی بەور دەکات، نەک ناوبانگی ئەو بەورەکەستایشکارەکانی حەزیان دەکرد پێستەکەی، لەباتی قاڵی، لە لای تەختەکەیان ڕابخەن.

ئەڵبەت ناوبانگ تەنیا تایبەت بەکەسانی ناودار نییە. هەموو کەس، بەش بە حاڵی خۆی، بۆ ساتێک ناوبانگ دەژی و دەبێتەخاوەنی ئەو هەستە کە"گرێتا گاربۆ"، "نیکسۆن"، یان بەورێکی کەوڵکراو هەیانە. دەمی کراوەی بێرنارد بەسەر دیوارەکانی پاریسەوەپێدەکەنی و هەستی دەکرد بووەبە گاڵتەجاڕی خەڵک: هەموو کەس ئەوی دەبینی، لێکدانەوەی بۆ دەکرد و هەڵی دەسەنگاند. کاتێک لاورا پێی گوت: «بێرنارد مارەم بکە»، لاورای هێنایەپێشچاوی خۆی کەدەتگوت بەکۆت و زنجیرەوەلەپەنایدا ڕاوەستاوە. پاشان لەپڕ پێی وابوو لاورا لە بەرچاویدا پیر بووە(ئەو هەرگیز تووشی ئەم حاڵەتەنەبووبوو)، بەشێوازێکی زۆر ناحەز، سەیر و گاڵتەجاڕیی بووە.

ئەمەزۆر گەوجانەبوو، چونکەئەو ئێستا لەهەمیشەزیاتر پێویستی بەلاورا بوو. ئێستاش وەک جاران بە قازانجی بوو کە ژنێکی لەخۆی بەتەمەنتر خۆشی بوێت، ئەڵبەت بەو مەرجەکە ئەو خۆشەویستییەشاراوەتر و ئەو ژنەش عاقڵتر و بەپارێزتر بێت.

ئەگەر لاورا لەباتی ئەو پێشنیارەگەوجانەی بۆ مارەکردن، هەوڵی بدایەدوور لەهەراهەرای کۆمەڵگەئەو خۆشەویستییەیان بکاتەباروودتێکی ئەفسانەیی و سیحراوی، بێگومان دەیتوانی بێرنارد بۆ خۆی ڕابگرێت، بەڵام ئەو کاتێک لەهەموو کوێ چاوی بەڕەسمی گەورەی بێرنارد کەوت و لەگەڵگۆڕانی ڕەفتار و بێدەنگی و هۆشپەرتییەکەیدا هەڵی سەنگاند، لەوەدڵنیا بوو کەئەو سەرکەوتنەژنێکی تازەی پێ بەخشیوەکەبەردەوام هۆشی لەلایەتی و چونکە نەیدەویست بەبێ شەڕ تەسلیم ببێت، هێرشی بۆ برد.

ئێستا دەتوانن لەوەتێبگەین کەبۆچی بێرنارد پاشەکشەی کرد. بەپێی یاسا کاتێک لایەک هێرش دەبات، لاکەی دیکەدەبێ پاشەکشەبکات. پاشەکشە، وەک هەموومان دەزانین، دژوارترین تاکتیکی سوپاییە. بێرنارد وەک ماتماتیکزانێکی وردبین پاشەکشەی کرد: ئەو کە جاران هەفتەیەک چوار شەو لەگەڵ لاورا پێکەوەبوون، ئێستا کردی بەدوو شەو. ئەو کەپێشتر هەموو کاتی پشووی کۆتایی هەفتەی لەگەڵ لاورا تێدەپەڕاند، ئێستا کردی بەدوو حەفتەجارێک و بەتەما بوو لە داهاتوودا لەوەش کەمتری بکاتەوە. ئەو پێی وابوو کاپیتانی کەشتییەکی ئاسمانییەکە خەریکەدێتەخوار و دەبێ گورجێک خێراییەکەی کەم بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەدا کەئەو دڵدارەمیهرەبان و دڵڕفێنەی لە پێشچاوی کاڵ دەبووەوە، دەستبەجێ ڕاوەستا. دڵدارەکەی وردەوردە دەبوو بەژنێکی شێت و شەڕانی و چالاک.

ڕۆژێک ورچ پێی گوت:

«دەسگیرانەکەتم بینی».

بێرنارد لە شەرمان سوور هەڵگەڕا. ورچ گوتی:

«باسی ئەوەی کرد کە نێوانتان ناخۆش بووە. ئەو ژنێکی دڵڕفێنە، لەگەڵی چاک بە».

بێرنارد لەداخان ڕەنگی پەڕی. دەیزانی ورچ قسەی لە دەمدا پێ ڕاناگیرێت و تا ئێستا هەموو هاوکارەکانی ڕادیۆی، بەهەموو شتێکی دڵدارەکەیان زانیوە. بێرنارد کەپێی وابوو چیرۆکێکی عاشقانەلەگەڵ ژنێکی لەخۆی بەتەمنتر لادانێکی خۆش و تا ڕادەیەک بوێرانەیە، ئێستا لەوەدڵنیابوو کە هاوکارەکانی بۆ ئەو هەڵبژاردنەی بەکەری دەزانن.

«بۆ دەچی بۆ ئەملاولا و لە لای خەڵک گلەییم لێدەکەیت؟»

«کامە خەڵک؟»

«ورچ».

«من پێم وابوو ئەو هاوڕێتە».

«تەنانەت ئەگەر هاوڕێشم بێت، بۆ لە لای ئەو باسی ژیانی تایبەتیی خۆمان دەکەیت؟»

لاورا بەخەمبارییەوەگوتی: «من خۆشەویستیی خۆم بۆ تۆ ناشارمەوە. نەکا نابێت باسی بکەم؟ ڕەنگەمن دەبمەهۆی شەرمەزاربوونت؟»

بێرنارد بێدەنگ بوو. ئەریَ، ئەو شەرمەزاری دەکرد. ئەگەرچی لاورا ئەوی خۆشحاڵ دەکرد، کەچی شەرمەزاریشی دەکرد، بەڵام لاورا تەنیا ئەو کاتانەئەوی خۆشحاڵ دەکرد کەبێرنارد شەرمەزارییەکەی بەرامبەر بەئەو لە بیر دەچووەوە.

١

## شەڕ

لاورا کاتێک هەستی بەوە کرد کەپاپۆڕی عەشق بەخاوی تێدەپەڕێت، زۆر شڵەژا.

«چی بووە؟»

«هیچنەبووە».

«بۆچی ئاوا گۆڕاوی؟»

«دەمەوێ بەتەنیا بم و هیچیتر».

«شتێک ڕووی داوە؟»

«زۆر تەنگاوم».

«مادام شتێک تەنگاوت دەکات، نابێت بە تەنیا بمێنیتەوە. خەڵک کاتێک تەنگاو دەبن، دەبێت پێکەوە قسەی لەبارەوەبکەن».

ڕۆژی هەینی بێرنارد بێ ئەوەی داوا لەلاورا بکات کەلەگەڵی بچێت، ڕۆشت بۆ ماڵەکەی لەگوند. لاورا ڕۆژی شەممە، بەبێ دەعوەت شوێنی کەوت. ئەو دەیزانی کەنابێت کاری وا بکات، بەڵام لەمێژبوو بەوە ڕاهاتبوو ئەو کارانەبکات کەنەدەبوایەبیانکات و شانازیشی پێوە دەکردن، چونکەلەبەر ئەو شتانەبوو کەپیاوان، لە هەمووشیان زیاتر بێرنارد، ستایشیان دەکرد. ئەو ئەگەر کۆنسێرت، یان شانۆیەکی پێ خۆش نەبوایە، بەهەراوهاوار نارەزایەتی دەردەبڕی و لەکاتێکدا سەیرکەرەکان دەیانبۆلاند، لەهۆڵەکەدەڕۆشتەدەر. ڕۆژێک کەبێرنارد کچی دەرکەوانەکەی نارد بۆ فرۆشگە تا ئەو نامەبۆ لاورا ببات کەدەمێکبوو چاوەڕێی بوو،

لاورا لەخۆشییان چەکمەجەکەی کردەوەو کڵاوێکی پێستەی بەو کچەشانزەساڵەبەخشی کەلانیکەم دوو هەزار فرانکی دەهێنا. جارێکی دیکەش کەئەو و بێرنارد بۆ دوو ڕۆژ حەوانەوە چووبوون بۆ ڤیلایەکی بەکرێی قەراغ دەریا، لاورا لەڕۆژی یەکەمدا بۆ تەمێکردنی بێرنارد، لەبەیانییەوەتا ئێوارە یاریی لەگەڵ کوڕێکی دوازدە ساڵانەی کابرایەکی ماسیگر کرد و خۆی وا پیشان دا کەدڵدارەکەی تەواو لەبیر چووەتەوە. سەیر ئەوەبوو کەبێرنارد هەرچەندەلەوەنیگەران بوو، بەڵام ئەو ڕەفتارەی لاورای بەنموونەی هەڵسوکەوتێکی دڵڕفێن و بێوێنەزانی (ئەو کوڕەبوو بەهۆی ئەوەکەمن هەموو دنیا لەبیر بکەم) و خۆی لەگەڵ ئەو ڕەفتارەژنانەدا گونجاند کە پیاو چەک دەکات. (ئایا هەستی دایکانەی لاورا بەو منداڵەنەورووژابوو؟) پاشان بۆ دواڕۆژدا کەلاورا لەبری کوڕی ماسیگرەکە، هەموو کاتەکەی لەگەڵ بێرنارد بردەسەر، ئەویش خێرا هەموو ڕق و توورەییەکەی فەرامۆش کرد. بیرۆکەبەهەوەسانەکەی لاورا، لە بەرچاوی عاشق و ستایشکاری بێرناردا بەشادییەوەدەپشکووتن؛ تەنانەت دەتوانم بڵێم ئەو بیرۆکەبەهەوەسانەوەک پنچکەگوڵ دەپشکووتن. لاورا ئەو ڕەفتارەنەشیاو و قسەناشایستانەی خۆی بەنیشانەی ویقار و سەرنجڕاکێشی دەزانی و پێی خۆش بوو.

ئەو کاتەش کە بێرنارد خۆی لێ دوورخستەوە، دیسان ئەو ڕەفتارە نائاسایی و دوور لە میانڕەوییەی خۆی نەگۆڕی، بەڵکو خێرا دۆخەشاد و سرووشتییەکەی ون کرد. ئەو ڕۆژەکەبڕیاری دا بەبێ دەعوەت شوێنی بکەوێت، سوور دەیزانی کەکەس مەدحی ئەو کارەی ناکات؛ بۆیە بەدڵەڕاوکەوەچوو بۆ لای، دڵەڕاوکەیەک کەبوو بەهۆی ئەوەسەرکێشییەکەی، ئەو سەرکێشییە پاک و شیرینەی جارانی، وەک سەرچڵییەکی هێرشکار و زۆرەملەی لێبێت. لاورا

بەوەی دەزانی و چونکەبێرنارد ئەوی لەو شادییەکەلەناخی خۆیدا هەستی پێ دەکرد بێبەش کردبوو، شادییەک کەئێستا دەردەکەوت زۆر ناسکەو بەبێرناردەوە، بە خۆشەویستیی بێرنارد و ستایشەکانی ئەوەوەبەستراوەتەوە، ڕقی لێی بوو. کەچی بەو حاڵەش شتێک پاڵی پێوەدەنا تا لە جاران زیاتر درێژەبەو کارە سەیر و گەوجانەی خۆی بدات و بێرنارد ناچار بکات لەگەڵی بەشەڕ بێت؛ هەستی دەکرد پێی خۆشەبە دزییەوەبۆمبێک بتەقێنێتەوە و بەهیوا بوو کەهەورەکان لەپاش ئەو زریانەبڕەوێنەوەو هەموو شتێک وەک جارانی لێ بێتەوە.

لاورا بە قاقای پێکەنینەوە گوتی:

«من لێرەم. هیوادارم کەپێت خۆش بێت».

«بەڵێ پێم خۆشە، بەڵام من بۆ کارکردن هاتووم بۆ ئێرە».

«من ڕێی کارکردنت لێ ناگرم. جگەلەوەی کەپێم خۆشەلەلات بم، هیچی دیکەم لەتۆ ناوێت. بۆ مەگەر تا ئێستا ڕێی کارکردنم لێ گرتووی؟»

بێرنارد وەڵامی نەدایەوە.

«تازە، خۆ ئێمە هەمیشەپێکەوەدەهاتین بۆ ئێرەو تۆ لێرەپڕۆگرامەکانی ڕادیۆت ئامادەدەکرد. ئایا تا ئێستا ڕووی داوەکە من ڕێم لێ گرتبێتی؟»

بیرنارد وەڵامی نەدایەوە.

«تا ئێستا من ڕێم لێ گرتووی؟»

ئیتر هیچی پێ نەدەکرا. ناچار بوو وەڵامی بداتەوە:

«نا».

«کەواتەچی بووەکەئێستا پێت وایەڕێت لێ دەگرم؟»

«تۆ ڕێم لێ ناگری».

«درۆم لەگەڵ مەکەبێرنارد. وەک پیاو هەڵسوکەوت بکە. لانیکەم ئەوەندەئازا بەو ڕاست و ڕەوان پێم بڵێ لەبەر ئەوەلێم تووڕەیت کەبەخواستی خۆم هاتووم. من پیاوی ترسنۆکم خۆش ناوێت. وا چاکەپێم بڵێی هەر ئێستا کەلوپەلەکەم کۆبکەمەوەو لێرەبڕۆم. دەپێمبڵێ!»

بیرنارد گێژ بووبوو. شانی هەڵتەکاند.

«بۆ ئەوەندە ترسنۆکیت؟»

دیسان شانی هەڵتەکاندەوە.

«ئەوەندەشان هەڵمەتیەکێنە!»

هەستی کرد حەز دەکات بۆ جاری سێهەمیش شانی هەڵتەکێنێت، بەلام بەری بەخۆی گرت.

«پێم بڵێ بزانم بۆچی ئاوات لێ هاتووە؟ چی بووە؟»

«هیچ نەبووە».

«تۆ گۆڕاوی».

بێرنارد دەنگی بەرزکردەوە:

«من بۆخۆم کێشەو گرفتم زۆرە».

«منیش کێشەو گرفتم هەیە».

بێرنارد هەستی بەگەوجانەبوونی ڕەفتارەکەی خۆی کرد، ڕێک وەک منداڵێک بوو کەدایکی زۆری بۆ هێنابێت؛ لەبەر ئەوەش ڕقی لە لاورا بوو. ئەو نەیدەزانی دەبێ چی بکات. دەیزانی چۆن لەگەڵ ژناندا ڕووخوش و میهرەبان و دلڕفێن بێت، بەلام نەیدەزانی چۆن ڕووگرژ و نامیهرەبان بێت. کەس فێری ئەوەی نەکردبوو؛ بەپێچەوانەوە، فێریان کردبوو کەنابێ هەرگیز لەگەڵ ژنان نامیهرەبان بێت. ئەی کەواتەلەگەڵ ژنێک کەبەبێ دەعوەت خۆی

بەماڵەکەیدا دەکات، دەبێ چۆن بجووڵێتەوە؟ لەکام زانکۆ پیاو فێری شتی ئاوا دەکەن؟

بێرنارد وازی لەوەلامدانەوەهێنا و چوو بۆ ژوورەکەی تر. لەوێ لەسەر چرپاکەڕاکشا و یەکەم کتێب کەلێی نزیک بوو، بە دەستییەوەگرت. کتێبەکەچیرۆکێکی پۆلیسی بوو بەبەرگێکی مەقەبایی ناسکەوە. ئەو بەقەفاوەڕاکشا و کتێبەکەی بەرزکردەوە، وای پیشان دا کەخەریکەدەیخوێنێتەوە. پاش دوو خولەک لاوراش شوێنی کەوت. لەسەر کورسییەکی بەرامبەری دانیشت. لاورا سەیری ڕەسمی ڕەنگاوڕەنگی سەر بەرگی کتێبەکەی کرد و گوتی:

«چۆن دەتوانی ئەم شتانەبخوێنیتەوە؟»

بێرنارد بەسەرسووڕمانەوەلێی وردبووەوە.

لاورا گوتی:

«سەیری ڕووبەرگی کتێبەکەدەکەم».

بێرنارد هێشتا تێنەگەیشتبوو.

«چۆن دەتوانی ڕووبەرگێکی ئاوا ناحەز بەرەوڕووی من بگریت؟ ئەگەر بەڕاست بەتەمای ئەم کتێبەلە لای من بخوێنیتەوە، لانیکەم پیاوەتی بکەو بەرگەکەی بدڕێنە».

بێرنارد بێ ئەوەهیچ بڵێت بەرگی کتێبەکەی دڕاند و لە خوێندنەوەی بەردەوام بوو.

لاورا هەستی کرد پێی خۆشەهاوار بکات. بیری کردەوەوا چاکەهەستێ و لەوێ بڕوات و ئیتر هەرگیز نەیبینێتەوە، یان بە ئارامی کتێبەکەی دەستی لابدا و تف لە ڕوومەتی بکات، بەڵام توانای هیچکام لەو کارانەی نەبوو. لەبری ئەوەخۆی فڕێدایەسەری و (کتێبەکەلە دەست بێرنارد بەربووەوە)بەتووڕەییەوەماچی کرد و بەخۆیەوەگووشی.

بێرنارد بچووکترین مەیلێکی بۆ دەستەملان و جووتبوون نەبوو، بەڵام نەیدەوێرا ئەوەی پێ بڵێت. نەیدەتوانی دەست بەڕووی ئەو داوا عاشقانەیەوەبنێت. لەم بارەوەئەویش وەک هەموو پیاوێکی دیکەی ئەم دنیایەنەیدەوێرا بەژنێک کەخستبوویەناو لنگانی و بە خۆیەوەدەگووشی بڵێ: «تکایەوازم لێبێنە».

پیاوێک کەساتێک لەوەوپێش بەلووتبەرزییەکی شاهانەوەبەرگی کتێبەکەی دڕاند و دایەدەستی دڵدارەداماوەکەی، ئێستا بە ملکەچییەوەوەڵامی ڕاموسانەکەی دەدایەوەو بەدەم داکەندنی پانتۆڵەکەیەوەماچی دەکرد.

هەرچۆنێک بێت، لاوراش حەزی لەجووتبوون و دەستەملان نەبوو. ئەوەی کەئەوی بەرەو بێرنارد ڕادەکێشا، یەکەم ئەوەبوو کەنەیدەزانی دەبێ چی بکات، لە هەمان کاتیشدا پێویستی بەوەبوو کارێک بکات. ڕەفتاری شەهوانی و بێعۆقرەی لاورا پێشاندەری جۆشوخرۆشی بۆ کارێک بوو، تەمەنای بێدەنگی بۆ وشەیەک. کاتێک ئەوان جووتبوون، لاورا هەوڵی دا لەجاران زیاتر باوەشی بۆ بکاتەوە، لەجاران زیاتر باوەشی بۆ بکات بەئاگر و بیسووتێنێت، بەڵام چۆن دەیتوانی بەم جووتبوونەبێدەنگەئەوەبکات؟ (جووتبوونی ئەوان هەمیشەبێدەنگ بوو، ئەوپەڕەکەی بەچرپەیەکی عاشقانەو شەهوانییەوە) ئەرێ، چۆن دەیتوانی؟ بەجووڵەی توند و گرژ؟ بەئاخ و ئۆفی بەرز و بڵیند؟ بەگۆڕینی بەردەوامی حاڵەتەکانی لەشی؟ لاورا جگەلەم سیانەهیچ شێوازێکی دیکەی نەدەزانی، بۆیەئێستا سێهەمینیانی هەڵبژارد. ئەو بۆخۆی، بە تەنیا هەوڵی دا وەزعی بێرنارد بگۆڕێت. ئێستا ئەو چوارچمکۆڵەبوو، لە کاتێکدا بێرنارد لنگی بڵاوکردبووەوە، لەبەرپێیدا کەوتەسەر چیچکان و خستییەدۆخێکی ئەوەندەخۆش و ئاواتەخوازییەوەکەپێشتر ئەوەیان نەکردبوو.

بێرنارد ئەم کارەسەیرەسێکسییەی وەک سەرکێشییەک لێکدایەوەکەناتوانێت یارمەتیی بدات، بەڵام وەڵامی دەداتەوە. ئەو لە ناخی خۆیدا هەستی بەیەکەم نیگەرانیی کوڕێکی مێرمنداڵ کرد کەدەترسێت بەرامبەرەکەی گومان لەهێز و توانا و باڵغبوونی بکات. نیگەرانییەکەی بێرنارد ئەو هێزەی بەلاورا بەخشی کەماوەیەک بوو لەدەستی دابوو، پەیوەندیی ئەوان لەبنەڕەتدا لەسەر ئەو هێزەبنیادنرابوو: هێز و دەسەڵاتی ژنێکی بەتەمەنتر لەدۆستەکەی. بێرنارد دیسان تووشی ئەو هەستەبووەوەکەلاورا زۆر لەئەو بەئەزموونترە، ئەو زۆر شت دەزانێت کەبێرنارد نایزانێت، ئەو دەتوانێت بێرنارد بە خەڵکیتر بەراورد بکات و هەڵی سەنگێنێت، بۆیەبەغیرەتەوەئەوەی پێویست بوو کردی. وەک سەربازێک کە فەرمانەکان بەڕێوە دەبات، بە چابوکی و ڕێکوپێکی وەڵامی بچووکترین ئیشارەتەکانی لەشی لاورای بۆ گۆڕینی دۆخەکەی دایەوە. ئەو ورووژانەناچاری و چاوەڕواننەکراوەی جووتبوونەکەیان، ئەوەندە بێرناردی بەخۆیەوەمەشغووڵ کرد کەنەیزانی ئایا بۆخوشی ورووژاوە،یان نا. ئایا هیچ چێژ و لەززەتێک لەو کارە دەبینێت، یان نا.

ئەڵبەتەلاوراش بیری لەچێژ، یان هەڵچوون و ورووژانی خۆی نەدەکردەوە. ئەو لەبێدەنگیدا بەخۆی دەگوت: ناهێڵم بڕۆی، ناهێڵم لەخۆتم دوور بکەیتەوە، شەڕت لەپێناودا دەکەم. ئەوسا سێکسکردنەکەی، هەڵبەزودابەزکردنەکەی، بووبوو بەمەکینەیەکی شەڕکەر کەخستبوویەگەڕ و کۆنترۆڵی بەسەردا بوو. لاورا بە خۆی گوت ئەمە دواهەم بیانوویەتی، تاکەبیانوویەکی زۆر بەهێز کەبۆی ماوەتەوە. وەک 'Ostinato' یەکەلەگەڵ 'bass' ێکدا کۆمپۆزسیۆنێکی مۆسیقای بۆ فەراهەم دەکات، لاورا بەدەم هەوای جووڵەکانییەوە،

لای خۆی دووبارەی دەکردەوە: شەڕ دەکەم، شەڕ دەکەم، شەڕ دەکەم و دڵنیابوو کەسەردەکەوێت.

هەر قامووسێکتان پێ خۆشەبێکەنەوە. شەڕکردن واتەسەپاندنی ئیرادەی خۆت بەسەر ئیرادەی ئەوی دیکەدا، بەمەبەستی تێکشکاندن و خستنەسەر چۆک و ئەگەر بکرێت کوشتنی بەرامبەرەکەت. «ژیان شەڕکردنە» ئەم دەستەواژەسەرەتا دەبێت بە مانای خەم و تەسلیم بووبێت، بەڵام سەدەی ئێمە، ئەم سەدەی گەشبینی و کۆکوژییە، توانیویەتی کارێک بکات کەئەم دەستەواژەترسناکەوەک دەنگێکی شادی لێ بێت کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە. ڕەنگە بڵێن شەرکردن دژ بە کەسێک ترسناکە، بەڵام شەڕکردن لەپێناوی شتێک، کارێکی شەریفانەو جوانە. بەڵێ، هەوڵدان لەپێناوی شادی (یان عەشق، یان دادپەروەری و هتد) جوانە، بەڵام ئەگەر بەوەڕابێن کەهەوڵەکەتان بەوشەی شەڕ دەرببڕن، بەو مانایەیەکەهەوڵەشەریفانەکەشتان ئەو ئاواتەشاراوەی تێدایەکەدەتانەوێ کەسێک بگلێنن. هەمیشەشەڕ "بۆ" بەشەڕ "دژ بە"وە گرێدراوە. لەکاتی شەڕدا ئامرازی پەیوەندیی "بۆ" بەقازانجی ئامرازی پەیوەندیی "دژ بە" لەبیر دەکرێت.

لاورا لە کاتی جووتبووندا بەهێز و گوڕێکی زۆرەوەهەڵدەبەزی و دادەبەزی. ئەو دەجەنگی؛ ئەو بە جووتبوون و دەستەملانەوە دەجەنگی. شەڕی لاورا بۆ بێرنارد بوو. ئەی دژ بەکێ؟ دژ بەو کەسەکەبەلەشی خۆیەوە نووساندبووی و بەرەو هەندێک دۆخ و جووڵەی تازەی سکسی پاڵی پێوە دەنا. ئەم جووڵەژیمناستیکییانەماندوویانی دەکرد و لەو دۆخەبێدەنگیەدا، لەشەڕێکی دڵڕەقانەدەچوو کەلاورا هێرشی دەبرد و بێرنارد بەرگری دەکرد، لاورا فەرمانی دەدا و بێرنارد ملکەچی فەرمانەکەی بوو.

## پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس"

پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" بە پێ بەشەقامی "دومایِن"دا دەگەڕا. لە ویستگەی شەمەندەفەری "مونپارناس" تێپەڕی و لەبەر ئەوەکە پەلەی نەبوو، بڕیاری دا سەیرێکی فروشگەی لافایت بکات. لە بەشی جلوبەرگی ژنانە، مانکەنەلاستیقییەکان کەدوا مۆدەی جلوبەرگیان لە بەردا بوو، لەهەموو لاوەسەیریان دەکرد. "ئاڤەناریوس" پێی خۆش بوو کەلای ئەوان بوو، بە تایبەت لەم ژنەبێجوولانەنزیک بووبووەوە کەلەفیگەرێکی شێتانەدا وشک بووبوون، چونکەدەمیان نەوەک بۆ پێکەنین (لێویان پان نەبووبووەوە)، بەڵکو بۆ دەربڕینی سەرسووڕمان کرابووەوە. پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" پێی وابوو ئەم ژنەڕچیوانە چاویان بەبەشێک لەلەشی ئەو کەوتووە. جگەلەو مانکەنانەکەترسێکی سەیریان دەردەبڕی، مانکەنی واشیان تێدا بوو کەهەر دەمیان نەکرابووەوە، بەڵکو لێویشیان، ئەو گردیلەسوور و بچووکانەکەدرزێک لە ناوەڕاستدا خونچەی کردبوون، هەموو ساتێک بۆ ماچکردنی شەهوانیی پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" ئامادە بوون. دەستەی سێهەمیش کەلێویان بەبزەیەکی ئەفسووناوی لەسەر ڕوومەتەلاستیقییەکەیان پشکووتبوو، چاوەنیوەکراوەکانیان بە ئاشکرا دەری دەخست کەخەریکن چێژ لەسێکسێکی ئارام و بەردەوام وەردەگرن.

ئەم دەعوەت بەسێکسەخۆشەکە وەک شەپۆلی تیشکپژێنی ئەتۆمی لەو مانکەنانەهەڵدەستا، بەبێ وەڵام دەمایەوە. خەڵکی

ماندوو، خەمۆک، بێزار، تووڕەو دوور لەشەهوەت، لە بەرامبەر ئەم نمایشەدا تێدەپەڕین. تەنیا پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس"، کە پێی وابوو دەرهێنەری ئەم چێژەخۆش و مەزنەیە، بەخۆشییەوەبەو ناوەدا دەسووڕایەوە.

بەڵام هەموو شتە جوانەکان دەبێ کۆتاییان پێ بێت. پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" لەفرۆشگەکەڕۆشتە دەر و بۆ پاراستنی خۆی لەهاتوچووی ئۆتۆمبێلەکانی شەقام، بەپلیکانێکدا داگەڕا و خۆی بەڕاڕەوی پێچاوپلووچی میترۆدا کرد. ئەو گەلێک جار بەم ڕێگەیەدا دەڕوشت و هیچکام لەو شتانەش کەدەیبینی تووشی سەرسووڕمانی نەدەکرد. ڕاڕەوی میترۆ وەک هەمیشەچەند کەسێکی ئاسایی لێ بوو. دوو بەرەڵلا (dochards) بەلۆرەلۆر دەڕۆشتن، یەکیان شووشەیەک شەرابی سووری پێبوو، جاروبار بە بێحاڵی ئاوڕی لەڕێبوارەکان دەدایەوەو بەبزەیەکی کڵۆڵانەداوای یارمەتیی زیاتری لێ دەکردن. پیاوێکی گەنج کەبەبەرەدەستی ڕوومەتی شاردبووەوە، دانیشتبوو پاڵی بە دیوارەوەدابوو. نووسراوەکەی بەردەمی ئاشکرای دەکرد کە تازەلە بەندیخانەبەربووە و نەیتوانیوەکارێک بۆ خۆی بدۆزێتەوەو برسییەتی. مۆسیقاژەنێکی ماندوو بەرەوڕووی زیندانییەکەی جاران پاڵی بەدیوارەوەدابوو، کڵاوێک و چەند دراوێک لەلایەکی و ترۆمپەتێکی برینجیش لەلاکەی دیکەی داندرابوو.

هەموو ئەمانەئاسایی بوون، بەڵام شتێکی نائاسایی سەرنجی پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس"ی ڕاکێشا. ژنێکی جوان لە مابەینی زیندانییەکەی جاران و دوو بەرەڵلا سەرخۆشەکەڕاوەستابوو کە تەمەنی چل ساڵ دەبوو. ئەو لەپاڵ دیوارەکەنەبوو، لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکە ڕاوەستابوو، سندووقێکی سووری کۆکردنەوەی یارمەتیی

به دەستەوەبوو، بەبزەیەکی شیرینی ژنانەوەسندووقەکەی لە پێش ڕێبوارەکان ڕادەگرت. شتێک لەسەر سندووقەکەنووسرابوو: «یارمەتیی گولەکان بدەن». جلەجوانەکانی ئەو ژنەلەگەڵ شتەکانی دەوروبەری نەدەگونجا و شادییەکەی وەکو فانۆسێک ڕاڕەوەتاریکەکەی ڕۆشن کردبوو. دیاربوو ئەو سواڵکەرانە، کەهەمیشەلەوێ سواڵیان دەکرد، لە بوونی ئەو ژنەلەوێ نیگەران بوون و ترۆمپەتی بەرپێی مۆسیقاژەنەکەش نیشانەی تەسلیمبوونی خاوەنەکەی لەو کێبەرکێ نایەکسانەدا بوو.

کاتێک چاوی ژنەکەلەنیگای کەسێک هەڵئەنگوت، ئەوەندە لەسەرخۆ دەدوا کەسەرەتا ڕێبوارەکەلەباتی بیستنی دەنگی، جووڵەی لێوی دەخوێندەوە: «گولەکان!» پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس"یش حەزی دەکرد وشەکانی سەر لێوی بخوێنێتەوە، بەڵام کاتێک ژنەکەچاوی بەئەو کەوت گوتی «گولە...» و «...کان»ەکەی پێتەواو نەکرا؛ چونکەژنەکەئەوی ناسیبووەوە. "ئاڤەناریوس"یش ئەوی ناسیبووەوەو سەری لەوەسوورمابوو کەئەو بۆ دەبێ لێرەبێت. "ئاڤەناریوس" بەپلیکانەکاندا هەڵگەڕا و خۆی گەیاندە ئەوبەری بلوارەکە.

ئەو زانیی کەبەخۆشاردنەوەی لەهاتوچووی ئۆتۆمبێلەکان کاتەکەی بەفیڕۆداوە، چونکە هاتوچووی ئۆتۆمبێلەکان ڕاوەستابوو. لەلای "لاکوپۆل"ەوەحەشیمەتێکی زۆر بەرەو "شەقامی ڕێن" دەجووڵان. هەموویان ڕەشپێست بوون. پرۆفیسۆر پێی وابوو کەعەرەبی گەنجن و دژ بە ڕەگەزپەرستی نارەزایەتی دەردەبڕن. بێ ئەوەی گوێیان بداتێ، کەمێک زیاتر بەپێ ڕۆشت و دەرکەی کافەیەکی کردەوە. بەڕێوەبەری کافەکەبەدەنگی بەرز پێی گوت:

«بەڕێز کوندێرا لێرەبوو. ئەو داوای لێبوردنی لێ کردیت و گوتی درەنگ دەگەڕێتەوە. کتێبەکەی بۆ دانایت تا لەم ماوەدا بێتاقەت نەبیت».

ئەوسا کتێبێکی بەرگ مەقەبای ناسک و هەرزانی لەڕۆمانەکەی من، «ژیان لەشوێنێکی دیکەیە»، دایە دەستی.

"ئاڤەناریوس" بێ ئەوەسەیری کتێبەکەبکات، خستیەناو گیرفانیەوە، چونکەلەو کاتەدا بیری ئەو ژنەکەوتەوەکەسندووقێکی سووری یارمەتیی بەدەستەوەبوو، ویستی جارێکی دیکەش بیبینێتەوە.

«هەر ئێستا دەگەڕێمەوە».

ئەوەی گوت و ڕۆشتەدەر. ئەو بەو دروشمانەدا کەبەژوورسەری خۆپیشاندەرەکانەوەبوون، زانیی کەئەوان عەرەب نین، بەڵکو تورکن و دژ بەرەگەزپەرستیی فەرەنسییەکان خۆپیشاندان ناکەن، بەڵکو دژ بەبولگاریکردنی کەمینەی تورکی بولگاریا خۆپیشاندان دەکەن. خۆپیشاندەرەکان لەبەرزکردنەوەی مستەکانیان بەردەوام بوون، بەڵام بەکەمێک دڵشکاوییەوە، چونکەخەمساردیی بێسنووری فەرەنسییەکان نائومێدی کردبوون. ئەوان کەئێستا چاویان بەسکی بەشکۆ و خڕ و شەڕانیی پیاوێک دەکەوت کەبەهەمان ڕێگەدا، بەلێواری پیادەڕۆکەدا دەڕۆشت و مستی هەڵبڕیبوو دەینەڕاند: «مردن بۆ ڕووسەکان! مردن بۆ بولگارییەکان!»، هێز و گوڕێکی زیاتریان پەیدا کرد و هاواریان جارێکی دیکەش لەهەموو بلوارەکەدا دەنگی دایەوە.

ئەو، لە ژوور ئەو پلیکانانە کەساتێک لەوەوپێش پیایاندا هەڵگەڕابوو، چاوی بە دوو ژنی ناحەز کەوت کە بەیاننامەیان

بڵاودەکردەوە. چونکەدەیویست شتی زیاتر لەبارەی ئاواتی تورکەکانەوەبزانێت، لەیەکێکیانی پرسی:

«تۆ تورکی؟»

ئەو ژنەکەدەتگوت تاوانی نازناوێکی ترسناکی دراوەتەپاڵ، هاواری کرد:

«خودا نەکات! ئێمەهیچ پەیوەندییەکمان بەم خۆپیشاندانەوەنییە! ئێمەهاتووین دژ بە ڕەگەزپەرستی ناڕەزایەتی دەرببڕین!»

پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" دوو بەیاننامەی لەو دوو ژنە وەرگرت و بەڕێکەوت چاوی بەزەردەخەنەی پیاوێکی گەنج کەوت کەبەخەمساردییەوەپاڵی بەنەردەی میترۆکەوەدابوو. کابرای گەنجیش بەخۆشی و هاندانەوەبەیاننامەیەکی پێدا. "ئاڤەناریوس" لێی پرسی:

«ئەمەدژ بەکێیە؟»

«ئەمەبۆ ئازادی کاناکا کانی کالەدۆنیای نوێیە».

پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" بە سێ بەیاننامەی ناو گیرفانییەوە، بەرەو وێستگەی میترۆ داگەڕا. هێشتا زۆری مابوو بگاتەڕاڕەوەکە، سەیری کرد کەشەکەی گۆڕاوە. ئەو کەشەبێزارکەرەی پێشووی نەمابوو، شتێک خەریکبوو ڕووی دەدا: گوێی لە دەنگی ترۆمپەت و چەپڵەڕێزان و پێکەنین بوو. پاشان چاوی بەو ژنەگەنجەکەوت کە هێشتا لەوێ مابوو، بەڵام ئێستا دوو پیاوەبەڕەڵڵاکە دەوریان دابوو. یەکیان ئەو دەستەی گرتبوو کەهیچی پێ نەبوو، ئەوی دیکەش بەهێمنی ئەو قۆڵەی گرتبوو کەلە دەوری سندووقەکەی ئاڵاندبوو. ئەوە کەقۆڵی ژنەکەی گرتبوو، کڵاوی موسیقاژەنەکەشی بەرەو

ڕێبوارەکان درێژ کردبوو، بە دەنگی بەرز دەیگوت: «بۆ گولەکان، بۆ ئەفریقا» ترۆمپەتژەنەکەش کەلە لای ڕاوەستابوو، لەئامێرەکەی دەتووراند، دەیتوراند، دەیتووڕاند، ئەرێ وەها دەیتووڕاند کەخەریکبوو هەناوی دەهاتە دەر. خەڵکەکەش دەوریان گرتبوون و زەردەخەنەیان دەکرد و دراو و پارەی کاغەزیان دەخستەناو کڵاوەکەی و ئەویش سپاسی دەکردن: «سپاس! ئای کە فەڕەنسییەکان چەندەدەستودڵ ئاوەڵان. ئەگەر فەڕەنسییەکان نەبن دەبێ گولەکان وەک ئاژەڵ بناڵێنن! ئای کە فەڕەنسییەکان چەندەدەستودڵ ئاوەڵان».

ژنەکەنەیدەزانی چی بکات؛ جارجار دەیویست خۆی ڕزگار بکات، بەڵام کاتێک گوێی لە دەنگی چەپڵەڕێزانەکەدەبوو، بەسەماکردن یەک دوو هەنگاو دەچووەپێش. جارێک یەکێک لەبەڕەڵڵاکان ویستی بەرەو خۆی بیسووڕێنێت و ڕوولەڕوو قسەی لەگەڵ بکات، ژنەکەلەبەر بۆنی ئەلکولی هەناسەی کشایەوەو بەترس و نیگەرانییەوەهەوڵی دا خۆی دەرباز بکات.

لەپڕ بەندییەکەی جاران لە جێی خۆی هەستا و وەک بیەوێت سەرنجی ئەو دوو بەڕەڵڵایەبە لای شتێکدا ڕابکێشێت، هەردوو دەستی ڕاوەشاند. دوو پۆلیس نزیک دەبوونەوە. کاتێک پڕۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" بەهاتنی ئەوانی زانی، ئەویش دەستی بەسەما کرد. سکەزلەخڕەکەی لەلایەکەوەبۆ لایەکی دیکەدەسووڕاند. بەو قۆڵانەی کەلەئانیشکەوە نووشتابوونەوە، جووڵەی بازنەیی دەکرد. یەکسەر زەردەخەنەی دەکرد و ئاسودەیی و سووکیی لێ دەرژا. هەر کە پۆلیسەکان ڕوشتن "ئاڤەناریوس" بەدەم ئەو ژنەوە پێکەنی

کەسندووقەکەی پێ بوو، دەتگوت جۆریک پەیوەندییان پێکەوەهەیە. ئەوسا بەهەوای ترۆمپێت و شەقاوەکانی چەپڵەی لێ دا. پۆلیسەکان بەناچاری ئاورێکیان دایەوەو لەگەڕانەکەیان بەردەوام بوون.

"ئاڤەناریوس" کەلەو سەرکەوتنەی خۆشحاڵ بووبوو، بەحەزێکی زیاترەوەسەمای دەکرد. بە چالاکییەکی چاوەڕۆاننەکراوەوەسووڕی دەدایەوە و بەرەوپێش و دواوە هەڵدەبەزی و لەحەوادا قاچی پێکدا دەدا. هەروەها بەدەستەکانیشی لاسایی سەماکەرێکی دەکردەوەکەسەمای کەنکەن دەکات و تەنوورەکەی هەڵدەداتەوە. ئەم جووڵەی ئەو، بەڕەڵڵاکەی هاندا، نەوییەوەو بەئەنگوستی، داوێنی تەنوورەی ژنەکەی گرت. ژنەکەدەیویست بەرگری لەخۆی بکات، بەڵام نەیدەتوانی چاو لەو پیاوەبەویقارەهەڵبگرێت کەبزەیەکی هاندەرانەی لەسەر لێو بوو. کاتێک ژنەکەویستی وەڵامی زەردەخەنەی ئەو کابرایەبدەاتەوە، بەڕەڵڵاکەتەنوورەکەی هەڵدایەوەو قاچی ڕووت و شۆرتەسەوزەکەی (کەزۆر لەتەنوورەپەمەییەکەی دەکاڵییەوە) دەرکەوت. ژنەکەدیسان ویستی بەرگری لەخۆی بکات، بەڵام نەیتوانی. ئەو بەدەستێک سندووقی یارمەتییەکەی گرتبوو (هەرچەندەئیتر کەس ئامادەنەبوو دراوێکی تێ باوێت، بەڵام ئەوەندە توند گرتبووی کەپێدەچوو هەموو شەرافەتی، مانای ژیان و گیانیشی لەنێو ئەو سندووقەدا بێت)، دەستەکەی دیکەشی بەچنگی بەڕەڵڵاکەوە جووڵەی لێ بڕابوو. ئەوان ئەگەر هەردوو دەستیشیان ببەستایەو دەستدرێژیشیان پێ بکردایە، وەزعی لە ئێستای خراپتر نەدەبوو. بەڕەڵڵاکە تەنوورەکەی هەڵدەدایەوەو دەینەڕاند: «بۆ گولەکان! بۆ ئەفریقا!» و فرمێسکی سووکایەتی لەچاوی

ژنەکەدەچۆڕا، بەڵام ژنەکەهەوڵی دەدا سووکایەتییەکەی بشارێتەوە، هەوڵی دەدا پێبکەنێت، دەتگوت هەموو شتێک بەڕەزامەندیی خۆی و بە قازانجی ئەفریقا ڕوودەدا و ئەو بە خواستی خۆی قاچە کورت و جوانەکەی بەرزدەکاتەوە.

پاشان لەپڕ شەپۆلێک بۆگەنی ترسناکی بەڕەڵلاکەی بەلووتدا چوو، بۆگەنی هەناسەو جلەکانی کەلەمێژبوو بەلەشییەوەلکابوون و وەک پێستیان لێ هاتبوو (ئەگەر ئۆتۆمبێلێک لێی بدایە و برینداری بکردایە، دەبوایە گرووپێک نەشتەرگەر سەعاتێک پێش نەشتەرگەرییەکەی هەوڵیان بدایە جلەکانی لەبەر داماڵن). ژنەکە عۆقرەی لێ بڕا و بە زۆر خۆی لە چنگی ڕاپسکاند، لەکاتێکدا سندووقەکەی بەسنگیەوە نووساندبوو، بەرەو پرۆفیسۆر "ئاڤەناریوس" هەڵات. بەدەم لەرزین و هەنیسکەوەخۆی بەلەشیەوەهەڵواسی. "ئاڤەناریوس" خێرا ئارامی کردەوە. دەستی گرت و لە وێستگەی میترۆ بردیەدەر.

## لەش

ئەگنێس بە نیگەرانییەوە گوتی:

«لاورا، تۆ زۆر لەڕ بوویت».

ئەو و خوشکەکەی خەریکبوون لەڕیستۆرانت نانی نیوەڕۆیان دەخوارد. لاورا گوتی:

«ئیشتیام نییە. هەرچی دەخۆم دەیهێنمەوە».

ئەوسا قومێک ئاوی کانزایی، کەلەبری شەراب داوای کردبوو، خواردەوەو گوتی:

«زۆر خەستە».

«ئاوەکە؟»

«دەبێ تراوی بکەمەوە».

«لاورا...»

ئەگنێس ویستی خوشکەکەی سەرکۆنەبکات، بەڵام لەباتی ئەوەگوتی:

«نابێت ئەوەندەبیر لە شتەکان بکەیتەوە».

«هەموو شتێکم لەدەست چووە، ئەگنێس».

«پێم بڵێ بەڕاست لەنێوان ئەو و تۆدا چی رووی داوە؟»

«زۆر شت، بەڵام ئێستا لەهەمیشەخۆشتر جووت دەبین. وەک شێتان».

«ئەگەر وەک شێتان جووت دەبن، ئەی کەواتەچی لەنێوانتان گۆڕاوە؟»

«هەر لەو کاتانەدایە کە دڵنیام ئەو لەگەڵ منە. کاتێک جووتبوونەکەمان کۆتایی هات، هۆشی دەچێت بۆ شوێنێکی دیکە. تەنانەت ئەگەر سەدجار لەوەشێتانەتریش جووت ببین، دیسان هەموو شتێک کۆتایی دێت. ئاخر خۆ جووتبوون هەموو شتێک نییە، کێشەکەلەسەر جووتبوون نییە؛ کێشەکەئەوەیەبیر لەمن بکاتەوە. من لەگەڵ زۆر پیاودا بووم کەئەمڕۆ نەئەوان هیچ لەمن دەزانن، نە من هیچ لەوان دەزانم. لەخۆم دەپرسم مادام هیچ کاریگەرییەکم لەسەر کەس جێنەهێشتووە، ئەی کەواتەئەم هەموو ساڵەبۆچی ژیاوم؟ چی لەژیانم بەجێ ماوە؟ هیچ. ئەگنێس، هیچ! بەڵام ئەم دوو ساڵەی دوایی بەڕاست شاد بووم، چونکەدەمزانی بێرنارد منی لەبیرە، دەمزانی لەمێشکیدا هەم، لە ناخیدا زیندووم. بە لای منەوە ژیانی ڕاستەقینەبەو مانایەیەکەلەبیری بەرامبەرەکەمدا بمێنمەوە. ئەگینا مردوویەکم کەدەجووڵێم».

«باشەکاتێک بۆخۆت لەماڵەوە گوێ لەقەوانەکانت دەگری، گوێ لە"ماڵەر" دەگری، ئایا هەر ئەوەخۆشییەکی هەرچەندەبچووک، بەڵام بنەڕەتیت پێ نابەخشێت کەئەوەندەبهێنێت بۆی بژی؟»

«ئەگنێس، دڵنیام بۆخۆشت دەزانی کەئەم قسەت گەوجانەیە. من کەبە تەنیا بم، "ماڵەر" بە لامەوەهیچ مانایەکی نییە. من ئەو کاتە چێژ لە "ماڵەر" وەردەگرم کەلەگەڵ بێرنارد بم، یان لەوەدڵنیا بم کەئەو یادم دەکات. کەلەگەڵ بێرنارد نەبم، تەنانەت ناتوانم تەختی خەوەکەشم هەڵپەرتێوم، حەز ناکەم خۆشم بشۆم، یان ژێرکراسەکەشم بگۆڕم».

«لاورا! خۆ بێرنارد تاقەپیاوی ئەم دنیایەنییە».

لاورا گوتی:

«تاقەپیاوە! بۆ دەتەوێ لەگەڵ خۆشم درۆ بکەم؟ بێرنارد دواهەم بەختی منە. خۆ من بیست، یان سی ساڵان نیم. دوای بێرنارد دنیا بۆ من چۆڵەوانی و بیابانە».

قومێک لە ئاوەکانزاییەکەی خواردەوەو گوتی:

«زۆر خەستە».

ئەوسا پێشخزمەتەکەی بانگ کرد تا ئاوی سادەی بۆ بهێنێت. پاشان درێژەی بەقسەکانی دا:

«ئەو تا مانگێکی دیکەبۆ ماوەی دوو حەفتەدەچێت بۆ "مارتی‌نیک". ئێمەدووجار پێکەوەچووین، بەڵام ئەمجارەپێشوەخت پێی گوتم کەبەتەمایەبەبێ من بچێت. دوای ئەوەکەئەم قسەی کرد، من دوو ڕۆژ هیچم پێنەخورا، بەڵام دەزانم چی بکەم».

پێشخزمەتەکەسوراحییەک ئاوی هێنا و لاورا لە بەرچاوی واقوڕماوی ئەودا کەمێک لەو ئاوەی تێکەڵ بەئاوەکانزاییەکەکرد و دیسان دووبارەی کردەوە:

«ئەرێ، دەزانم چی بکەم».

ئەوسا بێدەنگ بوو. دەتگوت بەتەمایەخوشکەکەی پرسیاری لێ بکات. ئەگنێس پێی زانی و بە ئەنقەست هیچی لێ نەپرسی، بەڵام کاتێک بێدەنگییەکەی زۆری خایاند، تەسلیم بوو، گوتی:

«پێت وایەبەتەمای چی بکەیت؟»

لاورا گوتی کەلەم چەند حەفتەیەدا سەردانی پێنج دکتۆری کردووە، گلەیی لە بێخەویی خۆی کردووەو تکای لێ کردوون دەرمانی خەو، "باربیتورات"ی، بدەنێ.

لەو کاتەوەکەلاورا بەدەم گلەوگازندەی هەمیشەییەوەئاماژەی بەخۆکوشتنیش دەکرد، ئەگنێس هەستی دەکرد بەردەوام خەمۆکتر و ماندووتر دەبێت. ئەو چەند جار هەوڵی دا بە بەڵگاندنی لۆژیکی و

هەستیاری، خوشکەکەی لەم کێشەیە ژێوان بکاتەوە:«دڵنیام تۆ هەرگیز تووشی بەڵای ئاوام ناکەیت»، بەڵام بێهوودەبوو. لاورا وەک ئەوەی گوێی لە قسەکانی ئەگنێسیش نەبووبێت، دیسان باسی خۆکوشتنی دەکردەوە:

«من حەفتەیەک لەئەو زووتر دەچم بۆ "مارتی نیک". کلیلم پێیە.ماڵەکەچۆڵە. کارێک دەکەم لەوێ تەرمەکەم بدۆزێتەوە. ئاوا هەرگیز ناتوانێت لەبیر خۆیم بباتەوە».

ئەگنێس دەیزانی کەلاورا توانای ئەنجامدانی کاری گەوجانەی هەیەو کاتێک گوتی: «کارێک دەکەم لەوێ تەرمەکەم بدۆزێتەوە»، ترسا. ئەو لەشی بێجووڵەی لاورای لە ناوەڕاستی ژووری دانیشتنی ڤێلاکەهێنایەپێشچاوی خۆی و چونکەدەیزانی ئەم وێنەیە دەکرێت ڕاست دەربچێت و لەلاوراش دەوەشێتەوە، تۆقا.

بەلای لاوراوەعاشقبوون بەو مانایەبوو کەمرۆڤ لەشی خۆی وەک دیارییەک پێشکەش بەدڵدارەکەی بکات، وەک پیانۆیەکی سپی کەپێشکەش بە خوشکەزاکەی کردبوو، لەشی خۆی لە ناوەڕاستی ماڵەکەدا دابنێت و بڵێت: «فەرموو من لێرەم، لەشێکی پەنجا و شەش کیلۆیی، ئەمەگۆشتەکەم، ئەمەش ئێسکەکانم، هەموویان بۆ تۆ، هەموویانت لێرەبۆ دادەنێم». لاورا دیارییەکی ئاوای بە کردەیەکی شەهوانی دەزانی. چونکەبە لای ئەوەوەلەش، نەوەک هەر لە کاتی تایبەتیی ورووژاندا دۆخێکی سێکسی بوو، بەڵکو هەروا کە پێشتریش گوتم، لەش هەر لەسەرەتاوە، لەپێشەوە، بەردەوام و بەگشتی، دەرەکی و ناوەکی، لە خەون و بێداری و مردنیشدا سێکسی بوو.

بە لای ئەگنێسەوە، حاڵەتی شەهوانی تەنیا تایبەت بەو ساتەوەختی وورووژانەیەکەلەش تیایدا جوان و دڵڕفێن دەبێت. هەر

لەو ساتەوەختەدایەکەلەش پاک و بێگەرد و دڵخواز دەبێت. بەڵام کاتێک ئەو ڕۆشناییەساختەیەنەمێنێت، دیسان لەشی دەبێتەوەبەماشینێکی پیس کەئەو مەجبوورەڕای بگرێت و بیپارێزێت. بۆیەئەو هەرگیز ئامادەنەبوو بڵێت: «کارێک دەکەم لەوێ تەرمەکەم بدۆزێتەوە». ئەو بیرۆکەئەگنێس دەتۆقێنێت کەدڵدارەکەی لەدۆخێکدا ببینێت کە بووەبەلەشێکی بەتاڵ لەسێکس و سیحر، کەڕوومەتی تێکچووەوەو لەسەر عەرز کەوتووەو توانای کۆنترۆڵکردنی خۆی نییە. ئەو شەرم لەخۆی دەکات. شەرمەزاری ڕێگەی پێ نادات بەخواستی خۆی ببێت بەتەرم.

بەڵام ئەگنێس دەیزانی کەلاورا وەک ئەو نییە؛ لاورا دەتوانێ لەشی بێگیانی خۆی لەناو ژووری دڵدارەکەی فڕێ بدات، ئەمەلەگەڵ پەیوەندیی نێوان لاورا و لەشی، لەگەڵ شێوازی خۆشەویستییەکەی دەگونجێت، بۆیەئەگنێس ترسا، بەسەر مێزەکەدا نەوییەوەو دەستی خوشکەکەی گرت. لاورا بە دەنگێکی کز گوتی:

«من دڵنیام تۆ تێم دەگەیت. تۆ پاولت هەیە. چاکترین پیاوێک کەدەتتوانی ئاواتی بۆ بخوازیت. من بێرناردم هەیە. ئەگەر بێرنارد وازم لێ بێنیت ئیتر هیچم نییە، ئیتر هیچ کەسم نابێت. تۆ دەزانی کەمن بەشتی کەم ڕازی نابم. نامەوێ ئاگام لەداماویی خۆم بێت. بە لای منەوەژیان مانایەکی زۆر گەورەی هەیە. ژیان دەبێت، یان هەموو شتێکم بداتێ، یان وازی لێ دەهێنم. دڵنیام تۆ تێم دەگەیت، تۆ خوشکمی».

هەردووکیان بۆ ساتێک بێدەنگ بوون. ئەگنێس لەوەڵام دەگەڕا. ماندوو بووبوو. ئەم وتووێژەحەفتەبەحەفتەدەوامەی بوو، ئەگنێس جار لەدوای جار لەبێهوودەبوونی قسەکانی خۆی دەگەیشت. لەپڕ کۆمەڵێک وشەی چاوەڕواننەکراو هاتنە ناو ئەم ساتەوەختی

ماندوویی و سستییەوە. لاورا گوتی: «دیسان بێرتراند بێرتراندی پیر لەبارەی بەرزبوونەوەی ڕادەی خۆکوشتنەوەئاژاوەی ناوەتەوە. ماڵەکەی "مارتی نیک"یش هی ئەوە. بیهێنەپێشچاوی خۆت کەمن بەو کارەم چ خۆشییەکی پێ دەبەخشم!» بەپێکەنینەوەئەوەی گوت.

هەرچەندەپێکەنینەکەی لاورا عەسەبی و زۆرەملەبوو، بەڵام وەک شتێکی چاوەڕواننەکراو یارمەتیی ئەگنێسی دا. ئەویش پێکەنی، پێکەنینێکی ڕاستەقینە، پێکەنینێکی بێدەربەست. چاوی هەردوو خوشکەکە پڕ بووبوو لە فرمێسک. ئەوان هەستیان کرد کەیەکتریان خۆش دەوێت و لاورا دژ بەژیانی خۆی هیچ ناکات. ئەوان لەکاتێکدا کەدەستی یەکتریان گرتبوو، باسی زۆر شتیان کرد. قسەکانیان تەژیی سۆزێکی خوشکانە بوو کەلەپشتییەوەچاوخشاندنێک بەڤیلاکەی سویس و جووڵەی دەستێکی هەڵبڕاو، شاردرابووەوە؛ دەستێک کەبەرزبووبووەوەو دەتگوت تۆپێکی جوان و ڕەنگاوڕەنگ فڕێ دەدات؛ وەک مزگێنی سەفەرێک، بەڵێنێک بۆ داهاتوویەکی خۆش، بەڵێنێک کەڕەنگەنەچێتەبواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام وەک زایەڵەیەکی جوان لەناخیاندا دەمێنێتەوە.

کەساتەوەختی کاسبوونیان تێپەڕی، ئەگنێس گوتی:

«لاورا، نابێت کاری گەوجانەبکەیت. کەس شایانی ئەوەنییەلە پێناویدا ئازار بکێشیت. بیر لەمن بکەرەوە، بیر لەوەبکەرەوەکەچەندەم خۆش دەوێیت».

لاوراش گوتی:

«بەڵام پێم خۆشە شتێک بکەم. من دەبێ شتێک بکەم».

«شتێک بکەیت؟ چی بکەیت؟»

لاورا بەقووڵی سەیری چاوی خوشکەکەی کرد و شانی هەڵتەکاند، دەتگوت پێی لێ دەنا کەهێشتا بۆخۆشی نازانێت .

مەبەستی لە"شتێک" چییە. پاشان کەمێک سەری خوار کردەوە، بزەیەکی ون و نائومێدانەنیشتەسەر ڕوومەتی و نوکی قامکەکانی خستەنێوان جووت مەمکی و دیسان بەگوتنەوەی وشەی "شتێک"، دەستی هێنایەپێش.

ئەگنێس لەوەدڵنیا بوو کەگوتنی "شتێک" بەمانای شتێکی دیاریکراو نییە، بەڵام ئەو جووڵەی لاورا بێگومان بەو مانایەبوو کە"شتێک" واتە فڕین بۆ بەرزاییەجوانەکان و ئەمەش هیچ پەیوەنییەکی بەلەشی مردوویەکەوەنییەکەلەسەر عەرز، لەناوەڕاستی ژوورێک، لەناوچەیەکی گەرمەسێری ڕاکشابێت.

چەند ڕۆژ دواتر لاورا سەردانی کۆمەڵگەی فەرەنسا-ئەفریقای کرد کەسەرۆکەکەی باوکی بێرنارد بوو، داوای کرد کەخۆبەخشانە لە شەقام و کۆڵانەکان یارمەتی بۆ گولەکان کۆبکاتەوە.

## جووڵەوەك ئارەزووی نەمری

یەکەم عەشقی بێتینا، خۆشویستنی "کلەمانسیبرای" بوو کەلە داهاتوودا دەبوو بەشاعیرێکی گەورەی ڕۆمانتیک؛ پاشان هەروا کەدەزانین عاشقی گۆتەبوو، بیتهۆڤنی دەپەرست، شەیدای "ئاخیم فۆن ئارنیم"ی مێردی بوو کەئەویش شاعیرێکی گەورەبوو. دواتر شێتی "کۆنت هێرمان ڤۆنپوکلەر موسکاو" بوو کەشاعیر نەبوو، بەڵکو کتێبی دەنووسی و (وا ڕێکەوت کە"نامەگۆڕینەوەکانی منداڵێک لەگەڵ گۆتە"ی پێشکەش بەئەو کرد). کاتێک تەمەنیشی گەیشتەپەنجا ساڵ، بەرامبەر بەدوو پیاوی گەنج، "فیلیپ ناتوسیوس" و "ژولیوس دورینگ" کە کتێبیان نەدەنووسی، بەڵکو نامەیان بۆ دەنارد (و بۆخۆی بەشێک لەو نامانەی بڵاوکردەوە) هەستێکی دایکانەشەهوانیی پەیدا کردبوو. "کارل مارکس"ی ناچار کردبوو کەئێواران، کاتێک دەچوو بۆ سەردانی "جێنن"ی دەزگیرانی، بۆ ئەو گەشتەدوورودرێژەی لەگەڵی بێت (مارکس پێی خۆش نەبوو ئەو بچێت بۆ لای، حەزی دەکرد لەگەڵ "جێنن"ی بێت نەک "بێتینا"، بەڵام ئەو پیاوەکە دەیتوانی دنیا ژێروزبەر بکات، دەرەقەتی ژنێک نەدەهات کەپەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ گۆتەهەبوو). "فرانتس لیست"یشی خوشویست، بەڵام ئەوەزۆری نەخایاند، چونکە"لیست" تەنیا بیری لە شانازییەکانی خۆی دەکردەوە. بەجۆشوخرۆشەوەویستی یارمەتیی "کارل بلەشن"ی شێوەکاریش بدات کەپێی وابوو نەخۆشیی دەروونییەتی(ئەو سووکایەتییە کەسەردەمانێک بەهاوسەرەکەی

گۆتەی کردبوو، بەژنەکەی ئەویشی دەکرد)، دەستی بە نامەگۆڕینەوەلەگەڵ "کارل ئەلیکساندر"، میراتگری تاجوتەختی ساکسۆنی و وایماریش کرد؛ کتێبێکیشی بەناوی "کتێبی شا" بۆ شای "پرۆس"، "فرێدریک ڤیلهێلم"یش نووسی کەلەوێدا باسی ئەرک و بەرپرسیاریی شایەک بەرامبەر بەژێردەستەکانی کرد و بەشوێن ئەوەشدا کتێبی "کلۆڵەکان"ی نووسی و داماویی خەڵکی هەژاری شیکردەوە. پاشان دیسان بەداوای ئازادکردنی "ڤیلهێلم شلیفەل"ەوە، کەتاوانی بەشداریکردن لەپیلانێکی کۆمۆنیستیی درابووەپاڵ، بەرەو شا گەڕایەوە. دیسان بە داوایەکی دیکە لەلایەن "لودوی گمیەرۆ ستاوسکییەوە، یەکێک لەڕێبەرانی شۆڕشی پۆلۆنیا کەلە بەندیخانەی پرۆس چاوەڕوانی مردن بوو، دەستەوداوێنی شا بووەوە. ئەو، بۆخۆی هەرگیز ئەو دواهەم پیاوەی نەبینی کەدەیپەرست: "شاندۆر پتۆفی"، شاعیری هەنگاری کەلەتەمەنی بیستوشەشساڵی، وەک سەربازێک لەڕاپەڕینی ١٨٤٨دا کوژرا. ئەو، نەوەک هەر شاعیرێکی گەورەی بەدنیا ناساند (ناوی خودای ڕۆژی لێ نا)، بەڵکو وێڕای شاعیرەکە، سەرنجی خەڵکی بەرەو وڵاتەکەشی کە ئەورووپا هیچی لێ نەدەزانی، ڕاکێشا. ئەگەر ئەوەتان لەبیر بێت کەڕۆشنبیرانی هەنگاری کەلەساڵی ١٩٥٦دا دژ بەئیمپراتۆریی ڕووسیەڕاپەڕین و ئیلهامبەخشی یەکەم شۆڕشی دژەستالینی بوون، بە ناوی ئەم شاعیرەوەخۆیان ناو نا "دەستەی پتۆفی"، ئەوسا لەوەتێدەگەن کە"بێتینا" بەو عەشق و دڵداریانەیەوە لەهەموو مێژووی دوورودرێژی ئەورووپادا، هەر لە سەدەی هەژدەوەتا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە، بەردەوام ئامادەبووە. "بێتینا"ی گەنج و سەرکێش. فریشتەی مێژوو، کاهینەی مێژوو. من ئەو مافەبەخۆم دەدەم کەپێی بڵێم

کاهینەی مێژوو، چونکەبە لای "بێتینا"وەمێژوو یەعنی (هەموو هاوڕێکانی ئەم خوازەیان بەکار دەبرد): شێوەی خواوەند.

هەندێک جار هاوڕێکانی سەرکۆنەیان دەکرد کەگوایەئەوەندەی پێویستە،گوێ بەخێزان و ئابووریی خوی نادات و لە خۆیەوە، بێ ئەوەبیر لەبەهاکەی بکاتەوە، خۆی بۆ خەڵکی دیکەتەرخان دەکات.

«من حەز لەو شتانەناکەم کە ئێوەدەیڵێن! خۆ من ژمێریار نیم! من هەر ئەوەم کەهەم!»

ئەوسا هەردوو دەستی بەشێوەیەک لەسەر سنگی دانا کەدوو قامکی ناوڕاستی ڕێک لەنێوان مەمکەکانیدا بوو. پاشان ئارام سەری خوارکردەوە، زەردەخەنەیەکی کرد و جوان و خێرا هەردوو دەستی بەرزکردەوە. لەم کاتەدا پەنجەکانی لێک دران و لەکۆتاییشدا هەردوو قۆڵی لێک جیابوونەوەو بەرەدەستی بەرەو سەرەوەڕاگرت.

نا، ئێوەبە هەڵەنەچوون. ئەمەهەر ئەو فیگەر و جووڵەیەکەلاورا لەبەشی پێشوودا، کاتێک دەیویست "شتێک" بکات، کردی. ئێستا با بابەتەکەلێک بدەینەوە:

کاتێک ئەگنێس پێی گوت: «لاورا نابێ کاری گەوجانەبکەیت. کەس شایانی ئەوەنییەئازاری بۆ بکێشیت. بیر لەمن بکەرەوەو لەوەی کەچەندەم خۆش دەوێیت» لاورا لەوەڵامدا گوتی: «بەڵام من پێم خۆشە شتێک بکەم! من دەبێ شتێک بکەم!»

لاورا کاتێک ئەوەی گوتبوو، بیری خەوتن لەگەڵ پیاوێکی دیکەی بەمێشکدا تێپەڕیبوو. پێشتریش زۆرجار ئەو بیرەی بەمێشکدا هاتبوو، ئەمەش لەگەڵ ئارەزووی خۆکوشتنەکی ناکۆک نەبوو. هەردووکیان پەرچەکرداری لۆژیکی و زێدەڕۆیانەی ژنێک بوون کەسووکایەتیی پێ کرابوو. هەوڵدانی ئەگنێس بۆ ڕوونکردنەوەی

هەموو شتەکان، ئەم خەونەتەمومژاوییەی خەیانەتی بەگرژییەوەپێ قرتاند:

«شتێک بکەیت؟ شتێکی چۆن؟»

لاورا زانیی کەدوای قسەوباسی خۆکوشتنەکەی، ئارەزووی خەیانەتکردن کارێکی گاڵتەجاڕانەیە، بۆیەشڵەژا و دیسان وشەی "شتێک"ی دووبارەکردەوە، بەڵام چونکەئەگنێس بەنیگا داوای وەڵامێکی ڕوونتری لێ دەکرد، لاورا هەوڵی دا تەنانەت ئەگەر بە جووڵەیەکیش بووبێت، مانا بەم وشەلێڵ و تەمومژاوییەی ببەخشێت: ئەو هەر دوو دەستی خستەسەر سنگی و پاشان بەرەو پێشەوەی بردن.

چۆن ئەم جووڵەی بەبیردا هات؟ وەڵامدانەوەبەم پرسیارەکارێکی دژوارە. ئەو لەوەوپێش هەرگیز جووڵەی ئاوای نەکردبوو. کەسێکی نەناسراو هانی دا ئەوەبکات، وەک ئەکتەرێک کەبەشێک لەشانۆنامەکەی لە بیر دەچێتەوەو کەسێک وەبیری دەهێنێتەوە. هەرچەندەئەم جووڵەشتێکی ئاشکرای دەرنەدەبڕی، کەچی بەوحاڵەش، بەو مانایەبوو کەئەنجامدانی "شتێک" واتەخۆفیداکردن، خۆبەجیهانسپاردن، هەڵفڕاندنی ڕۆحی خۆی، وەک کۆترێکی سپی، بەرەو ئاسۆی شین.

ئەگەر لاورا دەستی نەخستایەتەسەر سنگی و بەرەو پێشی نەبردنایە، بێگومان ئەو بیرۆکەی بەمێشکدا نەدەهات کەبەسندووقێکی کۆکردنەوەی یارمەتییەوەلە میترۆ ڕاوەستێت، هەر بیریشی لەکارێکی ئاوا نەدەکردەوە. دەتگوت ئەو جووڵەخاوەنی ئیرادەی خۆی بوو: ئەو جووڵەبوو کەڕێگەی پیشان دەدا و ئەویش بەدوایدا دەڕۆیشت.

کارەکانی لاورا و بێتینا وەک یەکن. بێگومان پەیوەندییەک لەنێوان ئاواتی لاورا بۆ یارمەتیدانی ڕەشپێستەبیانییەکان و هەوڵەکەی بێتینا بۆ ڕزگارکردنی پۆلۆنییەکی تاوانبار هەیە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێناچێت کەس بەم بەراوردکردنەڕازی بێت. من ناتوانم "بێتینا فون ئارنیم" لەو دۆخەدا بهێنمەپێشچاوی خۆم کەسندووقێکی یارمەتیی پێیەو لە وێستگەی میترۆ ڕاوەستاوەو دەرۆزەدەکات! بێتینا حەزی لەم جۆرەکارەخێرۆمەندانە نەبوو! بێتینا لەو ژنەسامانداراننەبوو کەچونکەهیچیان پێ ناکرێت، یارمەتی بۆ هەژاران کۆدەکەنەوە. ئەو لەئاست پێشخزمەتەکانی خۆشیدا دڵڕەق بوو؛ تا ڕادەیەک کە "فون ئارنیم"ی مێردی ناچار بووبوو سەرکۆنەی بکات (ئەو لەنامەیەکیدا بۆ بێتینای نووسیبوو «پێشخزمەتەکانیش مرۆڤن و تۆ نابێت وەک ماشین کاریان لێ بکێشیتەوە!» ئەوەی پاڵی پێوەدەنا یارمەتیی خەڵکی دیکەبدات، ئەوەنەبوو کەحەزی لەکاری چاکەبێت، بەڵکو بەئاواتی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و تایبەتییەوەبوو لەگەڵ خواوەند، کە پێی وابوو لە مێژوودا خۆی دەردەخات. هەموو چیرۆکەدڵدارییەکانی لەگەڵ پیاوەناودارەکان (پیاوانی تر سەرنجیان ڕانەدەکێشا) بۆ ئەو وەک سەکۆیەکی فەنەریی یاریگا بوون کەبچێتەسەری و لەوێوەخۆی بۆ حەواوەهەڵبدات، بۆ بەرزایی، بۆ ئەو شوێنەکەخودا لەشێوەی مێژوو دەردەکەوێت.

ئەرێ هەموو ئەمانەڕاستن، بەڵام ئاگادار بن! لاورا لەو ژنەدڵپاکانەی ڕێکخراوەخێرخوازییەکان نەبوو. ئەو پارەی بە سواڵکەرەکان نەدەدا. بە لایاندا تێدەپەڕی و هەرچەندەلێیانەوەنزیکیش بوو، بەڵام نەیدەبینین. ئەو تووشی نەخۆشیی دووربینیی ڕۆحی بووبوو. ئەو ئەفریقییانەکە هەزاران

کیلۆمەتر لێیەوەدوور بوون و گۆشتی لەشیان دەپروا، لەو سواڵکەرانەبەئەو نزیکتر بوون، چونکەئەوان لەشوێنێکی ئەوپەڕی ئاسۆ بوون؛ شوێنێک کەجووڵەی دەستەکانی لاورا، ڕۆحەدەردەدارەکەیان بۆ دەنارد.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بێگومان جیاوازییەک لەنێوان پۆلۆنییەکی تاوانبار و ئەفریقییەکی نەخۆش هەیە! ئەوەی کەبە لای بێتیناوەخۆهەڵقورتاندن لەمێژوو بوو، بەلای لاوراوە تەنیا کارێکی خێرۆمەندانەبوو، بەڵام ئەوەتاوانی لاورا نەبوو. مێژووی جیهان بەشۆڕش و یۆتۆپیا و ئومێد و نائومێدییەکانییەوەلەئەوروپا باری کردووە و تەنیا نۆستالژیا و حەسرەتی لەدوای خۆی جێهێشتووە. هەر بۆیەفەڕەنسییەکان کارە خێرخوازییەکانیان کردووەبەشتێکی نێونەتەوەیی. پاڵنەری ئەوان (وەک ئەمەریکییەکان) خۆشەویستییەکی مەسیحانەبۆ دراوسێکانیان نییە، بەڵکو ئاواتەبۆ مێژووی لەکیسچوو؛ ئاواتەبۆ بانگکردنەوەی دووبارەو ئامادەیی لەناو ئەو مێژووەدا، هیچ نەبێت لەشکڵی سندووقێکی یارمەتیی سوور بۆ ڕەشپێستەکان.

با جووڵەکەی بێتینا و لاورا بە نیشانەی ئاواتی نەمری بزانین. بێتینا کە ئاواتەخوازی نەمرییەکی مەزنە، حەز دەکات بڵێت: نامەوێت بەم ڕۆژگارەو داڵغەکانییەوەبمرم، حەز دەکەم خۆم هەڵبکێشم. حەز دەکەم ببم بەبەشێک لەمێژوو، چونکەمێژوو یادەوەریی ئەبەدییە. هەرچەندەلاوراش ئاوات بۆ نەمرییەکی بچووک دەخوازێت، بەڵام ئەویش هەر ئەمەی دەوێت. ئەویش دەیەوێت خۆی و ئەو ساتەوەختەخەمبارانە هەڵبکێشێت کە تیایاندا دەژی و "شتێک" بکات کەهەموو ناسیاوەکانی ئەویان لە بیر بێت.

## تەمومژ

بریژیت لەمنداڵییەوە حەزی دەکرد لەسەر ئەژنۆی باوکی دابنیشێت، بەڵام من پێم وایەکەتەمەنی بوو بەهەژدەساڵ، ئەو حەزەشی زیاتر بوو. ئەگنێس ئەوەی پێ ناخۆش نەبوو. بریژیت زۆرجار لەگەڵ دایکوباوکی دەچووەناو جێیگەکەیان (بە تایبەت شەوان کەسەیری تەلەفزیۆنیان دەکرد) و لەشی ئەم سییانەزیاتر لەیەک نزیک بوو، تا لەشی ئەگنێس و دایکوباوکی، بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەش، تەمومژ و لێڵیی دیمەنەکەلە بەرچاوی ون نەدەبوو: کچێکی گەنج بە سنگ و پشتی گەورەوەلەسەر کۆشی پیاوێکی جوانچاکی گەنج دانیشێت و دەست بەشان و گۆناکانیدا بێنێت و بەو مەمکەقوتانەیەوەپێی بڵێت بابە!

جارێک ئەگنێس میوانییەکی خۆشی لەماڵەکەی خۆی کردەوەو خوشکەکەیشی دەعوەت کرد. کاتێک هەموویان شاد و سەرخۆش بوون، بریژیت لەسەر کۆشی باوکی دانیشت. لاورا گوتی:

«منیش دەمەوێ وەک تۆ بکەم!»

بریژیت چووەسەر ڕانێکی و بەو شێوەهەردووکیان لەسەر کۆشی پاول جێگەیان بووەوە.

ئەم دۆخەدیسان "بێتینا"مان بیر دەخاتەوە، چونکەئەو لەهەموو کەس زیاتر دانیشتنی سەر کۆشی پیاوانی گەیاندە ئاستی مۆدێلێکی کلاسیکی، تەمومژی، ئێرۆتیکی و شەهوانی. من گوتم کە ئەو بەیارمەتیی قەڵغانی منداڵیی، بەهەموو مەیدانەکانی شەڕی شەهوانیی

ژیانیدا تێپەڕی. ئەو تا تەمەنی پەنجا ساڵیش ئەم قەڵغانەی پێ بوو، پاشان کردی بەقەڵغانی دایکیەتی و ڕێگەی بە پیاوەگەنجەکان دا کەلەسەر کۆشی دابنیشن. دیسان ئەمەش دۆخێکی زۆر لێڵ و تەمومژاوییە. خۆ ناکرێت گومان لەدایکێک بکەین کەگوایەبەچاوی شەهوەتەوەسەیری کوڕەکەی دەکات، هەر لەبەر ئەوەشە کە(لانیکەم وەک حاڵەتێکی خوازەیی) دانیشتنی پیاوێکی گەنج لەسەر کۆشی ژنێکی بەتەمەنتر پڕەلە مانای شەهوانی و ئەو مانایە چەندە تەمومژاوی بێت، بە هەمان ئەندازەش بەهێزە.

من هەنگاوێک دەڕۆمە پێش و دەڵێم بەبێ هونەری ئیبهام و تەمومژ، چێژی سێکسیی ڕاستەقینەبوونی نییە و چەندەتەمومژ بەهێز بێت، ورووژانی شەهوەتیش بەهێزتر دەبێت. کێ هەیەیاریی خۆشی دکتۆر دکتۆرێنەی تافی منداڵیی لە بیر نەمابێت! کچەکە لەسەر عەرز ڕادەکشێت و کوڕەکەش کەخۆی کردووەبەدکتۆر، جلەکانی لە بەر دادەکەنێت. دیارە کچەکە بۆخۆی ڕێگەی پێ دەدا ئەوەبکات، چونکەئەوەکوڕێکی چاوبزی کونجکۆڵ نییەکەلێی ورددەبێتەوە، بەڵکو پیاوێکی خانەدانەکەبەخەمی تەندروستی ئەوەوەیە. ناوەڕۆک و مەغزای شەهوانیی ئەم حاڵەتە چەندەزۆرە، بەهەمان ئەندازەش شاراوەو نهێنییە. هەردوو منداڵەکەدڵیان توند لێ دەدا، چونکەکوڕەکەتەنانەت بۆ ساتێکیش نابێت واز لەدکتۆربوونەکەی بهێنێت و لە کاتی پشکنینی کچەکەش، دەبێ بەزمانێکی فەرمی لەگەڵی بدوێت.

یادەوەریی ئەم ساتەخۆشەی تافی منداڵی بیرەوەرییەکی شیرینم بیردێنێتەوە: ژنێکی گەنجی خەڵکی چێک کەنیشتەجێی پاریس بوو، ساڵی ١٩٦٩ بۆ شارۆچکەیەکی وڵاتەکەی گەڕایەوە. ئەو لەساڵی ١٩٦٧وەبۆ خوێندن چووبوو بۆ فەڕەنسا و پاش دوو ساڵ

کەگەڕایەوە زانیی سوپای ڕووس وڵاتەکەی داگیرکردووە. خەلک ترسابوون و پێیان خۆش بوو لە شوێنێکی دیکەبن. ئەم ژنە گەنجەچێکییەلەماوەی دوو ساڵ خوێندنەکەیدا، بەشداریی هەندێک سمیناری کردبوو کەدەبوایەهەموو ئەو کەسانەکەبەتەمابوون لەباری فکرییەوە خۆیان لەگەڵ "ڕەوتی ڕۆژدا" بگونجێنن، بەشداریی ئەم سمینارانەبکەن. ئەو لەم سمینارانەدا فێر بووبوو کەهەموومان بەمنداڵی، تەنانەت بەر لەقۆناغی "ئۆدیپ"یش، دەکەوینەناو قۆناغێکەوەکەدەروونشیکارێکی بەناوبانگ پێی دەڵێت: «قۆناغی ئاوێنە» و مەبەست لەم ناونانەش ئەوەیەکەئێمەبەرلەوەی بەرامبەر بەلەشی دایک و باوکمان وشیار ببینەوە، بەرامبەر بەلەشی خۆمان وشیار دەبینەوە. ئەو ژنەگەنجەچێکییە پێی وابوو بەشێکی زۆر لەژنانی وڵاتەکەی، لەڕەوتی گەورەبوونیاندا بازیان بەسەر ئەم قۆناغەدا هەڵداوە. ئەو کەهێشتا لەبریقوباقی پاریس و سمینارەبەناوبانگەکانی دانەبڕابوو، کۆمەڵێک ژنی گەنجی لە دەوری خۆی کۆکردەوە. باسی تیۆرییەکی بۆ دەکردن کەهیچکامیان تێی نەدەگەیشتن و هەندێک ڕاهێنانی پێ دەکردن کەبە پێچەوانەی ئاڵۆزیی تیۆرییەکە، زۆر سادەبوون: ئەوان بەلەشی ڕووتەوەلەئاوێنەیەکی گەورەدا سەیری خۆیان دەکرد، پاشان بەوردی یەکتریان دەپشکنی و لەکۆتاییدا ئاوێنەی بچووکیان بۆ یەکتر دەگرت تا بتوانن سەیری ئەو بەشانەی لەشی خۆیان بکەن کەپێشتر نەیانتوانیبوو ببینن. ئەو ژنەفێرکارەتەنانەت بۆ ساتێکیش وازی لە ڕاڤەکردنی تیۆرییەکەی بۆ ژنەکان نەدەهێنا، ئەو تیۆرییەکەسیحری لێتێنەگەیشتنی هەموویانی لەبیرکردنەوەلەداگیرکاریی ڕووسەکان و دڵەڕاوکێیەکانی خۆیان دووردەخستەوە و تووشی هەڵچوون و ورووژانێکی سەیری

دەکردن کەپێیان خۆش نەبوو باسی بکەن. وا دیار بوو سەرۆکی گرووپەکە، جگە لەوەی کەقوتابیی "لاکان"ی گەورەبوو، ژنێکی هەتلەو هاورەگەزبازیش بووبێت، بەلام من پێم وا نییەکەلەنێو ئەم گرووپەدا ژنانی بەراست هەتلەو هاورەگەزباز زۆر بووبێتن. ئەوەراستە کە من لەناو ئەو هەموو ژنانەدا، حەز دەکەم زیاتر بیر لەو کچە بەستەزمانەبکەمەوەکە بە درێژایی ئەو پرۆگرامانە، جگەلەوشەتەڵخەکانی "لاکان" کەزۆر خراپ وەردەگێردرانەسەر زمانی چێکی، لەم دنیایەدا هیچی دیکەی نەبووبێت. ئاخ کەچەندەئەم کۆبوونەوەزانستییەی ژنەرووتەکان لەماڵێکی شارۆچکەیەکی چێک، کەسەربازەرووسەکان بەشەقامەکانیدا دەسوورێنەوە، لەو رابواردنانە خۆشترە کەهەرکەس هەوڵ دەدا کارێک بکات کەداوایان لێ کردووە، کارێکی هیچوپووچ و بێمانا کەپێشتر لەسەری رێکەوتوون، بەلام با جارێکبە پەلەواز لەو شارۆچکەبچووکەی چێک بێنین و بگەرێینەوەبۆ سەر ئەژنۆکانی پاول کەلاورا لەسەر یەکێکیان دانیشتووە و بۆ تاقیکردنەوەش بووبێت، بیهێنینەپێشچاوی خۆمان کەئەژنۆکەی دیکەشی نەوەک بۆ بریژیت، بەڵکو بۆ دایکیەتی.

لاورا چێژ لەو هەستەخۆشەدەبینێت کەپشتی بەپیاوێکەوەنووساندووە. ئەم چێژەشاراوەو نهێنییەلەهەموو شتێک زیاتر ختیلکەی دەدات، چونکەئەو نەوەکو دۆست و دڵدار، بەڵکو وەک ژنخوشکێک لەسەر کۆشی ئەو پیاوەدانیشتووەو خوشکەکەشی تەواو رازییە. لاورا هۆگری تەمومژ و نارۆوونییە.

ئەگنێس لەم دیمەنەدا هەست بەهیچ شتێکی ورووژێنەر ناکات، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت ئەو رستە گاڵتەجارییە دەرنەبرێت کەلەمێشکیدا دەخولێتەوە: «پاول هەر رانێکی بەسمت و قوونی ژنێک داوە!» ئەگنێس بینەری رۆشنبیری تەمومژ و نارۆوونییە.

ئەی پاول؟ ئەو بەهەراوهوریاوەگەمەدەکات، سەرەتا ئەژنۆیەکی و پاشان ئەژنۆکەی دیکەی بەرزدەکاتەوەتا نەهێڵێت ئەو دوو خوشکەبۆ ساتێکیش گومان لەوەبکەن کەئەو خاڵێکی میهرەبانە کە حەزی لە گاڵتەو گەمەی کەرانەیە و پێی خۆشەبۆ خوشکەزا بچکۆلەکەی ببێت بەئەسپ. پاول ساویلکەی تەمومژ و ناڕوونییە.

لاورا لەکاتی خەم و ئازارە عاشقانەکەیدا، زۆرجار ڕاوێژی بەپاول دەکرد و دووبەدوو دەچوون بۆ کافەتریاکان. لەبیرمان نەچێت کەهەرگیز لە وتووێژەکانیاندا باسی خۆکوشتنیان نەکرد. لاورا تکای لە خوشکەکەی کردبوو کەلە لای کەس باسی ئەو بیرۆکەنەخۆشانەی نەکات و بۆخۆشی هیچی بەپاول نەگوتبوو. بەم شێوەدەستچنی ناسکی ئەو خەمەجوانەی بە وێنەی گرژی مەرگ، هەڵنەدەوەشاندەوە. ئەو دوانەبەرەوڕووی یەکتر دادەنیشتن و جاروباریش دەستیان لەیەکتر دەدرا. پاول دەستی دەگووشی، یان وەک ئەو کاتانە کە دەمانەوێت متمانەو هێز بۆ کەسێک بگەڕێنینەوە، بەهێمنی دەستی بەشانیدا دەهێنا، چونکەلاورا عاشقی بێرنارد بوو، کەسی عاشقیش پێویستی بەیارمەتییە.

من حەزدەکەم بڵێم لەو ساتانەدا پاول چاوی لەچاوی لاورا دەبڕی، بەڵام ئەوەڕاست نییە، چونکەلاورا لەم قۆناغەدا دیسان چاویلکەی ڕەشی لەچاو دەکرد. پاول دەیزانی کەلاورا بۆیەئەو چاویلکەڕەشەی لەچاو دەکات تا ئەو نەتوانێت چاوەپڕ لەفرمێسکەکانی ببینێت. چاویلکەی ڕەش لەپڕێکدا گەلێک مانای وەرگرت: ئەو چاویلکەجوانی دەکرد و حاڵەتێکی پێ دەبەخشی کەگوایەکەس دەستی نایگاتێ؛ لەهەمان کاتیشدا ئاماژەی بەشتێکی جەستەیی و هەستێکی خۆش دەکرد: چاوێکی پڕ لەفرمێسک، چاوێک کەلەناکاو دەبێتەدەلاقەیەک بەرەوڕووی لەشی، دەبێت بەیەکێک لەو

تۆ ئاوەڕۆ جوانەی لەشی ژن کە"ئاپۆلینەر" لەشیعرەبەناوبانگەکەیدا بەم شێوەباسی دەکات: ئاوەڕۆیەکی تەڕ کەگەلاهەنجیری چاویلکەی ڕەش دایپۆشیوە. چەند جارێک خەیاڵی فرمێسک لەپشت چاویلکەکەیەوەئەوەندەتوند و فرمێسکی خەیاڵی ئەوەندەسووتێنەر بوو کەوەک هەڵم هەردووکیانی لەخۆی گرت و دەرفەتی بیندران و قەزاوەتی لەهەموو کەس سەندەوە.

پاول بەهەڵمەکەی زانی، بەڵام ئایا لەمانا و مەغزاکەشی گەیشت؟ من پێم وا نییە. ئەم دیمەنەبهێننە پێشچاوی خۆتان: کچێکی منداڵ لەکوڕێکی منداڵ نزیک دەبێتەوە، کچەکەجلەکانی دادەکەنێت و دەڵێ: «دکتۆر تۆ دەبێ پشکنینم بۆ بکەیت». کوڕەکەش دەڵێ: «کچۆڵەنازدارەکە! من دکتۆر نیم!»

پاول ئاوا دەجووڵایەوە.

## غەیبزان

پاول کاتێک لەگەڵ ورچ دەدوا، هەوڵی دەدا وەک پاڵەوانێکی گەورەی پووچی هەلسوکەوت بکات، بەڵام ئێستا، بەو دوو خوشکەوەکەلەسەر ئەژنۆی دانیشتبوون، هیچی لەپیاوێکی پووچگەرا نەدەچوو. ئەمەچۆن دەبێت؟ دەکرێت لێکدانەوەیەکی ئاوای بۆ بکەین: ئەو پووچی و بێهوودەیی بە عیمالەیەک بۆ عیلاجی فەرهەنگ و هونەر و ژیانی گشتی و سیاسەت دەزانی، عیمالەیەکی بەسوود بۆ گۆتەو ناپلیۆن، بەڵام هوشتان ببێت: ئەم عیلاجەبۆ لاورا و بێرنارد نابێت! بڕوای بێسنووری پاول بەعەشق بوو کەقەرەبووی بێمتمانەیی بە کەسێکی وەک"بیتهۆڤن"، یان "ڕیمباوی" دەکردەوە.

چەمکی عەشق لەمێشکی پاولدا بەوێنەی دەریاوەگرێدرابوو کەتۆفانیترین توخمی سروشتە. کاتێک لەگەڵ ئەگنێس دەچوو بۆ سەفەر، شەوان لەئوتێل پەنجەرەی ژوورەکەی دەکردەوەتا زرموکوتی شەپولەکان ڕەگاژۆی جووتبوون و نزیکییەکەیان بێت و ئەوان بتوانن لەناو ئەم دەنگەمەزنەدا نوقم ببن. پاول ژنەکەی خۆشدەویست و خۆشحاڵ بوو کەلەگەڵی بوو، بەڵام لەقووڵایی گیانیدا چرپەی ئەو خەم و نائومێدییەشەرمنەدەنگی دەدایەوەکەعەشقەکەیان هەرگیز لەوەدراماتیکتر دەرنابڕدرێت. ئەو تا ڕادەیەک ئێرەیی بەلاورا دەبرد کەبەربەستێکی زۆری لەسەر ڕێگە بوو، چونکەپێی وابوو تەنیا بەربەست دەتوانێت عەشق بکات بەچیرۆکێکی دڵداری. ئەو هەستی بەهاوخەمییەکی دڵسۆزانەلەگەڵ

ژنخوشکەکەی دەکرد و گرفتەدڵدارییەکانی لاورا، وەک ئەوەی کە گرفتی خۆی بن، نیگەرانی دەکرد.

ڕۆژێک لاورا تەلەفۆنی بۆ کرد کەپێی بڵێت بیرنارد بۆ ماوەی چەند ڕۆژ چووەبۆ ڤێلاکەیان لە "مارتی نیک" و ئەویش دەیەوێت بەپێچەوانەی خواستی بێرنارد شوێنی بکەوێت. گوتی ئەگەر لەوێ لەگەڵ ژنێکی تر بیبینێت، چاکترا چونکەلانیکەم هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا دەبێت.

پاول هەولی دا لەو بڕیارەی پەشیمانی بکاتەوە و لەشەڕ و قڕەی ناپێویست دووری بخاتەوە. ئەوان دەستیان بە وتووێژێکی دوورودرێژ کرد. لاورا دیسان بەڵگەو بیانووەکانی دووبارەکردەوەو پاولیش لای خۆی بڕاندبوویەوەکەلەکۆتایی قسەکانیاندا، هەرچەندەبەنابەدڵیش بێت، پێی بڵێ: «ئەگەر بەڕاست لەوەدڵنیایت کەبڕیارەکەت بەجێیە، ماتڵ مەبە، بڕۆ!» بەڵام کاتێک ویستی ئەوەی پێ بڵێ، لاورا گوتی:

«تەنیا شتێک کە دەتوانێت لەم بڕیارەپەشیمانم بکاتەوەئەوەیەکەتۆ نەهێڵی بڕۆم».

بەم شێوەلاورا بەئاشکرا بەپاولی دەگوت کەدەبێ چی بکات تا نەڕوات، لەهەمان کاتیشدا هەولێ دەدا لەلای ئەویش و خۆشی وەک ژنێکی بەویقار دەربکەوێت کەشێلگیرانەبەتەمایەتا کۆتایی بەرگری لەخۆی و داماوییەکەی بکات. لەبیرمان نەچێت کاتێک لاورا بۆ یەکەم جار چاوی بەپاول کەوت، لەمێشکی خۆیدا گوێی لەو وشانەبوو کەسەردەمانێک ناپلیۆن بەگۆتەی گوتبوو: «ئەمەیە پیاو!» ئەگەر پاول بەڕاست ئەو پیاو بوایەبەبڕشتەوەبەری بەڕۆشتنەکەی دەگرت، بەڵام مەخابن کەپاول ئەو پیاوەنەبوو، ئەو پیاوێکی بەئوسوول بوو

که لەمێژبوو وشەی "نابێ"ی لەقامووسی زمانی خۆی سڕیبووەوەو شانازیشی پێوەدەکرد. پاول بە تووڕەییەوەگوتی:

«تۆ دەزانی کە من هەرگیز هیچ لەکەس مەنع ناکەم».

لاورا پرکێشی کرد:

«من داوات لێ دەکەم هەندێک شتم لێ مەنع بکەیت و ئەمرم پێ بکەیت. بۆخۆت دەزانی کەجگەلە تۆ کەس مافی ئەو کارەی نییە، بەڵام تۆ هەرچیم پێ بڵێی دەیکەم».

پاول سەری لێ شێوابوو. سەعاتێک بوو کەپێی دەگوت نابێ شوێن بێرنارد بکەوێت و ساعەتێک بوو کەلاوراش دەمەقاڵەی لەگەڵ دەکرد. ئەگەر بەقسەو بەڵگاندنەکەی پێمل نەبووبوو، کەواتەبۆچی دەیویست ملکەچی فەرمانەکەی بێت؟ پاول بێدەنگ بوو. لاورا لێی پرسی:

«دەترسی؟»

«لەچی؟»

«لەوەی کەخواست و ئیرادەی خۆت بەسەر مندا بسەپێنیت؟»

«ئەگەر بەبەڵگەنەمتوانیوەپێملت بکەم، کەواتەمافی ئەوەشم نییەئەمرت پێ بکەم».

«مەبەستی منیش ئەوەبوو، تۆ دەترسی».

«من دەمویست بەبەڵگەقەناعەتت پێ بکەم».

لاورا پێکەنی:

«تۆ خۆت لەپشت بەڵگەکانتەوەشاردووەتەوە، چونکەدەترسی ئیرادەی خۆت بەسەر مندا بسەپێنی. تۆ لە من دەترسی!»

پێکەنینەکەی لەجاران زیاتر پاولی گێژ کرد، بۆیەتەنیا بۆ کۆتاییهێنان بەقسەکانیان، گوتی:

«بیری لێ دەکەمەوە».

دواتر پاول بۆچوونی ئەگنێسی پرسی. ئەگنێس گوتی:

«ئەو نابێ شوێن بێرنارد بکەوێت. ئەمەهەڵەیەکی ترسناکە. ئەگەر لاورات بینییەوە، هەرچی دەتوانی بیکەتا لەو کارەپەشیمانی بکەیتەوە».

هەر چۆنێک بێت، ڕاوبۆچوونی ئەگنێس زۆر گرینگ نەبوو، چونکەڕاوێژکاری سەرەکیی پاول بریژیت بوو. دوای ئەوەی کەپاول باسی ئەو دۆخەی لاورای بۆ بریژیت کرد، ئەو دەستبەجێ گوتی:

«بۆ نابێ بچێت؟ خەڵک دەبێت ئەو کارەبکەن کەپێیان خۆشە».

پاول بەرپەرچی قسەکەی دایەوە:

«بەڵام بیری لێ بکەرەوە، ئەگەر لاورا لەوێ چاوی بەدۆستەکەی بێرنارد بکەوێت! ڕیسواییەکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە!»

«ئایا بێرنارد بەشێوەیەک پێی ڕاگەیاندووەکەلەگەڵ ژنێکی دیکەدەچێت بۆ ئەوێ؟»

«نا».

«ئەگەر وا بێت، دەبوایەپێی بگوتایە. مادام پێی نەگوتووەپیاوێکی ترسنۆک و خوێڕییەو لاورا نابێ نازی بکێشێت. ئەو چی لەدەست دەدا؟ هیچ».

ئێمەدەتوانین ئەو پرسیارەبکەین کەبۆچی بریژیت ئەم وەڵامەی بە پاول دایەوەنەک وەڵامێکی دیکە. ئایا لەبەر ئەوەبوو کەهاوخەمی لەگەڵ لاورا بکات؟ نا. لاورا زۆرجار بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی دەکرد کەدەتگوت کچی پاولە و ئەمەبە لای بریژیتەوەناخۆش و گاڵتەجاڕی بوو. ئەو پێی خۆش نەبوو هاوخەمی لەگەڵ پووری بکات. تەنیا شتێک کەبیری لێ دەکردەوە، خۆشحاڵکردنی باوکی بوو. ئەو هەستی دەکرد پاول وەک غەیبزانێک هاتووەبۆ لای،

بۆیەدەیویست دەسەڵاتەجادووییەکەی بەکار بێنێت. بریژیت کەبەڕاست مەزەندەی ئەوەی کردبوو دایکی لەگەڵ ڕوشتنەکەی لاورا نەبێت، بڕیاری دا هەڵوێستێکی بەپێچەوانەی دایکی وەربگرێت و کارێک بکات کە بەو دەنگە گەنجەی خۆی، باوکی بۆ ئەنجامدانی کارێکی بوێرانەهان بدات.

بریژیت بەدەم هەڵتەکاندنی شان و برۆکانییەوە، بەحاستەم سەری بە لای ئاسۆدا ڕاوەشاند و پاول دیسان هەستی بەو خۆشییە کرد کە کچەکەی بووەبەژەنڕاتۆرێک و شەحنی وزەی دەکاتەوە. ڕەنگەپاول ئەوەی پێ خۆشتر بوایەکەبۆ هەر کوێیەک دەچوو ئەگنێس شوێنی بکەوتایە و سەراسیمەسواری فڕۆکەببوایەتا لەدوورگەدوورەکان، لەدۆستەکانی بگەڕێت. پاول بەدرێژایی ژیانی، ئاواتی بۆ ئەوەخواستبوو کەیارەکەی لەپێناوی ئەودا سەر بە دیواردا بکوتێت، لە نائومێدیان بقیژێنێت، یان لەخوشییان لەژوورەکەدا هەڵبەزێت و دابەزێت. ئەو بەخۆی دەگوت لاورا و بریژیت لایەنگری بوێری و کاری شێتانەن و بەبێگەوهەری شێتیەتی، ژیان هیچ بەهایەکی نییە. کەواتەبا لاورا بەقسەی دەنگی دڵی خۆی بکات! بۆچی دەبێ هەموو کردەیەکمان وەک قولیچەلەناو تاوەی عەقڵدا ئەمدیواودیوی پێ بکرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دیسان پاول ناڕازی بوو. گوتی:

«بەلام ئەوەت لە بیر نەچێت کەلاورا ژنێکی هەستیارە. ڕەنگەسەفەرێکی ئاوا تووشی ئازارێکی زۆری بکات».

بریژیت بەم شێوەکۆتایی بەگفتوگۆکەیان هێنا:

«ئەگەر من لەبری ئەو بوومایەدەچووم و کەسیش نەیدەتوانی بەرم پێ بگرێت».

پاشان لاورا تەلەفۆنی کرد. پاول هەر کەگوێی لەدەنگی بوو، بۆ ئەوەی خۆی لەوتووێژێکی دووورودرێژ بدزێتەوە، گوتی:

«من زۆر بیرم لەو بابەتەکردووەتەوەو دەمەوێ بڵێم تۆ دەبێ ئەو کارەبکەیت کەپێت وایەدەبێ بیکەیت. ئەگەر شتێک بەرەو ئەوێت رادەکێشێت، کەواتەبڕۆ».

«من بڕیارم دابوو نەچم. تۆ زۆر لەو سەفەرەم بەگومان بوویت. بەڵام مادام تۆ پێت باشە، بەیانی سواری فڕۆکەدەبم و دەڕۆم».

پاول هەستی کرد سەتڵێک ئاوی ساردیان بەسەردا ڕشتووە. زانیی کەلاورا بەبێ ئەو هاندانەئاشکرایەی ئەو نەدەچوو بۆ "مارتی نیک". بەڵام نەیدتوانی هیچی پێ بڵێت، وتووێژەکەیان کۆتایی هاتبوو. سبحەینێ ئەو بەفڕۆکەیەک بەئاسمانی ئاتلانتیکدا تێدەپەڕی و پاول دەیزانی کەخۆی لەم سەفەرەبەرپرسیارە، سەفەرێک کەئەویش وەک ئەگنێس لە ناخی خۆیدا بەبێمانای دەزانی.

## خۆکوشتن

دوو ڕۆژ لەدوای ڕۆشتنی لاورا بەفڕۆکە، سەعات شەشی بەیانی تەلەفۆن زەنگی لێدا. لاورا بوو. بەخوشک و زاواکەی گوت کەسەعات بەکاتی "مارتی نیک" نیوەشەوە. دەنگی بەشێوەیەکی نائاسایی شاد بوو. ئەگنێس دەستبەجێ زانیی کەلەهەلومەرجێکی خراپدایە.

ئەو بەهەڵەنەچووبوو: کاتێک بێرنارد لەشەقامێک کەئەمبەراوبەری دارخورما بوو، چاوی بەلاورا دەکەوێت کەبەرەو ڤێلاکەی دەچێت، لەتووڕەییان سپی دەبێت و بە گرژییەوەپێی دەڵێ: «من تکام لێکردی کەنەیەیت بۆ ئێرە». لاورا دەیەوێت قسەی بۆ بکات، بەلام بێرنارد بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت هەندێک کەلوپەلی خۆی دەخاتەناو جانتایەکی سەفەرییەوە و سواری ئۆتۆمبێلەکەی دەبێت و دەڕوات. لاورا بەتەنیا دەمێنێتەوەو بەناو ماڵەکەدا دەسووڕێتەوە: لەیەکێک لەدۆلابەکاندا چاوی بەجلی سووری مەلەکردنەکەی دەکەوێت کەلەسەفەرەکەی پێشوویدا جێیهێشتبوو.

«جگەلەو جلانە، هیچکەس چاوەڕێم نەبوو».

کە ئەمەی گوت، بەدەم پێکەنینەوەکوڵی گریانی پژا. بەهۆڕەهۆڕ درێژەی بەقسەکانی دا:

«ئەو ڕەفتارەی قێزەون بوو. ڕشامەوە. پاشان بڕیارم دا بمێنمەوە. هەموو شتێک لەم ڤێلایەکۆتایی دێت. کاتێک بێرنارد بگەڕێتەوە، بەم جلی مەلەکردنەوەلێرەدەمدۆزێتەوە».

دەنگی لاورا بە ژوورەکەدا بڵاوبووەوە. هەردووکیان گوێیان لێ بوو. ئەوان هەریەک هاندیان پێ بوو کەدەستاودەستیان پێ دەکرد. ئەگنێس گوتی:

«بێکەبەخاتری خودا ئارام بە. لەسەرخۆ بە. هەوڵ بدەخوێنسارد و مەعقوول بیت».

لاورا دیسان پێکەنییەوە:

«بیری لێبکەرەوە، من لەپێش سەفەرەکەمدا بیست بەستەحەبی سڕکەرم کڕیبوو، بەڵام ئەوەندەتووڕەبووم کەهەموویانم لەپاریس جێهێشتووە».

ئەگنێس، کەتا ڕادەیەک خەیاڵی ئاسوودەبووبوو، گوتی:

«ئۆی، چاکتر، چاکتر».

لاورا بە پێکەنینەوەدرێژەی پێ دا:

«بەڵام لەدۆلابێکدا تفەنگێکم دۆزیوەتەوە. وادیارەبێرنارد دەترسێت بەڵایەکی بەسەر بێنن! دەترسێت یەکێک لەقولەڕەشەکان لێی بچێتەکەمینەوە. ئەمەبۆ من وەک نیشانەیە!»

«نیشانەی چی؟»

«نیشانەی ئەوە کە تفەنگەکەی بۆ داناوم!»

«تۆ شێتی! ئەو کاری وای نەکردووە! ئەو تەنانەت نەیزانیوەکەتۆ دەچی بۆ ئەوێ!»

«دیارەبەئەنقەست داینەناوە، بەڵام تفەنگێکی کڕیوەکەجگەلەمن کەس بەکاری ناهێنێت. کەواتەبۆ منی داناوە».

ئەگنێس هەستی کرد هیچ کارێکی لەدەست نایەت. گوتی:

«تکات لێ دەکەم تفەنگەکەلە شوێنی خۆی دانەرەوە!»

«نازانم کاری پێ بکەم. بەڵام پاول... گوێت لە دەنگمەپاول؟»

پاول تەلەفۆنەکەی وەرگرت:

«ئەرێ».

«زۆر خۆشحاڵم کەگوێم لەدەنگتە، پاول».

«منیش خۆشحاڵم لاورا، بەڵام تکات لێ دەکەم...»

لاورا قوورڕەقوورڕ گریا:

«دەزانم پاول، بەڵام ئیتر ناتوانم درێژەی پێ بدەم...»

بۆ ساتێک هەموویان بێدەنگ بوون. پاشان لاورا گوتی:

«ئەم تفەنگەبەرامبەرم داندراوە. ناتوانم چاوی لێ هەڵبگرم».

پاول گوتی:

«کەواتەبیبەرەوەبۆ جێگەکەی خۆی!»

«پاول، تۆ لەسوپادا بوویت، وا نییە؟»

«بەڵێ وایە».

«تۆ ئەفسەر بوویت».

«نەقیب بووم».

«مەبەستم ئەوەیە دەزانی چۆن تەقەبە تفەنگ بکەیت».

پاول ئیستێکی کرد، بەڵام ناچاربوو بڵێ:

«بەڵێ».

«بەچیدا دیارەکەتفەنگەکەپڕە،یان نا؟»

«ئەگەر بتەقێت، ئەوەپڕە».

«ئەگەر پەلەپیتکەکەی ڕاکێشم دەتەقێت؟»

«ڕەنگە».

«مەبەستت چییەکە دەڵێی ڕەنگە؟»

«ئەگەر زامنەکەی ئازاد بێت، ئەوەدەتەقێت».

«بەچیدا دیارەکەزامنەکەی ئازاد کراوە؟»

ئەگنێس تەلەفۆنەکەی لەپاول وەرگرت و هاواری کرد:

«واز بێنە، ئیتر نامەوێت بۆی شەرح بکەیت کەچۆن خۆی بکوژێت».

لاورا بەردەوام بوو:

«من هەر دەمەوێت بزانم چۆن بەکاری بێنم. هەرچۆنێک بێت، من هەر دەمەوێت بزانم خەڵک چۆن بەکاری دەهێنن. مەبەستت چییەکەدەڵێی زامنەکەی ئازاد کراوە،یان نا؟ چۆن ئازادی دەکەیت؟»

ئەگنێس گوتی:

«بەسەئیتر. نامەوێت هیچی تر لەبارەی تفەنگەوەببیستم. برۆ بیبەرەوەبۆ جێگەی خۆی. گاڵتەبەسە».

دەنگی لاورا لەپڕ جیددی بوو، گۆڕا.

«ئەگنێس من گاڵتەناکەم».

ئەوسا دیسان گریایەوە.

وتووێژەکەیان کۆتایی نەدەهات. ئەگنێس و پاول قسەکانیان دووبارەدەکردەوە، لاورایان دڵنیا دەکرد کە خۆشیان دەوێت. تکایان لێ دەکرد لە لایان بمێنێتەوەو بەجێیان نەهێڵێت. تا ئەوەی کەلەکۆتاییدا لاورا بەڵێنی پێدان کەتفەنگەکە بخاتەوەناو دۆڵابەکەو بخەوێت.

ئەوان کاتێک تەلەفۆنەکەیان دانا، ئەوەندەشەکەت بوون کەتا ماوەیەک نەیانتوانی هیچ بڵێن. پاشان ئەگنێس گوتی:

«بۆ وا دەکات! بۆ وا دەکات!»

پاولیش گوتی:

«خەتای منە. من ناردم بۆ ئەوێ».

«هەرچۆنێک بێت، ئەو هەر دەچوو».

پاول سەری ڕاوەشاند:

«نا، ئامادەبوو نەچێت. من گەوجانەترین کاری ژیانم کرد».

ئەگنێس نەیدەویست پاول هەست بە تاوانباری بکات. نەوەک چونکەدڵی بۆی دەسووتا، چونکەئێرەیی پێ دەبرد. ئەو نەیدەویست پاول بەرامبەر بەلاورا هەست بەبەرپرسیاری بکات و لەمێشکی خۆیدا ئەوەندەپێی وابەستەبێت. بۆیەگوتی:

«بە چیدا ئەوەندەدڵنیایت کەئەو بەڕاست تفەنگی دۆزیوەتەوە؟»

سەرەتا پاول لەمەبەستەکەی نەگەیشت:

«دەتەوێ بڵێی چی؟»

«ڕەنگە هەر تفەنگیشی لەلا نەبێت»

«ئەگنێس! ئەو گەمەی نەدەکرد! ئاشکرا بوو!»

ئەگنێس هەوڵی دا ژیرانەتر گومانەکەی دابڕێژێت:

«ڕەنگەتفەنگێک لەماڵەکەدا ببێت. هەروەها ڕەنگەهەندێک حەبی سرکەری "باربیتورات"یشی لەگەڵ خۆی بردبێت و بەئەنقەست باسی تفەنگ بکات تا سەرمان لێ بشێوێنێت. هەروەها ناشتوانی ئەو ئەگەرەش پشتگوێ بخەیت کەڕەنگەنەتفەنگ و نەحەب، هیچیانی لێ نەبێت».

پاول گوتی: «ئەگنێس، تۆ بە نسبەت لاوراوەدڵڕەقیت».

سەرزەنشتەکەی پاول دیسان ئەگنێسی هوشیار کردەوە: پاول بێ ئەوەخۆی بزانێت، لەئەگنێس زیاتر گرینگیی بەلاورا دەدا. پاول بیری لەلاورا دەکردەوە، کەوتبووەژێر کاریگەریی ئەوەوە، هۆشی لەلای ئەو بوو، نیگەرانی بوو. لەپڕ ئەگنێس ناچاربوو بیر لەوە بکاتەوەکەپاول بە لاورای بەراورد دەکات و لەئەنجامدا ئەوەئەگنێسەکەبەبەراورد لەگەڵ لاورا، پێدەچێت کەمتر هەستیار بێت. ئەگنێس بەرگری لەخۆی کرد:

«من دڵڕەق نیم. تەنیا دەمەوێ هوشیارت بکەمەوەکە لاورا هەموو کارێک دەکات تا سەرنج ڕابکێشێت. ئەوەسروشتییە،

چونکەئازار دەکێشێت. هەموو حەزدەکەن بەو چیرۆکەدەڵتەزێنەعاشقانەی پێبکەنن و بەخەمسارديیەوەشانیان هەڵتەکێنن، بەڵام کاتێک تفەنگێک بەدەستەوەبگرێت، ئیتر کەس ناتوانێ پێی پێبکەنێت».

«بەڵام بیر لەوەش بکەرەوەکە ئەو ئارەزووەبۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵک وای لێ بکات کەخۆی بکوژێت. ئایا ئەمەناکرێت؟»

«بەڵێ، دەکرێت»

ئەگنێس ددانی بەوەدا نا و دیسان بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون. پاشان گوتی:

«من لەوەتێدەگەم کەکەسێک بۆ ئەوەی ئیتر ئازار نەکێشێت، بۆ ئەوەی لە بەرچاوی مرۆڤەپەستەکان ون ببێت، بیەوێت خۆی بکوژێت. هەر کەس مافی ئەوەی هەیەخۆی بکوژێت. ئەمەئازادیی ئەوە. من دژ بەخۆکوشتن، وەک ڕێگەیەک بۆ خۆونکردن، نیم»

ئەگنێس هەستی کرد پێی خۆشەبێدەنگ بێت، بەڵام ناڕازیبوونی لەڕەفتاری خوشکەکەی ناچاری کرد لەقسەکانی بەردەوام بێت:

«بەڵام کێشەی ئەو ئەمەنییە. ئەو نایەوێت ون ببێت. ئەو بۆیەبیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە، چونکەبەڕێگەیەک بۆ مانەوەی دەزانێت. بۆ ئەوەی لەگەڵ بێرنارد بمێنێتەوە، لەگەڵ ئێمەبمێنێتەوە، بۆ هەتاهەتایەخۆی لەیادەوەریی ئێمەدا بهێڵێتەوە، بەزۆر لەشی خۆی بخاتەناو ژیانی ئێمەوە، بۆ ئەوەی وێرانمان بکات».

پاول گوتی: «تۆ زوڵمی لێ دەکەیت. ئەو ئازار دەکێشێت».

«دەزانم».

ئەگنێس ئەوەی گوت و فرمێسک بەچاویدا هاتەخوار. بیری لەوەکردەوەکەخوشکەکەی مردووە، پێی وابوو ئەو قسانەی سووک و قێزەونن و شیاوی لێبوردن نیین.

«ئەی ئەگەر ویستبێتی بەو بەڵێنەی ئێمەئارام بکاتەوە، چی؟»

ئەوەی گوت و هەڵی دا ژمارەتەلەفۆنی ڤێلاکەی "مارتی‌نیک" بگرێت. تەلەفۆنەکەبەردەوام زەنگی لێدەدا و زەنگی لێدەدا و ناوچاوانی هەردووکیان دیسان سەر ئارەق نیشتبوو. ئەوان دەیانزانی کە هەرگیز ناتوانن تەلەفۆنەکەدابنێن و بەردەوام گوێ لەو زەنگەدەگرن کەدەلالەت لەمەرگی لاورا دەکات. لەئەنجامدا گوێیان لە دەنگی بوو. دەنگی تا ڕادەیەک غەریبانەبوو. لێیان پرسی لە کوێ بووە:

«لە ژوورەکەی تر».

هەر دووکیان بەیەک هاند قسەیان دەکرد، باسی نیگەرانیی خۆیانیان دەکرد، باسی ئەوەی کەپێویست بووەدیسان گوێیان لەدەنگی بێتەوە تا دڵنیا ببن. دیسان دووبارەیان کردەوەکە زۆریان خۆش دەوێت و چاوەڕێن بگەڕێتەوەبۆ لایان.

ڕۆژی دوایی هەردووکیان درەنگ چوونەسەر کارەکەیان و تا ئێوارەلەبیری لاورادا بوون. ئێوارەدیسان زەنگیان بۆ لێدایەوە؛ جاریکی دیکەش وتووێژەکەیان سەعاتێکی خایاند؛ دیسان دڵنیایان کردەوە کەزۆریان خوش دەوێت و بەهیوان جارێکی دیکەش بیبیننەوە.

چەند ڕۆژ دواتر لاورا تەقەی لەدەرکە دا. پاول بە تەنیا لەماڵەوەبوو. لاورا لەناودەرکەکەدا ڕاوەستابوو، چاویلکەی ڕەشی لەچاو کردبوو. ئەو خۆی خستەباوەشی پاولەوە. ئەوان دووبەدوو ڕۆشتن بۆ ژووری دانیشتنەکە و بەرەوڕووی یەکتر لەسەر موبلەکان دانیشتن، بەڵام لاورا ئەوەندەتووڕە بوو کەدوای ماوەیەکی کەم هەستا و بە ژوورەکەدا گەڕا. بەبێقەرارییەوەقسەی دەکرد. پاشان پاولیش هەستا و بەژوورەکەدا گەڕا و دەستی بە قسەکرد.

پاول بەسووکایەتییەوەباسی هاوڕێکەی دەکرد کەجاران قوتابی و یارمەتیدەری بوو. ئەڵبەت دەکرا وای دابنێین کەپاول دەیویست باری قورسی خەمەکەی لاورا کەم بکاتەوە، بەڵام کاتێک زانیی بەچ جیدییەت و ڕاستگۆییەکەوەئەو قسانە دەکات کەگوایەبێرنارد کوڕی نازداری باوک و دایکێکی دەوڵەمەند و کەسێکی لووتبەرز و لەخۆڕازییە، سەری لە خۆی سووڕما.

لاورا پاڵی بەپێشی ئاگردانەکەوەدابوو، سەیری پاولی دەکرد. پاول لەناکاو پێی زانی کەئیتر چاویلکەی ڕەشی لەچاودا نییە. لاورا چاویلکەکەی بەدەستەوەگرتبوو، چاوی لە پاول بڕیبوو. چاوی ماسیو و تەڕ بوون. پاول تێگەیشت کەماوەیەکی زۆرەلاورا گوێی لەقسەکانی نییە. بێدەنگ بوو. ئەو بێدەنگییە کەبەهێزێکی ئەفسووناوی بەرەو لاورای ڕادەکێشا هەموو ژوورەکەی گرتبوو. لاورا گوتی:

«پاول، بوچی ئیمەزووتر یەکترمان نەبینی؟ پێش هەموویان...»

ئەم وشانەوەک مژێک بەنێوانیاندا بڵاوبووەوە. پاول پێی خستەناو مژەکەوە و وەک کەسێکی نابینا کەبەکوێرەکوێر بەرێگەدا دەڕوات، دەستی پێش خست. دەستی لە لاورا درا. لاورا ئاخێکی هەڵکێشا و ڕێگەی بە دەستی پاول دا لەلەشی بدرێت. پاشان خۆی لادا و دیسان چاویلکەڕەشەکەی لە چاو کردەوە. ئەم جووڵەی لاورا مژەکەی ڕەواندەوەو جارێکی دیکەش وەک زاوا و ژنخوشک بەرەوڕووی یەکتر بوونەوە.

پاش ماوەیەکی کەم ئەگنێس لەسەر کارەکەی گەڕایەوەو خۆی بەژوورەکەدا کرد.

# چاویلکەی ڕەش

کاتێک ئەگنێس بۆ یەکەمجار لەدوای گەڕانەوەی خوشکەکەی لە"مارکی نیک" چاوی پێی کەوت، لەباتی ئەوەی وەک مەلەوانێک کەپاپۆڕەکەی شکابێت و لەمردن ڕزگاری بووبێت، باوەشی پێدا بکات، بەساردییەکی سەیرەوەبەخێرهاتنی کرد. ئەگنێس خوشکەکەی نەدی، هەر چاویلکەڕەشەکەی دی. ئەو دەمامکەتراژیکەکەدیکۆری دیمەنەکەی داهاتووی دیاری دەکرد. ئەو، بێ ئەوەی گوێ بەدەمامکەکەبدات گوتی:

«لاورا زۆر لەڕ بوویت».

کەئەمەی گوت لێی نزیک بووەوەو سووک ئەملاولای ماچ کرد، کارێک کەفەرەنسییەکان کاتێک ناسیاوێک دەبینن، دەیکەن.

ئەگەر بیر لەوەبکەینەوەکەئەم وشانەیەکەم وشەیەک بوون کەلەپاش ئەو چەند ڕۆژەپڕ لەخەم و مەرارەتەبە زمانیدا هات، دەبێت ددان بەوەدا بنێین کەوشەی باش و شیاو نەبوون. ئەم وشانە هیچ پەیوەندییەکیان بەژیان و مەرگ و خوشەویستییەوەنەبوو، بەڵکو پەیوەندییان بەخواردن و هەرسکردنەوەبوو. ئەڵبەت ئەمەلەخۆیدا خراپ نەبوو، چونکەلاورا حەزی دەکرد باسی لەشی بکەن و بەخوازەیەک بۆ هەستیارییەکەی دەزانی. لەهەمووی خراپتر ئەوەبوو کەئەگنێس ئەم ڕستەشی بەنیگەرانییەوە، یان بەستایشی خەمبارانەی ئەو ئازارەوەدەرنەبڕیبوو کەبووبووەهۆی لەڕبوونەکەی، بەڵکو بە جۆرێک ماندوویی و بێزاریی ئاشکراوەگوتبووی.

بێگومان لاورا لەشێوازی گوتنەکەی خوشکی گەیشت و بەماناکەشی زانی، بەڵام ئەویش خۆی وا دەرخست کەگوایەبەو شتەی نەزانیوە و بەدەنگێکی تەژی لەئێش و ئازار گوتی:

«بەڵێ، شەش کیلۆم داناوە».

ئەگنێس حەزی دەکرد پێی بڵێت: « بەسەئیتر! بەسە! زۆرت پێ لێ ڕاکێشاوە! واز بێنە!»، بەڵام بەری بەخۆی گرت و هیچی نەگوت.

لاورا قۆڵی بەرزکردەوە: «سەیری ئەمەبکە، ئایا ئەم چڵەدارەوشکەقۆڵی منە... تەنانەت ناتوانم تەنوورەش لە بەر بکەم. هیچیان بەکەمەرمەوەبەند نابن. بەردەوام خوێن لەلووتم دێت...»

ئەوسا بۆ پیشاندانی ڕاستیی قسەکەی سەری بۆ دواوەبرد و توند لووتی هەڵلووشی.

ئەگنێس کەنەیدەتوانی کۆنترۆلی بێزارییەکەی بکات، سەیری ئەو لەشەلەڕەی کرد و بیری کردەوە، چی بەسەر ئەو شەش کیلۆ کێشەهاتووەکەلاورا کەمی کردووە؟ ئایا وەک وزەی بەکاربراو بەحەوادا بڵاوبووەتەوە؟ یان لەگەڵ پیسایییەکەی ڕژاوەتەئاوەڕۆوە؟ چی بەسەر ئەو شەش کیلۆیەی لەشی لاورا هاتووەکەهیچ شتێک قەرەبووی ناکاتەوە؟

لەم ماوەدا لاورا چاویلکەڕەشەکەی هەڵگرت و لەسەر پێشی ئاگردانەکە، کەپاڵی پیوە دابوو، دایبنا. پێڵووەماسیوەکانی، هەروا کەساتێک لەوەوپێش بەرەو پاولی سووڕاندبوو، بەرەو ئەگنێسیشی سووڕاند.

کاتێک چاویلکەکەی لابرد، وەک ئەوەبوو ڕومەتی ڕووت کردبێتەوە. دەتگوت خۆی ڕووت دەکاتەوە، بەڵام نەوەک ژنێک کەخۆی بۆ دڵدارەکەی ڕووت دەکاتەوە، بەڵکو وەک ژنێک کەبۆ

دکتۆرەکەی ڕووت دەبێتەوەو هەموو بەرپرسیاریی لەشی بەئەو دەسپێرێت.

ئەگنێس نەیتوانی ئەو قسانەنەکات کەلە مێشکیدا دەیانویزاند. بەدەنگی بەرز گوتی:

«بەسە! ئیتر بەسە! هەموومانت وەڕس کردووە. تۆش وەک ملوێنەها ژن کەبەبێ هەڕەشەی خۆکوشتن لەملوێنەها پیاو جودابوونەتەوە، لەبێرنارد جودا دەبییەوە».

ئێمەدەتوانین پێمان وا بێت کەپاش چەند حەفتەوتووێژ، کەئەگنێس لە خۆشەویستیی خوشکانەی خۆی دڵنیای دەکرد، ئێستا لاورا لەم تووڕەبوونەکتوپڕییەی سەری سووڕمابێت، بەڵام سەیر ئەوەبوو کەسەری سووڕنەما. هەڵوێستی لاورا لە بەرامبەر قسەکانی ئەگنێس بەشێوەیەک بوو کەدەتگوت لەمێژەچاوەڕێی ئەم قسانەیە. ئەو، زۆر لەسەرخۆ گوتی:

«با پێت بڵێم من چۆن بیردەکەمەوە: تۆ نازانی عەشق چییە، هەرگیز نەتزانیوەو هەرگیزیش نایزانی. عەشق هەرگیز کێشەی سەرەکیی تۆ نەبووە».

لاورا دەیزانی کوێی خوشکەکەی بپێکێت و بەڕاست پێکای. ئەگنێس نیگەران بوو. دەیزانی لاورا لەبەر ئەوەی کە پاول گوێی لێ بێت ئەو قسانەدەکات. بۆیە کتوپڕ بۆی دەرکەوت کە کێشەی لاورا بێرنارد نییە، ئەو نمایشی خۆکوشتنەشی پەیوەندیی بەبێرناردەوەنەبووە؛ (ڕەنگەبێرنارد هەرگیز بەوە نەزانێت کە ئەو نمایشەتەنیا بۆ پاول و ئەگنێس بووە). ئەو هەروەها ئەوەشی بەبیردا هات کەئەگەر کەسێک بەتەمای شەڕکردن بێت، بە پێکانی

مەبەستێک ناوەستێتەوە، لەپاش یەکەم مەبەستی لاورا کەبێرنارد بوو، بێگومان کەسانی دیکەش بوون.

لەوە زیاتر نەیاندەتوانی خۆیان لەشەڕکردن بپارێزن. ئەگنێس گوتی:

«ئەگەر شەش کیلۆت لەبەر ئەو داناوە، ئەمەبەڵگەی ماددیی عەشقێکەکەکەس حاشای لێ ناکات، بەڵام هێشتا شتێک هەیەکە من تێی ناگەم. من ئەگەر کەسێکم خوش بوێت، ئاواتی ڕووداوی خۆشی بۆ دەخوازم و ئەگەر ڕقیشم لەکەسێک بێت، داوای شتی ناخۆشی بۆ دەکەم. تۆ لەم چەند مانگەی دواییدا هەم بێرناردت ئازار داوەهەم ئێمەش. ئەمەچ پەیوەندییەکی بەعەشق و خوشەویستییەوەهەیە؟ هیچ».

ئێستا با ژووری دانیشتنەکەوەک شانۆیەک بهێنینە پێشچاوی خۆمان: لەو سەری لای ڕاستی دیمەنەکە ئاگردانێکی دیواری لێیە و بەرەوڕووشی ڕەفەیەک کتێب. لە ناوەڕاستی دیمەنەکەش کورسییەکی لاکێشەو مێزێکی قاوەخواردنەوەو جووتێک مۆبل داندراوە. پاول لەناوەڕاستی ژوورەکەڕاوەستاوە. لاورا لە لای ئاگردانەکە چاوی لەئەگنێس بڕیوە، کەئەویش چەند هەنگاو دوورتر بەپێوەیە. چاوەماسیوەکانی لاورا خوشکەکەی بەدڵڕەقی و بێهەستی تاوانبار دەکات. کاتێک ئەگەنێس خەریکی قسەکردن بوو، لاورا پاشەوپاش بەرەو ناوەڕاستی ژوورەکە، بەرەو پاول کشایەوە؛ دەتگوت دەیەوێت بەو جووڵەی سەرسووڕمانی خۆی لەهێرشەناجوامێرانەکەی ئەگنێس پیشان بدات. ئەو کاتێک لەپاول نزیک بووەوەڕاوەستا و دووبارەی کردەوە:

«تۆ نازانی عەشق چییە».

ئەگنێس هاتەپێش و لەجێگەکەی پێشووی لاورا، لەلای ئاگردانەکەڕاوەستا. گوتی:

«زۆر چاک دەزانم عەشق چییە. لەعەشقدا گرینگترین شت بەرامبەرەکەمانە، واتەکەسێک کە خۆشمان دەوێت. ئەمەکرۆکیی بابەتەکەیەو هیچی تر. من لە خۆم دەپرسم: بڵێی عەشق بۆ ئەوانەی کەناتوانن جگەلەخۆیان کەسی دیکەببینن، چ مانایەکی ببێت؟ بڵێی عەشق بۆ ژنێک کەجگەلەخۆی کەس نابینێت، مانای چی بێت؟»

لاورا گوتی: «خوشکی ئازیز، ئەوەزۆر بێمانایەکە بپرسین عەشق چییە. عەشق شتێکەکەمرۆڤ، یان تاقیی دەکاتەوە، یان نا. عەشق عەشقە. تەنیا شتێک کەدەتوانم لەبارەیەوەبیڵێم ئەمەیە: جووتێک باڵەکەلەدڵمدا دەکوترێت و ناچار بەئەنجامدانی هەندێک کارم دەکات کەتۆ بەعاقڵانەی نازانیت. ئەمەڕێک ئەو شتەیەکەتۆ هەرگیز تاقیت نەکردووەتەوە. تۆ دەڵێی کەمن جگەلەخۆم ناتوانم کەس ببینم، بەڵام من تۆ دەبینم، بەئاشکرا تا قووڵایی ناخیشت دەبینم. کاتێک لەم چەند حەفتەیەدا منت لە خۆشەویستیی خۆت دڵنیا دەکرد، چاک دەمزانی ئەو قسانەت بێمانایە. ئەوانەتەنیا فریو بوون. قسەیەک بوون بۆ ئارامکردنەوەی من، بۆ ئەوەی نەهێڵی ئاسوودەبیت بشێوێنم. من تۆ دەناسم خوشکی خۆم، تۆ هەموو تەمەنت لەودیوی عەشق ژیاویت؛ لەودیوی عەشق، لەوبەری سنوورەکە».

هەردووکیان باسی عەشقیان دەکرد و هاوکاتیش بە ڕقەوە، تیری توانجیان لەیەکتر دەگرت. ئەو پیاوەش کەلەلایان بوو، نائومێد

بووبوو. ئەو دەیویست شتێک بڵێت کەلەو توندوتیژییەلەتاقەتبەدەرەکەم بکاتەوە:

«هەموومان ماندووین، هەرسێکمان تووڕەین. پێویستمان بەوەیەبڕۆین بۆ شوێنێک و بێرنارد لەبیر ببەینەوە».

بەڵام لەمێژبوو کەبیرنارد لەبیر چووبووەوە. تەنیا قازانجی قسەکانی پاول ئەوە بوو کەلەبری دەمەقاڵەی خوشکەکان، بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا؛ بێدەنگییەکی بەبێ زەڕاتێک میهرەبانی، بەبێ نیشانێک لە گونجان، بەبێ بچووکترین ئاماژەیەک بەپەیوەندیی خێزانی.

با وشیار بین و دیمەنەکەبەگشتی فەرامۆش نەکەین: ئەگنێس لە لای ڕاست ڕاوەستاوەو پاڵی بەئاگردانەکەوەداوە، لاوراش لەناوەڕاستدا بەرامبەر بە خوشکەکەی ڕاوەستاوە و پاولیش دوو هەنگاو لە چەپەوەلێی دوورە. ئەو کەنەیدەتوانی بەر بەو ڕق و قینەبێمانایەبگرێت کەلەنێوان ئەو دوو ژنەدا، کە هەردووکیانی خۆشدەویست، بڵێسەی سەندبوو، بە نائومێدییەوەشانی هەڵتەکاند. پاول کەگوایەدەیویست بەدوورکەوتنەوەی زیاتر لەهەردووکیان ناڕەزایەتی دەرببڕێت، ڕووی خۆی لێ وەرگێڕان و بەرەو ڕەفەی کتێبەکان هەنگاوی هەڵێنایەوە. پشتی بەڕەفەکەوە دا و سەری بەرەو پەنجەرەکەوەرچەرخاند و هەوڵی دا سەیری ئەوان نەکات.

ئەگنێس چاوی بەچاویلکەڕەشەکەکەوت کەلەسەر ئاگردانەکەبوو، بەهوشیەرتییەوەهەڵی گرت. ئەو کەدەتگوت دوو دڵۆپ فرمێسکی ڕەشی خوشکەکەی بەدەستەوەیە، بە ڕقەوەسەیری چاویلکەکەی کرد. بۆ ئەگنێس هەموو ئەو شتانەکەلەلای لەشی

خوشکەکەیەوەدەهاتن، ناپەسند بوون. ئەو چاویلکە گەورەش وەک پیسایی ئەو بوو.

لاورا سەیری ئەگنێسی کرد و چاویلکەکەی بەدەستیەوەبینی. لەپڕێکدا هەستی کرد پێویستی پێیەتی. هەستی کرد پێویستی بەقەڵغانێکە، بەدەمامکێک کەڕوومەتی لەڕق و قینی خوشکەکەی بشارێتەوە، بەڵام نەیتوانی سێ چوار هەنگاو لەخوشک-دوژمنەکەی نزیک بێتەوەو چاویلکەکەی لێ بستێنێت. لاورا لێی دەترسا. بە جۆرەحەزێکی خۆئازاردەرانەوە، چێژی لەڕووتیی گەزنگازی ڕوومەتی دەبینی کەخەم و ئازارەکانی دەنواندەوە. لاورا دەیزانی کەئەگنێس تەحەمولی لەشی ئەو ناکات، بەقسەکانیدا دەیزانی، کاتێک باسی لەشی دەکرد، کاتێک باسی ئەو شەش کیلۆ کێشەی دەکرد کەدایینابوو. ڕەنگەلەبەر ئەوەش بووبێت کە لەداخان دەیویست ئەوەندەی پێی بکرێت هەر لەش بێت، لەشێکی پشتگوێخراو و فڕێدراو. دەیویست لەشی لەناوەڕاستی ژوورەکەیاندا دابنێت و هەر لەوێش بەجێی بێڵێت. با قورس و بێجووڵەلەوێ ڕاکشێت. جا ئەگەر ئەوان ئەو لەشەیان لەوێ نەوێت، ناچاریان بکات هەڵی بگرن. ناچاریان بکات یەکێکیان دەستی و ئەوی دیکەیان قاچی بەرزبکەنەوەو بیبەن لەپشت دەرکەیماڵەکەیان فڕێی بدەن، هەروا کەخەڵک بەنیوەشەو دۆشەکەکۆنەکانیان فڕێ دەدەن.

ئەگنێس بەچاویلکەڕەشەکەی ناو دەستییەوە، لە لای زۆپاکەڕاوەستابوو. لاورا لە ناوەڕاستی ژوورەکەبوو، بەشەقاوی بچووک پاشەوپاش لە خوشکەکەی دوور دەکەوتەوە. ئەو دواهەم شەقاوی بۆ دواوەهەڵێنایەوەو پشتی توند، زۆر توند، بەلەشی

پاولەوەنووسا. چونکەڕەفەی کتێبەکان لەپشت پاولەوەبوو، نەیدەتوانی خۆی لا بدات. لاورا قۆڵی لێک هەڵبڕی و هەردوو بەرەدەستی بەئەژنۆی پاولەوەنووساند؛ سەریشی بۆ دواوەبرد و بەسنگی پاولییەوەلکاند.

ئەگنێس چاویلکەڕەشەکەی لاورای بە دەستەوەیەو لەلایەکی ژوورەکەڕاوەستاوە. لاوراش بەپاولەوەلکاوەو وەک جووتێک پەیکەرەوەستاون. هەردووکیان، کە دەڵێی لەبەرد داتاشراون، جووڵەناکەن. کەس هیچ ناڵێت. پاش چەند ساتێک ئەگنێس قامکی شادەی لەقامکەگەورەی دوور دەخاتەوە. چاویلکەی ڕەش وەک هێمای خەمەکانی خوشکی، واتەئەو فرمێسکەگۆڕاوانە، لەسەر موزاییکی ناو کەفی ژوورەکە، لەلای زۆپاکەدەکەوێت و دەشکێت.

## ١

کاتێک گۆتەیان برد بۆدادگای ئەبەدی، لەپەیوەندی لەگەڵ کەیسەکەی بێتینادا گەلێک تۆمەت و شایەتیان بەرەوڕوو کردەوە. بۆ ئەوەی خوێنەرەکان بەبابەتی لاوەکی و بێماناوەماندوو نەکەم، تەنیا ئاماژەبەسێ شایەتیدانی زۆر گرینگ دەکەم.

یەکەم: شایەتیدانی "ڕاینەماریا ڕیلکە"، گەورەترین شاعیری ئەڵمانی لەدوای گۆتە.

دووهەم: شایەتیدانی "ڕۆمەن ڕۆلان"، کەلەسالانی١٩٢٠ و ١٩٣٠ لە"ئۆڕاڵ"ەوەتا "ئاتلانتیک" پڕخوێنەرترین ڕۆماننووس بوو، وەک نووسەرێکی پێشەکەوتنخواز، دژەفاشیست، هیۆمانیست، ئاشتیخواز و لایەنگری شۆڕش ناوبانگێکی زۆری هەبوو.

سێهەم: شایەتیدانی "پاول ئەلوارد"ی شاعیر، ئەندامی بەرجەستەی ئەو شتەی کەدواتر پێی دەگوترا ئاوانگارد، هەروەها سترانبێژی عەشق، یان بەگوتەی خۆی سترانبێژی شێعری عەشق؛ چونکەئەو پێی وابوو ئەم دوو چەمکەلەچەمکێکدا تێکەڵ دەکرێن (بەهەمان شێوەکە بۆخۆی لە جوانترین کۆمەڵەشێعرەکەیدا "L'Amour la poesie" کردبووی).

## ٢

"ڕیلکە" وەک شایەتێکی داواکراو بۆ بەردەم دادگای ئەبەدی، هەر ئەو وشانەدەڵێتەوەکەلەکتێبی بەناوبانگی «یاداشتەکانی مالتەلاوریدز بریگ» لەساڵی ١٩١٠دا نووسیبووی و بەم وتارەدوورودرێژەبە بێتینای گوتبوو:

«ئەوەبۆ هێشتا خەڵک باسی عەشقی تۆ ناکەن؟ مەگەر لەو دەمەوەتا ئێستا چ شتێکی سەرنجڕاکێشتر لەو عەشقەڕووی داوە؟ خەڵک بەچییەوە سەرقاڵن؟ تۆ بەبەهاکانی عەشقی خۆتت دەزانی. تۆ باسی ئەو عەشقەت بۆ مەزنترین شاعیری خۆت کرد تا بیکات بەبابەتێکی مرۆیی، چونکەهێشتا دیاردەیەکی سروشتی بوو. کەچی ئەو لەنامەکانیدا بۆ تۆ، خەڵکی لێ دووردەخستنەوە. خەڵک وەڵامەکانی ئەویان خوێندووەتەوەو بڕوایان پێ کردووە، چونکەئەوان لەشاعیر زیاتر دەگەن تا لەسروشت، بەڵام ڕەنگەڕۆژێک بۆ هەموویان دەربکەوێت کە گەورەیی ئەو شاعیرە لەو ئاستە زیاتر تێنەپەڕیوە. ئەو یارێکی پێ بەخشرا (auferlegt)، بەڵام بۆ خۆی لەئاستی ئەو یارەدا نەبوو (واتەنەیتوانی لەتاقیکردنەوەی بێتینادا سەرکەوتوو بێت (er hat sic nicht bestanden). ئەوەیەعنی چی کەنەیتوانیوە وەڵامی عەشقەکەی تۆ بداتەوە erwidern؟ عەشقێکی وا کەی پێویستی بەوەڵامدانەوەیە؟

لەعەشقێکی وادا هەم داوا (Lockruf) هەیەو هەمیش وەلام، عەشقێکی وا بۆخۆی وەڵامی داواکانی خۆیەتی. ئەو دەبوایەبەهەموو گەورەیی خۆیەوەلەئاستی عەشقێکی وادا ملکەچ بوایەو هەر شتێکی پێ بگوترایە، دەستەوئەژنۆ، وەک یوحەننا لە دوورگەی پەتمۆس، بە هەردوو دەست بینووسیایە. ئەو لەئاستی ئەم دەنگە، کەفەرمان لەفریشتەکان وەردەگرێت (die dasAtnt derEngel verrichtete)، هیچ شانسێکی دیکەی نەبوو. ئەو دەنگەهاتبوو لە ئامێزی بگرێت و بەرەو ئەبەدییەتی ببات. ئێرە کەژاوەیەک بوو بۆ میعراجێکی ئاگرین؛ ئەفسانەیەکی تەڵخ بوو بۆ مردنی، کە بەناتەواوی جێی هێشت.

## ٣

"ڕۆمەن ڕۆلان" لەشایەتییەکەیدا ئاوڕ لەپەیوەندیی نێوان گۆتەو بیتهۆڤن و بێتینا دەداتەوە. ڕۆماننووس لەکتێبێکیدا بە ناوی "گۆتەو بیتهۆڤن"، کەساڵی ١٩٣٠ لەپاریس بڵاوکرایەوە، بەدوورودرێژی باسی ئەوپەیوەندییە دەکات. ئەو هەرچەندەبە نەرمونیانی و ناسکی بۆچوونەکەی دەردەبڕێت، بەڵام ئەو ڕاستییەش ناشارێتەوەکەلەگەڵ بێتینا هاوسۆزە. "ڕۆمەن ڕۆلان" تا ڕادەیەک بەتێرم و دەستەواژەکانی بێتینا ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە. ئەو ئێرەیی بەمەزنایەتی گۆتە نابات، بەڵام بەداخ و ئەسەفەوەباسی خۆپارێزییەکەی لەسیاسەت و ستاتیک دەکات کەهیچ پەیوەندییەکی بەبەهرەیەوەنییە. ئەی "کریستیان"؟ بەداخەوە، وا چاکەبەبێدەنگی لەپاڵییەوەتێپەڕین، ئەو سفرێکی ڕۆحی بوو (nullite d'esprit).

دەبێ‌دیسان جەختی لێبکەمەوە کە ئەم دید و بۆچوونەبە وردبینی و هەستیاری و ناوەندگیرییەوەدەربڕاوە، بەڵام شوێنکەوتووەکان هەمیشەلەئیلهامبەخشەکانیان ڕادیکاڵترن. بۆ نموونە، من ئێستا خەریکم بەزمانی فەڕەنسی ژیاننامەیەکی تێروتەسەلی بیتهۆڤن دەخوێنمەوەکە لەساڵانی ١٩٦٠دا بڵاوکراوەتەوە. لەوێدا نووسەر ڕاستەوخۆ باسی «ترسنۆکی»، «ماستاوچییەتی» و «ترسی پیرانەی گۆتەلەهەموو شتێکی ئەدەبی و ستاتیکی» و چی و چی دەکات، بەڵام لەبەرامبەردا سفەتی «غەیبزانی و توانای پێغەمبەرانە» دەداتەپاڵ بێتینا و وەک بەهرەمەندێکی گەورەباسی دەکات. دیارەکریستیانیش وەک هەمیشەجگەلە(olumineuse) هاوسەرێکی زەبەلاحی داماو، هیچی دیکەنییە.

## ٤

هەرچەندەرِیلکەو رۆلان لایەنی بێتینا دەگرن، بەڵام بەرِێزەوەباسی گۆتەش دەکەن. "پاول ئەلوار" لەکتێبی «بەرامبەر بەئەو بەویژدان بین» (کەساڵی ١٩٤٤، واتەلەخراپترین قۆناغی کارەکەیدا، کە بە حەزەوەستایشی ستالینی دەکرد، نووسراوە)وەک سەنتژوستێکی راستەقینەی شیعری عاشقانە، وشەی زۆر توندتر بەکار دەبات:

«گۆتەلەبیرەوەرییەکانیدا، تەنیا بەم دوو وشەباسی یەکەم دیداری خۆی لەگەڵ بێتینا برینتانۆ دەکات: «مادموازل برینتانۆ». بە لای شاعیری گەورەو نووسەری وەرتەرەوە، ئاسوودەگیی ناو ماڵ لەورِینەی کاریگەری عەشق گرینگترە. نابێت خەیاڵ و خەون و بەهرەمەندییەکەی بێتینا، خەونەئۆلەمپییەکەی گۆتەبشێوێنێت. ئەگەر ئەو خۆی بەجۆشوخرۆشی عەشق سپاردبایە، رەنگەستران و سرووودەکانی دابەزینایەتەسەر زەوی! ئەڵبەت ئەگەر ئەوەش رووی بدایەئێمەلە ئێستا زیاترمان خۆشدەویست، چونکەئەگەر وا بوایە، رەنگە دەوری ماستاوچییەتیی دەرباری شای نەدیبایە و هەوڵی بۆ ئەوەنەدایەکەخەڵکەکەی بەوەگومرِا بکات کەگوایەستەمکاری لەئاژاوەو بێنەزمی چاکترە».

# ٥

ڕیلکەنووسی: «ئەو یارەی پێ بەخشرا»، ئێمەدەتوانین ئەو پرسیارەبکەین کەپێکهاتەی ئەم ڕستەبکەرە نادیارەبە چ مانایەکە؟ واتەکێ ئەو یارەی بەگۆتەبەخشیوە؟

کاتێک لەنامەیەکی بێتینادا، کە ژوانی ۱۸۰۷ بۆ گۆتەی نووسیوە، چاومان بەم ڕستەیە دەکەوێت «من لەوەناترسم کەخۆم بەم هەستەبسپێرم، چونکەبۆ خۆم ئەم هەستەم لەدڵی خۆمدا نەچاندووە»، بەدڵنیاییەوەبەرەوڕووی ئەم پرسیارەدەبینەوە، کێ ئەوەی لە دڵدا چاندووە؟ گۆتە؟ بێگومان مەبەستی بێتینا گۆتەنەبووە. ئەوەی کەئەو عەشقەی لەدڵی ئەودا چاندووەکەسێکی گەورەتر لەگۆتەو خودی بێتینا بووە، ئەگەر خودا نەبوو بێت، لانیکەم یەکێک لەو فریشتانەبووەکەڕیلکەلەوتەکەیدا ئاماژەی پێ دەکات.

لێرەدا ئێمە دەتوانین بەرگری لەگۆتەبکەین. مادام کەسێک (خودا، یان فریشتە) ئەو هەستەی لە دڵی بێتینادا چاندبێت، کەواتەئەوەسروشتییەکە بێتینا شوێن ئەو هەستەی بکەوێت. ئەوەهەستێک بوو لەدڵی ئەودا، ئەوەهەستی ئەو بوو، بەڵام وادیارەکەس هەستێکی وای لە دڵی گۆتەدا نەچاندبێت. بێتینا «بەئەو بەخشرابوو» چونکەئەرکێکی پێ سپێردرابوو. Auferlegt ئەی کەواتەڕیلکەبۆچی بۆ خۆپارێزیی گۆتەلە ئاست ئەرکێک

کەبەپێچەوانەی خواستی خۆی و بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بووبێت بەسەریدا سەپابوو، سەرزەنشتی دەکات؟ بۆچی ئەو دەبێت بەچۆکدا بێت و «بەهەردوو دەست» ئەو شتانە بنووسێتەوەکەدەنگێک لەئاسمانەوە پێی دەڵێت؟

دیارەئێمەبەشوێن وەڵامێکی عەقڵانییەوەنیین و بەبەراودێک ڕازی دەبین. وەرن با بیر لەشەمعوون بکەینەوەکەلەدەریای جەلیل خەریکی ماسیگرتن بوو: مەسیح لێی نزیک دەبێتەوەو داوای لێ دەکات تۆڕی ماسیگرتنەکەی فڕێ بدات و شوێن ئەو بکەوێت. شەمعوون وەڵامی دەداتەوە: «وازم لێبێنە. من تۆڕی ماسیگرتنەکەم پێ باشترە». ئەوسا ئەم شەمعوونە، لەپڕێکدا دەبێت بەکەسێکی گاڵتەجاڕی، دەبێت بە"فالستاف"ێکی کتێبی پیرۆز، ڕێک بەو شێوەکەڕیلکەگۆتەی بەفالستافێک دەزانی.

## ٦

ڕیلکەلەبارەی عەشقی بێتیناوەدەڵێ: «پێویستی بەوەڵام نییە، لەو عەشقەدا هەم داوا هەیەو هەم وەڵام، بۆخۆی وەڵامی داوای خۆی دەداتەوە». عەشقێک کەفریشتەیەکی باخەوان لەدڵی خەڵکدا دەیچێنێت، نەپێویستی بەبابەتە (مەبەست)، نەپێویستی بەوەڵامە؛ یەعنی هەروا کەبێتینا دەیگوت (عەشقێکی دوولایەنە) نییە. کەواتەدڵدار (بۆ نموونەکەسێکی وەک گۆتە) نە هۆکار و نە مەبەستی ئەو عەشقە نییە.

بێتینا لەو کاتەدا کەپەیوەندیی لەگەڵگۆتەهەبوو، نامەی عاشقانەشی بۆ ئارنیم دەنووسی. لەیەکێک لەو نامانەدا نووسیبووی: «عەشقی ڕاستەقینەLiebe (die wahre) ناتوانێت خەیانەت بکات. عەشقێکی وا گوێ بەوەنادات کەوەڵامی بدرێتەوە، ( die Liebe ohne Gegenliebe) لەهەر ئاڵوگۆڕێکدا بەشوێن دڵدارەوەیە.

ئەگەر لەبری ئەو فریشتەباخەوانە، خودی گۆتە،یان ئارنیم ئەو عەشقەیان لە دڵی بێتینادا چاندبوایە، کەواتەئەوەعەشقی گۆتە، یان ئارنیم بوو کەلە دڵی ئەودا پەرەی دەسەند، ئەویش عەشقێکی بڕکابەر و نەگۆڕ کەبێگومان بە قسمەتی ئەو کەسەدەبوو کەچاندبووی (واتە دڵدار)، بەو پێیەئەوەعەشقێکی نەگۆڕ دەبوو

کەنەدەگوێزرایەوە. دەکرێت عەشقێکی ئاوا بە پەیوەندییەک بزانین، پەیوەندییەکی تایبەتی لە نێوان دوو کەسدا.

بەڵام ئەوەی کەبێتینا بە "wahre Liebe" (عەشقی ڕاستەقینە) ناوی دەبات، پەیوەندییەکی عاشقانەنییە، بەڵکو هەیەجان و وروژانێکی عاشقانەیە: «ئاگرێکەکە دەستێکی ئاسمانی لەڕۆحی مرۆڤدا دایگیرساندووە، مەشخەڵێکەکە عاشق لەبەر ڕۆشناییەکەی «لەهەموو ئاڵوگۆڕێکدا بەشوێن دڵدارەوەیە». عەشقێکی ئاوا (واتەهەیەجانی عەشق) دوورەلەخەیانەت، چونکەتەنانەت ئەگەر مەبەستەکەشی بگۆڕێت، خودی عەشقەکەبۆ هەمیشەوەک ئاگرەکەدەمێنێتەوە.

لەم قۆناغەی لێکۆڵینەوەکەماندا، وردەوردە پەی بەوەدەبەین کەبۆچی بێتینا لەو هەموو نامەگۆڕینەوەیدا لەگەڵ گۆتە، ئەوەندە کەم پرسیاری لێ کردووە. ئەی خودایە گیان، بیهێنەپێشچاوی خۆتان کەمرۆڤ بتوانێت نامەبۆ گۆتەبنووسێت! بیر لەو شتانەبکەنەوەکەبەتەمان لەوبارەوەپرسیار لە گۆتەبکەن! لەبارەی کتێبەکانی خۆی و کتێبی نووسەرانی نەوەی خۆیەوە، لەبارەی شێعر و پەخشان و شێوەکارییەوە، لەبارەی ئاڵمان و ئەورووپا و زانست و تەکنۆلۆژیاوە! ئەوەندەی پرسیار لێ دەکەن کە ناچار بێت زۆر بەوردی بۆچوونەکانی خۆی دەرببڕێت، ناچار بێت ئەو قسانەتان بۆ بکات کەپێشتر نەیکردووە.

بەڵام بێتینا گفتوگۆی لەگەڵ ناکات. ئەو تەنانەت باسی هونەریشی لەگەڵ ناکات. ئەڵبەت جگەلە شتێک، بێتینا لە نامەیەکدا باسی مۆسیقای بۆ دەکات، بەڵام خۆ لەو نامەشدا

ئەوەبێتینایەکەقسەی بۆ دەکات و بەدڵنیاییەوەگۆتەلەگەڵ بۆچوونەکانیدا نییە. بۆچی بێتینا لێی ناپرسێت کەبۆ لەگەڵ بۆچوونەکەیدا نییە؟ ئەگەر بیتوانیبایەلێی بپرسێت، بێگومان وەڵامەکەی گۆتەیەکەم ڕەخنەلە ڕۆمانتیسیزمی مۆسیقا دەبوو!

بەداخەوەلەو نامەگۆڕینەوەتێروتەسەلانەدا هیچی وامان دەست ناکەوێت، ئێمەلەو نامانەدا شتێکی کەممان لەبارەی گۆتەوەدەست دەکەوێت. هۆکارەکەشی بەئاشکرا ئەوەیەکەبێتینا لەوەی ئێمەچاوەڕێی دەکەین کەمتر گۆتەی خۆش ویستووە؛ هۆکار و مەبەست و بابەتی خۆشەویستیەکەی بێتینا گۆتەنەبووە، بەڵکو خودی عەشق بووە.

## ٧

هەرچەندە ئەورووپا بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە شارستانییەتێکە لەسەر بونیادی عەقڵ، بەلام دەتوانین بڵێین شارستانییەتێکی هەستەکیشە. ئەم شارستانییەتەجۆرێک مرۆڤی ئافراندووەکەمن پێی دەڵێم مرۆڤی هەستۆک: homo sentimentalis

ئایینی جوولەکەیاسایەک بۆ شوێنکەوتووەکانی دادەنێت. ئەم یاسایەلەلایەنی عەقڵانییەوەدەبێ لە بەردەستدا بێت (تەورات جگەلە شیکاریی عەقڵانی و بەردەوامی فەرمانەکانی خودا هیچی دیکەنییە) و پێویستی بەهیچ چەمکێکی شاراوەی بانسروشتی، هیچ جەزبەیەکی تایبەت و ئاگرێکی شاراوەلەڕۆحدا نییە. پێوەری چاکەو خراپەدیار و بەرهەستە، ئەم بابەتەپەیوەندیی بەتێگەیشتن و پەیڕەویکردن لەیاساوەهەیە.

ئایینی مەسیح ئەو پێوەرەی بەراوەژوو کردووەتەوە. ئاگۆستینی پیرۆز گوتوویەتی: «خودات خۆش بوێت و چیت پێ خۆشەبیکە!» بەم شێوەپێوەری چاکەو خراپەچووەتەناو گیانی تاکەکان و وەک بابەتێکی زەینی و نابەرهەستیی لێ هاتووە. ئەگەر گیانی کەسێک پڕ ببێت لە عەشق، ئیتر هەموو شتێک تەواوە. ئەوەپیاوێکی چاکەو هەرچی ئەو بیکات چاکەیە.

بێتینا کاتێک نامەبۆ ئارنیم دەنووسێت وەک ئاگۆستینی پیرۆز بیر دەکاتەوە: «پەندێکی جوانم بینی: عەشقی ڕاستەقینە، تەنانەت ئەو کاتەش کەبەهەڵەدەچێت، هەمیشەلەسەر حەقە؛ بەلام لوتەر لە

نامەیەکیدا دەڵێت: عەشقی ڕاستەقینەزۆرجار بەهەڵەدەچێت. ئەم پەندەبە لای منەوەبەقەدەر پەندەکەی خۆم چاک نییە. لوتەر لەشوێنیکی دیکەش دەڵێ: عەشق لەپێش هەموو شتێکەوەیە، تەنانەت لەپێش نوێژ و قوربانیکردنیشەوەیە. من بەمەدا بەو ئەنجامەدەگەم کەعەشق بالاترین چاکەیە. عەشق لە هەموو شتەزەوینییەکان داماندەبڕێت و پرمان دەکات لەشتی ئاسمانی. بەم شێوەعەشق لەهەموو گوناهێک پاکمان دەکاتەوە. (macht unschuldig)

بونیادی یاسای ئەورووپی و بۆچوونەکەی بۆ گوناه، کەهەستی تاوانباریش ڕەچاو دەکات، لەناخی ئەم باوەڕەوە سەرهەڵدەدات کەعەشق لە گوناه داماندەماڵێت: ئەگەر تۆ لەپێناوی پارەدا کەسێک بکوژیت، هیچ عوزر و بیانوویەکت لێ وەرناگیرێت، بەلام ئەگەر لەبەر ئەوەبیکوژی کەسووکایەتیی پێ کردوویت، توورەبوونەکەت دەبێتەبەڵگەیەک بۆ کەمکردنەوەی سزاکەت و حوکمێکی کەمت دەدرێتی. جا ئەگەر بەهۆی عەشقێکی دۆڕاو، یان خەیانەتەوەبیکوژیت، دەستەی ڕاوێژکاریی دادوەر هاوخەمیت لەگەڵ دەکەن و پاولیش وەک پارێزەری تۆ، داوای سزایەکی قورس بۆ کوژراوەکەدەکات.

# ٨

ناکرێت مرۆڤی هەستۆک بەمرۆڤی هەستیار، یان خاوەنهەست پێناسەبکرێت (چونکەهەمووومان خاوەنی هەستین). مرۆڤی هەستۆک مرۆڤێکەکەهەستەکانی خۆی بەکۆمەڵێک بەها و بایەخ بارگاوی دەکات. مادام وەک بەهایەک سەیری هەست بکردرێت، هەموو کەس دەخوازێت هەستیار بێت و لەبەر ئەوەی کە هەمووشمان حەزدەکەین شانازی بەبەهاکانمانەوەبکەین، پێمان خۆشەهەستی خۆمان دەربخەین. یەکەم جار لەئەوروپای سەدەی دوازدەدا هەستەکان بەبەها بارگاوی کران. ئەو گۆرانییانە کە سترانبێژە گەڕیدەکان بە جۆشوخرۆشەوە بۆ دڵدارەکانیان، بۆ ئەو شازادەخانمانەیان دەخوێند کە دەستیان پێیان نەدەگەیشت، بە لای بیسەرەکانەوەئەوەندە خۆش و دڵڕفێن بوون کەهەموو کەس حەزی دەکرد وەک نموونە پەیڕەوییان لێ بکات و خۆی بخاتەداوی تۆفانی دڵییەوە.

کەس وەک "سێرڤانتس" بەزەلاڵی نمایشی مرۆڤی هەستۆکی نەکردووە. "دۆن کیخۆتە"بڕیار دەدا خانمێک بەناوی "دولسینا"ی خۆشبوێت کە لەڕاستیدا هەر ناشیناسێت (ئەمەجێی سەرسووڕمان نییە، چونکەلەعەشقی ڕاستەقینەدا wahreLiebe دڵدار کرینگییەکی ئەوتۆی نامێنێت). لەبەشی بیستوپێنجی یەکەم بەرگی کتێبەکەدا، "دۆن کیخۆتە" لەگەڵ "سانچۆ پانزا" بەرەو کوێستان دەچێت و دەیەوێت شکۆی عەشقەکەی پیشان بدات. بەڵام چۆن دەکرێت

سووتانی ڕۆحی خۆت لە ئاگردا پیشان کەسێکی دیکە بدەیت، بە تایبەت کەسێکی گەوج و ساویلکەی وەکو "سانچۆ"؟ کاتێک ئەو دوانەبە ڕێچکەیەکی کوێستانیدا دەڕۆن، "دۆن کیخۆتە"، جگەلە کراسەدرێژەکەی، هەموو جلەکانی دیکەی دادەکەنێت و بۆ پیشاندانی جۆشوخرۆش و وروووژانەکەی بە"سانچۆ"، سەرمەقولات دەدا. کاتێک سەری بەرەو خوارە، کراسەکەی تا ناوشانی دادەکشێت و "سانچۆ" چاوی بەئەندامی زاوزێی دەکەوێت. دیمەنی ئەو ئەندامەبچووک و کارپێنەکراوەی سوارچاک، وێڕای ئەوەکە گاڵتەجاڕییە، ئەوەندەخەمهێن و دڵتەزێنیشەکە"سانچۆ"، ئەو پیاوەدڵڕەقە، ناتوانێت سەیری بکات و سواری "ڕوسینانتە"دەبێت و بە تەقڵەغار دوور دەکەوێتەوە.

ئەگنێس کاتێک کەباوکی مرد، ناچاربوو تەدارەک بۆ مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی بگرێت. ئەو نەیدەیویست کەس لەمەراسیمەکەدا وتار بخوێنێتەوە. تەنیا دەیویست بەشی "ئاداگیۆ"ی سەمفۆنیای دەی مالەر، کەپارچەمۆسیقایەکی دڵخوازی باوکی بوو، بڵاوبکرێتەوە، بەڵام ئەو مۆسیقایەش ئێجگار خەمناک بوو، ئەگنێس دەترسا لەو کاتەدا نەتوانێت بەر بە گریانی خۆی بگرێت. ئەو، کەلەگریان لە بەرچاوی خەڵکدا بێزار بوو، بەر لە مەراسیمەکەجارێک، دوو جار، سێ جار قەوانەکەی لێدا و گوێی لێ گرت. ئەو مۆسیقایەباوکی وەبیرهێنایەوەو گریا، بەڵام دوای هەشت نۆ جار، هێزی مۆسیقاکەکەم بووەوە. کاتێک سێزدەجار لێی دا، هێزێکی ئەوتۆی نەما و دەتگوت گوێ لەسروودی نیشتمانی وڵاتی "پاڕاگوا" دەگرێت. ئەو بە هۆی ئەم ڕاهێنانەوەتوانیی لەکاتی مەراسیمەکەدا چاوی تەڕ نەکات.

بەپێی پێناسەکان، هەست و حەسان وێڕای خواستی ئێمە و زۆرجار بە پێچەوانەی خواستی ئێمەش، لە ناخماندا سەرهەڵدەدات. کاتێک بڕیار دەدەین هەست بەهەستیاریی خۆمان بکەین (واتەبڕیار دەدەین هەست بکەین، هەروا کە "دۆن کیخۆتە"بڕیاری دا عاشقی دۆلسینا ببێت) ئیتر ئەوەهەست نییە، بەڵکو لاساییکردنەوەی هەستە، نمایشکردنی هەستە. زۆر جار بەمەدەڵێن هیستریا. کەواتەمرۆڤی هەستۆک، یان سانتیمانتاڵ (کەسێک کەهەستی خۆی بەبەها بارگاوی دەکات) لەڕاستیدا هەمان هۆمۆهیستریکۆسە، واتەمرۆڤی هیستریک.

ئەم گوتەبەو مانایەنییەکەسێک کەلاسایی هەستکردن دەکاتەوە، هەست ناکات. ئەکتەرێک کەدەوری "شا لیر" دەبینێت، تەژی لەخەمی خەیانەت، بەرەوڕووی بینەرەکان ڕادەوەستێت؛ بەڵام کاتێک شانۆکەکۆتایی دێت، خەمەکەشی نامێنێت. لەم ڕووەوەیەکەمرۆڤی هەستۆک، کەلەساتێکدا بەهەست و حەسانی زۆری خۆی تووشی سەرسووڕمانمان دەکات، ساتێک دواتر، بەبێدەربەستی خۆی داماندەچڵەکێنێت.

# ٩

"دۆن کیخۆتە" کوڕ (بوخچەی نەکراوە) بوو. بێتینا بۆ یەکەم جار لەتەمەنی بیستوپێنجساڵیدا، کاتێک کەلەگەڵ گۆتەلەژووری ئوتێلێکی "تەپلیتز" بە تەنیا بوون، هەستی بەدەستی پیاوێک لەسەر مەمکی خۆی کرد. ئەگەر متمانەبەژیاننامەنووسەکان بکەین، گۆتەلە کاتی سەفەرەکەی بۆ ئیتالیا، بۆ یەکەم جار لە تەمەنی چل ساڵیدا عەشقی جەستەیی ئەزموو. ئەو کەلەسەفەرەکەی گەڕایەوە، خێرا سەردانی ژنێکی کرێکاری بیستوسێ ساڵەی وایماریی کرد و بۆ هەمیشەبوو بەدۆستی. ئەو ژنە"کریستیان ڤولپیوس" بوو کە پاش ساڵەها پێکەوەبوون، ساڵی ١٨٠٦ بە یاسایی مارەی کرد. ئەو، هەمان ژنەکەلەساڵی لەبیرنەکراوی ١٨١١، چاویلکەکەی بێتینای فڕێدایەسەر عەرز. کریستیان بەو پەڕی وەفادارییەوەخۆی بۆ مێردەکەی تەرخان کرد. (دەڵێن بەلەشی خۆی گۆتەی لەهەڕەشەی سەربازە سەرخۆشەکانی ناپلیون پاراست). هەروا کەبەشۆخییەکەی گۆتەدا دەردەکەوێت کەگوایەپێی گوتووە Bettschatz (واتەگەوهەری تەختی خەوەکەم) دیارەدۆستێکی زۆر چاکیش بووە.

وێڕای هەموو ئەمانەش، لەمێژووی ژیانی گۆتەدا، کریستیان لەدەرەوەی بازنەی عەشق و دڵدارییە. سەدەی نۆزدە(هەروەها ئەم سەردەمەی ئێمەش کەهێشتا دیلی سەدەی ڕابوردووە) ڕێگەمان پێ

نادات کەکریستیانیش وەک "فریدریکا"، "لۆتە"، "لیلی"، "بیتینا" و "ئولریکا"، بخەینەڕیزی دڵدارەکانی گۆتەوە. ڕەنگەئێوەبڵێن ئەمەلەبەر ئەو ڕاستییەیەکەکریستیان ژنی بووەو ئێمەبەوەڕاهاتووین کەبەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هاوسەرگیری بەشتێکی ناشاعیرانەبزانین، بەڵام من پێم وایەهۆکارەڕاستەقینەکەی گەلێک لەمەقووڵترە: خەڵک لەبەر ئەوەوەک یەکێک لەدڵدارەکانی گۆتەسەیری کریستیان ناکەن، چونکەلەگەڵی خەوتووە، چونکەخەزێنەی عەشق و خەزێنەی چرپا و تەختی خەو دوو شتی تایبەتی لێکجودان. نووسەرانی سەدەی نۆزدەزۆرجار بەهاوسەرگیری کۆتاییان بە چیرۆکی دڵدارانەیان دەهێنا؛ لەبەر ئەوەنا کەدەیانویست چیرۆکە داڵدارانەکانیان لەبێزاریی هاوسەرگیری بپارێزن، نا، دەیانویست لەنزیکیی سێکسییان بپارێزن!

هەموو چیرۆکەدڵدارییە گەورەکانی ئەورووپا لەکەشێکی بەبێ نزیکیی سێکسیدا نووسراون: چیرۆکی «شازادە خانم کلێڤ» ، چیرۆکی «پاول و ڤیرژینی» ، چیرۆکی «دومینیک» بەقەڵەمی "فرۆمنتن"، کەلەهەموو ژیانیدا تەنیا ژنێکی خۆشدەوێت و هەرگیز، تەنانەت بۆ یەک جاریش ماچی ناکات. هەروەها سەربوردەکانی "وەرتەر"، "ڤیکتۆریای هامسون" و چیرۆکی «پیتەر و لوسی» ڕۆمەن ڕۆلان کەلەهەموو ئەورووپا فرمێسکی بەخوێنەرەژنەکانی هەڵڕشتووە. داستایۆفسکی لە کتێبی «گەلحۆ»دا ڕێگە بە"ناستازیا فیلیپوونا" دەدات هەر بازرگانێک لە دەرکەوەهاتەژوور، لەگەڵی بخەوێت، بەڵام کاتێک حەزی ڕاستەقینەدێتەژوور، واتەکاتێک "ناستازیا" خۆی لەنێوان "پرەنس میشیکین" و "ڕۆگۆژین"دا

بەدووکوتکراوی بینی، ئەندامی زاوزێیان وەک کەوچێک شەکر لەسێپیاڵەی چادا، لەسێ دڵی گەورەیاندا توایەوە. عەشقی "ئاناکارنینا" و "ڤرۆنسکی" لەپاش یەکەم پەیوەندیی سێکسییان کۆتایی دێت، لەوەودوا ئیتر هیچ نییەجگەلە چیرۆکی تیاچوونی ئەم عەشقە و ئێمەنازانین بۆچی. ئایا ئەو دوانەزۆر داماوانەجووتبووبوون؟ یان بە پێچەوانەوە، جووتبوون و نزیکییەکەیان هێندەجوان بوو، کەئەو چێژ و لەززەتەزۆرەهەستی گوناهی لەناخیاندا ورووژاندبوو؟ ئێمەهەر وەڵامێک بەم پرسیارانەبدەینەوە، بەردەوام بەیەک ئەنجام دەگەین: لەپاش ئەو عەشقەی بەر لەجووتبوونەکەیان ئیتر هیچ عەشقێکی گەورەلەنێوانیاندا نەمابوو، نەشیدەتوانی بمێنێت.

ئەم قسانەبەو مانایەنییەکەعەشقی بەبێ جووتبوون عەشقێکی پاک و بێگەرد و فریشتەئاسا و منداڵانەیە، بە پێچەوانەوە، ئەوەعەشقێکەکەهەموو شەڕانی و دۆزەخییەکی ئەم دنیایەلەخۆی دەگرێت. "ناستازیا فیلیپوونا" بەبێ‌خەم و دڵەڕاوکە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەپیاوەدەوڵەمەندەبچووکەکاندا جووتبوو، بەڵام لەو کاتەوەکە"پرێنس میشیکین" و "ڕۆگۆژین"ی بینی، کەوەک گوتم ئەندامی زاوزێیان لەمەنجەڵی هەستیاریدا توایەوە، تووشی بەڵا و نەهامەتی بوو، مرد. ڕێگەم بدەن دیمەنێکی جوانی دومینیک بەرهەمی فرۆمنتن"تان بیر بهێنمەوە: دوو دڵدار کەساڵانێکی زۆر یەکتریان خۆشدەویست و تەنانەت دەستیان لەدەستی یەکتریش نەدرابوو، بە سواریی ئەسپ دەچن بۆ گەڕان، "مادلین"ی نەجیب و بێگەرد و خۆڕاگر، وەک شێتان بەقامچی دەکەوێتەگیان ئەسپەکەی و تەقڵەغاری پێ دەکات، چونکەدەزانێت "دومینیک" کەئەسپسواریی

چاک نازانێت و شوێنی کەوتووە، ڕەنگەبکوژرێت. عەشق بی پەیوەندیی سێکسی وەک تیانەیەکی سەر ئاگرەکەهەست تا سنووری هەڵچوون و شەیدایی لەناویدا دەکوڵێت و وەک ڕۆحێکی داگیرکراو سەری تیانەکەدێنێتەلەرەلەر و سەما.

چەمکی عەشقی ئەوروپایی، ڕەگی لەنێو خاکی جووتنەبووندا داکوتراوە. سەدەی بیستەم کەشانازی بەئازادیی ئەخلاقیاتەوەدەکات و حەزدەکات بە ڕیشی هەستۆکی ڕۆمانسییانەپێبکەنێت، نەیتوانیوە بەناوەڕۆکێکی تازەوەمانای عەشق بەپێت بکات (ئەمەیەکێک لەخەسارەکانییەتی)، کەواتەئەوروپییەکی گەنج کەلەبێدەنگیدا ئەو وشەمەزنەلە دڵی خۆیدا دەڵێتەوە، پێت خۆش بێت، یان نا، بەسواریی باڵی ئیلهام دەگاتەئەو خاڵەکە"وەرتەر" کۆتایی بەعەشقی گەورەی خۆی بە"لۆتە" هێنا و دومینیک خەریکبوو لە ئەسپەکەی بەربێتەوە.

## ١٠

ڕیلکه، هاوکات لەگەڵ ئەوەکە مەدحی بێتینای دەکرد، ستایشی ڕووسیاشی دەکرد و ماوەیەک پێی خۆش بوو بەنیشتمانی ڕۆحیی خۆی بزانێت. چونکەڕووسیا بەر لەهەموو شتێک وڵاتی هەستیاریی مەسیحییە. ئەم وڵاتەهەم خۆی لەعەقڵگەرایی فەلسەفەی سکۆلاستیکیی سەدەکانی ناوەڕاست لادا، هەم لەڕێنێسانس. سەردەمی نوێ کەلەسەر بونیادی فکری ڕەخنەیی "دیکارت" ڕاوەستاوە، پاش ئیستێکی سەد یاخود دووسەد ساڵە، خۆی گەیاندەڕووسیاش. بەم شێوەمرۆڤی هەستۆک لەڕووسیا، هیچ هێزێکی هاوسەنگی بەرگریکاری لە بەرامبەر خۆیدا نەدی و لەوێ لەشێوەی زێدەڕۆیانەی خۆیدا کەبە ڕۆحی ئیسلاوی بەناوبانگە، دەرکەوت.

ڕووسیا و فەڕەنسا دوو جەمسەری ئەوروپان کەتا هەتاهەتایەیەکتر ڕادەکێشن. فەڕەنسا وڵاتێکی کۆن و ماندووەکەلەوێ هەستکردن بەشێوازی شکڵی دەردەکەوێت. فەڕەنسییەک لەکۆتایی نامەکەیدا دەنووسێت: «بەڕێزی خۆشەویست، لوتف بفەرموو هەستی تایبەتیم وەربگرە». من یەکەم جار کەنامەیەکی ئاوام لە لایەن سکرەتێری وەشانخانەی "گالیمار"ەوەپێگەیشت، هێشتا لەپراگ دەژیام. لەخوشیان هەڵبەزیمەوەو گوتم: لەپاریس ژنێک منی خۆشدەوێت! ئەو توانیویەتی زیرەکانەلەنامەیەکی ئیداریدا خوشەویستییەکەی بۆ من دەرببڕێت! ئەو نەک هەر هەستێکی بۆم هەیە، بەڵکو بە ئاشکرا گوتوویەتی کەئەو هەستەش تایبەتییە! لەژیانمدا هەرگیز ژنێکی چێک ئەوەی پێ نەگوتووم!

سالآنێک لەوەودوا لەپاریس پێیان گوتم کۆمەڵێک دێڕ بۆ کۆتایی نامەکان هەیە، کەلەڕێگەی ئەم فرمووڵانەوە، فەڕەنسییەک دەتوانێت وەک کەسێکی کیمیازان، ئاستێکی دیاریکراو لەهەستی خۆی بەبەرامبەرەکەی ڕابگەیەنێت. بەو پێوەرە«هەستی تایبەتی» کەمترین ئاستی ڕێزگرتنی ئیدارییەکەتا ڕادەیەک لەسووکایەتیپێکردنەوەنزیکە.

ئای فەڕەنسا، هەروا کەڕووسیا وڵاتی هەستە، تۆش وڵاتی شکڵ و فۆڕمی! هەر بۆیە پیاوی فەڕەنسی، کەبەهۆی نەبوونی ئاگرێک لە دڵیدا هەست بەهیچوپووچی دەکات، بەدڵتەنگی و ئێرەییەوەچاو لەوڵاتی داستایۆڤسکی دەبڕێت، لەو وڵاتەکەخەڵک لێویان بەنیشانەی ماچکردن دەکەن بەخونچە و ئەگەر کەسێک ماچەکەیان ڕەت بکاتەوەسەری دەبڕن. (تازە، ئەگەر سەری کەسێکیش ببڕن، خێرا لێیان خۆش دەبن، چونکەسۆزی برینداربیان هانی داون ئەوەبکەن و وەک بێتینا دەیگوت: عەشق مرۆڤ لەگوناهبەری دەکات. پیاوکوژێکی هەستۆک و سانتیمانتاڵ، لانیکەم لەپاریس سەد و بیست پارێزەر دەبینێتەوەکەهەموویان ئامادەن لەپێناوی بەرگریکردنیدا بچن بۆ مۆسکۆ. ئەوان، ئەو کارەلەبەر بەزەیی/هەستیاری ناکەن کەلەنیشتمانەکەی خۆیان زۆر سەیر و غەریبەو کەس نایکات، بەڵکو لەبەر ئەو ئینتیما زهنییەدەیکەن کەتاقەهۆیەبۆ وروژان و هەیەجانیان. پیاوکوژەڕووسەکەش کەئاگای لەمەنییە، هەر کەئازادکرا، خێرا دەچێت بۆ لای پارێزەرەفەڕەنسییەکەتا باوەشی پێدا بکات و ناودەمی ماچ بکات. کابرای فەڕەنسی دەتۆقێت و خۆی لێدووردەخاتەوە. ڕووسەکەش کەپێی وایەسووکایەتیی پێ کراوە، چەقۆیەک لەسکی پارێزەرەکەڕۆ دەکات و ئەم چیرۆکە، وەک ئەو گۆرانییە کەلەبارەی سەگ و قەراغەنانەوەگوتراوە، دووبارەدەبێتەوە).

## ١١

ئاخ، ڕووسەکان...

ئەو کاتەکەمن هێشتا لەپراگ دەژیام، ئەم حەقایەتەیان لەبارەی ڕۆحی ڕووسییەوەدەگێڕایەوە: پیاوێکی خەڵکی چیک زۆر بەخێرایی ژنێکی ڕووس هەڵدەخەڵەتێنێت، دوای ئەوەی کەلەگەڵی دەخەوێت، ژنەڕووسەکە بەوپەڕی سووکایەتییەوە پێی دەڵێ: «تۆ دەستت بەلەشم گەیشت، بەڵام دەستت بەڕۆحم ناگات!»

حەقایەتێکی بەشکۆیە. بێتینا بەگشتی چلونۆ نامەی بۆ گۆتەنووسیوەکەلەو نامانەدا پەنجا جار وشەی «ڕۆح» و سەد و نۆزدەجار وشەی «دڵ» دووبارە دەبێتەوە. وشەی دڵ بە دەگمەن بە مانا ئاناتۆمییەکەی (وەک دڵم لێدەدا) بەکاردێت، بەڵکو زۆرجار وەک نیشانەیەک بەکاردێت کەبەمانای سنگە (حەزدەکەم بەدڵی خۆمەوەبتنووسێنم)، بەڵام ئەوەش لەزۆر شوێندا دیسان مانای «ڕۆح»ی هەیە: خودی هەستیار.

«من بیردەکەمەوە،کەواتە هەم» گوتەی ڕۆشنبیرێکەکە ددانئێشەبەهیچ نازانێت. «من هەست دەکەم، کەواتەهەم» ڕاستییەکی گەلێک باوەڕپێکراوترەو بۆ هەموو بوونەوەرێکی زیندوو بەکاردێت. لە لایەنی فیکرییەوە، خودی من زۆر جیاواز لەخودی تۆ نییە. خەڵکی زۆر و بیرۆکەی کەم. هەمووومان کەم، یان زۆر، وەک یەکتر بیر دەکەینەوەو بیرکردنەوەکانمان لەگەڵ یەکتر دەگۆڕینەوە، لەیەکتری قەرز دەکەین، یان لە یەکتری دەدزین، بەڵام

ئەوکاتەکەکەسێک شەق لەقاچم هەڵبدات، من تەنیا هەست بەئازار دەکەم. لێرەدا ئیتر ئەساسی خود، فکر و بیرکردنەوەنییە، بەڵکو ئازارەکەئەویش بونیادیترینی هەستەکانە. تەنانەت کاتێک کە پشیلەیەک ئازار دەکێشێت ناتوانێت گومان لەخودی تاقانەو نەگۆڕی خۆی بکات. لە کاتی ئێشوئازاردا جیهان ون دەبێت و هەر کام لەئێمەلەگەڵ خودی خۆمان بەتەنیا دەمێنینەوە. لەڕاستیدا ئازار فێرگەی خودناوەندییە.

هیپۆلیت لە "پرێنس میشکین"ی پرسی:

«ئایا هەست بەسووکبوونی من دەکەیت؟»

«لەبەر چی؟ چونکەتۆ لەئێمەزیاتر ئازارت کێشاوەو بەردەوام ئازار دەکێشی، دەبێ هەست بەسووکبوونت بکەم؟»

«نا، چونکە من شایستەی ئێشوئازار نیم».

من شایستەی ئێشوئازار نیم. ئەمەڕستەیەکی گەورەیە. ئەم ڕستەبەو مانایەیەکەئازار نەک هەر ئەساسی خود و بەڵگەی حاشاهەڵنەگر بۆ سەلماندنی بوونناسانەی خودە، بەڵکو تاکەهەستێکیشەکەشیاوی زۆرترین ڕێز و حورمەتە، بەهای هەموو بەهاکانە. لەبەر ئەوەیەکە"میشکین" ستایشی هەموو ئەو ژنانەدەکات کەئازار دەکێشن. کاتێک "میشکین" بۆ یەکەم جار چاوی بەڕەسمی "ناستازیا فیلیپوونا" کەوت، گوتی: «ئەم ژنەدەبێ زۆری ئازار کێشابێت». ئەم وشانەلە سەرەتاوە، تەنانەت بەر لەوەی کە"ناستازیا فیلیپوونا"ش لە چیرۆکەکەدا دەربکەوێت، بە شێوەیەک پێناسەی دەکات کە سەروگەردنێک لەهەموویان بەرزترە. لەپاژی یەکی بەشی پازدەی کتێبەکەدا، "میشکین" بە "ناستازیا فیلیپوونا" دەڵێ: «من هیچ نیم، بەڵام تۆ، تۆ ئازارت کێشاوە». لەو کاتەوە"میشکین" ون دەبێت.

من گوتم "میشکین" ستایشی هەموو ئەو ژنانەی دەکرد کەئازاریان دەکێشا، بەڵام دەبوایە بڵێم: "میشکین" لەو کاتەوەکە ژنێکی خۆشدەویست ئێشوئازارەکەی دەبینی و چونکەنەیدەتوانی بیرکردنەوەکانی بۆ خۆی ڕابگرێت، دەستبەجێ لەلای ژنەکەدەیدرکاند. جگە لەوەش، ئەمەشێوازێکی چاک بۆ دەسخەڕۆکردن بوو (مەخابن کە میشیکین نەیدەزانی چۆن لەوەچاکتر بەکاری بێنێت!)، چونکەبەهەر ژنێک بڵێین «تۆ زۆرت ئازار کێشاوە»، وەک ئەوەیەڕێزمان لە ڕۆحی گرتبێت، لاواندبێتمانەوەو بەرەو ئاسمان هەڵمانکێشابێت. هەر ژنێک لەکاتێکی ئاوادا ئامادەیەپێمان بڵێ: «ئەگەر تۆ هێشتا دەستت لەلەشم نەداوە، بەڵام ڕۆحمت داگیر کردووە!»

لەبەر نیگای واقوڕماوی میشکیندا ڕۆح گەورەو گەورەتر دەبێت، وەک قارچکێکی دێوئاسا، بەقەد بینایەکی بەرزی پێنج نهۆمی لێدێت و وەک باڵۆنێکی پڕ لەهەوای گەرم ئامادەیەلەگەڵ سەرنشینەکانی بەرەو ئاسمان بفڕێت. ئێمەگەیشتووینەتەئەو دیاردەیەکەمن بەگەورەبوونی ڕۆح ناوی دەبەم.

## ١٢

ئەگەر لەبیرتان بێت، کاتێک گۆتەسکێچی پەیکەرەکەی بینی کەبێتینا بۆی کێشابوو، دڵۆپێک فرمێسک لە چاویدا پەنگی خواردەوەو دڵنیابوو کەئەوە خودی خۆیەتی کە ڕاستییەکەی لێ ئاشکرا دەکات. بێتینا بەڕاست ئەوی خۆش دەویست و ئەو خراپەی لەگەڵ کردبوو. گۆتەدواتر زانیی کەئەو دڵۆپەفرمێسکە هیچ ڕاستییەکی سەیر و سەرنجڕاکێشی لە بابەت خۆشەویستییەکەی "بێتینا"وەئاشکرا نەکردووە، بەڵکو ڕاستیی سادەو ساکاری پووچی و بێهوودەیی خودی گۆتەی دەرخستووە. ئەو لەوەشەرمەزار بوو کەجارێکی دیکەش خۆی تەسلیمی فریوی فرمێسکەکانی خۆی کردووە. لەوەتەی تەمەنی بۆ پەنجا ساڵ هەڵکشابوو، زۆرجار فرمێسکی دەڕشت. کاتێک کەسێک ستایشی دەکرد، یان بۆخۆی لەکارێکی چاک و خێرۆمەندانەی خۆی خۆشحاڵ دەبوو، چاوی پڕ دەبوو لەفرمێسک. گۆتەبێ ئەوەی هەرگیز وەڵامێک بۆ پرسیارەکەی خۆی ببینێتەوە، گوتی: فرمێسک چییە؟ بەڵام شتێکی لێ ڕوون بوو، ئەو زۆرجار کەبیری لەخۆی دەکردەوەو لەخۆی ڕادەما، هەستی دەهەژا و دڵۆپێک فرمێسک ناوچاوی تەڕدەکرد

نزیکەی حەفتەیەک پاش مەرگی دڵتەزێنی ئەگنێس، لاورا سەردانی پاولی خەمباری کرد و گوتی:

«پاول، ئێمەئێستا لەم دنیایەدا بە تەنیاین».

چاوی پاول پڕبوو لەفرمێسک و بۆئەوەی هەژان و هەیەجانەکەی وەشێرێت سەری بەرەو لایەکی دیکە وەرچەرخاند، بەڵام هەر ئەو سەرجووڵاندنەی پاڵی بەلاوراوەنا کەتوند قۆڵی بگرێت:

«مەگری پاول!»

پاول لەپشت پەردەی فرمێسکەوەسەیری لاورای کرد و زانیی کەچاوی ئەویش تەڕە. بەزەردەخەنەو دەنگێکی شکاوەوەگوتی:

«من ناگریم، ئەوەتۆی کەدەگری».

«پاول، هەرچییەکت پێویست بێت، من ئامادەم، دەتوانی داوا لە من بکەیت».

پاول وەڵامی دایەوە:

«دەزانم».

فرمێسکی چاوی لاورا فرمێسکی هەژان و هەیەجانێک بوو کەلاورا، بەبڕیاری لاورا بۆ فیداکردنی هەموو ژیانی لەپێناوی ڕاوەستان لە لای مێردی خوشکەکۆچکردووەکەی هەستی پێکرد.

فرمێسکی چاوی پاول فرمێسکی هەژان و هەیەجانێک بوو کەپاول، بەوەفای پاول هەستی کرد کەهەرگیز ناتوانێت جگەلەسێبەری هاوسەرەکۆچکردووەکەی، جگەلەخوشکەکەی، لەگەڵ هیچ ژنێکی دیکەدا بژی.

ئاوا بوو کەئەوان ڕۆژێک پێکەوەلەسەر چرپایەکی پان ڕاکشان و فرمێسک (لوتف و چاکەی فرمێسک) کارێکی کرد کە بەرامبەر بە کۆچکردووەکەهەست بەخەیانەت نەکەن.

هونەری کۆنی تەمومژی عەشقی جەستەیی بەهانایانەوەهات. ئەوان، نەوەک ژن و مێرد، بەڵکو وەک خوشک و برا لەپاڵ یەکتردا ڕاکشان. لاورا تا ئێستا بۆ پاول تابۆ بوو، هەرگیز، تەنانەت بەخەیاڵیش، لەدوورترین سووچەکانی زیهنیشیدا، بیری لەسێکس لەگەڵ ئەو نەکردبووەوە. ئێستاش کەلەجێگەی خوشکەکۆچکردووەکەی ڕاکشابوو، هەستێکی برایانەی بۆی بوو. لەپێشدا هەر ئەم هەستەش لەلایەنی ڕەوشتییەوەڕێگەی دابوو لەگەڵیدا بچێتەناو جێگەوە، بەڵام دواتر بە شێوەیەکی سەیر وروژاندبووی. ئەوان (وەک خوشک و برا) هەموو شتێکیان لەبارەی یەکترەوەدەزانی و ئەوەی لەیەک جودای دەکردنەوەسەیروسەمەرەیی دۆخەکەنەبوو، بەڵکو قەدەغەیی بوو؛ قەدەغەییەکی بیست ساڵەکەلەهەمیشەزیاتر بەری پێدەگرتن. هیچ شتێک بەقەد لەشی یەکتر لێیانەوەنزیک نەبوو. هیچ شتێک بەقەد لەشی یەکتر لێیان قەدەغەنەکرابوو، بۆیەپاول وەک کەسێک کەتەما لە خوشکی خۆی بکات، (بە چاوی پڕ لەتەمومژەوە) وروژا و لەگەڵ لاورادا جووتبوو. جوتبوونێکی ئەوەندەتوند کەلە ژیانیدا لەگەڵ هیچکەس نەیئەزموو بوو.

# ١٣

هەندێک شارستانییەتی بیناسازییەکی مەزنتر لەئەوروپایان هەیە و تراژیدیای یۆنانیش بۆ هەمیشەباڵادەستتر دەبێت، بەڵام هیچ شارستانییەتێک تا ئێستا وەک مۆسیقای ئەوروپی، بەو مێژووەهەزار ساڵەو خەزێنەی فۆرم و ستایلەوە، لەنەغمەو نۆتەمۆسیقاییەکان موعجیزەیەکی ئاوای دانەهێناوە! ئەوروپا واتەمۆسیقای مەزن و مرۆڤی هەستۆک؛ دووانەیەک کەپێکەوەلەلانکەیەکدا گەورەبوون.

مۆسیقا نەوەک هەر بەپێتی هەستی فێری تاکی ئەوروپی کرد، بەڵکو ئەوەشی فێرکرد کەستایشی هەست و خودی هەستیاریش بکات. هەرچۆنێک بێت، ئەم دیمەنەبەئێوەغەریب نییە: ڤیالۆنژەنێک کەلەسەر سەکۆ ڕاوەستاوە، چاوی دەبەستێ و دوو نۆتەی دوورودرێژی سەرەتای پارچەمۆسیقاکەی دەژەنێتێت. لەو کاتەدا گوێگرەکەش چاوی دەبەستێ و هەست دەکا ڕۆحی بەناو سنگیدا بڵاودەبێتەوە و بەخۆی دەڵێ: «ئای کەجوانە!»، بەڵام ئەو تەنیا گوێی لەدوو نۆتەبووەکەڕەنگە هێشتا شتێکی ئەوتۆیان لەفیکر و داهێنانی مۆزیسیەنەکە، یان بە واتایەکی تر، شتێکی ئەوتۆیان لەهونەر و جوانیی بەرهەمەکەتێدا نەبێت. هەرچۆنێک بێت، ئەو دوو نۆتەکاریان کردووەتەسەر دڵی گوێگرەکەو چرای عەقڵ و توانای هەڵسەنگاندنی ستاتیکییان کووژاندووەتەوە. ئاواز و مۆسیقا ئەو کاریگەرییەیان لەسەر ئێمەهەیەکەنیگا و تێڕامانەکەی "میشکین"

لەسەر ئەو ژنەیان بوو. مۆسیقا: دەمێنێ کەکە ڕۆحی پێ دەگەشێتەوە. ڕۆحەگەشاوەکان کە وەک باڵۆنی گەورەیان لێ هاتووە، بەرەو بنمیچی هۆڵی کۆنسێرتەکە هەڵدەکشێن و لەو قەرەباڵغییەسەیرەدا شان لەشانی یەکتر دەکوتن.

لاورا قووڵ و ڕاستگۆیانەمۆسیقای خۆشدەویست؛ من لە مانای ئەو خوشەویستییەدەگەم کەبۆ مالەر بووی. مالەر دواهەم موزیسیەنی ئەوروپییەکە هێشتا سادەو ڕاستەوخۆ لەلایەن مرۆڤی هەستۆکەوەپەسند دەکرێت. لەپاش مالەر، وردەوردە گومان لەهەست، لە مۆسیقادا دەکرێت. "دێبووسی" نایهەوێت کاریگەریمان لەسەر دابنێت، بەڵکو بەتەمایەسیحرمان بکات و "ستراڤینسکی"ش شەرم لەهەیەجان و خۆشی دەکات. بە لای لاوراوەمالەر دواهەم ئاوازدانەرە، ئەو کاتێک لەژوورەکەی بریژیتەوەگوێی لەدەنگی بەرزی مۆسیقای ڕاک دەبێت، خۆشەویستیی بۆ مۆسیقای ئەوروپی، کەلەژاوەژاوی گیتارەکارەباییەکاندا فەوتاوە، توورەی دەکات. لاورا هەڕەشەلە پاول دەکات: «یان مالەر، یان ڕاک». واتە، یان من، یان بریژیت.

بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێت لە نێوان دوو جۆر مۆسیقا، کەهەردووکیانی پێ ناخۆشە، یەکێکیان هەڵبژێرێت؟ مۆسیقای ڕاک بۆ پاول پڕەلەدەنگەدەنگ و هەراوهوریا (ئەویش وەک گۆتەگوێی تیژە)، مۆسیقای ڕۆمانتیکیش تووشی دڵەخورپەی دەکات. لەکاتی شەڕ، کەهەموو کەسەنزیکەکانی پاول بەهۆی هەواڵ و ڕاپۆرتەترسناکەکانەوەشڵەژابوون، ڕۆژێک ڕادیۆ لە باتیڤالس و تانگۆ، ئاوازێکی ڕێکوپێک و مۆسیقایەکی قورس و جیدیی

بڵاوکردەوە. ئەو ئاوازەڕێکوپێکە، وەک بەرایی کارەساتێک بۆ هەمیشەلەیادەوەریی منداڵییدا مایەوە. ئەو دواتر زانیی کەکاریگەریی مۆسیقای ڕۆمانتیک بووەتەهۆی یەکگرتوویی هەموو ئەوروپا. هەرجارێک کەپیاوێکی حکوومەت دەکوژرێت، یان شەڕێک ڕادەگەیەندرێت، هەر کاتێک کە پێویست بێت مێشکی خەڵک بەشانازی قانگ بدرێت تا بەئارەزووی خۆیان بمرن، ئەم مۆسیقایەبڵاودەکرێتەوە. ئەو نەتەوانەکە هەوڵیان دەدا یەکتر بفەوتێنن، کاتێک گوێیان لەگرمەی مارشی تازییەی شۆپن، یان ئیرۆیکای بیتهۆڤن دەبوو، پڕ دەبوون لەجوشوخرۆشێکی برایانەی یەکسان. ئاخ، ئەگەر پاول دەسەڵاتی بەڕێوەبەریی ببوایە، دنیا دەیتوانی بەبێ ڕاک و مالەر، لەدۆخێکی چاکتردا بژیەت، بەڵام ئەو دوو ژنەنەیانهێشت بێلایەن بمێنێتەوە؛ ناچاریان کرد لەنێوان دوو جۆر مۆسیقا و دوو ژندا یەکێکیان هەڵبژێرێت و ئەو نەیدەزانی چی بکات، چونکەهەر دوو ژنەکەی بەقەد یەک خۆشدەویست.

ئەو دوو ژنەڕقیان لە یەکتر بوو. بریژیت بەخەمێکی گرانەوەسەیری ئەو پیانۆ سپییەی دەکرد کەساڵەهای ساڵ هیچ کەڵکێکی نەبوو، جگەلەوەی کەبیکەن بەڕەفە. ئەو پیانۆیە ئەگنیسی وەبیر دەهێنایەوەکەلەخوشەویستیی خوشکەکەی، داوای لێ دەکرد فێری پیانۆژەنین ببێت. کەئەگنێس مرد پیانۆکەژیایەوەو هەموو ڕۆژێک دەنگی بەرزدەبووەوە. بریژیت هیواداربوو مۆسیقای تووڕەی ڕاک تۆڵەی دایکەخەیانەتلێکراوەکەی بستێنێتەوە و ئەو ژنەلە ماڵەکەی وەدەربنێت. ئەو کاتێک زانیی لاورا دەمێنێتەوە، بۆخۆی ماڵەکەی جێهێشت. لەوەدوا ئیتر کەس گوێی لەمۆسیقای

ڕۆک نەبوو. قەوانەکان لەسەر گرامافۆنەکەدەسووڕان و دەنگی کەڕەناکانی مالەر بەناو ماڵەکەدا بڵاودەبووەوەو دڵی پاولی، کە هێشتا لەبیری کچەکەیدا بوو، دەسووتاند. لاورا لەپاول نزیک بووەوە، بەهەردوو دەست سەری گرت و لەچاوەکانی وردبووەوە. ئەوسا گوتی:

«حەزم دەکرد منداڵێکم لێت ببوایە».

هەردووکیان دەیانزانی کەلەمێژبوو پزیشکەکان هەڕەشەی ئەوەیان لێ کردبوو کەنابێ منداڵی ببێت، بۆیەئاوا درێژەی بەقسەکانی دا:

«ئامادەم چی پێویست بێت، بیکەم».

هاوین بوو. لاورا فرۆشگەکەی داخست و دووبەدوو بۆ سەیرانێکی دوو حەفتەیی بەرەو کەناری دەریا چوون. شەپۆلەکان خۆیان بەڕۆخەکەدا دەکوتا و دەنگیان لەسنگی پاولدا کۆدەبووەوە. مۆسیقای ئەم دیاردەسروشتییەتاکە دەنگێک بوو کەحەزی لێ دەکرد و دەیهێنایەجۆشوخرۆش. ئەو بەسەرسووڕمانێکی خۆشەوەزانیی لاوراش لەگەڵ ئەم مۆسیقایەدا تێکەڵ دەبێت. لەژیانیدا ئەو تاکەژنێک بوو کەلە دەریا دەچوو، تاکەژنێک کەبۆخۆی دەریا بوو.

## ١٤

ڕۆمەن ڕۆلان کەلەدادگای ئەبەدی، دژ بەگۆتە بۆخۆی شایەتی تۆمەتەکەبوو، دوو خەسڵەتی دیاری هەبوو: هەڵوێستی ستایشکارانەی بەرامبەر بەژنان (لەبارەی بێتیناوەنووسیی: ئەو ژن بوو، هەر ئەوەبەسەبۆ ئەوەی کەخۆشمان بوێت) و حەز و ئارەزووی هاوڕێیی لەگەڵ پێشکەوتن (کە مەبەستی شۆڕش و ڕووسیای کۆمۆنیستی بوو). زۆر سەیرەکە ئەم پەسنبێژەی ژنان، هاوکات ستایشی بیتهۆڤنیشی دەکرد کەئامادەنەبوو سڵاو لە ژنان بکات، چونکەڕووداوی ئاوەکانزاییەکەی "تەپلینز"، ئەگەر باش تێگەیشتبێتین، هەمووی لەم بارەوەیە: بیتهۆڤن لەکاتێکدا کڵاوەکەی بۆ ناوچاوانی داخزاندووەو دەستی خستووەتەپشتی، بەرەو شاژن و هاوڕێکانی کەژن و پیاوی بەڕێزن، هەنگاوی هەڵێناوەتەوە. ئەو ئەگەر سڵاوی لێ نەکردبێتن پیاوێکی بە هەموو مانا بێئەدەب بووە! بەڵام ناکرێت بڕوا بەشتی وا بکەین: بیتهۆڤن ڕەنگە پیاوێکی سەیر و مۆن بووبێت، بەڵام هەرگیز لەئاست ژناندا بێئەدەب نەبووە! دیارەهەموو ئەم چیرۆکەبێمانایە و تەنیا لەبەر ئەوەی کەخەڵک (و بەداخەوەڕۆماننووسێکیش) هەستی واقیعبینییان نەماوە، وەرگیراوەو دووپات کراوەتەوە.

ئێوەگلەیی لەوەدەکەن کەلێکۆڵینەوەلەڕاست و درۆی چیرۆکێک کە بێگومان بۆ شایەتیدان نییەبەڵکو مەبەستێکی خوازەیی لەپشتە، کارێکی هەڵەیە. چاکە، کەواتەبا وەک حەقایەتێکی خوازەیی لێی

بکۆڵینەوە. با واز لەسەرچاوەکەی بهێنین (چونکەهەرگیز پەی پی نابەین) و گوێ بەو مانایانەنەدەین کە خەڵک دەیانەوێت بەسەر کەسێک، یان شتێکدا بیسەپێنن، با هەوڵ بدەین پەی بەمانا دیار و بەرهەستەکەی ببەین:

کڵاوێک کەتا ناوچاوانی بیتهۆڤن داخرابێت مانای چییە؟ ئایا مانای ئەوەیەکە بیتهۆڤن دەسەڵاتی خانەدانەکانی وەک شتێکی دواکەوتووانەو ستەمکارانەڕەت دەکردەوە و کڵاو لەسەر هەڵگرتنەکەی گۆتەی بەبەرگریکردن لەواقیعی ئەو سەردەمەی جیهان دەزانی؟ ئەرێ، ئەمەئەو لێکدانەوەیەکەهەموو کەس بەدڵییەتی، بەڵام لێکدانەوەیەکی هەڵەیە. هەروا کە گۆتەناچاربوو شێوازێکی ژیان بۆ خۆی و بەهرەکەی هەڵبژێرێت، بیتهۆڤنیش لەسەردەمی خۆیدا ناچاربوو ئەو کارەبکات، بۆیەسۆناتاکانی پێشکەش بەشازادەکان دەکرد و تەنانەت بۆ ساتێکیش لەوەدوودڵ نەبوو کەبەشانازی براوەکانی شەڕ، کەلەپاش تێکشکانی ناپلیۆن لەڤیەنا کۆبوونەوە، "کانتاتا"یەک بنووسێت کەلەوێدا "کۆرسئەم" شێعرەبخوێنێت: «خۆزگەجیهان جارێکیتر وەک جارانی لێبێتەوە!». ئەو تەنانەت لەم بارەوەئەوەندە پێی لێ ڕاکێشا کە "پۆلۆنایز"ێکیشی بۆ ئیمپراتریسی ڕووسیا نووسی، کەدەتگوت بەشێوازێکی سەمبولیکی، پۆڵەندای داماوی (ئەو پۆڵەندایە کەسی ساڵ دواتر بێتینا زۆر ئازایانەپشتگیری لێ کرد) لە بەر پێی داگیرکەرەکەیدا خستووەتەسەرچۆک.

هەرچۆنێک بێت، ئەم حەقایەتە خوازەییەبەشێوەیەک بیتهۆڤن پیشان دەدات کەبێ ئەوەکڵاوەکەی لەسەر هەڵبگرێت، بەخێرایی لەبەرامبەر دەستەیەک خانەداندا تێدەپەڕێ و ئەم کارەشی بەو مانایەنییەکەخانەدانەکان جەماعەتێکی دواکەوتووی سووک و ترۆن

و ئەویش پیاوێکی شۆڕشگێڕە کەدەبێ شانازیی پێوەبکەین، بەڵکو بەو مانایەیەکەکەسانی داهێنەر (داهێنەری پەیکەر و شێعر و سەمفۆنیا) لەو کەسانەکەئەمر بەسەر (خزمەتکار و فەرمانبەر و هەموو خەڵکی دنیادا) دەکەن، زیاتر شایانی ڕێز و حورمەتن. بەو مانایەیەکەداهێنان، لە دەسەڵات و هونەر، لەسیاسەت گەورەترە. ئەوەی کەنەمرەبەرهەمەهونەرییەکانە، نەوەک شەڕەکان، یان ئاهەنگی سەمای خانەدانەکان.

(لەڕاستیدا دەبێ گوتەش بۆچوونێکی ئاوای بووبێت، جگە لەوەی کەپێی وابوو ئاشکراکردنی ئەم واقیعەناخۆشەبۆ ئاغاکانی دنیا کەهێشتا زیندوون، کارێکی بێسوودە. ئەو دڵنیابوو کەلە ئەبەدییەتدا ئاغاکانی ئەوسای دنیا بەر لەهەموو کەس لە ئاستیدا سەر دادەنەوێنن و لەوەزیاتریشی نەدەویست).

ئەم حەقایەتەخوازەییەگەلێک ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام خەڵک بەخراپ لێکیان داوەتەوە. ئەوانەی کەلەم وێنەخوازەییەورد دەبنەوەو خێرا مەدحی بیتهۆڤن دەکەن، بەرەهایی لەلووتبەرزییەکەی ئەو ناگەن، ئەوانەزیاتر ئەو کەسانەن کەسیاسەت کوێری کردوون، کە بۆخۆیان لێنین و گیڤارا و کەنەدی و میتران، لە فیلینی و پیکاسۆ بەگرینگتر و گەورەتر دەزانن. بێگومان ئەگەر ڕۆمەن ڕۆلان لەڕێگەیەک لە "تەپلیتز" بەرەوڕووی ستالین بوایەتەوە، لەگۆتەزیاتر دەنەوییەوە.

# ١٥

من ئەم بابەتی ڕێزگرتنەی ڕۆمەن ڕۆلان لەژنانم بە لاوەسەیرە. ئەو تەنیا لەبەر ئەوەی کەبێتینا ژن بوو، ستایشی دەکرد. (ئەو ژن بوو، هەر ئەوەش بەسەبۆ ئەوەی کەخۆشمان بوێت)، بەلام ستایشی کریستیانی نەدەکرد کەبێگومان ئەویش ژن بوو. ئەو بێتینای بە«شێت و عاقڵ» (folk etsage)، «ئێجگار شاد و ئێجگار زیندوو»، خاوەنی دڵێکی «ناسک و شێت» دەزانی و لەزۆر شوێنی دیکەش بەشێت وەسفی دەکرد. ئێمەدەزانین بۆ مرۆڤی هەستۆک، وشەی «شێت» و «شێتانە» و «مرۆڤی شێت» (کەلە زمانی فەڕەنسیدا زۆر شاعیرانەترن تا لەزمانەکانی تر: (fou, folle, folie) بۆ دەربڕینی هەڵچوونی هەستێکەکەمل بەکۆتوبەندی سانسۆڕ نادات (ئەلوار پێی دەڵێ: وڕێنەکاریگەرەکانی عەشق) و بەپەسن و ستایشێکی ناسک و خۆشەوە بە زماندا دێن. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم پەسنبێژ و ستایشکەرەی ژن و پڕۆلیتاریا، بە پێچەوانەی ڕێوڕەسمی جوامێری، بەبێ پێوەلکاندنی هەندێک سفەتی وەک حەسوود، قەڵەو، سوور و زەبەلاح و قیرسیچمە، هەرگیز ناوی کریستیانی بە زماندا نەهاتووەو نەینووسیوە.

سەیرەکە ئەم دۆستەی ژنان و پڕۆلیتاریا، ئەم مزگێنیدەرەی یەکسانی و برایەتی، بە لایەوەگرینگ نەبووە کەئەو ژنەپێشتر کرێکار بووە و بەو شێوەکەلەگەڵ گۆتەدا ژیاوە، سەرەتا وەک دۆست و پاشان بە ئاشکرا وەک هاوسەر، بوێرییەکی زۆری نواندووە. گۆتە

ناچاربوو له لایەکەوەبەرەورووی بۆڵەبۆڵ و چپەچپی بێبنەمای خەڵکی ناو هۆڵەکانی وایمار ببێتەوە، له لایەکی دیکەشەوەگوێی لەسەرزەنشتی هاوڕێ ڕۆشنبیرەکانی وەک "هێردەر" و "شیلەر" بێت کە بەلووتبەرزییەوەهەڵسوکەوتیان لەگەڵ کریستیان دەکرد. من ئەوەم بە لاوەسەیر نییەکەخانەدانەکانی وایمار ئەو قسەی "بێتینا"یان پێ خۆش بووبێت کەبە کریستیانی گوتبوو "کێوەگۆشت"، بەلام ئەوەم بە لاوەسەیرەکەئەو هاوڕێی ژن و چینی کرێکارەش ئەوەی پێ خوش بووبێت. بۆچی دەبێ کەسێکی گەنجی خانەدان کەلەباری فەرهەنگییەوەخۆی بەگەورەتر لەو ژنەسادەدەزانی، ئەوەندەلەڕۆمەن ڕۆلان نزیک بووبێت؟ یان بۆچی دەبێ کریستیان کەحەزی لەسەما و خواردنەوەبوو، گرینگی بەلەشی خۆی نەدەدا و پێی خۆش بوو کەقەڵەو بووبوو، هەرگیز سیفەتی ئاسمانیی "شێت"ی پێ نەدرێت و هاوڕێکەی پرولتاریا وەک کەسێکی "قیرسیچمە" دیتبێتی؟

بۆچی هاوڕێکەی پرولیتاریا هەرگیز بەبیریدا نەهاتووە کەوەک تەمسیلێکی خوازەیی سەیری ئەو ڕووداوەبکات، کەژنێکی سادەی ڕەشۆکی ڕۆشنبیرێکی گەنجی لووتبەرزی سزا داوە و گۆتەش وێڕای لایەنگری له هاوسەرەکەی، بە سەربەرزی (ئەڵبەت سەرێکی بێ کڵاو) لەئاست خێڵی خانەدانەکان و نرخاندنی بێشەرمانەی پێشوەختیان، بەرەو پێش هەنگاوی ناوە؟

ئەڵبەت ئەم چیرۆکەخوازەییەش بەقەد چیرۆکەخوازەییەکەی پێشوو گەوجانەیە، بەلام هێشتا پرسیارێک ماوە: بۆچی هاوڕێکەی ژنان و پرۆلیتاریا، ئەم چیرۆکەخوازەییەهەڵدەبژێرێت نەک شتێکی دیکە؟ بۆچی ڕۆمەن ڕۆلان بێتینا بە چاکتر دەزانێت نەک کریستیان؟ ئەمەکرۆکیی باسەکەیە.

بەشی دواتر وەلامی ئەم پرسیارانەدەداتەوە:

## ١٦

گۆته(لەیەکێک لەنامەبیبەروارەکانیدا) هانی بێتینا دەدا تا «لەو بەرگەی خۆی بێتەدەر». لەئێستادا ئێمەدەڵێین کەگۆتەلەبەر خۆپەرستی سەرکۆنەی بێتینای کرد، بەڵام ئایا کارێکی چاکی کرد؟ کێ لەپێناوی شۆڕشگێڕەکانی "تیرولی" لەشاخ، لەپێناوی ناو و ناوبانگی شاندر پتۆفی شاعیر لەپاش مردنی، یان لەپێناوی ژیانی "میبەرۆسلاڤیسکی" شەڕی کرد؟ گۆتەیان بێتینا؟ کێ هەمیشەلەبیری ئەوانی دیکەدا بوو؟ کێ بەردەوام ئامادەی لەخۆبوردن بوو؟

بێگومان بێتینا بوو، بەڵام وێڕای ئەمانەش، ئەم قسانەهیچ لەبەها و ئیعتوباری سەرزەنشتەکەی گۆته کەم ناکەنەوە؛ چونکەبێتینا هەرگیز لەو بەرگەی خۆی نەهاتەدەر؛ بۆ هەرکوێیەک دەچوو، خودی خۆی وەک ئاڵایەک بەدوایەوەدەشەکایەوە. ئەوەی کەهانی دەدا لە پێناوی شۆڕشگێڕانی "تیرولی" بجەنگێت، خودی شۆڕشگێڕەکان نەبوون، بەڵکو وێنەی دڵڕفێنی بێتینا بوو کە بۆ شۆڕشگێڕەکان دەجەنگی. ئەوەی کەهانی دەدا گۆتەی خۆش بوێت، گۆتە نەبوو، بەڵکو وێنەی دەسخەرۆکەری بێتینای منداڵ و شەیدای شاعیری مەزن بوو.

با ئەو جووڵەی وە بیر خۆمان بهێنینەوەکەمن بە نیشانەی ئارەزووی نەمریم دانا. سەرەتا بێتینا سەرەقامکەکانی لەسەر

خاڵێکی نێوان جووت مەمکی دانا، دەتگوت دەیەوێت ئەو ناوەندەپیشان بدات کەبەخود ناسراوە. پاشان قۆڵی لێک بڵاوکردەوە، دەتگوت دەیەوێت ئەو خودەبۆ شوێنێکی دوور، بۆ ئاسۆ، بۆ ئەبەدییەت، بنێرێت. جووڵەی ئارەزووی نەمری لەفەزادا تەنیا دوو خاڵی ڕێنوێن دەناسێت: خود لێرە و ئاسۆش لەوێ لەو دوورانە. تەنیا دوو چەمک: ڕەها واتە خود و ڕەها واتەجیهان: ئەو جووڵەهیچ پەیوەندییەکی بەعەشقەوەنییە، چونکەئەوی دیکە، هەر کەسێک کەلەنێوان ئەم دوو جەمسەرەی (خود و جیهان)دا بێت، پێشوەخت وەلا نراوە، لەیارییەکەسڕدراوەتەوەو پشتگوێ خراوە.

گەنجێکی بیست ساڵەکەدەچێتەڕیزی حیزبی کۆمۆنیستەوە، یان تفەنگێک هەڵدەگرێت و شانبەشانی پێشمەرگە لەشاخ دەجەنگێت، شەیدا و دەسخەڕۆی وێنەی شۆڕشگێڕانەی خۆیەتی کەلە خەڵکی دیکەی جیادەکاتەوە و بەو کارەش دەبێت بەخودی خۆی. سەرچاوەی خەباتەکەی عەشقێکی ناخۆش و قێزەونەبەرامبەر بەخودی خۆی، خودێک کە بەتەمایەبەهەندێک سفەتی شاز و تایبەت بەرجەستەی بکاتەوە و پاشان بەجووڵەیەک بەنیشانەی ئارەزووی نەمری (کە پێشتر بۆم باس کردوون) لە پێشچاوی هەزاران هەزار کەسدا بەرەو مەیدانی گەورەی نەمری بەڕێی بکات. ئێمەبەنموونەکانی وەک 'میشیکین' و 'ئاستازیا فیلیپوونا'دا لەوەدەگەین کەدیدێکی ئاوا قووڵ دەتوانێت ببێتەهۆی ماسین و گەورەتربوونی ڕۆحێک، تا لەئەنجامدا وەک پاپۆڕێکی جوان و نوورانی بەرەو ئاسمان هەڵبکشێت.

ئەوەی کەخەڵک هان دەدا تا مستیان هەڵبڕن، چەک هەڵبگرن و لەپێناوی ئایدیالی دادخوازانەو نادادپەروەرانەی خۆیاندا خەبات بکەن، عەقڵ نییە، بەڵکو ڕۆحێکی گەورەبووە. ئەمەسووتەمەنییەکەکەبەبێ ئەو، ماتۆڕی مێژوو ڕادەوەستێت و ئەوروپا لەسەر شیناوەرد بە قەفاوەڕادەکشێت و سەیری ئەو هەورانە دەکات کەبە ئاسماندا تێدەپەڕن.

کریستیان ئازاری گەورەبوونی ڕۆحیی نەبوو، نەیدەویست لەمەیدانی گەورەی مێژوودا دەربکەوێت. پێم وا بێت ئەوەی پێ خۆشتر بوو کەبە قەفاوەلەناو شیناوەردێک ڕاکشێت و سەیری تێپەڕینی هەورەکان بەئاسماندا بکات (من تەنانەت پێم وایەئەو لەکاتێکی ئاوادا دەرکی بەشادی دەکرد، واتەبەشتێک کەخەڵکی ڕۆحزل لێی بێزارن، چونکەئەو خەڵکانەلەئاگری خودی خۆیاندا دەسووتێن و هەرگیز شاد نیین) بەم شێوەڕۆمەن ڕۆلان، هاوڕێی پێشکەوتن و فرمێسک، کاتێک ناچاربوو لەنێوان ئەو و بێتینادا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بۆ ساتێکیش دوودڵ نەبوو.

# ١٧

هەمینگوای کەلەو دنیایەی دیکەبەجادەیەکدا دادەگەڕا، چاوی بەپیاوێکی گەنج کەوت کەلە دوورەوەبەرەوپیری دەهات؛ گەنجێکی قیتوقنج کە بەسەلیقەوەجلی لە بەر کردبوو. بەنزیکبوونەوەی ئەو گەنجەتەڕپۆشە، هەمینگوای بزەیەکی سووک و بەحاستەمی لەڕوومەتیدا دی. کاتێک چەند هەنگاو لێک دوور کەوتنەوە، پیاوەگەنجەکە، کە پێدەچوو بەتەمابێت بۆ ناساندنی خۆی بەهەمینگوای دوادەرفەتی پێ ببەخشێت، هەنگاوی شل کرد. هەمینگوای بەسەرسووڕمانەوەهاواری کرد:

«یوهان!»

گۆتەبەخۆشییەوەپێکەنی. شانازیی بە خۆیەوەدەکرد کە توانیبووی کاریگەرییەکی ئاوا دراماتیکی لەسەر دابنێت. ئەوەشمان لە بیر نەچێت کەئەو ماوەیەکی زۆر لەبواری دەرهێنانی شانۆدا کاری کردبوو، وەک شۆمەنیش بەبەهرەبوو. پاشان گۆتەقۆڵی هاوڕێکەی گرت و بۆ گەشتێک لەگەڵ خۆی بردی (سەیرە، ئەو ئەگەرچی ئێستا لە هەمینگوای گەنجتر بووبوو، بەڵام وەک کەسانی بەتەمەنتر، بەسەبر و تاقەتەوەهەڵسوکەوتی دەکرد). هەمینگوای گوتی:

«یوهان، ئەمڕۆ تۆ لە خواوەندێک دەچی».

ئەو بیچمە جوانەی هاوڕێکەی لەدڵەوەخۆشحاڵی کردبوو، بەپێکەنینەوەگوتی: «نەعلەکانت لە کوێ داناوە؟ سەیوانەسەوزەکەی بەرچاوت لەکوێیە؟» پاشان کەوازی لەپێکەنینەکەی هێنا، «وا چاک

بوو هەر بەم شێوەی ئێستاتەوەبچوویتایەتەبەردەمی دادگای ئەبەدی، تا بەجوانیی خۆت، نەک بە قسەوباس و بەڵگاندن، دادوەرەکان سەرکوت بکەیت!»

«تۆ دەزانی من لەو دادگایە بۆئەوەی سووکایەتییان پێ بکەم، تەنانەت یەک وشەشم نەگوت، بەڵام نەمتوانی بەر بەخۆم بگرم و نەچم، ویستم بچم و سەیری ڕەوتی کارەکان بکەم. ئێستاش لەچوونەکەم پەشیمانم».

«تۆ چیت دەوێ؟ تۆ بەتاوانی کتێبنووسین حوکمی نەمریت بۆ دەرچووە. بۆخۆت ئەوەت پێ گوتم».

گۆتەشانی هەڵتەکاند و بەلووتبەرزییەکەوە گوتی:

«ڕەنگەبەمانایەک کتێبەکانمان نەمر بن، ڕەنگە».

ئەوسا پاش کەمێک بەئارامی درێژەی پێ دا:

«بەڵام بۆ خۆمان نەمر نیین».

هەمینگوای بەتوندی بەرپەرچی قسەکەی دایەوە:

«تەواو بەپێچەوانەوە. ڕەنگەتا ماوەیەکی دیکەکەس کتێبەکانمان نەخوێنێتەوە. تەنیا شتێک کەلە "فاوست"ەکەی تۆ دەمێنێتەوەهەر ئەو ئۆپەرێتەگەوجانەی گۆنۆدەو ڕەنگەئەو دێڕەش کە دەڵێی ژنان بۆ هەتاهەتایەبەملاولادا ڕاماندەکێشن...»

گۆتەدێرەشێعرەکەدەڵێتەوە:

«Das Ewt0weibliche zieht uns hinan»

«ڕاستە، بەڵام تا خەڵک پەی بەهەموو وردەکارییەکانی ژیانت نەبەن، وازت لێ ناهێنن».

«ئێرنست، هێشتا نەتزانیوەکەئەوان باسی کەسایەتییەک دەکەن کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوەنییە؟»

«یوهان، مەڵێ کەتۆ هیچ پەیوەندییەکت بەو گۆتەیەوەنییەکەئەوان شتی لەسەر دەنووسن و باسی دەکەن. ڕاستەکەئەو وێنەکەلەپاش تۆ بەجێ ماوەزۆر لەخۆت ناچێت. دەزانم ئەو وێنەتا ڕادەیەک تۆ دەگۆڕێت. بەڵام هێشتا تۆ لەو وێنەدایت».

گۆتەگوتی: «نا، نیم. با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم. من تەنانەت لەکتێبەکانیشمدا نیم. کەسێک کەنەمابێت ناتوانێ لە هیچ شتێکدا ببێت».

«ئەمەبۆ من زۆر فەلسەفییە».

«بۆ ساتێک لە بیر خۆتی ببەرەوەکەخەڵکی ئەمەریکایت و مێشکت بخەرە کار. کەسێک کەبوونی نەبێت ناتوانێت ئامادەبێت. ئایا ئەمەقسەیەکی زۆر ئاڵوزە؟ ئەو ساتەکەمن مردم، بەتەواوی لەهەموو شوێنێک سڕدرامەوە. من تەنانەت لەکتێبەکانیشمدا نامێنم. ئەو کتێبانەبەبێ من لە دنیادا ماون. هەرگیز کەس لەو کتێبانەدا من نابینێتەوە، چونکەتۆ ناتوانی کەسێک ببینیتەوەکە نەماوە».

هەمینگوای گوتی: «حەزم دەکرد قسەکەت بۆ بسەلمێنم، بەڵام ئەوەم بۆ شی بکەرەوە: ئەگەر ئەو وێنەکەتۆ لەپاش خۆت جێتهێشتووەهیچ پەیوەندییەکی بەتۆوەنییە، ئەی بۆچی کاتێک زیندوو بوویت ئەوەندەهۆشت لەلای بوو؟ بۆچی دەعوەتی "ئەکێرمان"ت کرد کەبێت بۆ لات؟ بۆچی "شێعر و ڕاستیت" نووسی؟»

«ئێرنست، دڵنیابەکەمنیش بەقەدەر تۆ گەوج بووم. ئەوەکە مرۆڤ حەز لەوێنەی خۆی دەکات، بێعەقڵییەکی کوشندەیە. زۆر سەختەمرۆڤ بەنسبەت وێنەکەیەوەبێدەربەست بێت. ئەم جۆرەبێدەربەستییەلەتوانای مرۆڤدا نییە. مرۆڤ پاش مەرگی دەگاتەئەم قۆناغە. تازەئەوساکەش ئەمەبە جارێک ڕوو نادا، بەڵکو ماوەیەکی زۆر پاش مردنی ڕوو دەدا. تۆ هێشتا نەگەیشتوویتەئەو

قۆناغه. تۆ هێشتا گەورەنەبوویت، بەڵام بەو حاڵەش مردوویت... ئەریَ بەڕاست لە کەیەوەمردوویی؟»

هەمینگوای گوتی: «بیستوحەوت ساڵە».

«زۆر نییە. لانیکەم دەبێ بیست، سی ساڵی دیکە چاوەڕوان بیت تا لەوەبگەیت کەمرۆڤ نەمێنەو مل بەئەنجامەکانی ئەم تێگەیشتنەش بدەیت. زووتر لەم ماوەتێناگەیت. من بۆخۆم پێش ئەوە کەبمرم ڕامگەیاند کەلە ناخی خۆمدا هەست بەهێزێکی ئەوەندەداهێنەرانەدەکەم، کەپێناچێت بێ ئەوەی وێنەیەک لەدوای خۆم بەجێ بێڵم، بفەوتێم. بێگومان بڕواشم بەوەهەبوو کەلەو وێنەدا کەلەپاش خۆم بەجێی دێڵم، دەژیم. ئەرێ، ڕێک وەک تۆ بووم. تەنانەت لەپاش مردنیشم بۆم سەخت بوو پێی لێ بنێم کەئیتر نیم. دەزانی! حاڵەتێکی زۆر سەیرە. نەمێنی و فەوتان سەرەتاییترین ئەزموونی مرۆڤە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەرگیز نەیتوانیوەمل بەو ڕاستییەبدات و تێبگات و بەپێی ئەو تێگەشتنەی هەڵسوکەوت بکات. مرۆڤ نازانێ چۆن نەمێن بێت، کاتێکیش دەمرێت تەنانەت نازانێ چۆن مردبێت».

هەمینگوای بۆئەوەی لەقورسیی ئەو ساتەوەختەکەم بکاتەوە، لێی پرسی: «تۆ یوهان، بۆخۆت دەزانی کەدەبێ چۆن بمری. ئایا بەڕاست پێت وایە چاکترین ڕێگەی مردووبوون ئەوەیەکەکاتی خۆت بەقسەکردن لەگەڵ من بەفیڕۆ بدەیت؟»

گۆتەگوتی: «خۆتی لێگەوج مەکە، ئێرنست. بۆخۆت چاک دەزانی کە ئێمەلەم ساتەوەختەدا تووشی فانتازیای بێمانای نووسەرێکین کەئەو قسانەمان پێ دەکات، ئەگەر بەخۆمان بوایەڕەنگەهەرگیز نەمانگوتایە، بەڵام لە کۆتایی ئەم قسانەدا، ئایا ئەمڕۆ سەیری ڕواڵەتی منت کرد؟»

«بۆی مەگەر کاتێک تۆم دی، پێم نەگوتی کەلە خواوەندێک دەچی؟»

گۆتەبە دۆخێکی پڕئاووتاوەوە گوتی:

«کاتێک هەموو خەڵکی ئاڵمان بەکەسێکی دەسخەڕۆکەری دڵڕەقیان دەزانیم، ئەم بیچم و ڕواڵەتەم هەبوو».

پاشان بە خەمەوەدرێژەی پێ دا:

«دەمویست لەساڵانی داهاتووشدا تۆ ئەم وێنەی منت لە لا بێت».

هەمینگوای سەیری گۆتەی کرد و لەپڕ بە کەمێک زێدەڕۆییەوەگوتی: «ئەی تۆ یوهان، لەو کاتەوەکە مردوویت تا ئێستا چەند ساڵ ژیاوی؟»

گۆتەشڵەژا:

«سەد و پەنجاوشەش ساڵ».

«کەواتەتا ئێستاش فێر نەبوویت چۆن بمری؟»

گۆتەبزەی هاتێ: «دەزانم ئێرنست. هەڵسوکەوتم لەگەڵ قسەکانی ساتێک لەوەوپێشم جیاوازە. مافی ئەوەم بەخۆم دا کەئەم کارەمنداڵانەبکەم، چونکە ئەمڕۆ دواهەمجارەکەیەکتر دەبینین».

ئەوسا بەئارامی، وەک کەسێک کە بەتەمانەبێت ئیتر بدوێت، ئەم وشانەی بەزماندا هات:

«دەزانی، من بەم ئەنجامەکۆتاییە گەیشتووم کەدادگای ئەبەدی شتێکی قوڕە. بڕیارم داوەسوود لەمردنەکەم وەربگرم و ئەگەر بکرێت بەم وشەنەک زۆر ڕوونانەبگوترێت، بخەوم. لەشادییەلاوجوودەڕەهاکان، کەبەگوتەی دوژمنی گەورەم نوالیس، ڕەنگیان شینە، چێژ وەربگرم.

# ١

دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ چوو بۆ ژوورەکەی خۆی لەنهۆمی سەروو. یەکشەممەبوو. نەمشتەرییەکی تازە دەهات و نەکەسیش پەلەی حسێب و پارەدانی بوو. چرپا پانەکە، وەک بەیانی کەجێی هێشتبوو، هێشتا هەڵنەپەرتاوترابوو. دیمەنی چرپاکەپڕی دەکرد لەبەختەوەری: دووشەو بە تەنیا لەسەری خەوتبوو، بێجگەلە دەنگی خۆی هیچی دیکەی نەبیستبوو. بە پانایی چرپاکە، لەم سەریەوەبۆ ئەوسەری ڕادەکشا و دەخەوت. دەتگوت لەشی بەتەمایە هەموو چرپاکە، هەموو ئەو شتەکەهی خۆی و خەوتنی خۆی بوو، بگرێتەوە.

پێشتر هەموو شتەکانی کۆکردبووەوەو لە جانتایەکی خستبوون. جانتاکەبە کراوەیی لەسەر مێزەکەبوو. کتێبێکی بەرگ مەقەبای شێعری ڕیمباو لەسەر تەنوورە چیندارەکەی داندرابوو. ئەو کتێبەی بۆیەلەگەڵ خۆی هێنابوو، چونکەلەماوەی چەند حەفتەی ڕابوردوودا زۆر بیری لە پاول کردبووەوە. بەر لەوەی بریژیت لەدایک ببێت، زۆرجار لەگەڵ پاول، بە سواریی ماتۆڕسیکلێتێکی گەورەکەلەپشتییەوەدادەنیشت، بەفەڕەنسادا دەگەڕان. یادەوەریی ئەو دەمانەو ئەو ماتۆڕەسیکلێتە لەگەڵ یادەوەریەکەی لەشێعری ڕیمباو تێکەڵ دەبوو: ڕیمباو شاعیری خۆشەویستی هەردووکیان بوو.

سەیری شێعرەکانی کرد کەنیوەیانی لەبیر چووبووەوە، دەتگوت لاپەڕەلەدەفتەری کۆنی یادداشتەکانی خۆی هەڵدەداتەوە و دەیەوێ

بزانێت کەئایا ئەم یادداشتانە، کەبە تێپەڕینی زەمەن زەرد بووبوون، وەک جاران خۆش و کاریگەر و گاڵتەجاڕی ماون، یان بێمانا بوون. شێعرەکان وەک هەمیشەجوان بوون، بەلاّم سەری لەشتێک سووڕ دەما: ئەو شێعرانەهیچ پەیوەندییەکیان بەو ماتۆڕسیکلێتەوەنەبوو کەسواری دەبوون. دنیای شێعرەکانی ڕیمباو لەکەسێک کەلەسەردەمی گۆتەدا ژیابێت نزیکتر بوو تا لە بریژیت. ڕیمباو کەفەرمانی بەخەڵک دەدا بە شێوەیەکی ڕەها نوێخواز بن، بۆخۆی شاعیری سروشت و مرۆڤێکی ئاوارەبوو. شێعرەکانی کۆمەڵێک وشەیان تێدایەکەمرۆڤی مۆدێرن لەبیری کردوون و نازانێت چۆن چێژیان لێ وەربگرێت: سیسرک، نارەوەن، تەڕەتیزە، دارگوێزی هیندی، دارلیمۆ، بنچکەدڕک، بەڕوو، قەلەڕەشەجوانەکان، ڕیقنەی گەرمی کۆترخانەگەورەکان، لەهەموو ئەمانەش گرینگتر ڕێگەکان، ڕێگەکان و گوزەرەکان. لەئێوارەی شینی هاوین، بە گوزەرێکدا دادەگەڕێم، گەنمەجاڕ دەمگەزێت، بەسەر گیاجاڕێکی کورتدا هەنگاو دەنێم... هیچ ناڵێم، بیر ناکەمەوە... لەو دوورانەدەسووڕێمەوە، لەو دوورانە، وەک قەرەچێک، لەگەڵ سروشت شاد و خۆشحاڵ وەک لەگەڵ ژنێک.

جانتا بچووکەکەی داخست و لە ژوورەکەڕۆشتە دەر، بەچالاکی بە پلیکانەکاندا بەرەو ڕێگەماشینی ئوتێلەکەداگەڕا، جانتاکەی لەسەر کورسیی دواوەی ئۆتۆمبێلەکەی دانا و لەپشت سوکانەکەدانیشت.

## ٢

سەعات دوو و نیو بوو، دەبوایەئێستا لەناو ڕێدا بوایە، چونکەحەزی لەلێخوڕین بەشەو نەبوو، بەڵام دڵی نەدەهات ئۆتۆمبێلەکەی هەڵکات. وەک عاشقێک کەنەیتوانیبێت هەموو قسەکانی دڵی خۆی بکات، دیمەنەکەی دەوروبەری بەری بە ڕۆشتنەکەی دەگرت. لەئۆتۆمبێلەکەدابەزی. چواردەوری کێو بوو، کێوەکانی لای چەپ ڕوون و ئاشکرا بوون و سپییەتی چاڵەبەفرەکان بەژوور سەوزایی قەدپاڵەکانەوەدەدرەوشایەوە. کێوەکانی لای ڕاست لەمژێکی زەردباودا نوقم بووبوون و وەک تاپۆیەکی لێڵ دیاربوون. ئەوێ دوو جۆرڕۆشنایی لێ بوو؛ دوو دنیای جیاواز بوو. سەری لەچەپەوەبۆ ڕاست و لەڕاستەوەبۆ چەپ دەسووڕاند، پاشان بڕیاری دا دوا هەنگاوی هەڵێنێتەوە. بە نەرمەهەورازی ڕێگەیەکدا کەبەناو گیاجاڕەکەدا بەرەو دەوەنێک هەڵدەگەڕا، سەر ڕێ کەوت.

نزیکەی بیستوپێنج ساڵ لەو دەمەتێدەپەڕی کەلەگەڵ پاول بە سواریی ماتۆڕسیکلێت هاتبوو بۆ ئالپ. پاول حەزی لەدەریا بوو، کوێستانی بە لاوەنامۆ بوو. ئەگنێس دەیویست بەرەو دنیای خۆی ڕایکێشێت، دەیویست شەیدای دیمەنی دارستان و گیاجاڕی بکات.

ئەوان ماتۆڕەکەیان لەگوێڕێگەکەڕاگرت و پاول گوتی: «گیاجاڕ مەزرای ئازارەو هیچی دیکە. هەرساتەبوونەوەرێک لەو پانتا سەوزەپڕشکۆیەدەمرێت، مێرووەکان کرمەکان دەخۆن، باڵندەکانی ئاسمان لەبۆسەی مشک، یان دەڵەکێکی سپیدان. چاوت لەو کتکەڕەشەیەکەلەناو گیاکاندا جووڵەی لەخۆی بڕیوە؟ ئەوە چاوەڕێی دەرفەتێکەتا بوونەوەرێک بکوژێت. من ڕقم لەم ڕێزگرتنەساویلکانەلە سروشتە. ئایا تۆ پێت وایەگاکێوییەک کەکەوتووەتەچنگی بەورێکەوەلەتۆ کەمتر هەست بە ترس و تۆقین دەکات؟ خەڵک پێیان وایەئاژەڵ بەقەدەر مرۆڤ بەرگەی ئازار ناگرێت، چونکەئەگەر وا بوایەتەحەمولی ئەو هوشیارییەیان نەدەبوو کەچواردەوریان بەسروشتێک تەندراوەکەهەمووی ئازارەو ئازار».

پاول خۆشحاڵ بوو کەمرۆڤ وردەوردەهەموو عەرز بەکۆنکرێت دادەپۆشێت. دەتگوت سەیری بکوژێکی دڵرەق دەکات کەخەریکن گەمارۆی دەدەن. ئەگنێس ئەوەندە پاولی دەناسی کەبۆ ئەو ڕق و قینەی لەسروشت سەرکۆنەی نەکات، بە تایبەت چونکەسەرچاوەی ئەو ڕق و قینەی، ئەگەر بکرێت بیڵێین، مرۆڤدۆستی و دادپەروەری بوو.

یان ڕەنگەبەڕاست هەوڵی ئاسایی مێردێکی حەسوود بووبێت کەبەتەمابێت ژنەکەی لەباوکی بڕفێنێت، چونکەئەوەباوکی ئەگنێس بوو کەفێری کردبوو سروشتی خۆش بوێت. ئەو چەند کیلۆمەتر لەگەڵ باوکی بەناو دارستانەکاندا دەگەڕا و چێژی لەبێدەنگیی ئەو شوێنەوەردەگرت.

جارێکیان چەند هاوڕێیەکی ئەویان بۆ گەشتوگوزار بۆ گوندەئەمەریکییەکان برد. ناوچەیەکی چڕوپڕ و لێرەوارێکی بێسنوور، کەچەند جادەی دووروودرێژی پێدا دەڕۆشت. بێدەنگیی ئەو دارستانەی، وەک هەراهەرای شاری نیۆیۆرک بە لاوەنامۆ و غەریب بوو. ئەو حەزی لە دارستانێک بوو کەڕێگەکانی ڕێچکەی بچووکیان لێ دەبووەوەو ڕێچکەکانیش گوزەری تەسک و باریک؛ پاسەوانەکانی دارستان بەم گوزەرەباریکانەدا دەڕۆشتن. بە درێژایی ئەو ڕێچکەو گوزەرانەدا نیوکەت و کورسیی لاکێشەداندرابوون کەدەتتوانی لەسەریان دابنیشی و سەیری دیمەنی لەوەڕانی مەڕ و ماڵاتەکان بکەیت. ئەوەئەورووپایە، ئەوەدڵی ئەورووپایە، ئەوەئاڵپە.

## ٣

**هەشت ڕۆژەپێڵاوەکانم بەسەر**
**بەردی ڕێگەکاندا ڕادەکێشم...**
**ڕیمباو**

ڕێگە: باریکەزەوییەکەکەهەنگاوی بەسەردا هەڵدێنینەوە. جادەلەڕێگە جیاوازە، نەوەک هەر چونکەشوێنی تێپەڕینی ئۆتۆمبێلە، بەڵکو چونکە هەر هێڵێکەو خاڵێک بە خاڵێکی دیکەوەدەبەستێتەوە. جادەلەخۆیدا هیچ مانایەکی نییە، هەموو ماناکەی لەو دوو خاڵەوەردەگرێت کەپێکیانەوەدەبەستێتەوە. ڕێگە ستایشی بەها و بایەخی شوێنە. هەموو پارچەیەکی ڕێگە خاوەنی مانایەکەو داوای ڕاوەستانمان لێ دەکات. جادەبە سەرکەوتوویەوەشوێنەکان بێنرخ دەکات، بۆیەئێستا وەک بەربەستێک لەسەر ڕێگەی جووڵەی مرۆڤ و بەفیڕۆدانی کاتەکەی لێ هاتووە.

بەرلەوەی ڕێگە و ڕێچکەکان لە دیمەنەکان بسڕدرێنەوە، لەڕۆحی مرۆڤ سڕدرابوونەوە. ئیتر مرۆڤ نەیویست بەڕێگەدا بڕوات، نەیویست بە پێی خۆی بەڕێگەدا بڕوات و چێژ وەربگرێت. لەوەش گرینگتر، مرۆڤ ئیتر ژیانی خۆی نەوەک ڕێگە، بەڵکو وەک جادەیەک دەدی: هێڵێک کەلەخاڵێکەوەبۆ خاڵێکی دیکەی دەبات، لە عەمیدییەوەبۆ سەرلەشکری، لە دەوری هاوسەرەییەوەبۆ بێوەژنی،

یان بێوەپیاوی. کات بوو بەلەمپەرێکی ژیان، بوو بەکۆسپێک کەدەبوو خێرا لێی تێپەڕێت.

ڕێگە و جادە: ئەمانەدوو چەمکی جیاوازی جوانین. کاتێک پاول بەشوێنێکی تایبەت دەڵێ دیمەنێکی جوانە، ئەمەبەو مانایەیەکەئەگەر ئۆتۆمبێلەکەت لەوێ ڕابگریت، ڕەنگەقەڵایەکی جوانی سەدەی پانزدەلەنێو باخێکدا ببینیت، یاخود چاوت بەزریبارێک بکەوێت کەقووەکان بەسەر ئاوە درەوشاوەکەیەوەمەلە دەکەن.

لە دنیای جادەکاندا دیمەنی جوان واتەدوورگەیەکی جوان کەهێڵێکی دوورودرێژ بە دوورگەی جوانی تریەوەبەستبێتەوە.

لەدنیای ڕێگە و ڕێبازەکاندا جوانی هەمیشەییەو بەردەوام لەگۆڕاندایە؛ لەهەموو هەنگاوێکدا پێمان دەڵێ: «ڕاوەستە!»

دنیای ڕێگەکان دنیای باوکەکان بوو. دنیای جادەکان دنیای مێردەکان بوو. چیرۆکی ئەگنێس وەک بازنەیەک دادەخرێت: لەدنیای ڕێگەکانەوەبۆ دنیای جادەکان و ئێستاش دیسان دەگەڕێتەوە. ئەگنێس دەیەوێت نیشتەجێی سویس بێت. ئەو پێشتر ئەم بڕیارەی داوە، بۆیەلەم دوو حەفتەی ڕابوردووەدا ئاوا شێتانەو بەردەوام هەستی بەخۆشی کردووە.

## ٤

کاتێک ئەگنێس گەڕایەوەبۆ لای ئۆتۆمبێلەکەی زۆر لەنیوەڕو تێپەڕیبوو، ڕێک لەو کاتەدا کەکلیلی خستەنێو قوفڵی دەرکەی ئۆتۆمبێلەکە، پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس بەجلی مەلەوەلە جەکووزییەکەنزیک بووەوە. من پێشتر لەو شوێنەچاوەڕێی بووم. ئەو لەناو ئاوی گەرمی جەکوزییەکەدانیشتبوو، گەڕیانی ئاوەکەلەژێرەوەبەتوندی لەلەشی دەدرا.

بڕوانەچۆن ڕووداوەکان هاوزەمەنن: کاتێک لەشوێنی «ی»، شتێک ڕوودەدا، لەشوێنی «ا»، «ب»، «پ»، «ت» و«ج»ێش شتی دیکەڕوودەدا. ڕستەی «هەر لەو کاتەدا کە...» ڕستەی سیحراویی هەموو ڕۆمانێکە. ڕستەیەکەلەکاتی خوێندنەوەی سی تفەنگچیدا سیحرمان دەکات؛ ئەوە ڕۆمانی خۆشەویستیی پرۆفیسۆر ئاڤەناریوسە، کە من لەبری سڵاو و چاکوخۆشی پێمگوت: «هەر لەو کاتەدا کەتۆ چوویتەناو مەلەوانگەکە، ژنەپاڵەوانی چیرۆکەکەی منیش ئۆتۆمبێلەکەی هەڵکرد تا بەرەو پاریس بچێت.»

«ڕێکەوتێکی سەیرە.»

پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس کەدیاربوو خۆشحاڵە، ئەمەی گوت و چووەناو ئاوەکەوە.

«ئەڵبەت لەهەر ساتەوەختێکدا ملوێنان ڕێکەوتی ئاوا لە دنیادا ڕوودەدات. حەزدەکەم کتێبێکی گەورە بنووسم: تیۆری ڕێکەوت. بەشی یەکەم: ئەوەڕێکەوتەکەحوکم بەسەر ڕووداوەهاوزەمەنەکاندا

دەکات. پۆلێنی جۆرەجیاوازەکانی ڕووداوەهاوزەمەنەکان. بۆ نموونە: «لەو کاتەدا کە پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس پێی خستەناو جەکووزییەکەو هەستی بەگەڕیانی ئاوی گەرم لەسەر پشتی خۆی کرد، لەباخێکی گشتیی شاری شیکاگۆش گەڵایەکی زەرد لە دارگوێزێکی هێندی بەربووەوە.» ئەمەڕێکەوتە، بەڵام بێمانایە. من لەپۆلینەکەی خۆمدا ئەمەبەڕێکەوتی خامۆش ناودێر دەکەم، بەڵام بیهێنەپێشچاوی خۆتان: «لەو کاتەدا کەلەشیکاگۆ یەکەم گەڵای زەرد کەوتەخوار، پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس چووە ناو جەکووزییەکە تا پشتی بشێلێت.» بەم شێوەڕستەکەوەک ڕستەیەکی ماتەمباری لێدێت، چونکەئاوا پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس بەجارچیی خەزان دەبینین و ئەو ئاوەش کەئێستا تیایدا نوقم بووە، بە لامانەوەوەک فرمێسکی سوێری لێدێت. بەم شێوەڕێکەوت مانایەکی چاوەڕواننەکراو بەڕووداوەکەدەبەخشێت، بۆیەمن بەڕێکەوتی شاعیرانەناوی دەبەم، بەڵام دەمتوانی ئەو شتەبڵێم کەلەکاتی بینینی تۆدا گوتم. گوتم: «پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس لەو کاتەدا خۆی خستە ناو ئاوی جەکووزییەکەوەکەئەگنێس لەسویس، لەئالپ ئۆتۆمبێلەکەی هەڵکرد.» ئەڵبەت ناکرێ بەم ڕێکەوتەش بڵێین شاعیرانە، چونکەهیچ مانایەکی تایبەت بەچوونەناو ئاوەکەی تۆ نابەخشێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەم ڕێکەوتەزۆر پربەهایەو من بەفرەدەنگی ناوی دەبەم. وەک دوو نۆتەیەکەلە ئاوازێکی کورتدا تێکەڵ بەیەکتر دەبن. من لە منداڵییەوەئەوەم لەبیرە. کوڕێک گۆرانییەکی دەخوێند و هاوکاتیش کوڕێکی دیکە گۆرانییەکی دیکەی دەخوێند، کەچی بەو حاڵەش پێکەوەهاواهەنگ دەبوون! لێ هێشتا جۆرێک ڕێکەوتی دیکەش هەیە: «پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس لەو کاتەدا چوو بۆ میترۆی مونپارناس کەژنێکی جوان بە سندووقێکی سووری کۆکردنەوەی

یارمەتییەوەلەوێ ڕاوەستابوو.» ئەمە ڕێکەوتێکی چیرۆکسازە کەڕۆماننووسەکان زۆریان پێ خۆشە.

من لەپاش گوتنی ئەم قسانەبۆ ساتێک بێدەنگ بووم، چونکەدەمویست هانی بدەم تا بەوردی باسی ڕووداوەکەی مێترۆم بۆ بکات، بەڵام ئەو بەردەوام لەشی دەجووڵاند و پشتی بەر شەپۆلی ئاوەکەدەدا. ئەوسا وەها کە ئەم نموونەی دوایی هیچ پەیوەندییەکی بەئەوەوەنەبێت، گوتی:

«من هەست دەکەم ڕێکەوت لەژیانی مرۆڤدا بە حسێبکردنی ئەگەرەکان دیاری ناکرێت. مەبەستم ئەوەیەکەزۆرجار ڕێکەوتێکمان بۆ دێتەپێش کەڕوودانەکەی ئەوەندەچاوەڕواننەکراوەکەناتوانین لەلایەنی بیرکارییەوە پاساوی بۆ بهێنینەوە. ماوەیەک لەمەوپێش لەشەقامێکی ئاسایی لە گەڕەکێکی ئاساییدا بەڕێگەدا دەڕۆشتم کەژنێکی هامبۆرگیم بینی. ژنێک کەبیستوپێنج ساڵ لەوەوپێش هەموو ڕۆژێک دەمبینی و پاشان بەتەواوی ونم کرد. من، چونکەبەهەڵەوێستگەیەک زووتر دابەزیبووم، لەو شەقامەبووم. ئەویش بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هاتبوو بۆ پاریس و ون ببووبوو. کەواتەئەگەری دیداری ئێمەیەک لەملیارد بوو.»

«تۆ بۆ حسێبکردنی ئەگەری دیدار و چاوپێکەوتنی مرۆڤەکان سوود لە چ مێتۆدێک وەردەگری؟»

«بۆ مەگەر تۆ بەمێتۆدێکی تایبەت دەزانی؟»

بەپڕۆفیسۆر ئاڤێناریوسم گوت:

«نا، بەداخەوەنایزانم. شتێکی سەیرە. ژیانی مرۆڤ هەرگیز نەبووەتەبابەتی لێکۆڵینەوەیەکی بیرکاری. بۆ نموونەزەمەن. من حەزدەکەم لەتاقیکردنەوەیەکدا، بەسوودوەرگرتن لەو ئەلکترۆدانەکەبەسەری مرۆڤیەوەدەلکێنن، بەوردی

لەوەبکۆڵنەوەکەچەندەی ژیانی کەسێک بۆ ئێستا، چەندەی بۆ یادەوەری و چەندەی بۆ داهاتوو تەرخان دەکرێت. ئەگەر ئەوەبکرێت ئێمەتێدەگەین کەهەرکەس لەپەیوەندی لەگەڵ زەمەنی خۆی، بەڕاست کێیە. زەمەنی مرۆیی بەڕاست چییە؟ بەم شێوەئێمەدەتوانین بە سەرنجدان بەوەی کەچ جۆرەزەمەنێک لایەنی زاڵە، سێ جۆری سەرەکیی مرۆڤ دیاری بکەین، بەڵام با بگەڕێینەوەبۆ سەر بابەتی ڕێکەوت. ئێمەبەبێ لێکۆڵینەوەی بیرکاری، ناتوانین هیچ شتێکی ڕاست لەبارەی دەوری ڕێکەوت لەژیاندا بڵێین. بەداخەوەهێشتا هیچ جۆرەبیرکارییەکی وجوودی بوونی نییە.»

ئاڤەناریوس بەڕامانەوەگوتی:

«بیرکاریی وجوودی! بیرۆکەیەکی بەهێزە.»

ئەوسا درێژەی بەگوتنەکەی دا:

«هەرچۆنێک بێت، بابەتەکەیەک لە ملوێن بێت، یان یەک لەملیارد، هیچ ئەگەرێک بۆ دیدار و چاوپێکەوتنی من و ئەو ژنەنەبوو، هەر ئەم نەبوونی ئەگەرەش دیدارەکەمانی بەنرخ کرد، چونکەهەر ئەو بیرکارییەوجوودییەکەبوونی نییە، ڕەنگەپێشنیاری هاوکێشەیەکی ئاوا بکات: بەها و نرخی ڕێکەوت یەکسانەبەئاستی نامومکینبوونی بابەتەکە.»

من کە دەتگوت خەون دەبینم، گوتم:

«لەناو جەرگەی پاریسدا بینینی چاوەڕواننەکراوی ژنێکی جوان کەدەمێک ساڵەنەتبینیوە...»

«نازانم چی وای لە تۆ کرد کەپێت وابێت ئەو ژنەجوان بووە. ئەو لەبیرەفرۆشییەک، کەمن هەموو ڕۆژێک دەچووم، خزمەتکاری ژووری جلەکان بوو. ئەو لەگەڵ دەستەیەک پیرێژنی خانەنشیندا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هاتبوو بۆ پاریس. کاتێک ئێمەیەکترمان ناسییەوە،

به خەجڵانەوەسەیری یەکترمان کرد. با بڵێین بەداماوییەوە، وەک داماویی کوڕێکی بێقاچ کەلەیانسیبدا پایسکیلی بۆ دەرچووبێت. دەتگوت هەردووکمان دەمانزانی کەڕێکەوتێکی زۆر بەنرخیان بە دیاری پێداوین کەهیچ سوودێکی بۆمان نییە. دەتگوت کەسێک خەریکەپێمان پێدەکەنیت. شەرممان دەکرد سەیری چاوی یەکتر بکەین.»

من گوتم:

«دەکرێت بەم جۆرەڕێکەوتەش بڵێین ڕێکەوتی ناخۆش، بەڵام لەخۆوەهەوڵ دەدەم پۆلێنی ئەو ڕێکەوتەبکەم کەبێرنارد بێرتراند تیایدا شانازیی کەرێکی تەواوی پێبڕا.»

ئاڤەناریوس بەدەنگی بەهێزی، وەڵامی دایەوە:

«بێرنارد بێرتراند لەبەر ئەوەشانازیی کەرێکی تەواوی پێ بڕا، چونکەکەرێکی تەواو بوو. لەم بارەوەڕێکەوت هیچ دەورێکی نەبوو؛ پێویستییەکی سادەبوو. تەنانەت یاسا ئاسنینەکانی مێژووش، کەمارکس شی کردوونەتەوە، بەقەد ئەم نازناوەپێویست نەبوون.»

ئەوسا وەها کەپرسیارەکەم تووڕەی کردبێت، بەهەموو حاڵەتی هەڕەشەکاریی شاهانەیەوە، لەناو ئاوەکەهەستا. منیش هەستام. پێکەوەلە مەلەوانگەکەهاتینەدەر و چووین بۆ باڕەکە، کەلەو سەری یانەکەبوو.

# ٥

هەر یەکەمان داوای پەرداخێک شەرابمان کرد. کاتێ یەکەم قوومەمان خواردەوەئاڤەناریوس گوتی:

«دەبێ بۆت ڕوون بووبێتەوە من هەر کارێک دەکەم خەباتێکەدژ بەشەیتان.»

من وەڵامم دایەوە:

«بێگومان دەزانم. بۆیەلەتۆم پرسی مانای ئەو هێرشکردنەت بۆ سەر بێرنارد بێرتراند چی بوو؟»

ئاڤەناریوس کەپێدەچوو لەتێنگەیشتنی من لەو بابەتەکەزۆرجار بۆی باس کردبووم ماندوو بووبێت، گوتی:

«تۆ تێناگەیت. هیچ ڕێگەیەکی عاقڵانەو کاریگەر بۆ شەڕکردن دژ بەشەیتان نییە. مارکس و گشت شۆڕشگێڕەکان هەوڵیان دا، بەڵام لەئەنجامدا شەیتان توانیی دەست بەسەر هەموو ئەو ڕێکخراوانەدا بگرێت کەمەبەستی سەرەکییان فەوتاندنی خۆی بوو. هەموو ڕابوردووی شۆڕشگێڕانەم بەنائومێدی کۆتایی هات و ئێستا تەنیا یەک پرسیار مێشکی داگیر کردووم: مرۆڤ کاتێک لەوەگەیشت کەهیچ شەڕێکی ڕێکخراو و کاریگەر و عاقڵانەی دژ بەشەیتان پێناکرێت، دەبێ چی بکات؟ دیارەدوو ڕێگەی بۆ دەمێنێتەوە: یان دەبێت تەسلیم ببێت و دەست لەخودی خۆی هەڵبگرێت، یان بەردەوام لە ناخی خۆیدا پێویستبوونی شۆڕش پەروەردەبکات و جاروباریش بینوێنێت. ئەویش نەوەک لەبەر ئەوەکەدنیای پێ

بگۆڕێت، هەروا کەمارکس سەردەمێک بێهوودە،بەڵام بەرەواو دەیویست بیکات، بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوەکەفەرمانێکی ئەخلاقی لە ناخەوەهانی دەدا. ماوەیەک بوو بیرم لە تۆ دەکردەوە. تۆش وا چاکەئیتر سەرکێشیی خۆت بەنووسینی چیرۆک، کەلەدڵەوە ڕازیت ناکات، دەرنەبڕیت، بەڵکو لەبری ئەوەکارێکی پراکتیکی بکەیت. ئەمڕۆ تکات لێدەکەم شوێن من بکەوە!»

گوتم:

«هەرچۆنێک بێت، هێشتا بۆم ڕوون نەبووەتەوەکەبۆچی تەمەنایەکی دەروونیی ئەخلاقی وای لەتۆ کردووە هێرش بکەیتەسەر هەواڵنێرێکی داماوی ڕادیۆ؟ کام هۆکاری بەرهەست هانیداوی ئەوەبکەیت؟ بۆچی ئەوت وەک سەمبولی کەرییەتی هەڵبژارد، نەوەک کەسێکی دیکە؟»

ئاڤەناریوس دەنگی بەرزکردەوە:

«تۆ نابێ‌وشەی گەوجانەی "سەمبول" بەکار بێنیت. ڕێکخراوەتێرۆریستییەکان بە سەمبول بیردەکەنەوە! سیاسەتمەدارەکانیش بەو شێوەبیردەکەنەوە، بۆیە ئەمڕۆ پێیان دەڵێن تەڵەکەبازەکانی سەمبول! من وەک چۆن بە چاوی سووکەوەسەیری ئەو کەسانەدەکەم کەلە مەیدانەکاندا ئاڵا دەسووتێنن، هەرواش بەسووکایەتییەوەسەیری ئەو کەسانەدەکەم کەئاڵای نەتەوەیی بەزۆور پەنجەرەکانیانەوەهەڵدەواسن. بێرنارد بۆ من سەمبول نییە. بە لای منەوەهیچ شتێک ڕوونتر و دیارتر لەخودی ئەو نییە! هەموو بەیانییەک گوێ لەقسەکانی دەگرم! دەنگەناسک و ژنانەکەی، ئۆیین و نوکتەگەوجانەکانی تووڕەم دەکەن! قسەکانی بێزارم دەکەن! هۆکاری بەرهەست؟ نازانم هۆکاری

بەرهەست چییە! من بەپێی سەیرترین و دوژمنانەترین و بەهەوەسانەترین ئازادیی خۆم، بە"کەرێکی تەواو" ناوم برد!»

«منیش دەمویست ئەوەت لێ ببیستم. تۆ وەک خودای پێویستیت نەکرد، بەڵکو وەک خودای ڕێکەوتت کرد.»

پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس کەدەنگی بۆ دۆخی ئاسایی و هێمنی جاران گەڕابووەوە، گوتی:

«بەڕێکەوت یان بە پێویست، خۆشحاڵم کەدیسان وەک خودایەک سەیرم دەکەیت، بەڵام تێناگەم بۆچی ئەو هەڵبژاردنەی منت ئەوەندەبەلاوەسەیرە. کەسێک کەئاوا گەمژانەنوکتەبۆ بیسەرەکانی دەگێڕێتەوەو دژ بەکوشتن بەهۆی بەزەییەوەبزوتنەوەڕێکدەخات، بێگومان کەرێکی تەواوە. بە لای منەوەدەربڕینی نارەزایەتییەکی بچووکیش دژ بەکوشتن بەهۆی بەزەییەوە، کارێکی ناڕەوایە.»

کاتیک دوا ڕستەی ئاڤەناریوسم بیست، تۆقام:

«تۆ بە هەڵەبێرنارد بێرتراندت لەگەڵ بێرتراند بیرتراند لێ تێکچووە!»

«من خەریکم باسی بێرنارد بێرتراند دەکەم کەلەڕادیۆ قسەدەکات و دژ بەخۆکوشتن و بیرەدەجەنگێت!»

من دەستم بەسەرمەوەگرت:

«ئەوان دوو کەسی جیاوازن! باوک و کوڕن! بۆ دەبێ تۆ هەواڵنێرێکی ڕادیۆت لەگەڵ ئەندام پارلەمانێک لێ تێکبچێت؟ ئەو هەڵەی تۆ نموونەی ئەو شتەیەکەتۆزێک لەمەوپێش بەڕێکەوتی ناخۆش ناومان برد.»

ئاڤەناریوس بۆ ساتێک تووشی سەرسوورمان بوو، بەڵام زۆری نەخایاند کەبە خۆیدا هاتەوەو گوتی:

«بەداخەوەم کەتۆ ئاگادارییەکی تەواوت لە تیۆری ڕێکەوتەکەی خۆت نییە. هیچ شتێکی ناخۆش لەم هەڵەی مندا نییە. بەپێچەوانەوە، بەئاشکرا وەک ئەوەیەکەتۆ بە ڕێکەوتی شاعیرانەناوت برد. باوک و کوڕ بەدوو سەرەوەوەک کەرێکی تەواویان لێ هاتووە. تەنانەت لەئەفسانەکانی یۆنانیشدا ئاژەڵێکی دووسەری ئەوەندەسەیر نییە!»

شەرابەکەمان خواردەوە. چووین جلەکانمان لەبەر بکەینەوە و پاشان تەلەفۆنمان بۆ ڕیستۆرانتێک کرد کەمێزێکمان بۆ دابنێن.

## ٦

لەو کاتەدا کە پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس گۆرەوییەکانی لەپێ دەکرد، ئەگنێس ئەم ڕستەی بیرکەوتەوە: «هەموو ژنێک منداڵەکەی لەمێردەکەی بە لاوەگرینگترە.» ئەو کاتێک سیانزەساڵی تەمەن بوو، دایکی (لەهەلومەرجێکدا کە ئێستا فەرامۆشی کردبوو) بەدزییەوەئەوەی پێ گوتبوو. مانای ئەم ڕستەئەو دەمەئاشکرا دەبێت کەتۆزێک بیری لێ بکەینەوە: ئەوەی کەدەگوترێت کەسی «ئا»مان لەکەسی «ب» بە لاوەگرینگترە، بەمانای بەراوردی دوو ئاستی خۆشەویستی نییە، بەڵکو بەو مانایەیەکە کەسی «ب»مان هەر خۆش ناوێت، چونکەئەگەر کەسێکمان خۆش بوێت ناتوانین بەهیچکەسی دیکەی بەراورد بکەین. خۆشەویست بێڕکابەرە. تەنانەت ئەگەر کەسی «ئا» و کەسی «ب»یشمان خۆش بوێت، ناتوانین پێکیان بگرین، چونکەبەو بەراوردکردنە، پێشوەخت ئاشکرا دەبێت کەیەکێک لەو دوو کەسەمان خۆش ناوێت. جا ئەگەر بەخەڵک بڵێین کەیەکێک لەو دوو کەسەمان بە لاوەگرینگترە، کێشەکەهەر ئەوەنییەکەبەدەنگی بەرز خۆشەویستیمان بۆ کەسی «ئا» دەربڕیوە (مادام وا بوایە، هەر ئەوەبەس بوو کەبڵێین: من «ئا»م خۆش دەوێت)، بەڵکو ویستوومانەبەپارێزەوە، بەبێ دوودڵی ئاشکرای بکەین کەکەسی «ب»یمان خۆش ناوێت.

ئەڵبەت ئەگنێس لەو تەمەنەدا توانای ئەم شیکاریی و لێکدانەوەیەی نەبوو، بەڵام بێگومان دایکی پێی لەسەر دادەگرت. دایکی پێویستی بەوەبوو کەلە لای کەسێک باسی ئەم بابەتەبکات و لەهەمان کاتیشدا نەیدەویست ئەو کەسەبەتەواوی لەقسەکەی بگات. ئەو منداڵە، هەرچەندە هێشتا نەیدەتوانی لە هەموو شتێک بگات، کەچی بەو حاڵەش هەستی بەوەکرد قسەکەی دایکی بەقازانجی باوکی نییە. ئەگنێس باوکی خۆشدەویست و پێی خۆش نەبوو لەباوکی زیاتر گرینگیی پێ بدرێت، ئەو خەمبار بوو کەئەو کەسەوا خۆشی دەویست، بێڕێزیی پێ کرابوو.

ئەم ڕستەلەزیهنی ئەگنێسدا مایەوە. هەوڵیدا لەمێشکی خۆیدا وێنای مانای ئەو قسەبکات کەکەسێکمان لەکەسیکی دیکەزیاتر خۆش دەوێت. ئەو کچەچکۆلەلە کاتێکدا لەناو جێگەکەی ڕاکشابوو، بەتانیی تێوەپێچرابوو، بەر لەوەخەوی لێ بکەوێت ئەم دیمەنەلە پێشچاوی دەرکەوت: باوکی دەستی هەردوو کچەکەی گرتووەو هەرسێکیان بۆ ئیعدامکردن ڕاوەستاون و چاوەڕێی فەرمانی تەقەن. دایکی دەچێت بۆ لای سەرۆکی سوپای دوژمن و داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات، بەڵام سەرۆک تەنیا ئامادەیەلە دوو کەسیان خۆش ببێت. بەرلەوەسەرۆک فەرمانی تەقەبدات، دایکی هەڵدێ و کچەکان لەدەستی مێردەکەی ڕادەکێشێت و خێرا دووریان دەخاتەوە. ئەگنێس لەو کاتەدا کە دایکی ڕایدەکێشێت، ئاوڕ لەباوکی دەداتەوە؛ بەئیرادەیەکی ئەوەندەپتەوەوەئاوڕ لەباوکی دەداتەوەکەملی ژان دەکات: ئەو سەیری باوکی دەکات کەبەبێ هیچ ناڕازیبوونێک، بەدۆخێکی خەمبارانەوەلێیان وردبووەتەوە: ئەو ملی بەهەڵبژاردنی

هاوسەرەکەی داوە، چونکەدەزانێت کەعەشقی دایکانەلەعەشقی هاوسەرانەبەهێزترە و ئەو دەبێ دەست لەژیانی خۆی هەڵبگرێت.

ئەگنێس جاروبار بیری لەوەش دەکردەوەکەئەگەر سەرۆکی سوپای دوژمن تەنیا مافی ڕزگارکردنی یەک کەس لەو سێ کەسە بەدایکی بدات. دایکی بەبێ دوودڵی لاورا ڕزگار دەکات. ئەگنێس بە چاوی خەیاڵ سەیری خۆی و باوکی دەکات کەبەرامبەر بەتفەنگەکانی دوژمن ڕاوەستاون. ئەوان دەستی یەکتر دەگرن. لەو کاتەدا ئەو حەز ناکات بزانێت چی بەسەر دایک و خوشکەکەی دێت، چاو و نیگایان شوێن ناخات، بەڵام دەزانێ کەهەردووکیان خێرا دووردەکەونەوە و هیچ کامیان ئاوڕ لەدواوەنادەنەوە! ئەگنێس لەناو بەتانییەکەلەسەر چرپاکەی ڕاکشا، چاوی پڕ بوو لەفرمێسکی ئاگرین و بۆ ئەوەی کەدەستی لەناو دەستی باوکیدا بوو، لەگەڵ ئەو بوو، لەگەڵ ئەویش دەمرد، بە شێوەیەکی سەیر خۆشحاڵ بوو.

# ٧

ئەگەر ئەو دوو خوشکە ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت چاویان بەباوکیان نەکەوتبایە کەبەسەر تەبارێک وێنەی دڕاودا نەویبووەوە، ڕەنگەئەگنێس دیمەنی ئیعدامکردنەکەی فەرامۆش بکردایە. ئەو کەبینی لاورا بەسەر باوکیدا دەنەڕێنێت، بیری کەوتەوەئەمەهەر ئەو لاورایەیەکەئەو و باوکی لە کاتێکدا بەجێهێشت کەخەریکبوون ئیعدام دەکران و تەنانەت ئاوڕیشی لێ نەدانەوە. ئەگنێس کتوپڕ پەی بەوەبرد کەناکۆکییەکەی نێوانیان زۆر لەوەقوووڵترەکەپێی زانیوە، بۆیەهەرگیز باسی ئەو ناکۆکییەی نەکرد؛ دەتگوت دەترسێت ناو لەشتێک بنێت کەپێویستەهەروا بەبێ ناو بمێنێتەوە، یان شتێک بەئاگا بکاتەوەکەپێویستەهەروا بخەوێت.

ئەودەمەکاتێک خوشکی بە تووڕەیی و گریانەوەلەوێ ڕۆشت و ئەگنێس لەگەڵ باوکی بەتەنیا مایەوە، بۆ یەکەم جار لەو کەشفەسەیرەی خۆی داچڵەکی (هەمیشەئاساییترین کەشفەکان لەهەموو شتێک زیاتر داماندەچڵەکێنن) کەبۆ هەمیشەئەو خوشکەی دەبێت و هەستی بەماندووییەکی غەریب کرد. ئەو دەیتوانی هەردوو دەستی خۆی بگۆڕێت، هاوڕێکانی بگۆڕێت، ئەگەر حەز بکات لەپاولیش جودا ببێتەوە، بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی خوشکەکەی بگۆڕێت. لاورا لەژیانی ئەگنێسدا شتێکی نەگۆڕ بوو، ئەوەش بێزاری دەکرد، چونکەلە منداڵییەوەپەیوەندییەکەیان وەک هەڵاتن و

شوێنکەوتن بوو: ئەگنێس لەپێشەوەهەڵدەهات و لاوراش لە دواوەشوێنی دەکەوت.

ئەو هەندێک جار خۆی وەک شازادەخانمی ئەو حەقایەتەدەهاتەپێشچاو کەبە منداڵی بیستبووی: شازادەخانم بەسواریی ئەسپ لەبەر پیاوێکی بەدفەڕ هەڵدێت کەشوێنی کەوتووە. ئەو بڕۆسێک و شانەیەک و تەوقەسەرێکی پێیە. بڕۆسەکەبۆ پاش خۆی فڕێ دەدا و بێشەلانێک لەمابەینی خۆی و کابرا بەدفەڕەکەسەوز دەبێت. شازادەخانم بەم کارەی دەرفەتێک بۆ دەربازبوونی خۆی دەڕەخسێنێت، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت کابرای بەدفەڕ دیسان لێی نزیک دەبێتەوە. ئەو ئەمجارەشانەکەی بۆ فڕێ دەدا کەدەستبەجێ دەبێت بەکۆمەڵە شاخێکی ڕەقەن و نووکتیژ. ئەوسا کاتێک هەمدیسان ئەو کابرایەبە شوێن خۆیەوەدەبینێتەوە، تەوقەکەی فڕێ دەدا و دەبێتبەڕووبارێکی گەورە.

لەوەودوا ئەگنێس تەنیا یەک شتی بەدەستەوەمابوو: چاویلکەی ڕەش. ئەو چاویلکەکەی فڕێدایەسەر عەرز و بەپانتایەک شیشەی شکاو لەشوێنکەوتووەکەی دابڕا.

بەڵام ئێستا دەستی بەتاڵە و دەزانێت کە لاورا بەهێزترە. لاورا بەهێزترە، چونکەلاوازییەکەی خۆی کردووەبەچەک و باڵادەستییەکی ئەخلاقی: ئەو ژنێکی ستەمدیدەیە، دڵدارەکەی وازی لێ هێناوە، ئازار دەکێشێت، هەوڵی خۆکوشتنی داوە، کەچی ئەگنێس، بەو ژیانە خێزانییەخۆشەیەوە چاویلکەی خوشکەکەی فڕێ دەداتەسەر عەرز و سووکایەتیی پێ دەکات، ناهێڵێت بچێتە ماڵەکەی. ئەرێ، لەو ڕۆژەوەکەچاویلکەکەی شکاندووەنۆ مانگە یەکتریان نەبینیوە. ئەگنێس دەزانێ پاول، بێ ئەوەی باسی کردبێت، ئەمەی پێ خۆش نییە. پاول بەزەیی بەلاورادا دێت. ئەگنێس ناتوانێت خۆی لەو دۆخە

دەرباز بکات. هەست بەهەناسەی خوشکەکەی لەسەر پشتەملی خۆی دەکات و دەزانێ کەلەسەرەتای تێکشکاندایە.

هەستی ماندوویی و بێزاریی زیاتر دەبێت. ئیتر حەز ناکات هەڵبێت. خۆ ئەو بۆ کێبەرکێ نەهاتووە. خۆ ئەو هەرگیز نەیویستووەبەربەرەکانێی لاورا بکات. ئەو بۆخۆی خوشکەکەی هەڵنەبژاردووە. بەتەما نەبووەببێت بەکەسێکی نموونەیی بۆی، یان ببێت بەڕەقیب و مونافسی. بوونی خوشکێک لە ژیانیدا، وەکو شکڵی گوێچکەی بەڕێکەوت بووە. ئەو، نەخۆشکەکەی هەڵبژاردوە، نەشکڵ و شێوازی کوێچکەی؛ بەڵام بۆ هەموو ژیانی گیرۆدەی ئەم ڕێکەوتەهیچوپووچ و بێمانایەیە.

کەمنداڵ بوو، باوکی فێری شەترەنجی کرد. ئەو شەیدای جووڵەیەک بووبوو کەپێی دەڵێن قەڵاگرتن: یاریکەرەکەبەجووڵەیەک جێگۆڕکەبەدوو مۆرەدەکات. ئەو، ئەم جووڵەی پێخۆش بوو: دوژمن هەموو هەوڵی خۆی بۆ هێرش کردن بۆ سەر شا تەرخان دەکا و شا لەناکاو لە بەرچاویدا ون دەبێت؛ دوژمن پاشەکشەدەکات. ئەگنێس بەدرێژایی ژیانی، خەونی بەم جووڵەوەدەبینی و هەرچی زیاتر هەستی بەبێزاری دەکرد، زیاتریش بیری لەو خەونەی دەکردەوە.

# ٨

ئەگنیس لەو دەمەوەکەباوکی مردبوو و هەندێک پارەی لەبانکێکی سویسیدا بۆ جێهێشتبوو، ساڵی دوو سێ جار سەردانی ئالپی دەکرد و هەموو جارێک لەئوتێلێکی تایبەت دەمایەوە و هەوڵی دەدا بیهێنێتەپێشچاوی کەبۆ هەمیشەلەم بەشەی دنیا بمێنێتەوە: ئایا دەیتوانی بەبێ پاول و بریژیت بژی؟ چۆن بزانێت؟ بەو سێ ڕۆژ تەنیاییەکەلەو ئوتێلەدەمایەوە، بەو جۆرە«تەنیاییە تاقیکارییە» بە هیچی وای نەدەزانی. بەردەوام ئەم وشانە، وەک هاندەرێکی سەیر لەگوێیدا دەزرینگایەوە: «دەبڕۆ ئیترا» بەلام ئایا ئەگەر بەڕاست بڕۆشتایە، زوو پەشیمان نەدەبووەوە؟ ڕاستەبەتەنیابوونی پێ خۆش بوو، بەلام کچ و مێردەکەشی خۆشدەویست و تاسەی دەکردن. پێویستی بەوەبوو ئاگای لێیان بێت، پێویستی بەوەبوو هەواڵیان بزانێت. باشە چۆن دەیتوانی بەتەنیا بێت و هاوکاتیش ئاگای لێیان بێت؟ چۆن دەیتوانی ژیانی ڕێکبخاتەوە؟ ئایا دەبوو لەپیشەیەکی تازەبگەڕێت؟ ئەوەکارێکی دژوار بوو. ئایا نەدەبوو هیچ بکات؟ ئەرێ، ئەوەخۆش و سەرنجڕاکێش بوو. بەلام ئایا هەستی نەدەکرد کەوەک پیرێژنێکی خانەنشینی لێ هاتووە؟ ئەو، کاتێک بیری لەم هەموو شتەدەکردەوە، پلانەکەی بۆ «ڕۆشتن» لەجاران زیاتر ناواقیعی و ناچاری و ناکردەیی دەردەکەوت، لە وەهم و خەیالاتی کەسێک دەچوو کەلەدڵی خۆیدا دەیزانی بێتوانایەو دەرەقەتی کاری وا نایەت.

پاشان ڕۆژێک کتوپڕ لە دەرەوە، بەبێ هیچ چاوەڕوانییەک و بە ئاسانی، دەرفەتی چارەسەرکردنی ئەم کێشەی بۆ ڕەخسا.

خاوەنکارەکەی نووسینگەیەکی لەبێرن کردەوە و چونکەهەموو کەس دەیزانی ئەگنێس زمانی ئاڵمانیش هەر وەک فەڕەنسی دەزانێت، لێیان پرسی ئایا حەز دەکات لەوێ سەرپەرشتیی کارێکی لێکۆڵینەوەیی بکات؟ ئەوان دەیانزانی مێردی هەیەو هیوایەکی ئەوتۆیان بە وەڵامی ئەرێی نەبوو؛ بەڵام ئەو دایچڵەکاندن و خێراگوتی: «بەڵێ». بۆخۆشی لەوەڵامەکەی خۆی داچڵەکی. ئەو «بەڵێ»یەدەیسەلماند کەئاواتی ڕۆشتن بە لایەوەنمایشێکی کۆمیدی نەبووەکەبێ ئەوەبڕوای پێی بێت یاریی تێدا کردبێت، بەڵکو شتێکی ڕاستەقینەو جیدی بووە.

ئەو ئاواتەی، بەخۆشییەوەدەرفەتەکەی قۆستەوەتا لە خەونێکی ڕۆمانتیکی تێپەڕێنێت و وەک بەشێک لەشتێکی تەواو ئاسایی لێ بێت: پێشکەوتنێکی پیشەیی. ئەگنێس کاتێک ئەو پێشنیارەی وەرگرت، بۆ ئەوەکەکەس بەهۆی ڕاستەقینەی بڕیارەکەی نەزانێت، وەک هەموو ژنێکی پلەوپایەخواز جوولایەوە. لەپڕ هەموو شتێکی بۆ ڕوون بووەوە؛ ئیتر پێویست نەبوو خۆی تاقی بکاتەوەو بیر لەوەبکاتەوەکە «چی دەبوو ئەگەر تەنیا...». ئەوەی ئاواتی بۆ دەخواست لەپڕ هاتبووەسەر ڕێگەی و پێی سەیر بوو کەوەک خۆشحاڵییەکی ئاشکرا و سادەوەری دەگرت. خۆشحاڵییەکەی ئەوەندەزۆر بوو کەلە ناخی خۆیدا هەستی بەشەرم و گوناه دەکرد. ئەوەندەئازا نەبوو کەلە لای پاول باسی بڕیارەکەی بکات، بۆیەبۆ دواجار سەفەری بۆ ئالپ کرد و چوو بۆ ئوتێلەهەمیشەییەکەی. (لە سەفەرەکەی دواتریدا ئیتر لەبێرن، یان لەناوچەکوێستانییەکانی ئەو لایە، ئاپارتمانێکی بچووکی خۆی دەبێت.) ئەو بەتەما بوو لەو دوو ڕۆژەدا بیر لەوەبکاتەوەکەچۆن هەواڵەکەبە پاول و بریژیت ڕابگەیەنێت و چۆن قەناعەتیان پێ بکات کەژنێکی پلەوپایەخواز و ئازادەو تەنیا بیر لەپیشەکەی و سەرکەوتنەپیشەییەکەی دەکاتەوە، ئەویش لەکاتێکدا کەهەرگیز کەسێکی ئاوا نەبووە.

# ٩

ئێستا ئیتر هەوا تاریک بووبوو. ئەگنێس لەبەر ڕۆشنایی چرای ئۆتۆمبێلەکەی، لەسنووری وڵاتی سویس پەڕییەوەو بەجادەیەکی فەڕەنسادا ڕۆشت کەهەمیشەعەسەبیی دەکرد. شۆفیرەڕێکوپێکەسویسییەکان یاساکانی هاتوچۆیان دەپاراست؛ بەڵام شۆفیرەفەڕەنسییەکان، بەڕاوەشاندنی سەریان لەو کەسانەتووڕەدەبوون کەنەیاندەهێشت پێش ماشین و ئۆتۆمبێلەکانی دیکەبکەونەوە. فەڕەنسییەکان جادەکانیان دەکرد بەئاهەنگی خۆشیی مافی مرۆڤ.

ئەگنێس هەستی بەبرسیەتی دەکرد و لەو جادەدا لەڕیستورانت، یان موتێلێک دەگەڕا تا نانێکی لێ بخوات. سێ ماتۆڕسیکلێتی زۆر گەورەلەلای چەپیەوەتێپەڕین و دەنگەدەنگ و هەراهەرایەکی ترسناکیان نایەوە. ئەگنێس لە بەر ڕۆشنایی چرای پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەی چاوی بەلێخوڕی ماتۆرەکان کەوت. ئەوان بەو جلانەیانەوە، کەلە جلی ئاسمانپێوەکان دەچوو، وەک بوونەوەری نازەوینی و نامرۆیی دەردەکەوتن.

ڕێک لەو کاتەدا پێشخزمەتێک بەسەر مێزەکەی ئێمەدا نەویبووەوەتا قاپی بەتاڵی دەسپێکی خواردنەکانمان کۆبکاتەوە و من خەریکبووم بە ئاڤەناریوسم دەگوت:

«هەر ئەو ڕۆژەکەمن دەستم بە نووسینی بەشی سێهەمی کتێبەکەم کرد، هەواڵێکم لەڕادیۆوە بیست کەڕەنگەنەتوانم فەرامۆشی بکەم. کچێک بەشەو چووەتەسەر جادەیەک و پشتی لەو ئۆتۆمبێلانەکردووەکەبەرەوڕووی دێن و لەسەر جادەکەدانیشتووە. ئەو، لەکاتێکدا سەری خستووەتەسەر ئەژنۆی، چاوەڕێی مردن بووە. شۆفیرِی یەکەم ئۆتۆمبێل لەدواساتەکاندا لە ڕاستە ڕێگەکەلای داوەو خۆی و ژن و دوو منداڵەکەی تیاچوون. ئۆتۆمبێلی دووهەمیش کەوتووەتەنێو چاڵێکەوە. ئۆتۆمبێلی سێهەمیش هەرواتر. کچەکەهیچی لێ نەهاتووە. هەستاوەو ڕۆشتووەو هەرگیز کەس نەیزانی کێ بووە.»

ئاڤەناریوس گوتی:

«تۆ پێت وایەچی پاڵی بەو کچەوەناوە کەبەو شەوەلەو سەرجادەدابنیشێت و بەهیوا بێت ئۆتۆمبێلێک پانی بکاتەوە؟»

من گوتم:

«نازانم. بەڵام گرەو دەکەم شتێکی زۆر بچووکە، یان با بڵێم، ئەگەر لە دەرەوەسەیری بکەین بە لای ئێمەوەزۆر بچووک و گەوجانەیە.»

ئاڤەناریوس پرسی:

«بۆچی؟»

من شانم هەڵتەکاند.

«من ناتوانم هیچ هۆیەکی گرینگ بۆ ئەم خۆکوشتنەزۆر ترسناکەببینمەوە، هۆیەکی وەک نەخۆشیی بێعیلاج، یان مردنی کەسێکی زۆر نزیک. هیچکەس بۆ ئەم گرفتانە، مەرگێکی ئاوا ترسناک، کەببێتەهۆی مردنی خەڵکی دیکەش، هەڵنابژێرێت! تەنیا عەقڵێکی بێعەقڵ دەتوانێت کارەساتێکی ئەوەندەنامەنتقی بنێتەوە.

لەهەموو ئەو زمانانەدا کەلەزمانی لاتینەوەسەریان هەڵداوەوشەی«ratio, reason, ragtime‹reason» دوو مانای هەیە: یەکەم بە مانای توانای بیرکردنەوەیە و دووهەم بەمانای هۆکارە (دەلیل). کەواتە ئەم وشەبە مانای هۆکار، یان (دەلیل)، هەمیشەوەک شتێکی عاقڵانەفام دەکرێت. هۆکار، یان دەلیلێک کەعاقڵانەبوونی ئاشکرا نییە و بەڕواڵەت توانای چیکردنی مەدلوولی نییە، بەڵام لەزمانی ئاڵمانیدا بەم وشەبە مانای هۆکار دەگوترێت Grund. ئەم وشەهیچ پەیوەندییەکی بە وشەی لاتینی «ratio»وەنییەو ماناکەشی لەبنەڕەتدا «خاک»ەو دواتر مانای «بنەما» یان «زەمینە»شی وەرگرتووە. ڕەفتاری ئەو کچە کەلەسەر جادە دادەنیشێت، بەسەرنجدان بە وشەی ratio بەڕواڵەت گەوجانەو ناشایست و ناعەقڵانییە، بەڵام هۆکاری خۆی و بنەما و زەمینەی خۆی هەیە. زەمینەیەکی ئاوا لە قووڵایی ناخی هەمووماندا هەڵکۆڵدراوە، ئەمە هۆکاری سەقامگرتووی کرداری ئێمەیە، ئەمەخاکێکەکە چارەنووسی ئێمەی تێدا دەڕوێت. من هەوڵ دەدەم لەو بنەما شاراوەیەتێبگەم کەلەقووڵایی ناخی هەریەک لەکەسایەتییەکانمدایە و لە جاران زیاتر پێمل دەبم کەئەم بنەما شاراوەیەخەسڵەتێکی خوازەیی هەیە.»

ئاڤەناریوس گوتی:

«تێناگەم چی دەڵێی.»

«بەداخەوە. ئەمەگرینگترین بیرۆکەیەکەتا ئێستا بە مێشکمدا هاتووە.»

لەو کاتەدا پێشخزمەتەکەمراوییەکی برژاوی بۆ هێناین. بۆنەکەی ئەوەندەخۆش بوو کەوتووێژەکەی پێشومان لەبیر چووەوە.

لەئەنجامدا ئاڤەناریوس بێدەنگیی شکاند:

«با واز لەوەبێنین، ئێستا سەرقاڵی نووسینی چیت؟»

«نازانم چۆنت بۆ بگێڕمەوە.»

«بەداخەوە.»

«بۆ بەداخەوە! چاکتر. ئەم سەردەمەی ئێمە دەستی بەسەر هەموو نووسراوەکاندا گرتووەتا بیانکات بە فیلم و پرۆگرامی تەلەفزیۆنی، یان کارتۆن و ئەنیمەیشن. لەڕۆماندا تەنیا ئەو شتانەزاتیی و جەوهەرین کەهەر بە ڕۆمان دەگێڕدرێنەوە. هەموو ئەو شتانەکەلەڕۆمانەوەدەگوێزرێنەوەبۆ بوارەکانی دیکە، شتی ناجەوهەرین. ئەگەر کەسێک هێشتا ئەوەندەگەوج بێت کە بیەوێت ڕۆمان بنووسێت و بیشیپارێزێت، دەبێ بەشێوازێک بینووسێت کەمەجالی لێوەرگرتن و گوێزانەوەبۆ بوارەکانی دیکەی نەبێت، بەواتایەکی تر، دەبێ بەشێوازێک بینووسێت کەکەس نەتوانێت بیگێڕێتەوە.»

ئاڤەناریوس ئەم قسەی بەدڵنەبوو:

«من دەتوانم هەرکاتێک تۆ بخوازی لەسەرەتاوەتا کۆتایی، بەو پەڕی چێژ و خۆشییەوە، چیرۆکی «سێ تفەنگچی»ی ئەلکساندر دۆمات بۆ بگێڕمەوە.»

من گوتم:

«منیش دەتوانم. من ئەلکساندر دۆمام خۆشدەوێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، پێم ناخۆشەهەموو ئەو ڕۆمانانە کە تا ئێستا نووسراون زیاد لەپێویست پەیڕەوی لەیاسا و ڕێسای یەکەی کردار دەکەن. مەبەستم ئەوەیەکە لە کاکڵ و ناوکی ئەم ڕۆمانانەدا زنجیرێک کردار و ڕووداو هەیەکەپەیوەندییەکەیان لەسەر بنەمای هۆکار و ئەنجامە. ئەم ڕۆمانانەوەک شەقامێکی تەنگەبەرن کەنووسەر بەزەبری قامچی، کەسایەتییەکانی تێدا بەرەوپێش دەبات. کێشەی دراماتیکی بەڵای ڕاستەقینەی ڕۆمانە، چونکە ئەم کێشەهەموو شتێک دەگۆڕێت،

تەنانەت جوانترین لاپەڕەکانی ڕۆمانیش، سەرسووڕهێنەرترین دیمەنەکانیش بەسەر چەند قۆناغێکی سادەدا دابەش دەبن و بەرەو ئەنجامێکی کۆتایی دەڕۆن. لەم ئەنجامەکۆتاییەدا مانای هەموو ئەو شتانەکەپێشتر باسکراون، کۆدەبنەوە. ڕۆمان لەئاگری کێشەو گرفتەکانی خۆیدا وەک باوەشێک پووش دەسووتێت.»

پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس بەنیگەرانییەوەگوتی:

«بەم قسانەتدا هیوادارم ڕۆمانەکەت خوێنەرەکانی بێزار نەکات.»

«تۆ پێت وایەهەرشتێک شوێنکەوتنێکی شێتانەبۆ ئەنجامی کۆتایی تێدا نەبێت، ئەو شتەبێزارکەرە؟ کاتێک تۆ ئەم مراوییەخۆشەدەخۆیت، بێزار دەبێت؟ ئایا تۆ بەپەلەشوێن مەبەستێک دەکەویت؟ بەپێچەوانەوە، تۆ دەتەوێ ئەم مراوییەزۆر بە ئارامی بچێتەناو لەشتەوەو تامەکەی هەرگیز کۆتایی نەیەت. ڕۆمان نابێت وەک کێبەرکێی پایسکیلسواریی لێ بێت، بەڵکو دەبێ وەک زیافەتێک بێت کەخواردنی زۆری لێیە. من بەتایبەت چاوەڕوانی بەشی شەشەمی ئەم کتێبەم. لەو بەشەدا کەسایەتییەکی تازە دێتەناو ڕۆمانەکەوەکەلەکۆتایی بەشەکەدا، بێ ئەوەشوێنپێیەک جێبێڵێت، ون دەبێت. ئەو نابێتەهۆی هیچ شتێک و هیچیش لەپاش خۆی جێناهێڵێت. من هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندییەئەو کەسایەتییەم خوشدەوێت. بەشی شەشەم، ڕۆمانێکەلەناو ڕۆمانەکەدا و خەمبارترین چیرۆکێکی شەهوانیشەکە تا ئێستا نووسیبێتم. ئەم چیرۆکەتۆش خەمبار دەکات.»

ئاڤەناریوس لە بێدەنگییەکی شپرزەدا نوقم بوو. پاش ماوەیەک بەدەنگێکی میهرەبانەوەلێی پرسیم:

«ناوی ڕۆمانەکەت چییە؟»

«سووکیی لە تاقەت بەدەریبوون!»

«پێم وا بێت پێشتر کەسێک ئەوەی نووسیوە.»

«خۆم نووسیومە! بەڵام ئەو دەمەبۆ ناوی ڕۆمانەکەبە هەڵەچووم. پێم وایەئەو ناوەبۆ ئەم ڕۆمانەشیاوەکەئێستا خەریکم دەینووسم.»

وازم لەقسەکردن هێنا و دڵم بەتامی خۆشی شەراب و مراوییەکەسپارد. ئاڤەناریوس بەدەم خواردنەوەگوتی:

«تۆ زۆر کار دەکەیت. دەبێ ئاگات لەتەندروستیی خۆشت بێت.»

دەمزانی دەیەوێ چی بڵێت، بەڵام خۆم وا دەرخست کەگوایەتێنەگەیشتووم و بەبێدەنگی تامی شەرابەکەم دەچەشت.

## ١٠

ئاڤەناریوس پاش ئێسێکی دووردودرێژ دووبارەی کردەوە:

«من پێم وایەتۆ زۆر کار دەکەیت. دەبێ ئاگات لەتەندروستیی خۆشت بێت.»

گوتم:

«ئاگام لەتەندروستیی خۆشم هەیە. من بەردەوام وەرزشی کێش بەرزکردنەوە دەکەم.»

«ئەوەزۆر ترسناکە. نەکا تووشی جەڵتەببیت.»

لە کاتێکدا کەبیرم لەڕۆبێرت موسیل دەکردەوە، گوتم:

«ئەمەئەو شتەیە کەزۆری لێ دەترسم.»

«تۆ پێویستت بەغاردانە، غاردانی شەوانە. ئێستا شتێکت پیشان دەدەم»

لەکاتێکدا قۆپچەکانی جاکەتەکەی دەکردەوە، بەدۆخێکی گوماناوییەوە ئەوەی گوت. بە دەوری سنگ و سکەزلەکەیەوەسیستەمی پشتێنەیەکی سەیرم بینی کەشاش و وێش لەڕەختی ئەسپ دەچوو. لەخوار لای ڕاستەوەکێردێکی گەورەلەکێلانێکدا بوو.

پەسەنی ڕەختەکەیم کرد، بەڵام چونکەدەمویست لەبابەتی وتووێژەکەلابدەم کەچاک دەمزانی، گۆڕیم. دەمویست باسی ئەو شتەم بۆ بکات کەزۆرم بە لاوەگرینگ بوو.

«کاتێک لاورات لەوێستگەکەی میترۆ بینی، تۆ ئەوت ناسی و ئەویش تۆی ناسییەوە؟»

ئاڤەناریوس گوتی:

«بەڵێ.»

«حەزدەکەم بزانم ئێوەچۆن یەکترتان ناسیوە.»

ئاڤەناریوس بەدەم داخستنی قۆپچەکانیەوە، بەنائومێدی گوتی:

«تۆ حەزت لەم وردەشتانەیەو بابەتەجیددییەکان ماندووت دەکەن. تۆ لە داڵاندارێکی پیر دەچی.»

من شانم هەڵتەکاند و ئەو درێژەی بەقسەکانی دا:

«ئەم ناسیاوییەهیچ شتێکی سەرنجراکێشی تێدا نییە. بەرلەوەی دیپلۆمی کەریەتی بەو "کەرەتەواوە" پێشکەش بکەم، وێنەکەی بە هەموو شاردا بڵاو بووبووەوە. من لەهۆڵی وێستگەی ڕادیۆ چاوەڕێی بووم تا بیبینم. کاتێک لەمەسعەدەکە هاتە دەر، ژنێک بەرەوپیری هەڵات و ماچی کرد. دوای ئەو ڕووداوەش زۆرجار شوێنیان دەکەوتم و چەند جاریش نیگام لەنیگای ئەو ژنەهەڵەنگوت. بەم شێوەئەو ئەگەرچی نەیدەزانی من کێم، بەڵام دەبێ ڕوومەتم بۆی ئاشنا بووبێت.»

«بەدڵت بوو؟»

ئاڤەناریوس بە دەنگی نزم گوتی:

«لە لای تۆ پێی لێ دەنێم ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە، ڕەنگەهەرگیز پلانی دیپلۆمەکەم بەڕێوەنەبردایە. من هەزار پلانی وام هەیە، بەڵام زۆربەیان لەخەیاڵێکتێناپەڕن.»

گوتم:

«ڕاست دەکەیت. دەزانم.»

«بەڵام کاتێک پیاو شەیدای ژنێک دەبێت، هەموو کارێک دەکات تا پەیوەندیی پێوەبکات، هەر هیچ نەبێت ناڕاستەوخۆ، تەنانەت ئەگەر بووەلەدووریشەوە، لە دنیاکەی نزیک ببێتەوەو بیجووڵێنێت.»

«کەواتەبێرنارد لەبەر ئەوەبوو بەکەرێکی تەواو کەتۆ لاورات خۆشدەویست.»

ئاڤەناریوس بیرمەندانەگوتی:

«ڕەنگەبەهەڵەنەچووبێتی.»

ئەوسا درێژەی پێدا:

«شتێک لەو ژنەدا هەیەکەقەدەری قوربانیبوونی دیاری دەکات. ئەمەئەو شتەیەکەمنی بەرەو ئەو ڕاکێشا. کاتێک ئەوم بە دەست دوو پیاوی سەرخۆش، دوو بەرەڵلای بۆگەنەوەبینی، زۆر خۆشحاڵ بووم. ئەمە ئەو ساتەوەختە بوو کە هەرگیز لە بیری ناکەم!»

«بەڵێ تا ئێرەی چیرۆکەکەت دەزانم. بەڵام دەمەوێت بزانم دواتر چی ڕوویدا.»

ئاڤەناریوس کەپرسیارەکەمی پشتگوێ خستبوو، درێژەی پێدا:

«سمتێکی زۆر سەیر و جوانی هەیە. حەتمەن ئەو دەمەکەچووەبۆ قوتابخانە هاوڕێکانی حەزیان کردووەنوقرچکی لێ بگرن. من دەتوانم بە خەیاڵ گوێم لەهەراوهاواری پاش ئەو نوقرچکانەی بێت. ئەو هەراوهاوارانەوەک بەڵێنی خۆشی داهاتوویەکی شاد بوون بۆی.»

«چاکە. با باسی ئەوەبکەین. پێم بڵێ بزانم دوای ئەوەی کەوەک ڕزگارکەرێکی ئاسمانی لەمیترۆکە دەربازت کرد، چی ڕوویدا؟»

ئاڤەناریوس وا خۆی پیشان دا کەگوایە گوێی لەقسەکەم نەبووە. گوتی:

«ڕەنگەجوانناسێک بڵێت سمتی زۆر گەورەیەو کەمێکیش داکەوتووەو چونکەڕۆحیشی حەزی لەهەڵکشانە، ئەمەزیاتر جێگەی نیگەرانییە، بەڵام لەم دژوازییەدایە کەمن بارودۆخ و کێشەی مرۆڤ دەبینم: سەرمان پڕەلەخەون و خەیاڵ، بەڵام سمت و قوونمان وەک لەنگەر بەرەو خوارەوەڕاماندەکێشێت.»

هەر خودا دەزانێت بۆچی دوا وشەکانی ئاڤەناریوس ماتەمبارانەبوون، ڕەنگەچونکەقاپەکانمان بەتاڵبووبوون و گۆشتی مراوییان تێدا نەمابوو. پێشخزمەتەکەدیسان بە ژوور سەرمانەوەنەوییەوەتا قاپەکان بباتەوە. ئاڤەناریوس سەیری کرد و گوتی:

«کوتێک کاغەزت پێیە؟»

پێشخزمەتەکەپەڕەیەک کاغەزی سپیی حسێباتەکەی دایەدەستی. ئاڤەناریوس قەڵەمەکەی دەرهێنا و ئەم ڕەسمەی کێشایەوە.

پاشان گوتی:

«ئەمەلاورایە: پڕەلە خەون و خولیا، سەری سەیری ئاسمان دەکات و لەشی بەرەو عەرز ڕادەکێشرێت: سمت و مەمکی، کە ئەوانیش تا ڕادەیەک گەورەن، بۆ خوارەوەدەڕوانن.»

«سەیرە.»

ئەوەم گوت و منیش ئەم ڕەسمەم لەپاڵ ڕەسمەکەی ئەودا کێشایەوە:

ئاڤەناریوس پرسیی:

«ئەمەکێیە؟»

«ئەمەئەگنێسی خوشکیەتی: لەشی وەک بڵیسەیەک هەڵدەکشێت و سەریشی کەمێک دانەویوە. سەرێکی دڕدۆنگ کەسەیری عەرز دەکات.»

ئاڤەناریوس ڕاشکاوانەگوتی:
«من لاورام زیاتر بەدڵە.»
ئەوسا درێژەی بەقسەکەی دا:
«هەرچۆنێک بێت، من شەوانم پێ خوشترە. تۆ کلێسای "سەن ژێرمەن دێپرە"ت پێ خۆشە؟»
بە نیشانەی "بەڵێ" سەرم بۆ لەقاند.
«بەڵام تۆ هەرگیز بەڕاست نەتبینیوە.»
گوتم:
«تێناگەم.»
«چەند ڕۆژ لەمەوپێش لەشەقامی ڕێنەوەبەرەو بولواری "سەن ژێرمەن" دەڕۆشتم، بۆ ئەوەبزانم چەند جار دەتوانم سەیری کلێساکەبکەم، بێ ئەوەبترسم ڕێبوارێکی بەپەلەشانم تێبکوتێت، یان ژێر ئۆتۆمبێلێک بکەوم، بژاردم. حەوت کورتەڕوانینم بژارد کەپیاوێکی گەنجی بەپەلەقۆڵی تێکوتام و دەستی چەپی ئازار دام. خەریکبووم بۆ جاری هەشتەم سەیرم دەکرد کەگەیشتمەبەر دەرکەی کلێساکە و کاتێک سەرم بەرزکردەوە، وەک ئەوەی کەبەچاوی ماسی سەیر بکەم، ڕووی پێشەوەی کلێساکەم بەخواروخێچی بینی. مێشکم لەو دیمەنەخواروخێچ و تێژتێپەڕە وێنەیەکی کێشاوەتەوەکەهەر ئەوەندەلە کلێسا دەچێت، کەڕەسمی ئەو دوو هێڵە کە من بەقەڵەم کێشامەوەلە لاورا دەچوو. کلێسای "سەن ژێرمەن" ون بووە. هەموو کلێسای شارەکان وەک وێنەی مانگ لە کاتی مانگگیراندا ون بوون. شەقامەکان پڕ بوون لەئۆتۆمبێل و شۆستەکانیان، کەپڕەلەحەشیمەت، تەنگەبەر کردووە. ئەگەر خەڵک بیانەوێت سەیری یەکتر بکەن، لەپشتیانەئۆتۆمبێل دەبینن. ئەگەر بیانەوێت سەیری بیناکانی ئەوبەر شەقامەکان بکەن،

لەپێشیانەوەئۆتۆمبێل دەبینن. هیچ گۆشەنیگایەک نەماوەکەلە پێشەوە،یان لە دواوە، لەئەمبەر، یان لە ئەوبەریەوەچاوت بەئۆتۆمبێل نەکەوێت. دەنگەدەنگی بێبڕانەوەی ئۆتۆمبێلەکان هیچ دەرفەتێکیان بۆ ساتێک تێڕامان نەهێشتووەتەوە. ئەوان کارێکیان کردووەکەجوانییەکەی جارانی شار نەبیندرێت. من وەک ئەو ئەخلاقگەرا گەمژانەنیم لەوەتووڕەبم کەبۆچی سالّی دەهەزار کەس، لەناو جادەکاندا دەمرن، ئەوەلانیکەم ژمارەی شۆفیرەکان کەمتر دەکاتەوە؛ من لەوەبەگلەییم کەبۆچی ئۆتۆمبێلەکان کارێکیان کردووەکلێساکانی جامیعەنەبینردێن.»

پاش ساتێک بێدەنگی، پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس گوتی:

«حەز دەکەم بلّێم کەمێک پەنیرمان بۆ بێنن.»

# ١١

پەنیرەکەوردەوردە وای لێ کردم کلێساکەلەبیر بکەم، شەرابەکەش وێنەی شەهوانیی نێزەکێکی لەمێشکمدا کێشایەوەکە سوار نێزەکێکی دیکەبووە:

«دڵنیام تۆ لاورات بردووەتەوەبۆ ماڵەکەی خۆی و ئەویش داوای لێ کردووی لەگەڵی بچیتەژوور و لەوێش پێی گوتووی کەداماوترین ژنی دنیایە؛ پاشان کەتۆ دەستت بەلەشولاریدا هێناوە، خاو بووەتەوەو نەیتوانیوەبەر بەڕژانی فرمێسک، یان گمێزەکەی بگرێت.» ئاڤەناریوس هاواری کرد:

«فرمێسک، یان گمێز. وێنەیەکی بەشکۆیە!»

«پاشان تۆ باوەشت پێدا کردووەو لەگەڵی جووت بوویت، ئەویش بەدەم سەیرکردنی ڕوومەتتەوەسەری لەقاندووەو پەیتاپەیتا گوتوویەتی: 'تۆ ئەو کەسەنییت کەمن خوشم دەوێ! تۆ ئەو کەسەنیت کەمن خۆشم دەوێ!'»

ئاڤەناریوس گوتی:

«ئەو قسانەزۆر خۆشن، بەڵام تۆ باسی کێ دەکەیت؟»

گوتم:

«باسی لاورا.»

ئاڤەناریوس قسەکەی پێ بڕیم:

«ئێستا ئیتر دڵنیام کەپێویستت بەوەرزشکردنە. غاردانی شەوانەتەنیا شتێکەکەدەتوانێت ئەم وەهمەشەهوانییەت لێ دوور بخاتەوە.»

لەکاتێکدا کەئاماژەم بۆ ڕەختەکەی دەکرد، گوتم:

«من وەک تۆ تەیار و تەکووز نیم. بۆخۆت چاک دەزانی کەبەبێ کەلوپەلی پێویست ئەوەناکرێت.»

«نیگەران مەبە. کەلوپەل زۆر گرینگ نییە. سەرەتا من بەبێ ئەم کەلوپەلەش غارم دەدا.»

دەستی بەسنگی خۆیدا هێنا و درێژەی بەقسەکانی دا:

«چەند ساڵێکی خایاند تا بیرم لەم کەلوپەلانەکردەوەو ئاوا خۆم ڕازاندەوە. ئەڵبەت لەوەزیاتر کەبەکردەوەپێویستم بەم شتانەبێت، حەزێکی ستاتیکی بۆ زۆر چاک و ڕازاوەبوون هانی دام ئەم شتانەبکرم. تۆ جارێکەهەر پێویستت بەچەقۆیەکەکەلەگیرفانتدا بێت. گرینگ ئەوەیەکەپەیڕەوی لەم ڕێسایەبکەیت: ئۆتۆمبێلی یەکەم، تایەی ڕاستی پێشەوە، ئۆتۆمبێلی دووهەم، تایەی چەپی پێشەوە، ئۆتۆمبێلی سێهەم تایەی ڕاستی دواوە، ئۆتۆمبێلی چوارەم...»

«تایەی چەپی دواوە...»

ئاڤەناریوس وەک مامۆستایەکی دڵڕەق کەچێژ لە وەڵامی هەڵەی قوتابییەکەی وەربگرێت، پێکەنی و گوتی:

«هەڵەیت! ئۆتۆمبێلی چوارەم هەر چوارتایەکە!»

هەردووکمان پێکەنیین و ئاڤەناریوس درێژەی پێدا:

«بیستوومەماوەیەکەخۆت بەبیرکارییەوە سەرقاڵ کردووە، کەواتە دەبێ ئەم ڕێکوپێکییەهەندەسییەت پێ خۆش بێت. من وەک ڕێسایەکی بنەبڕ، بەدوو مانا، جەخت لەم ڕێسایەدەکەمەوە: یەکەم، لەبەر ئەوەکەپۆلیسەکان بەلاڕێدا دەبات، چونکە ئەوان لەم شێوازی

کونکردنەی تایەکاندا هەست بەبوونی جۆرێک کۆد و نیشانە دەکەن کەهەوڵ دەدەن تێی بگەن و ساغی بکەنەوە. دووهەم، چونکە پەیڕەویکردن لەم هاوکێشەهەندەسییەجوانییەکی بیرکارانەبەخراپکارییەکەمان دەبەخشێت و لەو خەڵکەلاتولەوێرەجودامان دەکاتەوەکەبەنینۆک ئۆتۆمبێلەکان دەڕووشێنن، یان پیساییان پێدا دەکەن. من چەند ساڵ لەمەوپێش لە ئاڵمان، ئەو دەمەکەهێشتا بڕوام بەبەرخۆدانی ڕێکخراوەیی لەبەرامبەر شەیتان هەبوو، زۆر بەوردی کارم بۆ ئەم میتۆدەی خۆم کرد. لەوێ، لەکۆبوونەوەی گرووپەژینگەپارێزەکاندا بەشداریم دەکرد. ئەوان سەرەکیترین شەڕی شەیتان بەفەوتاندنی سرووشت دەزانن. باشەبۆ دەبێت نەیزانن؟ ئەوەش ڕێگەیەکەبۆ پەیبردن بەشەیتان. من لەوێ هاوخەمیم لەگەڵ ئەو گرووپانەدا کرد. پلانێکم بۆ ڕێخستنی ئەو کۆماندۆیانەدانا کەشەوانەتایەکان کون بکەن. ئەگەر ئەو پلانەم بکەوتایەتە بواری جێبەجێکردنەوە، دڵنیابەکەهەموو ئۆتۆمبێلەکانمان دەفەوتاند. پێنج یەکەی کۆماندۆیی کەهەرکامیان سێ کەس بوون، دەیانتوانی لەماوەی مانگێکدا هەموو ئۆتۆمبێلەکانی شارێکی لەکار بخەن! من هەموو وردەکارییەکی پلانەکەم پێ گوتن، ئەوان دەیانتوانی بێ ئەوەپۆلیس پێیان بزانێت، لەمنەوەفێری نەخشەیەکی کارا بۆ فەوتاندنی ئۆتۆمبێلەکان ببن، بەڵام ئەو گەمژانەمنیان بەپیاوێکی خراپکار زانی؛ گاڵتەیان پێ کردم و هەڕەشەیان لێ کردم! ئەوان پاش دوو هەفتەبەماتۆڕسیکلێتی گەورەو ئۆتۆمبێلی زۆر بچووک، بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی دژ بە چێکردنی وزەگەیەکی ناووکی بەرەو ناوچەدارستانییەکان چوون؛ دارودرەختێکی زۆریان فەوتاند و لەماوەی ئەو چوار مانگەدا کەلەوێ مانەوە، بۆگەنێکی ترسناکیان لەدوای خۆیان جێهێشت. من

ئەودەمەبوو کە زانیم ئەوان لەمێژەبوون بەبەشێک لەشەیتان و تێگەیشتم کەئەوەدوا هەوڵی من بۆ گۆڕینی دنیا بووە. ئێستا من تەنیا بۆ چێژبردنی خۆم سوود لەتاکتیکەشۆڕشگێڕانەکانی جارانم وەردەگرم. غاردانی شەوانەبە شەقامەکاندا و کونکردنی تایەی ئۆتۆمبێلەکان شادییەکی گەورەیەبۆ ڕۆح و وەرزشێکی چاکیشەبۆ لەش. جارێکی دیکەش پێت دەڵێم ئەو کارەبکە. ئاوا چاکتر دەخەویت و بیر لە لاوراش ناکەیتەوە.»

«کەواتەپێم بڵێ، ئایا هاوسەرەکەت بەڕاست بڕوات پێ دەکا کەشەوانەبۆ تایەکونکردن دەچیتە دەر؟ ئایا گومانت لێ ناکات کەئەمەبیانوویەک بێت بۆ پەردەپۆشکردنی هەندێک چیرۆکی شەوانەی تر؟»

«شتێک هەیەکەتۆ نایزانی! من بەدەم خەوەوەدەپرخێنم. ئەمەئەو مافەی پێ بەخشیوم کەلە دوورترین ژووری ماڵەکەبخەوم. کەواتەشەوانەچیم پێ خۆش بێت ئەوەدەکەم.»

ئەو بزەی هاتێ و منیش حەزم کرد لەو خەباتەیدا هاوکاری بکەم و لەگەڵی بڕۆم: من لەلایەکەوەئەو کارەم پێ کارێکی چاک بوو کە ستایشم دەکرد، لە لایەکی دیکەشەوەهاوڕێکەمم خۆش دەویست و دەمویست خۆشحاڵی بکەم. بەڵام بەرلەوەی هیچ بڵێم، ئەو بۆ حسێبکردنی پارەی خواردنەکەمان بانگی پێشخزمەتەکەی کرد. ئەوەهەودای وتووێژەکەمانی پچڕاند و پاشان باسی شتی دیکەمان کرد.

# ١٢

ئەگنێس هیچکام لەڕیستورانتەکانی سەرجادەی پێ خۆش نەبوو. بەئۆتۆمبێل لەپێش یەکەیەکەیانەوەتێدەپەڕی و زیاتر برسیی دەبوو. درەنگانێک لەبەر مۆتێلێک ڕایگرت.

لەهۆڵەکەجگەلەدایکێک و منداڵێکی شەش ساڵانەی جەربەزە، کەبێ هەدادان بەدەنگەدەنگ بە دەوری هۆڵەکەدا هەڵدەسووڕا، کەسی دیکەی لێنەبوو.

ئەگنێس داوای خواردنێکی سادەی کرد و لەبووکەڵەیەک وردبووەوەکەلەناوەڕاستی مێزەکەداندرابوو؛ پەیکەرێکی بچووکی کاوچۆیی کەڕیکلامی بۆ بەرهەمێک دەکرد. بووکەڵەیەکی زل کەدوو پێی کورت و لووتێکی سەوزی ترسناکی بوو، تا سەر ناوکی شۆڕبووبووەوە. ئەو لەبەر خۆیەوەگوتی: «زۆر سەیرە.» ئەوسا بووکەڵەکەی بەرزکردەوەو قووڵتر لێی وردبووەوە.

بە خەیاڵیدا هات کەکەسێک گیان بە بەر ئەم پەیکەرەدا بکات. مادام گیانی بەبەردا بکرێت، ئەگەر کەسێکی وەک ئەگنێس لووتەسەوزە کاوچۆییەکەی با بدات، بێگومان هەست بە ئازارێکی زۆر دەکات. ئەو زوو فێر دەبێ لە مرۆڤ بترسێت، چونکەهەموو خەڵک دەیانەوێ یاری بەلووتی بکەن و ژیانی بە ترس و ئازارێکی زۆرەوەتێدەپەڕێت.

ئایا ئەم پەیکەرەڕێزێکی پیرۆز لەداهێنەرەکەی دەگرێت؟ ئایا بۆ ئەوەکەژیانی بەبەردا کردووەسپاسی دەکات؟ ئایا لە بەرامبەری

بەچۆکدا دێت و نزای بۆ دەکات؟ ڕۆژێک کەسێک بەرەوڕووی ئاوێنەیەکی دەکاتەوە و ئەویش ئەوەندەشەرمەزار دەبێت کەپێی خۆشەبۆ شاردنەوەی لووتەزلەکەی دەست بەڕوومەتیەوەبگرێت، بەڵام ئەو ناتوانێت بەو شێوەڕوومەتی خۆی داپۆشێت، چونکەداهێنەرەکەی توانای جووڵەی بە دەستەکانی نەداوە.

ئەگنێس پێی سەیر بوو تەنانەت بیر لەوەش بکاتەوەکەڕەنگەئەو پیاوەبچووکەهەست بەشەرم بکات. ئایا ئەو پیاوە بچووکەلەو لووتەسەوزەدرێژەی بەرپرسیارە؟ ئایا ئەگەری ئەوەنییەکە بەبێدەربەستییەوە شانی هەڵتەکێنێت؟ نەخێر، ئەو شانی هەڵناتەکێنێت. ئەو هەست بەشەرمەزاری دەکات. کاتێک کەسێک بۆ یەکەم جار لەشی خۆی پێ دەناسێنێت، یەکەم هەست و دواهەم هەستی نەبێدەربەستییە، نەڕق و نەفرەت، بەڵکو شەرمە: شەرمێکی تەواو کەلەهەموو ژیانیدا بەرۆکی بەر نادات. شەرمێک کەجارجار توند و جارجاریش خاو دەبێتەوە، زەمەن خاوی دەکاتەوە.

ئەگنێس ئەودەمەکەشانزە ساڵی تەمەن بوو، سەردانی هاوڕێکانی باوکودایکی کرد. نیوەشەو تووشی سووڕی مانگانەبوو، چەرچەفەکەی خوێناوی کرد. بەیانی کاتێک چاوی بەو خوێنەکەوت، تۆقا. بەدزییەوەچوو بۆ حەمام و بەسابوون و کوتێک پەڕۆی تەڕ چەرچەفەکەی شوشت. ئەو پەڵەسوورەنەوەک هەر گەورەتر بوو، بەڵکو تەشتەکەشی سوور کرد. ئەو بەشێوەیەکی زۆر ترسناک شەرمەزار بوو.

بۆ ئەوەندەهەستی بەشەرمەزاری دەکرد؟ مەگەر هەموو ژنێک بەهۆی سووڕی مانگانەوەئازار ناکێشێت؟ مەگەر ئەو ئەندامی زاوزێی داهێناوە؟ ئایا ئەو بەرپرسیارە؟ نا، بەڵام بەرپرسیاری هیچ پەیوەندییەکی بەشەرمەوەنییە. بۆ نموونە، ئەو ئەگەر تۆزێک ڕەنگی

بڕشتایەو فەرش و خوانی خانەخوێکەی ڕەنگاوی بکردایە، پێی ناخۆش دەبوو، بەڵام شەرمەزار نەدەبوو. شەرم لەهەڵەکانمانەوەسەرهەڵنادات. بەڵکو لەوەوەسەرهەڵدەدا کەبۆئەوەی کەهەین، بەبێ ئەوەهیچ دەورێکمان لەو بوونەی خۆماندا ببێت، هەست بەسووکایەتی و سووکبوون دەکەین؛ هەروەها لەوەوەسەرهەڵدەدات کەخەڵک ئەو سووکی و سووکبوونەمان ببینن.

ئەوەسەیر نەبوو کەبووکەڵەیەکی لووت سەوزی لووتدرێژ شەرم لەڕوومەتی خۆی بکات، بەڵام باوکی ئەگنێس بۆ؟ خۆ ئەو پیاوێکی جوانچاک بوو!

ئەری، ئەو پیاوێکی جوان بوو! بەڵام لەڕوانگەی بیرکارییەوەجوانی چییە؟ جوانی بەو مانایەیەکەبابەتێک زۆر لەنموونەئۆرجیناڵەکەی بچێت. بیهێننەپێشچاوی خۆتان کەئەندازەی هەموو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ (بە لایەنی زۆر و کەمەوە) بەکۆمپیوتەرێک بدەن. بۆ نموونە: درێژیی لووت لەسێ سانتیمەترەوەتا حەوت سانتیمەتر، بەرزیی ناوچاوان لەسێوەتا هەشت سانتیمەتر و... هتد. بەو پێیەبەکەسێک دەڵێن ناحەز کەناوچاوانی هەشت سانتیمەتر و لووتی سێ سانتیمەتر بێت. ناحەزی: بولهەوسیی شاعیرانەی ڕێکەوتە. بۆ کەسێکی جوان، گەمەی ڕێکەوت بە ئاڕاستەیەکدا دەڕوات کەقەوارەیەکی ناوەنجی بۆ ئەندامەکانی ڕوومەتی هەڵبژێرێت. کەواتەجوانی: ناونجییەتییەکی ناشاعیرانەیە. جوانی لەناحەزی زیاتر غیابی فەردانییەت و تاقانەبوونی ڕوومەت پیشان دەدا. کەسی جوان لەڕومەتی خۆیدا کۆپیی ئەو نوسخەئۆرجیناڵەدەبینێت کەشێوەکارەنموونەییەسەرەکییەکەکێشاویەتەوە و بە لایەوەسەختەبڕوا بەوەبکات کەئەوەی دەیبینێت خودێکی بێوێنەیە،

بۆیەئەویش وەک بووکەڵەلووتدرێژەکە، کەلەپڕ گیانی بە بەردا کراوە، شەرم دەکات.

کاتێک باوکی خەریکبوو دەمرد، ئەگنێس لەسەر لێواری تەختەکەی دانیشت. باوکی لەپێش ئەوەدا کەبۆ دواجار لەهۆش خۆی بچێت، پێی گوت: «ئیتر سەیرم مەکە.» ئەوەدواهەم وشەیەک بوو کەئەگنێس لەباوکی بیست، دواهەم پەیامی باوکی بوو.

ئەگنێس بەگوێی کرد؛ سەری داخست و چاوی قووچاند و دەستی باوکی گرت. ئەو ڕێگەی بەباوکی دا بێ ئەوەی ببیندرێت، بەئارامی پێ بنێتەناو دنیای بێڕوومەتەوە.

## ١٣

ئەگنێس پارەی خواردنەکەی دا و بەرەو ئۆتۆمبێلەکەی ڕۆشت. ئەو کوڕەمنداڵەجەربەزەی ناو ڕیستورانتەکەبە غاردان بەرەوپیری چوو. کوڕەکەهەڵترووشکا و دەستی بردەپێش. وەک ئەوەی دەمانچەیەکی ئۆتۆماتیکیی بەدەستەوەبێت، لاسایی تەقەی کردەوە: تەق، تەق، تەق، ئەگنێسی بەگوللەی خەیاڵی کون کون کرد. ئەگنێس ڕاوەستا، بەسەریدا نەوییەوەو بەهێواشی پێی گوت:

«بۆ وەک گەمژەدەجووڵێیتەوە؟»

کوڕەکەوازی لە تەقەکردن هێنا و بەچاوە درشتەمنداڵانەکەی لێی وردبووەوە. ئەگنێس دووبارەی کردەوە:

«ئەری، تۆ گەمژەیت.»

کوڕەکەدڵی پڕ بوو، گوتی:

«بە دایکم دەڵێم!»

ئەگنێس گوتی:

«یاڵا بڕۆ، بڕۆ و درۆی بۆ بکە.»

ئەوسا چووەناو ئۆتۆمبێلەکەی و خێرا دەرچوو.

ئەو خۆشحاڵ بوو کە لەگەڵ دایکی ئەو کوڕەبەرەوڕوو نەبووەتەوە. بە خەیاڵ ئەو ژنەی هێنایە پێشچاوی کەبۆ بەرگریکردن لەمنداڵەسووکایەتیپێکراوەکەی هەراوهاوار دەکات، سەری بەملاولادا

ڕادەوەشێنێت و شان و بڕۆی هەڵدەتەکێنێت. ئەڵبەت مافی منداڵ لەژوور هەموو مافێکەوەیە. کەواتەبۆچی دایکی ئەگنێس، کاتێک فەرماندەیدوژمن ڕێگەی پێدا لەسێ ئەندامی خێزانەکەی یەکێکیان ڕزگار بکات، لاورای ڕزگار کرد نەک ئەگنێس؟

وەلامەکەڕوون و ئاشکرایە: ئەو لاورای هەڵبژارد، چونکەمنداڵتر بوو. لە زنجیرەی قۆناغەکانی تەمەندا، کۆرپەلەسەری سەرەوەیە، پاشان منداڵ، ئەوسا مێرمندال و هەرزەکار و گەنج و گەورە. بەلام پیرەکان، ئەوان لە خواری خوارەوەن، لە خوارترین پلیکانەی پەیژەی بەهاکاندان.

ئەی مردووەکان؟ ئەوان لەژێر عەرزدان. تەنانەت لەخوار پیرەکانیشەوەن. پیرەکان هێشتا مافی مرۆڤیان هەیە، بەلام مردووەکان لەو ساتەوەکە دەمرن هیچ مافێکیان نامێنێت. هیچ یاسایەک بۆ بوختانپێکردن لەسەریان هەڵناقرێت، شوێنەتایبەتییەکانیان ئیتر تایبەتی نییە، ئیتر تەنانەت ئەو نامانەش کەکەسوکاریان بۆی نووسیون، تەنانەت ئەو ئاڵبۆمەخێزانییانەش کەدایکیان بەمیرات بۆی جێهێشتوون، هی خۆیان نییە.

باوکی لە دواساڵەکانی پێش مردنیدا وردەوردەهەموو شتەکانی فەوتاند، هیچ جلێکی لەدۆلابدا نەهێشتەوە، هیچ دەستوخەت و هیچ یادداشت و نامەیەکی نەهێشت. ئەو، بێ ئەوەکەس بزانێت، هەموو نیشانەکانی خۆی سڕییەوە. تەنیا لە کاتی فەوتاندنی ڕەسمەکاندا ئەگنێس و لاورا، بە ڕێکەوت، پێیان زانی، بەلام بەو حاڵەش نەیانتوانی بەر بەفەوتاندنی ڕەسمەکان بگرن، یەک ڕەسمیشی نەهێشتەوە.

لاورا بەسەریدا قیژاندی. ئەو لەپێناوی مافی زیندووەکان، لەگەل داوای بێپاساوی مردوەکان بەشەڕ هات. ئەو ڕوومەتەکەسبحەینی لەژێر خاک، یان لە ئاگردا دەفەوتێت، ڕوومەتی مردووەکانی داهاتوو نییە، بەڵکو ڕوومەتی زیندووەکانەکەبرسییانەو دەیانەوێت مردووەکانیان، بەنامەو پارەو ڕەسم و عەشقەکۆن و نهێنییەکانیانەوەقووت بدەن.

ئەگنێس بەردەوام لەبەر خۆیەوەدەیگوتەوە: «بەڵام باوکم خۆی لەم شتانەدەرباز کرد.» ئەو باوکی بیرکەوتەوەو بزەی هاتێ. لەپڕ بە مێشکیدا تێپەڕی کەهەر باوکی خۆشویستووە. بەڵێ، ئاشکرا بوو کەباوکی تەنیا عەشقی ژیانی بوو.

لەو کاتەدا دیسان ماتۆڕسیکلێتەکان بەخێراییەکی ئێجگار زۆر بەلایدا تێپەڕینەوە. لە بەر ڕۆشنایی چرای پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەی، چاوی بەماتۆڕسوارەکان کەوت کەبەسەر ڕۆڵی ماتۆڕەکانیاندا نەویبوونەوەو تووڕەییەکەیان شەوی هێنابووەلەرزین. ئەمە هەر ئەو دنیایەبوو کەدەیویست بۆ هەمیشەبەجێی بێڵێت، بۆیەبڕیاری دا لەیەکەم دەرفەتدا لەجادەکەبچێتە دەر و خۆی بەجادەیەکی چۆڵتردا بکات.

# ١٤

لەشەقامێکی پڕ لەڕۆشنایی و دەنگەدەنگی شاری پاریس بووین و بەرەو ئۆتۆمبێلەمارسدسەکەی ئاڤەناریوس دەچووین کەچەند بلۆک بەولاترەوەڕاگیرابوو. هێشتا لەبیری کچێکدا بووین کەلەجادەیەکی تاریک هەڵترووشکاوە، سەری خستووەتەسەر دوو دەستی و چاوەڕێی ئۆتۆمبێلێکە ژێری بخات. من گوتم:

«دەمویست ئەوەت بۆ شی بکەمەوەکەهەمووومان هۆکاری کردارەکانمان لەناخماندا هەڵگرتووە کەئاڵمانییەکان پێی دەڵێن Grund: ئەمانە کۆمەڵە کۆد و نیشانەیەکن کەجەوهەری چارەنووسمان دیاری دەکەن. بەبڕوای من ئەم کۆدانەلەسروشتی خوازەیەکدا شاردراونەتەوە. تۆ ناتوانی بەبێ خەیاڵێکی خوازەیی لەو کچەبگەیت کەخەریکین باسی دەکەین. بۆ نموونە: ئەو بەشێوازێک بەناو ژیاندا تێدەپەڕێت کەدەڵێی بەدۆڵێکدا دەڕوات. ئەو بەردەوام خەڵک دەبینێ و دەیاندوێنێت، بەڵام دەنگی ئەوەندەکز و نزمەکەخەڵکەکەبێ ئەوەگوێیان لێی بێت و لێی تێبگەن، سەیری دەکەن و دەڕۆن. ئەمە وێنای منەلەو کچەو دڵنیام بۆخۆشی هەروا وێنای خۆی دەکات: وەک ژنێک کەبەدۆڵێکی قەرەباڵغدا تێدەپەڕێت کەکەس گوێی لەدەنگی نییە.

یان ئەم وێنەیتر: ئەو چووەبۆ لای دکتۆری ددان و لەهۆڵی قەرەباڵغی چاوەڕوانی دانیشتووە، لەو کاتەدا مشتەرییەک دێتەژوور و ڕاستەوخۆ بەرەو کورسییەکەی ئەو دچێت و لەسەر کۆشی

دادەنیشێت. کابرا بەئەنقەست ئەوەی نەکردووە، ئەو کورسییەکەی بە لاوەچۆڵ بووەو لەسەری دانیشتووە. کچەکەتووڕەدەبێت، هەوڵ دەدا بەرزی بکاتەوە و دەقیژێنێت: «کاکی بەڕێز! بۆ مەگەر چاوت لێ نییەکە من لێرەدانیشتووم؟!» بەڵام کابراکە نایبینێت، ئەو بەئاسوودەیی لەسەر کچەکەدادەنیشێ و بە ڕووی خۆشەوەنەخۆشێکی چاوەڕوانی تر دەدوێنێت. ئەمانە دوو وێنەبوون؛ دوو خوازەکەکچەکە دەناسێنن و ئەو توانایەش بەمن دەبەخشن کەتێی بگەم. ئاواتی ئەو کچەبۆ خۆکوشتن هیچ هاندەرێکی لەدەرەوەی خۆی نەبوو. ئەم ئاواتەلەخاکی ناخیدا چاندرابوو، کەوردەوردە شین بوو، وەک گوڵێکی ڕەش پشکووت.»

ئاڤەناریوس گوتی: «ئەوەم بە لاوەڕاستە، بەڵام دەبێ پێم بڵێی کەئەو کچەبۆچی بڕیار دەدا لەو ڕۆژەتایبەتەدا کۆتایی بەژیانی بێنێت، نەوەک ڕۆژێکی دیکە.»

«بۆ تۆ دەتوانی پێم بڵێی کەبۆ گوڵێک لە ڕۆژێکی دیاریکراودا دەپشکوێت، نەوەک لەڕۆژێکی دیکەدا؟ چونکەکاتی هاتووە. ئارەزووی خۆفەوتاندن وردەوردە لەناخیدا سەری هەڵداوە، تا ئەوەی کەئیتر ڕۆژێک نەیتوانیوەلەئاستیدا بەرخۆ بدات. من پێم وایەئەو ئازارانەکەبریندارییان کردووەزۆر بچووکیش بوون، خەڵک وەڵامی مەرحەبابییان نەدەدایەوە؛ کەس زەردەخەنەی بۆ نەدەکرد؛ لەسەرەی فەرمانگەی پۆستەچاوەڕوان بوو، بەڵام ژنێکی قەڵەو پاڵی پێوەدەنا و پێشی دەکەوتەوە؛ فرۆشیاری فرۆشگەیەک بوو کەخاوەنەکەی بەوەتاوانباری دەکرد گوایەهەڵسوکەوتی لەگەڵ مشتەرییەکاندا چاک نییە؛ هەزاران جار هەستی بەوەدەکرد کەدەبێ ناڕەزایەتی دەرببڕێت و هاوار بکات، بەڵام هەرگیز نەیدەوێرا؛ چونکەدەنگی زۆر کز بوو، کاتێک تووڕەدەبوو دەنگی دەشکا. ئەو لە

هەموو کەس لاوازتر بوو، هەمیشەسووکایەتییان پێ دەکرد. مرۆڤ کاتێک تووشی نەهامەتییەک دەبێت خەشی خۆی بەخەڵکی دیکەدەڕێژێت، کەبەمەدەڵێن دژایەتی، یان شەڕ، یان تۆڵە، بەڵام کەسی لاواز توانای ئەوەی نییەبەخەڵکی دیکەی بڕێژێت و تەنانەت لاوازییەکەی خۆشی سووکایەتیی پێ دەکات و ئەو ناتوانێت بەرگری لە خۆی بکات. ئەو هیچی بۆ نامێنێتەوەجگە لەوەی کەلاوازییەکەشی لەگەڵ خۆی بفەوتێنێت. بەم شێوەیە کەخەونی ئەو کچەبۆ مردنی دێتەدی.»

ئاڤەناریوس چاوی بۆ ئۆتۆمبێلەکەی گێڕا و زانی بەهەڵەهاتووین بۆ شەقامێکی دیکە. بەرەو ئۆتۆمبێلەکەگەڕاینەوە و من درێژەم بە قسەکانم دا:

«ئەو جۆرە مردنەکەکچەکەبە ئاواتی دەخواست دوورکەوتنەوەنەبوو، بەڵکو فڕێدان بوو، فڕێدانی خۆی. ئەو لەهیچ ڕۆژێکی ژیانی، تەنانەت لەهیچ وشەیەکیش کەتا ئێستا بەزاریدا هاتبوو، ڕازی نەبوو. خۆی وەک بوونەوەرێکی ناتەواو، وەک شتێک کەلێی بێزارەو ناتوانێت لێی دەرباز ببێت، بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، بۆیەحەزی دەکرد وەک کەسێک کەکوتێک کاغەزی گرمۆڵەبوو فڕێ دەدا، خۆی فڕێ بدات. ئەو دەیویست خۆی فڕێ بدات؛ دەتگوت ئەو کەسەکەفڕێ دەدرێ و ئەو کەسەش کەفڕێ دەدات، دوو کەسی جیاوازن. بیری لەوەدەکردەوەکەخۆی لەپەنجەرەوەبخاتەخوار، بەڵام ئەوەبیرۆکەیەکی گەوجانەبوو، چونکەلە نهۆمی یەکەم دەژیا و ئەو فرۆشگەیەش کەکاری لێ دەکرد لە نهۆمی یەکەم بوو، پەنجەرەشی نەبوو. ئاواتی خواست کەوەک قالۆنچەیەک بمرێت، مستەکوڵەیەکی کتوپڕ بیفلیقێنێتەوە. ئەمەتا ڕادەیەک ئارەزوویەکی جەستەیی بوو بۆ

فلیقانەوە، وەک تەمەننای بەبەرەدەست گووشینی شوێنێکی لەشمان کەئازاری پێ گەیشتووە.»

لەمارسدێسەبەبریقەکەی ئاڤەناریوس نزیک بووینەوەو ڕاوەستاین. ئەو گوتی:

«بە شێوەیەک باسی دەکەیت کەپیاو دڵی پێی دەسووتێت...»

«دەزانم دەتەوێت چی بڵێی: دەتەوێت بڵێی ئەگەر بڕیاری نەدایەخەڵکی دیکەش لەگەڵ خۆی بەکوشت بدات، بەڵام ئەمەش بەو دوو خوازەیەشی دەکرێتەوەکەمن بۆ ئەوەی بەتۆی بناسێنم بۆم باس کردی. ئەو کاتێک قسەی لەگەڵ خەڵک دەکرد، کەس دەنگی نەدەبیست. ئەو دنیای ون دەکرد. کە دەڵێم دنیا، مەبەستم ئەو بەشەی بوونەکەوەڵامی دەنگەکەمان دەداتەوە(تەنانەت بەدەنگدانەوەیەکی نزمیش کەبەحاستەم دەبیسترێت) و ئێمەش دەیبیستین. ئەو پێی وابوو دنیا بۆ ئەو لاڵ بووە. ئەو دنیایەئیتر دنیای ئەو نەبوو. ئەو لەناو خۆیدا و لەناو ئێش و ئازارەکانیدا دیل دەبوو، بەڵام دەکرێت ئەو پرسیارەش بکەین کەئایا ئێشوئازاری خەڵکی دیکە دەیتوانی لەو دیلی و تاریکییەدەربازی بکات؟ بێگومان نا، چونکە ئێشوئازاری خەڵک لە دنیایەکدا بوو کەئەو دۆڕاندبووی، دنیایەک کەئیتر هی ئەو نەبوو. ئەگەر ئەستێرەی مەریخ (مارس) گۆیەکی گەورەی ئێش و مەینەتی بوایە و هەموو بەردێکی لەئازاردا بیقیژاندایە، نەیدەتوانی هاوخەمیمان بورووژێنێت، چونکەمەریخ بەشێک لەدنیای ئێمەنییە. کەسێک کەبۆخۆی پێی وا بێت لە دەرەوەی دنیایە، ئیدی گوێ بەئێشوئازاری دنیا نادات؛ بە لایەوەگرینگ نییە. تاکە ڕووداوێک کەبۆ ساتێک ئەوی لە ئازارەکانی دوورخستەوە، نەخۆشی و مردنی سەگەبچووکەکەی بوو. ئەوەدراوسێکەی تووڕەکردبوو، گوتبووی: گوێ بەمرۆڤەکان نادا، کەچی بۆ سەگەکەی دەگری! ئەو بۆ سەگەکەی دەگریا،

چونکەسەگەکەبەپێچەوانەی دراوسێکانی، بووبوو بەبەشێک لە دنیاکەی. سەگەکەگوێی لە دەنگی بوو، بەڵام مرۆڤەکان گوێیان لێ نەبوو.»

ئێمەکەبیرمان لەو کچەداماوەدەکردەوە، بێدەنگ بووین. پاشان ئاڤەناریوس دەرکەی ئۆتۆمبێلەکەی کردەوەو بەسەر ئیشارەتی بۆ کردم:

«سواربە! لەگەڵ خۆم دەتبەم! جووتێک پێڵاوی غاردان و چەقویەکت بە قەرز دەدەمێ!»

دەمزانی ئەگەر من لەبزووتنەوەی دڕاندنی تایەکاندا هاوڕێیەتی نەکەم، هەرگیز کەسی دیکە نادۆزێتەوە و وەک مرۆڤێکی دوورخراوەلە غوربەتی خۆیدا تەریک دەمێنێتەوە. زۆرم پێ خۆش بوو لەگەڵی بڕۆم، بەڵام هەستم بەتەمبەڵی دەکرد. خەواڵوو بووم و غاردان بەو نیوەشەوەبەشەقامەتاریکەکاندا فیداکارییەکی سەیر بوو.

دەستیم گووشی و گوتم: «دەڕۆمەوەبۆ ماڵەوە، بە پێ دەڕۆم.»

ئەو سوار ئوتومبێلەکەی بوو، دوور کەوتەوە. لە دواوەچاوم لە مارسدسەکەی بڕیبوو، بۆ ئەوەی لەگەڵی نەچووبووم هەستم بەگوناه دەکرد. پاشان بەرەو ماڵەوەڕۆشتم و دوای ماوەیەک دیسان بیرم گەڕایەوە بۆ لای ئەو کچەکەئاواتی خۆکوشتن، لە ناخیدا وەک گوڵێکی ڕەش پشکوتبوو.

بیرم کردەوە: ئەو کچەڕۆژێک لەپاش گەڕانەوە لەسەر کارەکەی، نەڕۆشتەوەبۆ ماڵەوە، بەڵکو بەپیاسەلەشار چووە دەر. ئاگای لە هیچ شتێکی دەوروبەری نەبوو. نەیدەزانی هاوینە، یان زستان، بەقەراغ دەریادا دەڕوات، یان بەپاڵ دیواری کارگەیەکدا تێدەپەڕێت. هەرچۆنێک بێت، ئەو لەمێژ بوو کەلەم دنیایەدا نەدەژیا. دنیاکەی ئەو ڕۆحی خۆی بوو.

# ١٥

ئاگای لە هیچ شتێکی دەوروبەری نەبوو، نەیدەزانی هاوینەیان زستان، نەیدەزانی بەقەراغ دەریادا دەڕوات، یان بەپاڵ دیواری کارگەیەکدا تێدەپەڕێت؛ تەنیا هەنگاوی هەڵدەهێنایەوە، چونکەڕۆحە بێئارامەکەی پیویستی بە جووڵەبوو. ڕۆحی نەیدەتوانی لە شوێنێک عۆقرەبگرێت، ئەگەر نەجووڵایەبە شێوەیەکی ترسناک ژانی دەکرد. بیر لەددانئێشەیەکی سەخت و بەژان بکەنەوە: شتێک ناچارتان دەکات کەلەمسەری ژوورەکەوە بۆ ئەوسەری بجووڵێن؛ هیچ هۆیەکی عەقڵانی بۆ ئەم جووڵەنییە؛ جووڵەلەخۆیدا ناتوانێت ئازار کەم بکاتەوە، بەڵام ددانئێشەکەتان، بێ ئەوەبزانن بۆچی، داواتان لێدەکات درێژەبە جووڵەکردنەکەتان بدەن.

لەبەر ئەوە بوو کەکچەکەلە ڕۆشتنەکەی بەردەوام بوو. گەیشتەجادەیەک کە ئۆتۆمبێلەکان، یەک لەدوای یەک، بە خێرایی پیایدا دەڕۆشتن. ئەو بەقەراغ جادەکەدا هەنگاوی دەنا و یەکەیەکەتابلۆکانی تێدەپەڕاند. ئاگای لە هیچ نەبوو. تەنیا لەڕۆحی خۆی ڕامابوو کەجگەلەو چەند وێنەی سووکایەتیپێکردنەهیچی دیکەی تێدا نەبوو. نەیدەتوانی چاو لەو چەند وێنەهەڵبگرێت، جاروبار کەماتۆڕسوارێک بەهاڕەهاڕ لەپاڵیەوەتێدەپەڕی، دەیزانی

کەدنیایەکیش لەدەرەوەی خۆی هەیە، بەڵام ئەو دنیایەش بێمانا بوو. ئەو دنیایەش بۆش و بەتاڵ بوو. ئەو دنیایەهەر بەکەڵکی ئەوەدەهات کەپیایدا بڕوات؛ بەهیوای ئێشوئازاری کەمتر، ڕۆحەداماوەکەی خۆی لەشوێنێکەوەبۆ شوێنێکی دیکەبگوێزێتەوە.

لەمێژ بوو بیری لەوەدەکردەوەخۆی ژێر ئۆتۆمبێلێک بخات، بەڵام ئەو ئۆتۆمبێلانەکەبە خێرایی بەجادەکەدا تێدەپەڕین، دەیانترساند. ئەوان هەزاران جار لەخۆی بەهێزتر بوون؛ نەیدەزانی کەی و لەکوێ دەوێرێت خۆی بخاتەژێر تایەکانیان. دەبوایەلەتەنشتیانەوە،یان لە پێشیانەوەخۆی بۆ فڕێ بدانایە و نەیدەتوانی؛ هەروا کەنەیتوانیبوو بەسەر بەڕێوەبەرەکەدا کەبەناهەق سەرزەنشتی کردبوو، بنەڕێنێت.

ئەو، ئێوارەڕێکەوتبوو، ئێستا شەو بوو. قاچی دێشا و دەیزانی ئیتر ناتوانێت بەرەو پێشتر بڕوات. لەو کات و ساتەی بێهێزییەدا، لەسەر تابلۆیەکی ڕووناک چاوی بە وشەی دیژۆن کەوت. ماندوویەکەی لەبیر چووەوە. پێی وابوو ئەم وشەشتێکی بیر دەخاتەوە. هەوڵی دا چنگی لەیادەوەرییەکی تیژتێپەڕ گیربکات: ئایا کەسێکی خەڵکی دیژۆنی دەناسی، یان نا؟ کەسێک نوکتەیەکی خۆشی بۆ گێڕابووەوەکەلەدیژۆن ڕوویدابوو؟ لەپڕ لەوەدڵنیا بوو کەدیژۆن شارێکی خۆشەو خەڵکەکەشی لەو خەڵکانەجیاوازن کەپێشتر ناسیویەتی. لەوەدەچوو لەپڕێکدا لەو بیابانەمۆسیقای سەمای بیستبێت. لەوە دەچوو کە ڕووبارێک ئاوی زیوین لەناو گۆڕستانەوەهەڵقوڵبێت. ئەرێ، دەچێت بۆ دیژۆن!

دەستی بۆ ئۆتۆمبێلەکان ڕاگرت، بەڵام ئەوان بەردەوام تێدەپەڕین، بەر شەوارەی چراکانیان دەخست و ڕانەدەوەستان.

دیسان ئەو دۆخەکە نەیدەتوانی لێی دەرباز ببێت لەناخیدا دووبارەو سێبارەبووەوە: هانا بۆ کەسێک دەبات، دەیدوێنێت، بانگی دەکات، بەڵام ئەو دەنگی نابیستێت.

بۆ ماوەی نیوسەعات بێهوودەدەستی لەئۆتۆمبێلەکان بەرزکردەوە، بەڵام ئەوان ڕانەوەستان. شاری ڕووناکییەکان، شاری دیژۆن، ئۆرکێسترای سەما لەناوەڕاستی بیابان، لە تاریکیدا نوقم بوو. دنیا جارێکی دیکەش لێی دوورکەوتەوە و ئەو دیسان بۆ ڕۆحی خۆی گەڕایەوەکەپڕ لەبۆشییەکی ڕەها بوو.

پاشان گەیشتەشوێنێک کەجادەیەکی باریک دەهاتەسەر جادەسەرەکییەکەو ڕاوەستا: نا، ئۆتۆمبێلەکانی ئەم جادەبێکەڵکن: ئەوان نەژێر خۆی دەنێن و پانی دەکەنەوە، نەدەیبەن بۆ دیژۆن. لەو جادەش هاتە دەر و جادەیەکی ئارامتری دوزییەوە.

# ١٦

چۆن دەکرێ لە دنیایەکدا بژیت کەلەگەڵی ناتەبایت؟ چۆن دەکرێ لەناو خەڵکێکدا بژیت کەنەهاوبەشی خەمەکانیانی و نەشادییەکانیان، هەروەها بشزانی کەلەئەوان نییت؟

ئەگنێس ئۆتۆمبێلەکەی بەڕێگەیەکی ئارامدا لێدەخوڕی و وەڵامی خۆی دەدایەوە: عەشق، یان سەومەعە. عەشق، یان سەومەعە؛ بەم دوو ڕێگەیەدەتوانی کۆمپیوتەری ئافرێنەر ڕەت بکەیتەوەو لێی دەرباز ببیت.

عەشق: ئەگنێس لەمێژ بوو بیری لەم تاقیکردنەوەیەدەکردەوە: لێت دەپرسن ئایا حەزدەکەیت لەپاش مەرگت دووبارەزیندوو ببیتەوە؟ ئەگەر بەڕاست کەسێکت خۆشویستبێت، دەڵێی بەمەرجێک کەدیسان لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا بیت. ژیان بەو مەرجە بەبایەخەکەئەو هێزەت پێ ببەخشێت کەلەگەڵ خۆشەویستەکەتدا بژی. ئەو کەسەکەخۆشت دەوێت بە لاتەوەلەئافڕاندنی خواوەند و خودی ژیانیش بالاترە. ئەڵبەتەئەمەکفرێکی گاڵتەجاڕییەبەرامبەر بەکۆمپیوتەری ئافرێنەر کەخۆی بەبالاترینی بالاکان و سەرچاوەی هەموو ماناکان دەزانێت.

بەلام زۆربەی هەرەزۆری مرۆڤەکان هەرگیز عەشقیان نەناسیوە و لەوانەش کەپێیان وایەناسیویانەتەنیا ژمارەیەکی کەمیان لەم تاقیکردنەوەیەدەردەچن کەئەگنێس بەخەیاڵ دایناوە. ئەوان بێ ئەوەپێ لەسەر مەرجێک دابگرن، دڵ بەو بەڵێنی دووبارەزیندووبوونەوەیە

خۆش دەکەن، بە لای ئەوانیشەوەژیان لەعەشق گرینگترەو هەمدیسان بە خواستی خۆیان دەکەونەوەناو داوی ئافرێنەر.

ئەگەر کەسێک لەچارەیدا نەنووسرابێت کەلەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بژی و هیچ شتێکیشی بە لاوەلەعەشق گرینگتر نەبێت، دەتوانێ بەشێوازێکی تر لە فەرمانی ئافرێنەر دەربچێت، بچێت بۆ سەومەعە. ئەگنێس ڕستەیەکی ڕۆمانەکەی "ستاندال"ی بیرکەوتەوە: «ئەو پەنای بۆ سەومەعەی پارم برد. فابریس ڕۆشت بۆ سەومەعەی پارم و لەوێ نیشتەجێ بوو.» لە هیچ بەشێکی ئەو ڕۆمانەدا ناوی سەومەعەنەبراوە، بەڵام ئەم ڕستەی دواهەم لاپەڕەی ڕۆمانەکەئەوەندەگرینگەکەستاندال وەک ناو و عینوانی ئەو بەشەش بەکاری هێناوە؛ چونکەمەبەستی ڕاستەقینەی هەموو چیرۆکەکەی فابریس سەومەعەیە، شوێنێک کەلە هەموو خەڵک و دنیا دابڕاوە.

سەردەمانی زوو، ئەوانەکەلەگەڵ دنیا نەدەگونجان و خەم و شادییەکانی دنیایان بە هیی خۆیان نەدەزانی، پەنایان بۆ سەومەعەدەبرد، بەڵام ئەم سەدەی ئێمەمافی نەگونجان لەگەڵ دنیا بە کەس نادات، هەر بۆیەسەومەعەیەک نییەکەکەسانێکی وەکو فابریس پەنای بۆ ببەن. ئیتر شوێنێکی دابڕاو لەخەڵک و دنیا بوونی نییە. تەنیا شتێک کەلەم جۆرەشوێنانەماوەتەوەیادەوەری و ئایدیالی سەومەعەیە، خەونی سەومەعەیە. «ئەو پەنای بۆ سەومەعەی پارم برد.» ئەگنێس لەپێناوی خەون و ڕوئیای دۆزینەوەی سەومەعە، سەومەعەی ڕێگە چۆڵەکانی دنیا، حەوت ساڵەکەدەچێت بۆ سویس.

ئەو، ساتەوەختێکی تایبەتیی بیرکەوتەوەکەڕۆژی ڕۆشتنەکەی ئەزموونبووی، ئەو ساتەوەختەکەبۆ دواهەم جار بەگوندەکەدا دەگەڕا. گەیشتەقەراغ ڕووبارێک و لەسەر گژوگیاکان ڕاکشا؛ ماوەیەکی زۆر لەوێ ڕاکشا. هەستی دەکرد ڕووبارەکەدەڕژێتەنێو دەروونیەوەو

هەموو ئازار و پیساییەکانی دەروونی دەشواتەوە. خودی خۆی دەشواتەوە. ئەوەساتەوەختێکی گرینگ و تایبەتی بوو: ئەو خودی خۆی لە بیر دەکرد، خودی خۆی ون دەکرد. ئەو بێخود بوو، ئەوەش شتێکی ئێجگار خۆش بوو.

ئەگنێس بەیادەوەریی ئەو ساتەوەختە، بیرۆکەیەکی بەمێشکدا هات کەهەرچەندەلێڵ و تیژتێپەڕ بوو، بەڵام زۆر گرینگ بوو، ئێجگار گرینگ، بۆیەهەوڵی دا بەم وشانەئەو بیرۆکەبۆ خۆی ڕابگرێت:

ئەوەی کەلەژیاندا تەحەمول ناکرێت بوون نییە، بەڵکو بوونی خودە. ئافرێنەر بەکۆمپیوتەرەکەی ملیاردەها خودی بەژیانەکانیانەوەهێناوەتەدنیا، بەڵام وێڕای ئەم هەموو خەڵکەزیندووە، دەکرێت وێنای ئەوەش بکەین کەتەنانەت بەرلەوەی ئافرێنەریش دەست بەئافراندن بکات، بوونێکی ئەزەلی، بوونێک لە دەرەوەی دەسەڵات و نفووزی ئافرێنەر بووەو هێشتاش هەیە. ئەگنێس ئەو ڕۆژەکەلەسەر گژوگیاکە ڕاکشابوو سروودی ڕووبارەکەوەک شەپۆلێک دەڕژایەدەروونییەوەو خودی خۆی، پیساییەکانی خودی خۆی دەشوشتەوە، دەبووەهاوبەشی ئەو بوونە ئەزەلییەکەلەنەغمەی تێپەڕینی زەمەن و شینایی ئاسماندا خۆی دەنواند. ئەو دەیزانی کەهیچ شتێک لەم حاڵەی جوانتر نییە.

ئەو ڕێگەیە کەلەجادەکەجودا دەبووەوەو ئەگنێسی پێدا دەڕۆشت ئارام بوو، ئەستێرەدوورەکان، ئەستێرەبێکۆتا دوورەکان، بە ژوور سەرییەوەدەدرەوشانەوە. ئەگنێس ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی و بیری دەکردەوە: ژیان هیچ شادییەکی تێدا نییە. ژیان، ڕاکێشانی خودی پڕ لە ئازارەبە دنیادا.

ئەی بوون؟ بوون شادییە. بوون، بەکانیاوبوونە، کانیاوێک کەجیهان وەک بارانێکی گەرم بە سەریدا دەبارێت.

# ١٧

کچەکەماوەیەکی دوورودرێژ لەڕۆشتنەکەی بەردەوام بوو، قاچی دێشا، ڕەتڵی دەدا، پاشان لەسەر قیرتاوەکە، لە چەقی لای ڕاستی جادەکەدانیشت. سەری بەنێوان هەردوو شانیدا نەویبووەوەو لووتی لەئەژنۆی دەدرا، پشتەکۆمەکەی چاوەڕێی زەربەتی ئاسن و پۆڵا بوو، هەڵدەلەرزی. سنگی بەقووڵدا چووبوو. سنگەلەڕولاوازەکەی بە گرێکی تاڵ دەسووتا و نەیدەهێشت جگەلە خودەپڕئازارەکەی بیر لەهیچی دیکەبکاتەوە. ئاواتی بۆ زەربەتێک دەخواست کەخۆی بفلیقێنێتەوەو ئەو گڕەش دامرکێنێت.

کاتێک گوێی لەدەنگی ئۆتۆمبێلێک بوو کەلێی نزیک دەبووەوە، زیاتر کۆم بووەوە. دەنگەکەلەتاقەتدا نەبوو، بەڵام لەبری ئەو زەربەتەکەچاوەڕێی دەکرد، هەستی بەبایەکی زۆر توند لەلای ڕاستی کرد کەنیوەسوورێکی پێدا . گوێی لەخشەو ناڵەی ڕاکێشرانی تایەیەک لەسەر قیرتاوەکەبوو، پاشان دەنگی بەرزی شکانی ئوتومبیلەکەشی بیست. ئەو بەچاوی بەستراوی سەرڕوومەتییەوە کەلە ئەژنۆی توند کردبوو هیچی نەدی و بۆ ئەوەش کەهێشتا زیندوو بوو و وەکو پێشوو دانیشتبوو، سەری سوورما.

جاریکی دیکەش گوێی لەدەنگی نزیکبوونەوەی ئۆتۆمبێلێک بوو؛ ئەمجارە"با"کەی خستی. گوێی لەدەنگی زۆر نزیکی شکانی ئۆتۆمبێلەکەش بوو. قیژەقیژ و هەراوهاوارێکی سەیر و ترسناکیشی بیست کەگورجێک بەرزی کردەوە. لەناوەڕاستی جادەیەکی چۆڵ ڕاوەستابوو، نزیکەی سەدوپەنجا مەترێک دوورتر، چاوی بەئاگرێک

کەوت و لەملاشەوە، لەنزیک خۆی، ئەو قیژەقیژ و هاوارەترسناکەلەنێو چاڵێکەوەبەرەو ئاسمانی تاریک هەڵدەچوو.

قیژەقیژ و هاوارەکەئەوەندەبەردەوام و ترسناک بوو کەدنیای دەوروبەری، ئەو دنیایەکەونی کردبوو، بە لایەوەڕاستەقینەو ڕەنگاوڕەنگ و پڕ لەزەنازەنا بووەوە. کچەکە لەناوەڕاستی جادەکەڕاوەستا و هەردوو دەستی بڵاوکردەوەو لەپڕ هەستی بەمەزنی و بەهێزی کرد. دنیا، ئەو دنیا ونبووەکەنەیدەویست گوێی لێ بگرێت، ئێستا دەگەڕایەوەبۆ لای و ئەوەندەجوان و ترسناک بوو کەدەیویست بقیژێنێت، بەڵام نەیدەتوانی. دەنگ لەقورگیدا مردبوو، نەیدەتوانی زیندووی بکاتەوە.

چاوی کچەکەبەر شەوارەی چراکانی پێشەوەی ئۆتۆمبێلی سێهەم کەوت. بەتەما بوو خۆی لێ لابدات، بەڵام نەیدەزانی بەکامەلادا بخزێت. گوێی لەدەنگی جیڕەی تایەکانی بوو. ئۆتۆمبێلەکەبەلایدا تێپەڕی و دەنگی کەوتن و تێکشکانی بەرزبووەوە. لەو کاتەدا هاوارێک لەقورگی دەرباز بوو. هێشتا لەنێو چاڵەکەهاواری ئێشوئازار نەبڕابوو کە ئەو بۆی سەندەوە. پاشان گەڕایەوەو هەڵات. بەدەم هاوارەوە هەڵدەهات و بە لایەوە سەیر بوو کەبەو دەنگە لاوازەی چۆن دەیتوانی ئاوا بقیژێنێت! لەو شوێنەکەڕێگە و جادەکە یەکرتیان دەگرتەوە، تەلەفۆنێک بەستوونێکەوە بەر بووبووەوە. کچەکە تەلەفۆنەکەی بەرزکردەوە: «هەلاو! هەلاو!»

لە ئەنجامدا دەنگێک لەودیو هێڵەکەوەوەلامی دایەوە.

«لێرەئۆتۆمبێلێک کەوتووەتەچاڵێکەوە!»

دەنگە کەپرسیاری شوێنی کەوتنەکەی لێ کرد، بەڵام کچەکە نەیدەزانی کوێیە. بۆیەتەلەفۆنەکەی دانا و بەرەو ئەو شارەهەلات کە دوانیوەڕۆ جێی هێشتبوو.

## ١٨

چەند کاتژمێر لەوەوپێش بوو کەپرۆفیسۆر ئاڤەناریوس باسی گرینگی دڕاندنی تایەی بەمیتۆدی "بەرودوایی" بۆ دەکردم: ئۆتۆمبێلی یەکەم، تایەی لای ڕاستی پێشەوە. ئۆتۆمبێلی دووهەم، تایەی لای چەپی پێشەوە. ئۆتۆمبێلی سێهەم، تایەی لای ڕاستی دواوە. ئۆتۆمبێلی چوارەم هەر چوار تایەکە، بەڵام ئەمەتەنیا تیۆرێک بوو کە بەهیوا بوو کاریگەری لەسەر بەردەنگە ژینگەپارێزەکان، یان هاوڕێ خۆشباوەڕەکەی دابنێت؛ لەکاتێکدا بۆخۆی بەکردەوەپەیڕەویی لەهیچ میتۆدێک نەدەکرد. ئەو بەشەقامەکاندا ڕای دەکرد و هەر کاتێک پێی خۆش بوایەچەقۆکەی دەردەهێنا و لەنزیکترین تایەی ئۆتۆمبێلێکی ڕۆ دەکرد.

لەڕیستورانتەکەپێی گوتم کەپێویستەلەدوای هەر هێرشێک دیسان چەقۆکەبخەیتەوەناو کیلانی ژێر جاکەتەکەت و بەدەستی بەتاڵ هەڵبێیت. ئەم جۆرەهەڵاتنەئاسانتر و لەباری ئەمنیشەوەچاکترە: کارێکی عاقڵانەنییەکەکەسێک بەچەقۆوەبتبینێت و خۆت بخەیتەمەترسییەوە. دەبێ‌بەگورجی و لەچەند چرکەدا تایەکان بدڕێنیت.

بەداخەوەهەرچەندە ئاڤەناریوس لەتیۆرەکانیدا دۆگم بوو، بەڵام بەکردەوەبێدەربەست بوو، پەیڕەویی لەهیچ میتۆدێک نەدەکرد و بە شێوەیەکی ترسناک حەزی لەهەڵبژاردنی ئاسانترین ڕێگە بۆ خۆدەربازکردن بوو. ماوەیەکی کەم لەوەوپێش، لەشەقامێکی چۆڵ،

دوو تایەی ئۆتۆمبێلێکی دڕاندبوو، پاشان هەستابووەسەر پێ و بەپێچەوانەی هەموو ڕێسا ئەمنییەکان، لەکاتێکدا کەهێشتا چەقۆکەی بەدەستەوەبوو، هەڵاتبوو. ئۆتۆمبێلەکەی دیکەش کەبەتەمابوو تایەکانی بدڕێنێت لە سووچێک ڕاگیرابوو. ئەو کەهێشتا چوار پێنج هەنگاو لێیەوەدوور بوو (بە پێچەوانەی ڕێسایەکی دیکە) زۆر زوو دەستی بەرزکردەوە و هاوکات لە لای ڕاستییەوەهاوارێکی بیست. ژنێک کەلە ترسان وشک بووبوو، لێی وردبووبووەوە. وا دیاربوو ئەو ژنە، کاتێک ئاڤەناریوس هەموو هۆشی لای مەبەستەکەی بووە، لەپێچی شەقامەکەوەدەرکەوتبێت. هەردووکیان بێ ئەوە بجووڵێن بەرەوڕووی یەکتر ڕاوەستابوون، ئاڤەناریوسیش لەترسان دەستی بە حەواوەمابووەوە. ژنەکەنەیدەتوانی چاو لەچەقۆکەی هەڵبگرێت، دیسان قیژاندییەوە. دوای ئەو قیژەبوو کەئاڤەناریوس هۆش خۆی هاتەوەو چەقۆکەی بۆ بن جاکەتەکەی بردەوە. ئەو، بۆ هێورکردنەوەی ژنەکەزەردەخەنەیەکی کرد و لێی پرسی: «سەعات چەندەیە؟»

پێدەچوو ئەم پرسیارە لەچەقۆکەزیاتر ژنەکەی ترساندبێت، بۆیەبۆ جاری سێهەم قیژاندییەوە.

لەو کاتەدا چەند ڕێبوار بەشەقامەکەدا تێدەپەڕین و ئاڤەناریوس هەڵەیەکی کوشندەی کرد. ئەو ئەگەر دیسان چەقۆکەدەربهێنایەو بەتووڕەییەوەڕایوەشاندایە، ژنەکەهۆش خۆی دەهاتەوەو هەڵدەهات، ئەوسا ڕێبوارەکانیش بەدوایدا هەڵدەهاتن؛ بەڵام لەباتی ئەوە، بڕیاری دا کارێک بکات کەگوایە هیچ ڕووینەداوەو دیسان بەدەنگێکی دۆستانەوە پرسیارەکەی دووبارەکردەوە:

«دەکرێ پێم بڵێی کاتژمێر چەندەیە؟»

کاتێک ژنەکەزانیی خەڵک لێیان نزیک دەبنەوەو ئاڤەناریوسیش بەتەما نییەئازاری بدات، بۆ جاری چوارەم قیژاندیەوەو بەدەنگی بەرز بەڕێبوارەکانی گوت:

«بەچەقۆ هەڕەشەی لێ کردم! دەیویست دەستدرێژیم بکاتە سەر!»

ئاڤەناریوس بەجووڵەیەکی بێگوناهانەدەستی لێک هەڵبڕی و گوتی:

«داوام لێ کرد پێم بڵێ سەعات چەندەیە!»

پیاوێکی کورتەبالا بەجلوبەرگی پۆلیسییەوە، لەنێو خەڵکەکەهاتە دەر و پرسیی چی ڕوویداوە. ژنەکەدووبارەگوتیەوەکەئاڤەناریوس بەتەمابووەدەستدرێژیی بکاتەسەر.

پۆلیسەکورتەبالاکەبەشەرمەوەلە ئاڤەناریوس نزیکبووەوە. ئاڤەناریوس کەمەزنایەتییەپرشکۆکەی بۆ گەڕابووەوە، دەستی بەرزکردەوەو بە ویقارێکەوەگوتی:

«من پرۆفیسۆر ئاڤەناریوسم!»

ئەم وشانەو ویقاری دەربڕینەکەی کارێکی زۆریان کردە سەر پۆلیسەکە، زۆری نەمابوو داوا لەخەڵکەکەبکات بڵاوەی لێ بکەن و ڕێگەی بدات کەبڕوات، بەڵام ژنەکە، کە ئێستا ئیتر نەدەترسا، بەدۆخێکی هێرشکارانەوەنەڕاندی:

«تۆ ڕەنگەپرۆفیسۆر کاپیارپوس یان هەر کەسێکی دیکەبیت! بەڵام بەچەقۆ هەڕەشەت لێ کردم!»

لەو کاتەدا پیاوێک لە دەرکەی ماڵێکی نزیک لەڕووداوەکەهاتە دەر. ئەو، وەک کەسێک کەبەدەم خەوەوەبەڕێگەدا بڕوات، لێیان

نزیکبووەوە و کاتێک ئاڤەناریوس گوتی «من هیچ کارێکم نەکردووەجگە لەوەی کەلێم پرسیوەسەعات چەندەیە» ڕاوەستا.

ژنەکە کەهەستی دەکرد ئاڤەناریوس خەریکەبەویقارەکەی هاوسۆزیی ڕێبوارەکان بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت، بەرەو پۆلیسەکەڕۆشت و نەڕاندی:

«ئەو چەقۆیەکی لەژێر جاکەتەکەیەوەشاردووەتەوە! چەقۆیەکی گەورە! بیگەڕێن با بۆتان دەربکەوێت.»

پۆلیسەکەشانی هەڵتەکاند و بە دۆخێکی لێبووردنخوازانەوەگوتی:

«دەکرێ لوتف بکەیت و دوکمەی جاکەتەکەت بکەیتەوە.»

ئاڤەناریوس بۆ ساتێک نەجوولا. پاشان کەزانیی هیچ چارێکی نییەجگە لەوەی کەبەقسەی بکات، بەکاوەخۆ دوگمەکانی کردەوە. ئەوسا چاکەتەکەی هەڵدایەوەو هەموویان ئەو سیستەمەوەستایانەی دەوری سنگی و چەقۆ گەورەترسناکەکەیان بینی کەپێیەوەهەڵواسرابوو.

خەڵکەکەبە سەرسووڕمانەوەئاخێکیان هەڵکێشا و کابرا خەوگەڕەکەش چوو بۆ لای ئاڤەناریوس و گوتی:

«من پارێزەرم. ئەگەر پێویستت بەیارمەتی بوو، ئەمەکارتەکەمە. ئێستا دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، تۆ نابێ وەڵامی هیچ پرسیارێک بدەیتەوە. تۆ دەتوانی لەسەرەتاوەداوا بکەیت پارێزەرێکت لەلا بێت.»

ئاڤەناریوس کارتەکەی لێ وەرگرت و خستیەگیرفانیەوە. ئەوسا پۆلیسەکەقۆڵی گرت و بەڕێبوارەکانی گوت:

«بڵاوەبکەن! بڕۆن بەشوێن کاری خۆتانەوە!»

ئاڤەناریوس بەرگریی لەخۆی نەکرد. زانیی کەگیراوە. دوای ئەوەکەهەموویان چاویان بەو چەقۆیەکەوت کەبەسنگیەوەبەربووبووەوە، ئیتر بچووکترین هاوخەمییەکی بەڕوومەتی خەڵکەکەوەنەبینی. سەری بەرەو پیاوە پارێزەرەکەوەرچەرخاند کە کارتەکەی دابوویە، بەڵام ئەویش بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوەخەریکبوو دەڕوشت: ئەو بەرەو ئۆتۆمبێلەکەی چوو، کلیلی لەقفڵەکەیدا سووڕاند. ئاڤەناریوس مەجالی بوو سەیرێکی ئەو پیاوەبکات کەلە ئوتومبیلەکەی دوورکەوتەوەو لەلای یەکێک لە تایەکانی هەڵترووشکا.

لەهەمان کاتدا پۆلیسەکەش قوڵی ئاڤەناریوسی گرت و لەگەڵ خۆی بردی.

کابرا کەلە لای ئۆتۆمبێلەکەی هەڵترووشکابوو، ئاخێکی بەرزی هەڵکێشا:

«ئەی خودایەگیان!»

ئەوسا وەها گریا کەهەموو لەشی کەوتەلەرزین.

## ١٩

کابرا بەگریانەوەبەپلیکانەکاندا بەرەو ئاپارتمانەکەی هەڵگەڕا و خێرا بەرەو تەلەفۆنەکەهەڵات. هەوڵی دا تەلەفۆن بۆ تاکسییەک بکات. گوێی لەدەنگێکی زۆر خۆش بوو کەلەوبەر هێڵی تەلەفۆنەکەوەدەیگوت: «پاریس تەکسی، تکایەچاوەڕێ بن، تەلەفۆنەکەدامەخەن...» دواتر گوێی لەدەنگی مۆسیقا بوو، دەنگی کۆرسێکی ژنانەو زرمەزرمی تەپڵ. پاش ماوەیەک دیسان ئەو دەنگەخۆشەمۆسیقاکەی بڕی و داوای لێ کرد تەلەفۆنەکەی بەدەستەوەبێت. حەزی دەکرد هاوار بکات کەژنەکەی خەریکەدەمرێ و ناتوانێت سەبر بکات، بەڵام دەیزانی هاوارەکەی بێهوودەیە، چونکەئەو دەنگەخۆشە تۆمارکرابوو، کەس نەبوو گوێی لەقسەکانی بێت. پاشان دیسان دەنگی موسیقاکەبەرزبووەوە، کۆرسی دەنگەکان، هاوار و زرمەزرمی تەپڵ و... دوای ماوەیەک گوێی لەدەنگی ژنێکی ڕاستەقینەبوو، بەوەدا زانیی کەدەنگی ناخۆش و بەپەلەبوو. کاتێک گوتی پێویستی بەتاکسییەکەکەچەندسەد کیلۆمەترێک بۆ دەرەوەی پاریسی ببات، خاوەنی دەنگەکەخێرا پەیوەندییەکەی قرتاند و ئەو کەدرێژەی بەقسەکانی دا و گوتی زۆر پێویستی بەتاکسییە، دیسان دەنگی مۆسیقا و تەپڵ و کۆرسی ژنەکان بەرزبووەوەو پاش ئیستێکی زۆر دەنگەکەداوای لێ کرد تەلەفۆنەکەی بەدەستەوەبێت و سەبر بکات.

ئەو تەلەفۆنەکەی دانا و ژمارەی یاریدەدەرەکەی گرت، بەلاّم لەباتی یاریدەدەرەکە، گویی لەدەنگەتۆمارکراوەکەی بوو کەلەوبەر هێڵەکەوەوەلاّمی دەدایەوە. دەنگێکی شۆخ و بێزارکەر کەبزەیەک ناخۆشی کردبوو: «خۆشحالّم کەمنت بیرکەوتووەتەوە. نازانی چەندەم پێ ناخۆشەکەناتوانم قسەت لەگەلّ بکەم، لێ ئەگەر ژمارەکەت بلّێیت، بەخۆشییەوەلەیەکەم دەرفەتدا تەلەفۆنت بۆ دەکەمەوە...»

ئەو گوتی: «گەوجە» و تەلەفۆنەکەی قرتاند.

«بۆچی بریژیت لەمالّ نییە؟ دەبوایەتا ئێستا بهاتایەتەوەبۆ مالّەوە.» ئەمەی سەدجار لە خۆی پرسی، پاشان چوو سەیری ژوورەکەی بکات، هەرچەندەرێی تێنەدەچوو بریژیت هاتبێتەوەو ئەو گوێی لەدەنگی نەبووبێت.

دەبێ تەلەفۆن بۆ کێی دیکەبکات؟ لاورا؟ بێگومان لاورا پێی خۆش دەبێت کەئۆتۆمبێلەکەی خۆی بداتێ، بەلاّم پێداگریش دەکات کەلەگەلّی بچێت. دیارە خۆ ئەویش ناتوانێت لەگەلّ خۆی ببات: ئەگنێس نێوانی لەگەلّ خوشکەکەی تێکچووەو پاولیش نایەوێ کارێک بکات کەئەگنێس پێی خۆش نەبێت.

پاشان بیری بێرنارد کەوتەوە. هەموو هۆکارەکانی دوورکەوتنەوەی لەبێرنارد، لەپڕێکدا بە لایەوەگەوجانەو سووک بوون. ژمارەکەی گرت. بیرنارد لەمالّەوەبوو. پاول داوای لێ کرد ئۆتۆمبێلەکەی بۆ بێنێت، چونکە ئەگنێس کەوتووەتەناو چالێکەوە و ئێستا نەخۆشخانەئەم هەوالّەی پێ ڕاگەیاندووە.

«هەر ئێستا دێم.»

بێرنارد ئەوەی گوت و پاول لەپڕ هەستی کرد کەزۆری خۆشدەوێت. حەزی دەکرد لەباوەشی بگرێت و سەر بخاتەسەر سنگی و بگری.

ئەو ئێستا خۆشحاڵ بوو کەبریژیت لەماڵەوەنییە. هەموو شتێک لەناکاو ون بووبوو، ژنخوشکەکەی، کچەکەی، هەموو دنیا، هیچ شتێک نەمابوو جگەلەئەو و ئەگنێس. ئەو نەیدەویست کەسی دیکەیان لەگەڵ بێت. لەوەدڵنیا بوو کە ئەگنێس خەریکەدەمرێت. ئەگەر حاڵی زۆر خراپ نەبوایەبەو نیوەشەوەلە نەخۆشخانەیەکی گوندییەوەتەلەفۆنیان بۆ نەدەکرد. ئەو ئێستا بیری لەهیچ نەدەکردەوە، جگەلەوەی کە تا ئەگنێس زیندووەبیگاتێ. تا بتوانێت جارێکی دیکەش ماچی بکات. ئارەزووی ماچکردن هەموو گیانی داگیر کردبوو. ئارەزووی ماچێک، ماچی کۆتایی، تا بتوانێت ڕوومەتی وەک کلافەیەک، بەرلەوەی ون ببێت و تەنیا یادێک لەخۆی بەجێبێڵێت، بۆ خوی ڕابگرێت.

ئێستا ئیتر جگەلە سەبرکردن هیچ چارێکی دیکەی نەبوو. دەستی بەخاوێنکردنەوەی مێزی نووسینەکەی کرد و سەری لەوەسووڕما کەچۆن دەتوانێت لەکاتێکی ئاوادا کارێکی ئەوەندەبێمانا بکات. کەی ئەوەگرینگەمێزەکەی خاوێن و ڕێکوپێک بێت، یان نەبێت؟ یان بۆچی ئێستا کارتەکەی بەپیاوێکی نەناسراو دا؟ بەڵام نەیدەتوانی بەر بەخۆی بگرێت: هەموو کتێبەکانی بۆ لایەکی سەر مێزەکەگوێزایەوە، پاکەتنامەکۆنەکانی گرمۆڵەکرد و فڕێیدانەناو تەنەکەی خوڵەکەوە.

ئەو زانیی کە کاتێک کارەسات ڕوودەدا مرۆڤ، وەک ئەوەکەبەدەم خەوەوەبڕوات، ئەم جۆرەکارانەدەکات. پاشماوەی وزەی ڕۆژانەی بەسەر نەردەی ژیانەوەڕایدەگرێت.

سەیری کاتژمێرەکەی کرد. بەهۆی دڕانی تایەی ئۆتۆمبێلەکەیەوە تا ئێستا لانیکەم نیوسەعاتی بەفیڕۆ چووبوو. لەبەر خۆیەوە، بە بێدەنگی بەبێرناردی گوت: پەلەبکە، پەلەبکەبا بریژیت لێرەنەمبینێت. وا بکەبەتەنیا بڕۆم بۆ لای ئەگنێس، وا بکەلەکاتی خۆیدا بیگەمێ.

بەڵام بەخت یاری نەبوو. کاتێک بێرنارد هات کەبریژیت گەڕابووەوە. ئەو جووتەهاوڕێ کۆنەباوەشیان بەیەکتردا کرد. بێرنارد گەڕایەوەبۆماڵەکەی و پاول و بریژیت سوار ئۆتۆمبێلەکەی بریژیت بوون. پاول چووەپشت سوکانەکەو بەوپەڕی خێراییەوە لێی خوڕی.

## ٢٠

ئەگنێس لەپێش خۆی، چاوی بەلەشی شووش و باریکی کچێک لەسەر جادەکەکەوت کەلەبەر تیشکی چراکانی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەدەدرەوشایەوە؛ کچەکەدوو دەستی لێک بڵاوکردبوو، دەتگوت خەریکەسەما دەکات؛ دەتگوت سەماکەرێکی بالەیەکەلە کۆتایی پرۆگرامەکە پەردەکەدەکێشێت، چونکەلەوەودوا هیچ نییە، هیچ لەو پرۆگرامەنەماوەو هەمووی لەئانوساتێکدا لەبیر دەکرێت، هەمووی جگەلەو دواهەم وێنە. لەوەودوا تەنیا ماندووییە، ماندووییەکی قووڵ، وەک چاڵێکی ئێجگار قووڵ، ئەوەندە قووڵ کە ئەگەرچی هێشتا هوشی مابوو دەیزانی خەریکەدەمرێت، کەچی پزیشک و پەرستارەکان پێیان وابوو لەهۆش خۆی چووە. ئەو تەنانەت دەیتوانی تووشی سەرسوورمانیش ببێت، چونکەهەستی بەخەم و داخ و ترس و ئەم شتانەنەدەکرد کەتا ئێستا پێی وابوو پەیوەندییان بە بیرۆکەی مردنەوەهەیە.

پاشان چاوی بەپەرستارەکەکەوت کەبەژوور سەرییەوە نەوییەوەو گوێی لەدەنگی بوو کە گوتی: «مێردەکەت بەڕێوەیە، بەڕێوەیەبێت بۆ لات. مێردەکەت...»

ئەگنێس بزەی هاتێ. بۆچی؟ بیری شتێکی ئەو پڕۆگرامەکەوتەوەکەفەرامۆشی کردبوو: ئەرێ، ئەو شووی کردبوو. ئەوسا ناوی مێردەکەشی بیرکەوتەوە: پاول. ئەرێ پاول، پاول. بزەکەی بۆ ئەوە بوو کەکتوپڕ لەگەڵدنیایەکی ونبوودا بەرەوڕوو بووبووەوە. وەک ئەوەبوو کەورچێکی لاسیقت پیشان بدەن کە پەنجا ساڵ بێت نەتدیبێ و بیناسییەوە.

بەهێمنی لەبەر خۆیەوەگوتی پاول و بزەی هاتێ. هەرچەندەدیسان هۆکاری بزەکەی لەبیرچووەوە، بەڵام بزەکەلەسەر لێوی مایەوە. ماندوو بوو، هەموو شتێک ماندووی دەکرد. جگە لەوەش تاقەتی هیچ نیگایەکی نەبوو. چاوی بەستبوو تا هیچ شت و هیچ کەس نەبینێت. ئەوەی لە دەوروبەری تێدەپەڕی نیگەران و شپرزەی دەکرد. هیوادار بوو هیچ ڕوونەدات.

دیسان بیری کەوتەوە: پاول. پەرستارەکەچیی پێ گوت؟ کێ دێت؟ کێ بەڕێوەیە؟ لەپڕێکدا یادەوەریی ئەو پڕۆگرامەلەبیرکراوەی ژیانی خۆی زیاتر لێ ڕوونبووەوە. پاول. پاول بەڕێوەیەکەبێت! لەو کاتەدا بەوپەڕی ئارەزووەوەهیوادار بوو کە نەیبینێت. ماندوو بوو، نەیدەویست کەس سەیری بکات. نەیدەویست پاول سەیری بکات. نەیدەویست پاول ئاگای لەمردنەکەی بێت. دەبێ پەلەلە مردنەکەی بکات.

بۆ دواهەم جار نموونەسەرەکییەکەی ژیانی دووبارەبووەوە: خەریکبوو ڕای دەکرد و کەسێکیش بەدوایەوەبوو. پاول شوێنی کەوتبوو؛ ئەو هیچی بە دەستەوەنەبوو، نەبرۆس و نەشانەو

نەتەوقی سەر. ئەو بێ چەک بوو، ڕووت بوو، تەنیا ڕووپۆشەسپییەکەی نەخۆشخانەی لە بەردا بوو. خۆی لەو دواهەم شوێنەبینییەوەکەئیتر کەس نەیدەتوانی یارمەتیی بدات، لەو شوێنەکەهەر دەیتوانی پشت بەخێرایی ڕاکردنەکەی خۆی ببەستێت. کێ خێراتر دەبێت؟ پاول، یان ئەو؟ مردنی خۆی، یان گەیشتنی پاول؟

ماندووتر بوو، هەستی دەکرد بەپەلەدوور دەکەوێتەوە؛ دەتگوت کەسێک خەریکەچرپاکەی لەپشتەوەڕادەکێشێت. چاوەکانی هەڵهێنا و پەرستارەکەی بە جلی سپییەوەبینی. ڕوومەتی چۆن بوو؟ وە بیری نەدەهاتەوە. پاشان ئەم وشانەی بە مێشکدا هات: «نا، ئەوان لەوێ ڕوومەتیان نییە.»

## ٢١

کاتێک پاول و بریژیت لەچرپاکە نزیک بوونەوە، پاول بینیی لەشی بەچەرچەف داپۆشراوە. ژنێک بەجلی سپییەوەپێی گوتن:

«چارەکەسەعاتێک لەمەوپێش مرد.»

کورتیی ئەو ماوە کە پاولی لەدواهەم ساتەکانی ژیانی ئەگنێس جودا کردبووەوە، ناوئومێدییەکەی زیاتر کرد. چارەکەسەعاتێک درەنگ گەیشتبوو، نەیدیبوو. چارەکەسەعاتێک درەنگ هاتبوو، نەیتوانیبوو ژیانی قرتاوی خۆی کەبەشێوەیەکی بێمانا جیابووبووەوە، تەواو بکات. پێی وابوو لەهەموو ئەو ساڵانەدا کەپێکەوەژیابوون، ئەگنێس هەرگیز بەڕاست هی ئەو نەبووە. ئەو هەرگیز بەڕاست خاوەنی ئەگنێس نەبووە و ئێستاش لە کۆتایی چیرۆکەکەیان، واتەلەترۆپکی سەربوردەی عەشقەکەیان، لەدواهەم ماچیش بێبەش بووە؛ دواهەم ماچ بۆ ئەوەی بتوانێت لە دەمیدا ئەگنێس زیندوو بێڵێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لە دەمیدا ڕایبگرێت.

ژنەسپیپۆشەکە چەرچەفەکەی لادا. پاول ئەو ڕوومەتەزۆر ئاشنایەی دی، ڕوومەتێکی بێرەنگ، جوان و هاوکاتیش جیاواز. لێوەکانی هەرچەندەوەک هەمیشەئارام بوون، بەڵام هێڵێکیان ساز

کردبوو کەئەو هەرگیز نەیدیبوو. ڕوومەتی حاڵەتێکی بوو کەئەو تێینەدەگەیشت. نەیدەتوانی بنەوێتەوەو ماچی بکات.

بریژیت لەپاڵ پاولدا گریا، سەری خستەسەرسنگی و بەدەم گریانەوەهەڵلەرزی.

پاول جارێکی دیکەش سەیری ئەگنێسی کردەوە، ئەو بزەتایبەتییەکەهەرگیز بەڕوومەتیەوەنەیدبوو، ئەو بزەنامۆیەی سەر ڕوومەتێک کە پێڵووی چاوەکانی بەسترابوو، بۆ ئەو نەبوو. ئەو بزەبۆ کەسێک بوو کە پاول نەیدەناسی و شتێکی دەگوت کەئەو نەیدەفامی.

ژنەسپیپوشە کەتوند قۆڵی پاولی گرت؛ ئەو خەریکبوو دەبوورایەوە.

## ١

کوڕپەهەر کە لەدایک دەبێت مەمکی دایکی دەمژێت. دوای ئەوەکەدایکی لەشیری دەبڕێتەوە، قامکەگەورەی خۆی دەمژێت.

جارێک ڕوبەنس لەژنێکی پرسی:

«بۆ ڕێگە بەمنداڵەکەت دەدەی قامکی خۆی بمژێت؟ لانیکەم دەساڵی تەمەنە.»

ژنەکەتووڕەبوو:

«تۆ دەتەوێ بەر بەقامکمژینەکەی بگری؟ ئەو بەم کارەی ناهێڵێت لە سنگ و مەمکی دایکی داببڕێت! تۆ دەتەوێ دەروونی بریندار بکەیت؟»

ئاوایە کە منداڵ تا تەمەنی سیانزەساڵان قامکی گەورەی خۆی دەمژێت و پاشان، لەبری ئەوە خێرا جگەرەیەک بەلالێویەوەدەنێت.

دواتر ڕوبەنس لەو ژنەکەبەرگریی لەقامکمژینی منداڵەکەی دەکرد نزیک بووەوەو لە کاتی جووتبووندا قامکەگەورەی لەلێوی هەڵسوو. ژنەکەش، لەکاتێکدا سەری بەڕاست و چەپدا دەجووڵاند، قامکی بۆ مژی. ئەو هەردوو چاوی خۆی قووچاندبوو، بەخەیاڵ لەگەڵ دوو پیاودا جووت بووبوو.

ئەم ڕووداوەبچووکەبۆ ڕوبەنس ساتەوەختێکی گرینگ بوو. ئەو شێوازێکی چاکی بۆ تاقیکردنەوەی ژنان دۆزیبووەوە: لەکاتی

پەیوەندیی سێکسیدا قامکی گەورەی لەلێویان هەڵدەسوو، سەیری پەرچەکردارەکەیانی دەکرد. ئەوانەی کە قامکیان دەمژی، بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەک بەدڕەوشت بوون و ئارەزووی سێکسی بەکۆمەڵیان بوو، بەڵام ئەوانەی کە گوێیان بە قامکی نەدەدا، لە ئاست ئەو بەدڕەوشتییەکەڕ و کوێر بوون.

یەکێک لەو ژنەبەدڕەوشتانەبەڕاست عاشقی ڕوبەنس بووبوو. ئەو جارێک پاش جووتبوونەکەیان قامکی ڕوبەنسی گرت و ماچی کرد، ئەمە بەو مانایەبوو کە: ئێستا من دەمەوێ قامکت بەڕاست ببێتەوەبە قامک. من خۆشحاڵم کەئێستا، پاش هەموو خەیاڵ و فانتازیاکانم، لێرەلەگەڵ تۆ بەتەنیام.

سووڕی گۆڕانی قامکەگەورە، یان: جووڵەی میلەکان لەسەر ڕووپەڕەی کاتژمێری ژیان.

## ٢

میلەکانی کاتژمێر لەسەر ڕووپەڕەیەکی بازنەیی دەسووڕێنەوە. ئەستێرەناسەکانیش شکڵەئاسمانییەکان لەشێوەی ڕووپەڕە، یان ڕووتەختەیەکی بازنەیی ژمارەدار دەکێشنەوە. فاڵی ئەستێرە، یان هۆرۆسکۆپیش وەک ڕووپەڕەی کاتژمێرە. ئێمەبڕوامان بەدوابینیی ئەستێرەناسەکان ببێت، یان نا، فاڵی ئەستێرە، یان هۆرۆسکۆپ بریتییەلەخوازەیەکی ژیان کە ئاوەزێکی مەزنی لەخۆیدا هەڵگرتووە.

ئەستێرەناس چۆن فاڵی ئەستێرەتان بۆ دەگرێتەوە؟ ئەو، بازنەیەک دەکێشێتەوەکەوێنای گەردوونەو بەدوازدە بەش، دابەشی دەکات کەهەر بەشێکی بە جیا شکڵ، یان وێنەیەکی ئاسمانی، وەک نێری، گا، دوو پەیکەر و... پیشان دەدا؛ ئەوسا لەسەر ئەم شکڵەئاسمانییانە هەندێک سەمبول کەنیشانەی خۆر و مانگ و حەوت ئەستێرەن، لەو شوێنەتایبەتییانەدادەنێت کەلە کاتی لەدایک بوونتدا لەوێ بوون. ئەمەوەک ئەوەوایەکە ئەستێرەناس لەسەر ڕووپەڕەی کاتژمێرێک کەبە شێوەی سروشتی بە دوازدەبەش دابەش کراوە، نۆ ژمارەی دیکەشی بەهەڕەمەکی دانابێت. نۆ میل لەسەر ئەم ڕووپەڕە دەسووڕێنەوەکەبریتین لەخۆر و مانگ و ئەو حەوت ئەستێرەکەبە درێژایی ژیانت بەئاسماندا دەگەڕێن. هەر ئەستێرەیەک ژمارەیەکەکەبەردەوام لەگەڵ ئەستێرە،یان ژمارەکانی

دیکەشکڵێکی نوێ وەردەگرن کەنیشانەی نەگۆڕیی هۆرۆسکۆپ ،یان فاڵ و دوابینیی تۆیە.

هەیکەلی دووبارەنەبووی ئەم ئەستێرانەلە ساتەوەختی لەدایکبوونتدا، شکڵ و شێوازی ڕەوتی هەمیشەیی ژیان و پێناسەی قەدەری و چارەنووسی تۆ دیاری دەکەن. ئەو ئەستێرانەکەلەهۆرۆسکۆپەکەی تۆدا بێجووڵە وەستاون، بەنسبەت یەکترەوە هەندێک گۆشەساز دەکەن کەڕەهەندەکانیان، بە دەرەجەی جیاواز، هەڵگری مانای جیاوازی (ئەرێنی، نەرێنی، یان بەتاڵ)ن: بیهێننەپێشچاوی خۆتان کە"ڤینۆس"ی عاشقپیشەی ئێوەلەگەڵ"مارس"ی جەنگاوەرتان ناتەبایە؛ "خۆر" کەنیشانەی کەسایەتیی کۆمەڵایەتیی ئێوەیە، بەپەیوەندی لەگەڵ وزەی "ئورانوس"ی گوڕێخەوەبەهێز دەبێت؛ ئارەزووی سێکسی کە "مانگ" سەمبولیەتی، لەگەڵ"نیپتۆن"ی خەیاڵاویدا یەک دەگرنەوەو... هتد، بەڵام میلی ئەستێرەکان لەسووڕی گەڕانەکەیاندا، لەخاڵەوەستاوەکانی هۆرۆسکۆپ دەدرێن و توخم و ڕەگەزی جۆراوجۆری بابەتەکانی ژیانتان وەگەڕ دەخەن (واتەلاوازیان دەکەن، یارمەتییان دەدەن، یان هەڕەشەیان لێ دەکەن). ئەمەژیانی ئێوەیە: ئەم ژیانەلەڕۆمانێکی پڕ لەڕووداو و کارەسات ناچێت کەپاڵەوانەکەی بەردەوام بەرەوڕووی ڕووداوی تازەدەبێتەوەکەخاڵی هاوبەشیان نییە، بەڵکو لەئاوازێک دەچێت کەمۆسیقازانەکان پێی دەڵێن: تێمێک بەچەند واریاسیۆنەوە.

ئورانووس تا ڕادەیەک بەهێمنی بەهەموو ئاسماندا دەسووڕێتەوە. حەوت ساڵدەخایەنێت تا شکڵ، یان وێنەیەکی

ئاسمانی ببپێوێت. ئێستا وای دابنێن کەئەمرۆ ئورانووس لەگەڵ خۆری هۆرۆسکۆپەکەی ئێوەلەپەیوەندییەکی خراپدا بێت (بۆ نموونەبە نسبەت یەکترەوەگۆشەیەکی ۹۰ دەرەجەساز بکەن)، ئاوا ئێوەلەقۆناغێکی دژواری ژیانتاندان. پاش بیستویەک ساڵ ئەم دۆخەدیسان دووبارەدەبێتەوە(ئەمجارە ئورانووس لەگەڵ خۆری هۆرۆسکۆپەکەی ئێوەدەکەوێتەگۆشەیەکی ۱۸۰ دەرەجەوەکەهەمدیسان نیشانەی بێبەختی و کلۆڵییە)، بەڵام ئەم لێکچوونەفریودەرە، چونکەلەو کاتەدا کەئورانووس هێرشی بۆ خۆرەکەتانهێناوە، ئەستێرەی "ساتۆرن" لەگەڵ ڤینۆس لەپەیوەندییەکی ئەوەندەچاکدایەکەئەو زریانە بە ئارامی بە لاتاندا تێدەپەڕێت. ئەمەوەک ئەوەوایە کەدیسانەوەتووشی نەخۆشییەکەی پێشووتان ببنەوە، بەڵام ئەمجارەیان خۆتان لە نەخۆشخانەیەکی خەیاڵیدا ببیننەوەکەلەباتی ئەوەی پەرەستارێکی تووڕەئاگای لێتان بێت، فریشتەکان بەژوور سەرتانەوەبسووڕێنەوە.

وا دیارە ئەستێرەناسی، فێری قەدەرخوازیمان دەکات. تۆ ناتوانی لەبەر چارەنووسی خۆت هەڵبێیت! بەبۆچوونی من ئەستێرەناسی (تکایەتێبگەن، مەبەستم لەئەستێرەناسی، وەک خوازەی ژیانە) بابەتێکی زۆر وردبینانەتر دەهێنێتەئاراوە. ئێوەناتوانن خۆتان لەڕەوتی ژیانتان دەرباز بکەن! ئەم گوتەبەو مانایەیەکەنابێت تەسلیمی ئەو وەهمەبین کەگوایە دەتوانن سەرلەنوێ دەست بەهەموو شتێک بکەنەوە و ژیانێکی تازەساز دەکەن کەلەژیانەکەی پێشووتان نەچێت، یان بە گوتەیەکی دیکە، لە سفرەوەدەست پێدەکەنەوە. ژیانی ئێوەهەمیشەلەهەمان کەرەستەو خشت و کێشەو

گرفتانەسازدەکرێت و ئەوەی کەلەسەرەتادا پێتان وایە «ژیانێکی تازە»یە، پاش ماوەیەکی کەم بۆتان دەردەکەوێت کە ئەوەهەر ژیانەکەی پێشووی خۆتانە کەگۆڕاوە.

«هۆرۆسکۆپ» لە کاتژمێر دەچێت و کاتژمێریش قوتابخانەی کۆتاییە. کاتێک میلێک سووڕەکەی تەواو دەکات و دەگەڕێتەوەبۆ خاڵی دەسپێک، ئەوەقۆناغێک کۆتایی هاتووە. نۆ میل بەخێرایی جیاوازەوەلەسەر ڕووتەختەی هۆرۆسکۆپەکەو بەردەوام قۆناغێک کۆتایی پێ دێت و قۆناغێکی دیکەدەست پێدەکاتەوە. مرۆڤ، ئەو کاتەکە هێشتا گەنجە، ناتوانێت لەوە تێبگات کەزەمەن وەک بازنەیە، بەڵکو بەڕێگەیەکی دەزانێت کەبەردەوام بەرەو ئاسۆ تازەکان دەڕوات. ئەو هێشتا هەست بەوە ناکات کەژیانی بابەتێکی تاقانەیەو لەسەر یەک ڕەوت دەسووڕێت. ئەو کاتێک بەو ڕاستییەدەزانێت کەیەکەم گۆڕانەکان لەژیانیدا دەردەکەون.

ڕوبەنس چواردە ساڵانەبوو کەکچێکی بچووکی حەوت ساڵانەبەری پێ گرت و لێی پرسی:

«گەورەم دەکرێ بفەرمووی سەعات چەندەیە؟»

ئەمەیەکەم جار بوو کەژنێک، ژنێکی بێگانە، بەزمانێکی فەرمی پێی گوت «گەورەم». ڕوبەنس خۆشحاڵ بوو، پێی وابوو ئەوەسەرەتای قۆناغێکی تازەیەلەژیانیدا. ئەو دواتر ئەم ڕووداوەی لەبیر کرد و کاتێک وەبیری هاتەوەکەژنێکی زۆر ورووژێنەر و سەرنجڕاکێش پێی گوت:

«تۆ کە گەنج بوویت، ئایا بیرت لەوەدەکردەوەکە...»

ئەوەیەکەم جار بوو کەکەسێک، وەک شتێک لەڕابوردوودا، باسی گەنجێتییەکەی بکات. لەو کاتەدا وێنەی ئەو کچەمنداڵەی بیرکەوتەوەکەئەو دەمەسەعاتی لێ پرسیبوو، تێگەیشت کەئەو دوو بیچمەژنانەهی یەک کەسن. ئەم دوو ڕوومەتەکەبەڕێکەوت دیتبوونی هەرکام بەجیا هیچ مانایەکیان نەبوو، بەڵام کاتێک هەستی بەپەیوەندییەک لە نێوانیاندا کرد، بۆی دەرکەوت کەئەو دوو ڕووداوەلەسەر ڕووپەڕەی ژیانی دوو ڕووداوی چارەنووسساز بوون.

با ئەم بابەتەتان بەشێوازێکی دیکەبۆ بگێڕمەوە: بیهێننەپێشچاوی خۆتان کەڕووپەڕەی ژیانی ڕوبەنس خرابێتەسەر کاتژمێرێکی گەورەی سەدەکانی ناوەڕاست، کاتژمێرێکی وەک ئەوەی مەیدانی شارەکۆنەکەی پراگ کەبیستوپێنج ساڵ بەردەوام بە لایدا تێپەڕیوین؛ ئەو کاتژمێرە هەموو سەری سەعاتێک زەنگ لێدەدات و پەنجەرەیەکی بچووک بەژوور ڕووپەڕەکەیەوەدەکرێتەوە: بووکەڵەیەک، کچۆڵەیەکی بچووکی حەوت ساڵانەسەری لێ دەردێنێت و لەڕوبەنس دەپرسێت سەعات چەندەیە. ئەوسا پاش چەند ساڵی دیکە، کاتێک ئەو میلەخاوەی دەگاتە ژمارەیەکی دیکە، زەنگەکەلێدەدرێتەوە، پەنجەرەکەدەکرێتەوە و بووکەڵەکە، کە ئەمجارەژنێکی گەنجەسەری لێ دەردەهێنێت و دەڵێ:

«تۆ کە گەنج بوویت...»

## ٣

ئەو دەمەکەڕوبەنس زۆر گەنج بوو، نەیدەوێرا لای هیچ ژنێک باسی خەون و خولیا شەهوانییەکانی خۆی بکات. پێی وابوو دەبێ‌زەڕات بەزەڕاتی ئەو وزەشەهوانییەلەسەر لەشی ئەوان پراکتیزە بکات. ئەڵبەت دۆستەژنەکانیشی وەک خۆی بیریان دەکردەوە. ئەو بە شێوەیەکی لێڵ و تەمومژاوی یەکێک لەو ژنانەی بیردەهاتەوەکەئێمەبە «ئەلف» ناوی دەبەین. «ئەلف» جارێکیان لەکاتی نزیکی و جووتبووندا، لەپڕ ئەژنۆ و پاژنەی پێی لێ توند کرد و لەشی وەک پردێکی لێ هات کەبروسی بەلاشاندا خست و خەریکبوو لەسەر تەختەکە بیخاتەخوار. ئەم جووڵەوەرزشکارانەی ژنەکەپڕ بوو لەمانای درووژێنەر و شەهوانی، بۆ ئەو زۆر خۆش و چێژبەخش بوو. ئەو لەیەکەم قۆناغدا دەژیا کە قۆناغی بێدەنگیی وەرزشکارانەبوو.

ڕوبەنس وردەوردەوازی لەم بێدەنگییەهێنا. کاتێک بۆ یەکەم جار، لە کاتی نزیکی و جووتبوونی لەگەڵ ژنێکی گەنج، بە دەنگی بەرز ناوی هەندێک لەئەندامەکانی لەشی ژنەکەی برد، هەستی بەئازایەتی و بوێرییەکی زۆر کرد، بەڵام ئەو بوێرییەئەوەندەش گرینگ نەبوو کەخۆی پێی وابوو، چونکەدەربڕینەکەی، یان زۆر کورت بوو، یان زۆر شاعیرانە. هەرچۆنێک بێت، ئەو لەبوێرییەکەی خۆی زۆر شاد بوو (بە لایەوەسەیر بوو کەژنەکەش ئەو قسانەی پێ ناخۆش نەبوو). بیری لەوەکردەوەبۆ قسەکردن لەبارەی سێکس و

جووتبوونەوە هەندێک خوازەی ئاڵۆز دابهێنێت. ئەمە قۆناغی دووهەم بوو: قۆناغی خوازەکان.

هەر لەو ماوەدا ڕوبەنس سەردانی ژنێک بەناوی «ب»ێی کرد. ئەوان دوای ئەوەکەکۆمەڵێک وشەی سۆزداری (خوازەییان) بەگوێی یەکتردا چرپاند، جووتبوون. ئەو ژنە کاتێک ڕەحەت و ئاسوودەدەبوو کەبەئاشکرا و بەبێ تەمومژ باسی ئەندامی ژنانەی دەکرد. ئەوەیەکەم جار بوو کەڕوبەنس ئەو قسانەی لەزمانی ژنێک دەبیست (ئەویش بەشێوەیەک کە ئیتر خوازەیی نەبوو) بۆیەسەیری هاتێ و لەژنەکە وردبووەوە. ئەو زانیی کەئەم قسەئاساییانەی لە هەموو خوازەکانی پێشوو زیاتر پێ خۆشەو زیاتر دەیورووژێنێت.

پاش ماوەیەکی دیکە، ژنێک بەناوی «س» دەعوەتی کرد کە پانزدەساڵ لەخۆی بەتەمەنتر بوو. ڕوبەنس لەوەوپێش لەگەڵ «م»ی دۆستیدا، خۆی بۆ گوتنی زۆر قسەی قۆڕ و خۆشی سێکسی ڕاهێنابوو (ئەو قسانەئیتر خوازەیی نەبوون) کەبەتەما بوو لەکاتی جووتبووندا پێی بڵێت، بەڵام سەیر ئەوەبوو کەبەکردەوەنەیتوانی بیانڵێت. بەرلەوەڕوبەنس بوێرێت ئەو قسانەی پێ بڵێت، خودی ژنەکەهەموویانی گوت و بۆ جارێکی دیکەش ڕوبەنس تووشی سەرسووڕمان بوو. ئەو ژنەنەک هەر لە بوێریدا پێش ڕوبەنس کەوتبووەوە، بەڵکو ئەو شتانەشی پێ گوتبوو کەڕوبەنس خۆی بۆ گوتنیان ڕاهێنابوو. ئەم ڕێکەوتەزۆر سەرنجی ڕاکێشا و پێی وابوو پەیوەندیی بەوشیارییەکی شەهوانی، یان ئارەزوویەکی شاراوەی ڕۆحییەوەهەیە. بەم شێوەبوو کەڕوبەنس پێی نایەقۆناغی سێهەمەوەکەقۆناغی ڕاستییەقێزەونەکان بوو.

لەقۆناغی چوارەمدا پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ «م»ی دۆستی هەبوو. قۆناغی چپەچپی چینی. چپەچپی چینی ناوی یارییەک بوو

کەلەتەمەنی نێوان پێنج بۆ حەوتساڵیدا دەیانکرد. منداڵەکان لەڕیزێکدا دادەنیشتن و شتێکیان بەگوێی یەکتردا دەچرپاند. یەکەم بە گوێی دووهەمدا و دووهەم بەگوێی سێهەمدا و تا کۆتایی، تا ئەوەی کەدواهەم منداڵ بە دەنگی بەرز دەیگوتەوەو هەموویان بەو جیاوازییەپێدەکەنین کە لەنێوان یەکەم چرپەو ئەو دواچرپەدا هەبوو کە دواهەم کەس دەیگوت. ڕوبەنس و «م»ی هاوڕێی کەگەورەبوون، بەچرپاندنی دەستەواژەی قۆڕ و قێزەون، کەبەزیرەکی داڕێژرابوون، یاریی چپەچپیان دەکرد و ژنەکانیش کە نەیاندەزانی لەیارییەکەدا بەشدارن، ئەو قسەقۆڕ و قێزەونانەیان بۆ ژن و کچی دیکەدەگوێزایەوە. چونکەڕوبەنس و «م» چەند کچەهاوڕێیەکی هاوبەشیان بوو (بەزیرەکییەوەهاوڕێکانیان دەنارد بۆ لای یەکتر) و ئەو هەواڵپرسییەخۆشانەیان پێدا دەناردن. جارێکیان ژنێک، لەکاتی جووتبووندا، دەستەواژەیەکی ئەوەندەنائاسایی و گۆڕدراوی گوت کەڕوبەنس دەستبەجێ توانای داهێنەرانەی هاوڕێ شەیتانەکەی خۆی تێدا ناسییەوە. ڕوبەنس پێکەنینی لێ پژا و چونکە ژنەکەئەو پێکەنینەی بە گەیشتن بەترۆپکی چێژی سێکسی لێکدایەوە، بەجەسارەتێکی زیاترەوەڕستەکەی دووبارەکردەوەو بۆ سێهەم جاریش بەدەنگی بەرز گوتیەوە. ڕوبەنس بەچاوی خەیاڵ ڕۆحی هاوڕێکەی لەلەشی ئەو ژنەدا بینی.

لێرەدا ڕوبەنس «ب»ی بیرکەوتەوەکەلە کۆتایی قۆناغی خوازەکان، لە کاتی جووتبووندا پڕوشەیەکی ناحەزی بەزماندا هاتبوو. ئەو ئێستا، پاش تێپەڕینی ئەو هەموو ماوە، لەخۆی دەپرسی: ئایا ئەو کچەبۆ یەکەم جار بوو کەئەو وشەی بەزماندا دەهات؟ ئەو دەمەڕوبەنس گومانی لەوەنەبوو؛ پێی وابوو کچەکەخۆشی دەوێت و دەیەوێت هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات. ئەو

دڵنیا بوو کە کەسی دیکەلەژیانی «ب»دا نییە، بەڵام ئێستا دەیزانی کەدەبێ کەسێکی دیکەئەو قسەی فێری ئەو کچەکردبێت (یان با بڵێین ئەو کچەلەگەڵ کەسێکی دیکەدا ڕاهێنانی کردبێت) تا بەرلەوەی بەڕووبەنسی بڵێت، بە دەنگی بەرز گوتبێتی. ئەرێ، ڕووبەنس دوای چەند ساڵ، بە هۆی ئەزموونی یاریی چپچپەوەلەوەگەیشت کە کاتێک «ب» سوێندی وەفاداریی بۆ خواردووە، بێگومان دۆستێکی دیکەی هەبووە.

ئەزموونی یاریی چپەچپی چینی ئەوی گۆڕی: ئەو (ئەڵبەت ئێمەش) ئەو هەستەی دۆڕاند کەعەشق و نزیکیی شەهوانی واتەسۆزدارییەکی ڕەها، کەجیهانی دەوروبەرمان دەبێتەبیابانێکی بێکۆتایی کە دوو لەشی لێکدابڕاو لە ناوەڕاستیدا یەک دەگرن و یەکتر دەگووشن. ئەو لەپڕێکدا لەوەگەیشت کەساتەوەختی نزیکی و جووتبوون خەڵوەتێکی سەمیمانەی لێ ناکەوێتەوە. مرۆڤ لەکاتی پیاسەکردن لەشەقامی قەرەباڵغی شانزەلیزەزیاتر هەست بەخەڵوەتی سەمیمانە دەکات تا لەباوەشی پۆشتەترین ژنەکان. چونکەقۆناغی چپەچپی چینی بریتییەلە قۆناغی کۆمەڵایەتیی عەشق: کۆمەڵگە بەردەوام بازاری خەیاڵات و فانتازیای ناشایست گەرم دەکات و ڕێگە بۆ پەرەسەندن و بڵاوکردنەوەیان خۆش دەکات. ڕووبەنس ئەم پێناسەی بۆ نەتەوەداهێنا: کۆمەڵەخەڵکێک کەژیانی سێکسی و تایبەتییان بە چپەچپی چونیەکەوەگری دراوە.

ئەو دەمەڕووبەنس لەگەڵ کچێک بە ناوی «ت» ئاشنا بوو کەلەهەموو ژنەکانی پێشووی ژیانی فرەوێژتر و بەقسەتر بوو. «ت» لە دووهەمین دیدارياندا نهێنییەکی لەلا درکاند و گوتی زۆری حەز لەدەستپەڕکردنە و بەگێڕانەوەی چیرۆکی خۆش بۆ خۆی، بەوپەڕی چێژی سێکسی دەگات.

«چیرۆک؟ چ جۆرەچیرۆکێک؟ پێم بڵێ!»

ڕوبەنس لەگەڵی جووت بوو، کچەکەباسی کۆمەڵێک شتی وەک حەمام، ژوورێکی بچووک، ئەو کونانە کەلە دیوارەچێوییەکە کراون، ئەو چاوانەکەلەو کونانەوە سەیری ڕووتبوونەوەی دەکەن، دەرکەیەک کەلەپڕێکدا دەکرێتەوەو چوار پیاوی لێوەدێتەژوور و چی و چی... بۆ کرد. ئەوەچیرۆکێکی خۆش و ئاسایی بوو. ڕوبەنس لای «ت»ی زۆر پێ خۆش بوو.

بەڵام لەوەودوا شتێکی سەیر ڕوویدا: ئەو کاتێک لەگەڵ ژنانی دیکەدەخەوت، لەخەیاڵ و فانتازیاکانی ئەوانیشدا هەندێک بەشی ئەو چیرۆکەدووررودرێژانەی، تەنانەت بەهەمان وشەو ڕێزمانیشەوە، دەبینییەوەکە «ت» لەکاتی جووتبووندا بۆی گێڕابووەوە. تاکبێژیی «ت» ئاوێنەیەک بوو کەهەموو ئەو ژنانەی تێدا دەبینییەوەکەدەیناسین؛ وەک قامووسێکی لاروسی هەشت بەرگیی تایبەت بەوشەو زاراوەئێرۆتیکی و شەهوانییەکان بوو. ئەو سەرەتا بەپێی بنەماکانی یاریی چپەچپ، بیری لە تاکبێژییەزۆرەکەی ئەو دەکردەوە. کۆی نەتەوەیەک لەڕێگەی سەدان دڵدار و ئەویندارەوە خەون و خەیاڵی ناحەز و قێزەون لەملاولاوەکۆدەکەنەوە و وەک کەندوویەکی مێشەنگوێن دەیرێژنەناو سەری کچێکەوەکە ناوی «ت»یە، بەڵام دواتر تێگەیشت کەئەمەڕێی تێناچێت. ڕوبەنس هەندێک بەشی تاکبێژییەکەی «ت»ی لە زمانی ئەو ژنانە دەبیست کەدڵنیا بوو هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیان لەگەڵ «ت» نەبووە، چونکەدڵدارێکی هاوبەشیان نەبووەکەئەو قسانەی لێ ببیستن.

پاشان بیری ئەزموونەکەی لەگەڵ «پ» کەوتەوە: ڕوبەنس هەندێک ڕستەی ناحەزی ئامادەکردبوو کەلە کاتی نزیکی و

جووتبووندا پێی بڵێت، بەڵام «پ» لەپێش ئەودا پێی گوتبوو. لەو کاتەدا ڕوبەنس ئەوەی بەپەیوەندییەکی تەلەپاتی زانیبوو. ئایا «پ» دەیتوانی ڕستەکانی ناو مێشکی ئەو بخوێنێتەوە؟ ڕەنگەئەو پێش ناسینی ڕوبەنسیش ئەو ڕستانەی لە مێشکدا بووبێت، بەڵام چۆن دەکرێت هەردووکیان ڕستەی چونیەکیان لەمێشکدابێت؟ بێگومان دەبێ سەرچاوەیەکی هاوبەش لەئارادا بووبێت. ئەوسا بیری کردەوەکەدەبێ خوڕاوگەیەکی هاوبەشی خەیاڵ و فانتازیای شەهوانی بەناخی هەموو ژن و پیاوێکدا بگەڕێت. ئاوا کەسەکان نەوەک لەڕێگەی یاریی چپەچپەوە، بەڵکو لەڕێگەی ئەو خوڕاوگەنەکەسی (باڵاکەسی، یان بنکەسی)یەوەبەشێک لەم جۆرەخەیاڵ و فانتازیانەی دڵدارەکەیان پێ دەگات. ئەوەکە دەگوترێت ئەو خوڕاوگەکەبەناخ و دەروونی ئێمەدا دەگەڕێت خوڕاوگەیەکی نەکەسییە، بەو مانایەیەکە بڵێن ئەم خوڕاوگە هیی ئێمەنییە، بەڵکو هیی ئەو کەسەیەکەئێمەی ئافراندووەو بەناخ و دەروونی ئێمەیدا دەگێڕێت. بە گوتنێکی تر، ئەم خوڕاوگە هیی خودایە. کاتێک ڕوبەنس بۆ یەکەم جار ئەم بیرۆکەی بۆ خۆی فرمۆڵەکرد، پێی وابوو کفرە، بەڵام دواتر بیرۆکەی کفری وەلا نا و بەتەوازوعێکی ئایینییەوە لەم خوڕاوگەدا نوقم بوو. ئەو زانیی کە ئەم خوڕاوگە، هەموو ئێمەنەوەک نەتەوە، بەڵکو وەک منداڵانی خودا، پێکەوەدەبەستێتەوە. ئەو هەرجارێک کەخۆی لەم خوڕاوگەدا نوقم دەکرد، هەستی تێکەڵبوون لەگەڵ خودای لەئاهەنگێکی عیرفانیدا دەئەزموو. ئەرێ، قۆناغی پێنجەم، قۆناغی عیرفانی بوو.

## ٤

بەڵام ئایا چیرۆکی ژیانی ڕوبەنس جگەلەم عەشقە جەستەییە نییە؟

دەکرێ ئاوا بیربکەینەوە، ئەودەمەش کەئاوا دەرکەوت لەسەر ڕووپەڕەی ژیانی ڕووداوێکی گرینگ بوو.

کاتێک ڕوبەنس هێشتا لە قوتابخانە دەیخوێند، ماوەیەکی زۆر لەمۆزەخانەکان دەمایەوەو سەیری تابلۆی شێوەکاریی دەکرد. ئەو سەدان وێنەی بەگواش کێشابووەوە و لەبەر کێشانەوەی کاریکاتێری مامۆستاکان، لەناو هاوپۆلەکانیدا ناوبانگی دەرکردبوو. ئەو لەناو شادی و خۆشیی هاوپۆلەکانیدا ئەو کاریکاتێرانەی بەقەڵەم بۆ ڕۆژنامەدیوارییەکان و بەگەچ لەسەر تەختەڕەشەکان دەکێشایەوە. لەو قۆناغەدا بوو کەهەستی بەچەمکی ناوبانگ کرد. هەموو قوتابییەکان دەیانناسی و ستایشیان دەکرد. هەموویان بەگاڵتەوە پێیان دەگوت ڕوبەنس. ئەو بەیادی ئەو ساڵە خۆشانەوە (کەساڵی ناوبانگی بوون) ئەم نازناوەی بۆ هەموو ژیانی پاراست و (بە ساویلکەییەکی سەیرەوە) جەختی لەوە دەکردەوە کەهەموو هاورێکانی بەو ناوەبانگی بکەن.

ئەم شانازییەلەدوای تەواوکردنی قوتابخانەکۆتایی هات. لەزانکۆی هونەرە جوانەکان خۆی ناونووس کرد، بەڵام

لەتاقیکردنەوەکەیدا دەرنەچوو. ئایا لەئەوانی دیکەخراپتر بوو؟ یان بێبەخت بوو؟ سەیرە، من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەسادەو ساکارەبدەمەوە.

ڕوبەنس بەخەمساردییەوە دەستی بەخوێندنی ماف کرد و بۆ ئەو هەوڵەسەرنەکەوتووەشی گلەیی لەبێفکریی وڵاتی سویس، واتەنیشتمانەکەی خۆی دەکرد. ئەو هیوادار بوو لەشوێنێکی تر درێژەبەکاری هونەری بدات و دوو جاری دیکەش بەختی خۆی تاقیکردەوە: یەکەم جار، ئەو کاتەکەلەقوتابخانەی هونەرەجوانەکانی پاریس ناوی خۆی نووسی و لەتاقیکردنەوەکەی دەرنەچوو، پاشان کاتێک کەهێڵکارییەکانی بۆ چەند گۆڤارێک نارد. بۆچی گۆڤارەکان ئەو هێڵکارییانەیان وەرنەگرت؟ ئایا ئەوان خراپ بوون، یان ئەوانەی کەڕەتیان کردبوونەوەگەمژەبوون؟ یان مۆدەی ئەو هێڵکارییانە بەسەر چووبوو؟ من دیسان دەبێ دووبارەی بکەمەوەکەوەڵامی ئەم پرسیارانەش نازانم.

ڕوبەنس کەلەو تێکشکانانەی خۆی ماندوو بووبوو، وازی لەهەوڵدانی زیاتر هێنا. ئەڵبەت ئەمەبەو مانایەبوو (خۆشی بەوەی دەزانی) کەحەز و ئارەزووی بۆ کاری شێوەکاری لەوەکەمتر بووەکەخۆی پێیوکەم بوو؛ بەپێچەوانەی بۆچوونی سەردەمی قوتابییەتیی، چارەنووسی ئەوەنەبووە کە شوێن کاری شێوەکاری بکەوێت. ئەو سەرەتا لەم تێگەیشتنەی خۆی نائومێد بوو، پاشان لەناخی خۆیدا پاساوی بۆ ئەو تەسلیمبوونەی هێنایەوە. بۆ دەبێ حەز لەشێوەکاری بکات؟ حەز و ئارەزوو بە کەڵکی چی دێت؟ ئایا بە زمانێکی سادە، هۆکاری خراپیی زۆربەی تابلۆ و ڕۆمانەکان

ئەوەنییەکەهونەرمەندەکان حەز و ئارەزووی خۆیان بۆ هونەر بەشتێکی پیرۆز دەزانن و پێیان وایە خاوەنی ئەگەر نەڵێم ئەرک (ئەرکێک بەرامبەر بەخۆیان، یان تەنانەت بەرامبەر بەهەموو مرۆڤایەتی)، جۆرێک پەیامی تایبەتن. ئەو وردەوردە، بەهۆی کاریگەریی ئەم تەسلیمبوونەیەوە، هونەرمەند و نووسەرەکانی بەکەسانێکی نەوەک بەهرەمەند و داهێنەر، بەڵکو پلەوپایەخواز دەزانی و ئامادەنەبوو بیاندوێنێت.

گەورەترین ڕەقیب و مونافسی، «ن» کەهاوتەمەن و هاوپۆل و هاوشاریشی بوو، نەوەک هەر لە«پەیمانگەی هونەرە جوانەکان» وەرگیرا، بەڵکو پاش ماوەیەکی کەم سەرکەوتنێکی گەورەشی بەدەست هێنا. ئەو دەمەکەقوتابی بوون، هەموو کەس ڕوبەنسی بەبەهرەمەندتر لە«ن» دەزانی. ئایا ئەمەبەو مانایەیەکەهەموویان بەهەڵەچووبوون؟ یان بەهرەشتێکەکەدوای ماوەیەک دەفەوتێ و تیادەچێت؟ هەروا کەبۆخۆشتان دەزانن ئەم پرسیارانەش وەڵامیان نییە. هەرچۆنێک بێت، هەلومەرجێکی دیکەهاتەگۆڕێ. لەو دەمەدا کەتێکشکانەکانی ناچاریان کرد بۆ هەمیشەواز لەشێوەکاری بێنێت (لەو کاتەدا کە«ن» ئاهەنگی بۆ یەکەم سەرکەوتنی دەگێڕا) ڕوبەنس لەگەڵ کچێکی زۆر جوان ئاشنا بوو. ئەمەلەکاتێکدا بوو کە«ن» ژنی لەخێزانێکی ساماندار خواستبوو کەئەوەندە ناحەز بوو، کاتێک ڕوبەنس چاوی پێی کەوت لەسەر جێگەی خۆی وشک بوو. ئەو پێی وابوو کەچارەنووس بەم دوو ڕووداوەویستوویەتی شوێنی ڕاستەقینەی خاڵی قورسایی ژیانی پیشان بدات؛ ئەو خاڵەنەوەک لەژیانی کۆمەڵایەتی، بەڵکو لەژیانی تایبەتی و کەسیدایە؛ نەوەک

لەسەرکەوتنی پیشەیی، بەڵکو لەسەرکەوتن لەپەیوەندی لەگەڵ ژناندایە، بۆیەلەپڕێکدا ئەوەی تا دوێنێکەبە لایەوەتێکشکان بوو، ئێستا وەک سەرکەوتنێکی گەورەی لێ دەهات. ئەرێ، ئەو وازی لەناوبانگی خەباتکاری لەپێناوی ناسراوی هێنا (خەباتێکی بێهوودەو خەمبار)، تا خۆی بۆ ژیان تەرخان بکات. ئەو تەنانەت وەڵامی ئەو پرسیارەشی بەخۆی نەدایەوە کە بۆچی ژنان نوێنەرایەتیی «خودی ژیان» دەکەن. ئەمەبە لای ئەوەوەشتێکی حاشاهەڵنەگر بوو. دڵنیابوو کەلەبەرامبەر موونافسەکەی، کەژنێکی زۆر ناحەزی ساماندار خواستبوو، ڕێگەیەکی باشتری هەڵبژاردووە. لەدۆخێکی ئاوادا ژنەجوانەکەی نەوەک هەر بەمانای مزگێنیی خۆشی و شادی بوو، بەڵکو لەوپەڕی هەموو ئەمانەشەوە، سەرکەوتن و سەرچاوەی شانازیپێکردنیش بوو. ئەو بۆ چەسپاندنی سەرکەوتنە چاوەڕواننەکراوەکەی و بۆ ئەبەدیکردنی ئەم سەرکەوتنەی، ئەو ژنە گەنجە جوانەی خواست و دڵنیا بوو کەهەموو دنیا ئێرەیی پێ دەبەن.

## ٥

ژنان بۆ ڕوبەنس بە مانای «خودی ژیان» بوون، کەچی بەو حاڵەش ئامادەبوو ژنێکی جوان بخوازێت و هەموو ژنانی دیکەی لەکیس بچێت. ئەو ڕەفتارەی هەرچەندە نالۆژیکی، بەڵام تەواو سروشتی بوو. ڕوبەنس بیستوچوار ساڵی تەمەن بوو. تازەپێی نابووەناو قۆناغی ڕاستییەقێزەونەکانەوە(با بڵێین دوای ئەوەی کەسەردانی کچێک بەناوی «ب» و ژنێک بەناوی «پ»ی کردبوو)، بەڵام ئەو ئەزموونەتازانەشی هیچ شتێکی لەو دڵنیاییەنەگۆڕی کەشتێک لەوپەڕی پەیوەندیی سێکسییەوەبوونی هەیە: عەشق، عەشقی مەزن، گەورەترین بەهای ژیان کەهەرچەندەهیچی لێ نەدەزانی، بەڵام زۆر شتی لەبارەیەوەبیستبوو، زۆر شتی لەبارەیەوەخوێندبووەوەو زۆرجاریش هەستی پێ کردبوو. ئەو، گومانی لەوەنەبوو کەعەشق تاجی ژیانە(«خودی ژیان»ە و بە لایەوەلەپیشەکەی گرینگترە)، کەواتە دەبێ بەبێ هیچ ڕێکەوتنێک باوەشی بۆ بکاتەوە.

هەروها کەلەمەوپێش گوتم، میلەکانی سەر ڕووپەڕەی کاتژمێری سێکس، کاتی ڕاستییە قێزەونەکەیان پیشان دەدا، بەڵام کاتێک ڕوبەنس عاشق بوو، گەڕانەوەیەک بۆ قۆناغەکانی پێشوو ڕوویدا: ئەو لەناو جێدا، یان بێدەنگ بوو، یان بە زمانی خوازەو بە ئارامی لەگەڵ هاوسەری داهاتووی دەدوا. ڕازی بوو کە قێزەونی لە هەرێمی خۆشەویستییەکەی بچێتە دەر.

ئێستا ئەمەتان بە زمانێکی دیکەبۆ باس دەکەم: خۆشەویستیی ئەو ژنەجوانەئەوی بۆ دۆخی پاکیزەیی و بوخچەی نەکراوەیی گەڕاندبووەوە، چونکەهەروا کەپێشتر گوتم، هەموو تاکێکی ئەورووپی بەگوتنی وشەی عەشق، بەسەر باڵی خۆشییەوەبەرەو هەرێمی بەر لەجووتبوون (یان جووتنەبوون)ی فکر و هەست دەفرێت. بۆ ئەو شوێنەکە وەرتەری گەنج ئازاری کێشا و دومینیکی فرومنتین خەریکبوو لەئەسپەکەی بەرببێتەوە. ڕوبەنس، دوای دیداری لەگەڵ ژنەجوانەکەی، ئامادەبوو کەتیانەی گەرمی هەستی بخاتەسەر ئاگر و چاوەڕێی ئەو کاتەبێت کەبکوڵێت و هەستی بهەژێت. مابووەوە گرفتێکی ئاڵۆز؛ لەم کاتەدا ڕوبەنس لەشارۆچکەیەکی دیکەدۆستێکی بوو (پێی دەڵێین «ت») کەسێ ساڵ لەخۆی گەورەتر بوو، ماوەیەکی زۆر پێش لەناسینی ژنەکەی و چەند مانگیش دوای ئەو ناسینە، دیسان پێکەوەبوون و یەکتریان دەبینی. ڕوبەنس لەو ڕۆژەوەکە بڕیاری دا زەماوەند بکات، وازی لەبینینی ئەو دۆستەی هێنا. ئەم جودایی و وازهێنانەی لەبەر ئەوەنەبوو کە ئیتر«ت»ی خۆش نەدەویست (ئێمەدواتر لەوەدەگەین کەزۆریشی خۆش دەویست)، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کەزانیبووی خەریکە پێ دەنێتەناو قۆناغێکی گەورەو گرانی ژیانەوەکەپێویستەبەوەفاوەعەشقی گەورەی پیرۆز بکات. هەر چۆنێک بێت، حەفتەیەک بەر لەڕۆژی زەماوەندەکەی (کە لە ناخی دڵیەوەگومانی لەپێویستبوونی بوو) زۆری حەز لەبینینی «ت» بوو، کەبەبێ هیچ قسەوباسێک وازی لێ هێنابوو. ئەو چونکەهەرگیز بەو پەیوەندییەی نەگوتبوو عەشق، لەو هەموو حەز و ئارەزووەی خۆی بۆ جەستەو گیان و دڵی «ت» داچڵەکی. ڕوبەنس کە ئارام و ئۆقرەی لێ بڕابوو، چوو بیبینێت. حەفتەیەک لەلای مایەوەو باسی

داماویی خۆی بۆ کرد، لێی پاڕایەوە، سۆزی دەربڕی و ئاخ و ئۆفی پەشیمانیی بۆ هەڵکێشا، بەڵام «ت» جگەلە دیمەنی خەمباری ڕوومەتی، هیچی دیکەی پێ نەبەخشی، ئەو تەنانەت نەیهێشت کە دەست لەلەشیشی بدات.

ڕوبەنس، خەمۆک و ناڕازی، لەڕۆژی زەماوەندەکەیدا گەڕایەوەبۆ ماڵەوە. لەکاتی ئاهەنگەکەدا سەرخۆش بوو، ئێوارەش هاوسەرەکەی بۆ ماڵەتازەکەی خۆی برد. ئەو کەلە شەراب و ماتەم دڵتەنگ بووبوو، لەگەرمەی نزیکی و جووتبووندا، بە ناوی دۆستەکەی جارانیەوەبانگی هاوسەرەکەی کرد. ئای لەو کارەساتە! هەرگیز ئەو چاوەدرشتانەی لەبیر ناچێتەوەکەبە عەجایباتییەکی ترسناکەوەلێی ورد بووبوونەوە. لەو کاتەدا کە هەموو شتێک خەریکبوو دەڕووخا، بیری کردەوەڕەنگەدۆستەکەی جارانی بیەوێت تۆڵەی لێ بستێنێتەوەو لەڕۆژی زەماوەندەکەیدا، بەناوەکەی، بۆ هەمیشەژیانی هاوبەشییان تێکبدات، یان ڕەنگەگەمژەیی زمانی خۆی بێت کەخەریکەهاوسەرگیرییەکەی دەشێوێنێ و ئەمەش بە لایەوەشتێکی لەتاقەت بەدەر بوو. ئەو بۆ ماوەی سێ چوار چرکەی کوشندە نەیدەزانی دەبێت چی بکات، بەڵام کتوپڕ بەدەنگی بەرز گوتی:

«ئێڤا! ئەلیزابت! هەیدی!»

لەو کاتەدا ناوی هیچ کچێکی دیکەی بە بیردا نەهات، بۆیەدیسان دووبارەی کردەوە:

«هەیدی! ئەلیزابت! تۆ بۆ من هەموو ئەمانەیت! هەموو ژنانی ئەم دنیایەیت! ئێڤا! کلارا! ژوولی! تۆ وێنای هەموو ژنێکیت! تۆ کۆی هەموو ژنێکیت! هەیدی! گرێتشن، هەموو ژنانی دنیا لەتۆدا کۆبوونەتەوە؛ ناوی هەموو ژنەکان هی تۆیە!»

ئەوسا خێرا وەک عاشقێکی بێئۆقرەجوولایەوەو پاش چەند چرکەتێگەیشت کە چاوەتۆقاوەکانی دیسان ئاسایی بوونەتەوە، لەشی وەک بەرد نەماوە و ئاسوودەیی و دڵنیاییەکەی جارانی دەست کەوتووەتەوە. دیارەشێوەی خۆدەربازکردنەکەی لەو چەرمەسەرییەشەیتانانە، بۆ ئەوەنابێت بڕوای پێبکردرێت. پێم سەیرەئەو بووکەگەنجەچۆن ئەم چیرۆکەقۆڕ و بێمانایەی بەجیدی وەرگرت، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێتەوەکەهەردووکیان گیرۆدەی بیرۆکەی پێش جووتبوون و نزیکی بوون. بیرۆکەیەک کەعەشق بەشتێکی ڕەها دەزانێت. چ پێوەرێک بۆ عەشقی قۆناغی پاکیزەیی و بوخچەی نەکراوەیی هەیە؟ تەنیا پێوەری چەندایەتی. عەشق بریتییەلە هەستێکی گەورەی گەورەی گەورە. عەشقی درۆزنانەهەستێکی بچووکە، عەشقی ڕاستەقینەهەستێکی گەورەیە (die wahre Liebe!)، بەڵام ئایا ئەگەر بەدیدێکی ڕەهاوەسەیری بکەین، هەموو عەشقێک بچووک نییە؟ بێگومان بچووکە. کەواتەعەشق بۆئەوەی ڕاستەقینەیی خۆی بسەلمێنێت، دەیەوێت بەرهەست نەبێت، دەیەوێت میانڕەوی ڕەت بکاتەوە، نایەوێت وەک شتێکی مومکین دەربکەوێت، دەیەوێت ببێت بە وڕێنەی چالاکیی عەشق. (پۆل ئێلوارمان لەبیر نەچێتەوە!) بەزمانێکی تر، دەیەوێت شێت بێت. بەم شێوە نەبوونی ئەگەری جووڵەیەکی زێدەڕۆیانە، دەبێتەسەرترییەکی تەواو. بە لای بینەرێکی دەرەکییەوەئەم شێوەخۆدەربازکردنەی ڕوبەنس لەکێشەکە، جوان و شایستەنییە، بەڵام لە دۆخێکی وادا ئەوە تاکەئامرازێکی خۆدوورخستنەوەلە کارەسات بوو. ڕوبەنس کەوەک پیاوێکی شێت جوولایەوە، ڕەهایی شێتیەتیی عەشقی بەکارهێنا و سەرکەوتووش بوو.

## ٦

ئەگەر ڕوبەنس جارێکی دیکەش لەلای هاوسەرەگەنجەکەی بوو بەپاڵەوانی دلداری، ئەمەبەو مانایەنییەکەبۆ هەمیشەبەدرەوشتییەکەی وەلا نابێت، بەڵکو بەو مانایەیەکەدەیویست بەدڕەوشتیش بخاتەخزمەتی خۆشەویستییەوە. ئەو پێی وابوو لەشادی و خۆشیی تاکژنیدا دەتوانێت ئەزموونێکی زیاتر بەدەست بێنێت تا لەگەڵ سەد ژنی دیکە. ئێستا ئیتر تەنیا یەک پرسیار مابووەوەکە دەبوایەوەڵامی بداتەوە: کاتێک بەڕێچکەو ڕێبازی عەشقدا دەڕوات، دەبێ هەنگاوی چێژ و لەززەتی چەندە گورج یاخود خاو بێت؟ چونکە قەراربووڕێچکەو ڕێبازی عەشق زۆر دووورودرێژ و تەنانەت بێکۆتاییش بێت. ئەو پەیڕەویی لەڕێسایەک کرد؛ تێپەڕینی کات خاو بکاتەوەو پەلەنەکات.

با وای دانێین کەڕوبەنس داهاتووی سێکسیی خۆی لەگەڵ ژنەکەی، وەک هەڵگەڕان بەشاخێکی بەرزدا زانیبێت. ئەگەر قەرارەلەڕۆژی یەکەمدا بگاتە لووتکەی شاخەکە، کەواتەڕۆژانی دوایی دەبێ چی بکات؟ بۆیەدەبێ بەجۆرێک پلانی بۆ هەڵگەڕانەکەی دانابێت کەهەموو ژیانی بگرێتەوە. ئەو بەئارەزووی جەستەو بەمیتۆدی کلاسیکی لەژنەکەی نزیک دەبووەوەو خۆی لەو دۆخەخۆش وورووژێنەرە(کە بەرامبەر بەژنەکەی زیاتر لەهەموو

ژنێکی دیکەهەستی پێ دەکرد) دەپاراست و ئەوەی دادەنا بۆ ساڵانی داهاتوو.

بەڵام لەپڕ شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا: ئەوان لە یەکتر دوور کەوتنەوە، یەکتریان عەسەبی دەکرد، لەسەر ئەوەکەی لەناو ماڵدا خاوەنی دەسەڵات بێت شەڕیان دەبوو. ژنەکەی دەیگوت پێویستی بە شوێنێکی زیاتر بۆ ژیانی تایبەتیی خۆی هەیەو ئەویش لەوە نیگەران بوو کەبۆچی ژنەکەی، بۆ ناشتا، هێلکەی بۆ ناکوڵێنێ و لەوەزووتر کەبیریان لێ دەکردەوەلەیەکتر جودا بوونەوە. ئەو هەستەگەورەکە ویستبووی هەموو ژیانی لەسەر بنیاد بنێت، ئەوەندەزوو کۆتایی هات کەبەگومان بوو بڵێی ئەو هەستەی بووبێت، یان نا. ونبوونی هەست (ئەویش ئاوا کتوپڕی و خێرا و سادە) بە لایەوەخۆش و بڕواپێنەکراو بوو! ئەم بابەتەئەوی لەجاران زیاتر شەیدای خۆی کردبوو.

بالانسی بێخەوشیی هاوسەرگیرییەکەی لەلایەنی سۆزداری و سێکسییەوەبووبوو بەسفر. بەهۆی ئەو ڕیتمەخاوەوەکەبۆ خۆی دیاریی کردبوو، هەموو ئەزموونی لەگەڵ ئەو ژنەجوانەتەنیا جووتبوونێکی سادەی بەبێ ورووژانێکی گەورەبوو. ڕوبەنس نەک هەر نەیتوانیبوو بۆ لووتکەی شاخەکەی ببات، بەڵکو نەگەیشتبووەلاپاڵەکانیش، بۆیەهەوڵی دا لەدوای جیابوونەوەکەیان چەند جارێکی دیکەش سەردانی بکات (ژنەکەش پێی ناخۆش نەبوو. ئێستا کەشەڕی دەسەڵاتی ناوماڵ کۆتایی هاتبوو، پێی خۆش بوو دیسان لێی نزیک ببێتەوە) و هەوڵی دا لانیکەم چەند کار لەو کارە ناڕێساییانەی لەگەڵ بکات کەبۆ ساڵانی داهاتووی دانابوو، بەڵام

هیچیانی پێ نەکرا، چونکەئەمجارەبە ڕیتمێکی زۆر خێرا لێی چووەپێش و ئەو بێسەبری و بێئۆقرەییەی ڕوبەنس (کەڕاستەوخۆ بۆ قۆناغی ڕاستییە قێزەونەکەی بردبووەوە) بەبۆچوونی ئەو ژنەجوانەزۆر ناحەز و نەشیاو بوو، هیچ نیشانەیەکی عەشقی پێوەدیار نەبوو، بۆیەزۆری نەخایاند کە پەیوەندیی پاش هاوسەرگیرییەکەشیان کۆتایی هات.

ئەو هاوسەرگیرییەکورتەکەلەژیانیدا وەک ڕستەیەکی ناو دوو کەوانەبوو، وام لێ دەکات بڵێم ئەو گەڕایەوەبۆ شوێنێککەبەر لە ناسینی ژنەکەی لێی بوو، بەڵام ئەمەش ڕاست نییە. پەرەسەندنی هەستی عاشقانەو دامرکانەوەی سووک و بێئازار و چاوەڕواننەکراوی ئەو هەستە، ڕوبەنسی تووشی شۆکێکی گەورەکرد. بەهەموو کەسی ڕایگەیاند کەئێستا ئیتر بەناچاری کەوتووەتەپشت سنووری خۆشەویستییەوە.

# ٧

ئەو عەشقە گەورەکە دوو ساڵ لەوەوپێش بەشەوارەی خستبوو، شێوەکاریی لەبیر بردبووەوە، بەڵام کاتێک کەوانەی لەسەر هاوسەرگیرییەکەی داخست و بە خەم و ئازاری تاڵەوەزانیی کەکەوتووەتەپشت سنووری خۆشەویستییەوە، کتوپڕ تێگەیشت کەوازهێنانەکەی لەشێوەکاری تەسلیمبوونێکی بێ پاساو بووە.

ڕوبەنس دیسان دەستی بەهێڵکاریی ئەو دیمەنانەکردەوەکەپێی خۆش بوو بیانکێشێتەوە، بەڵام زانیی کەئیتر ناتوانێت کاری هونەری بکات. ئەو کاتێک قوتابی بوو بیری لەوەدەکردەوەکەهەموو شێوەکارەکانی دنیا بەڕێگەیەکی گەورەدا دەڕۆن، بەشارێیەکدا کەشێوەکارەکانی گوتیکی بە شێوەکارەگەورەکانی ئیتاڵیای سەردەمی ڕێنیسانس، شێوەکارەکانی هۆڵەندای بەدێلاکرۆڤا و دێلاکرۆڤای بەمانێت و مانێتی بەمۆنێت و بۆناردی (ئای کەچەندە بۆناردی خۆشدەویست!) بەماتیس و سێزانی بەپیکاسۆ دەگەیاند. ئەڵبەت شێوەکارەکان وەک دەستەیەک سەرباز نەبوون کەپێکەوەڕێگە ببڕن، نا، هەرکامەیان بەڕێی خۆیاندا دەڕۆشتن، لێ هەرکامەیان شتێکی بدۆزییایەوەدەبوو بەئیلهامێک بۆ ئەوانی دیکەش. هەموویان دەیانزانی کەئەو ڕێگەیەبەرەو شوێنەنەناسراوەکان، بەرەو مەبەستێکی یەکگرتووی هاوبەشیان دەبات، پاشان لەپڕێکدا ڕێگەکەون بوو. لەوەدەچوو مرۆڤ

لەخەونێکی خۆش بەئاگا بووبێتەوە؛ ماوەیەک بە شوێن ئەو وێنانەوەین کەخەریکن کاڵ دەبنەوە، کەچی لە ئەنجامدا تێدەگەین‌ناتوانین خەونەکان بگێڕینەوە. ڕێگەکەون بووبوو، بەڵام ڕێگە وەک ئاواتێکی درەوشاوەبۆ «بەرەوپێش چوون» لەگیانی شێوەکارەکاندا مایەوە. باشە، مادام ڕێگە نەبێت، «پێش» لەکوێیە؟ بۆ دیتنەوەی ئەو «پێش»ەونبووە، مرۆڤ دەبێت سەیری کوێ بکات؟ بەم شێوەئاواتی «بەرەوپێش چوون» بۆ نیگارکێشەکان وەک نەخۆشییەکی لێ هات، هەر یەکە و بە لایەکی جیاوازدا دەئاژوان، وەک ئاپۆرەی ناو مەیدانێک تێکدەئاڵان، ڕێی یەکتریان دەبڕی. لەکاتێکدا هەوڵیان دەدا لەیەکتر جیاواز بن، هەریەکەبەجیا شتێکیان دەدۆزییەوەکەلەوەوپێش دۆزرابووەوە. خۆشبەختانەزۆر زوو سەروسەکوتی خەڵک (نەوەک هونەرمەندەکان، بەڵکو بازرگانەکان و ڕێکخەری پیشانگەکان و فەرمانبەر و پیاوەکانی ڕیکلام و پڕۆپاگاندە) دەرکەوت و کۆتاییان بەم پاشاگەردانییەهێنا. لەوەدوا ئیتر ئەوانەبوون بڕیاریان دەدا کەلەهەر ساڵێکدا کامەدۆزراوەی تازەدیسان بدۆزرێتەوە. سەقامگیربوونەوەی دووبارەی دۆخەکەبڕەوی بەفرۆشی تابلۆی هونەرمەندانی هاوچەرخ دەدا. هەر ئەو خەڵکەسامانداره‌کەدەساڵ لەوەوپێش پێکەنینیان بە پیکاسۆ و دالی دەهات، تابلۆکانیان دەکڕین و ئەوەش‌ڕوبەنسی توورەدەکرد. ئێستا کەئەو کڕیارەسامانداران‌ەبڕیاریان دابوو نوێخواز بن، ڕوبەنس خۆشحاڵ بوو کەشێوەکار نییەو هەستی بەئاسوودەیی دەکرد.

ئەو جارێکیان سەردانی مۆزەخانەی هونەری مۆدێرنی نیویۆرکی کرد. لە نهۆمی یەکەم چاوی بە(تابلۆکانی) ماتیس، براک، پیکاسۆ،

میرۆ، دالی و ئێرنست کەوت و خۆشحاڵ بوو. جووڵەی فڵچەلەسەر قوماشەکەزەوقێکی کێوییانەی دەردەبڕی. واقیع، وەک ژنێک بوو کەیەکێک لە خواوەندەیونانییەکان دەستدرێژیی کردبێتە سەر، یان وەک گایەک کەلەگەڵ گابازێکدا زۆرانبازیی دەکرد، بەلام لەنهۆمەکەی تر کەتایبەت بوو بەشێوەکارەکانی هاوچەرخ، خۆی لەبیابانێکدا بینییەوە، نەجووڵەی بوێرانەی فڵچەبەسەر تابلۆکانەوەدیار بوو، نەهیچ نیشانەیەک لەزەوقی هونەری. گا و گابازیش ون بووبوون. تابلۆکان، یان پشتیان لەواقیع کردبوو، یان موو بەموو لاسایی واقیعیان کردبووەوە. لەمابەینی دوو نهۆمەکەشدا، ڕووباری لەتە، ڕووباری مەرگ و فەرامۆشی، بەخوڕ دەڕژا. ئەو لەو ساتەدا بەخۆی گوت کەڕەنگەپشتکردنەکەی لەنیگارکێشی مانایەکی یەکجار قووڵتر لەبێبەهرەیی، یان قیرسیچمەیی ببێت. لەسەر ڕووپەڕەی کاتژمێری هونەری ئەورووپی زەنگی نیوەشەو لێدراوە.

ئەگەر کیمیاکارێکی بلیمەتیان بۆ سەدەی نۆزدەبهێنایە، چ پیشەیەکی بۆخۆی هەڵدەبژارد؟ ئەمڕۆ کە هەزار کۆمپانیای پاپۆڕەوانی هەیە، کریستۆف کلۆمبۆس چیی بەسەر دەهات؟ ئەو کاتەکەشانۆ نەبوو، یان فەوتابوو، شێکسپیەر چیی دەنووسی؟

ئەمانە پرسیاری ئەدیبانەنین. کاتێک توانای داهێنانی کەسێک لەنیوەشەو تێپەڕیبێت (یان هێشتا زەنگی یەکەم سەعاتی لێ نەدرابێت) بەهرەکەی چیی بەسەر دێت؟ دەگۆڕێت؟ خۆی دەگونجێنێت؟ ئایا کریستۆف کلۆمبۆس دەبوو بەبەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی پاپۆڕەوانی؟ ئایا شێکسپیەر دەقی شانۆیی بۆ

هۆلیڤوود دەنووسی؟ پیکاسۆ نمایشی کارتۆنیی بەرهەم دەهێنا؟ ئایا هەموو ئەم بەهرەگەورانەکەتەژی نائومێدیی سەردەمێکی نابەجێ بوون، ئەوانەکەلەدەرەوەی سەردەمەکەیان، لە دەرەوەی ڕووپەڕەی ڕۆژگار لەدایک بووبوون و هەر بۆ ئەوەش لەدایک بووبوون، پاشەکشەیان دەکرد و دەخزانەنێو سەومەعەی مێژووەوە؟ ئایا ئەوانیش وەک ڕیمباو کەلەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا وازی لەشێعر هێنا، وازیان لەبەهرەی ناوەختی خۆیان دەهێنا؟

ئەڵبەتە هیچ وەلامێک بۆ ئەم پرسیارانەش نییە، نە من و نەئێوەو نەڕوبەنسیش بەوەلامی ئەم پرسیارانەنازانین. ئایا ڕوبەنسی ڕۆمانەکەی من بەهرەی بوون بەنیگارکێشێکی گەورەی بوو؟ یان هیچ بەهرەیەکی نەبوو؟ ئایا ئەو لەبەر بێبەهرەیی خۆی وازی لەنیگارکێشی هێنا، یان بەپێچەوانەوەوە، لەبەر ئەوەی کەبە ئاشکرا دەیزانی کارێکی هیچوپووچە؟ سروشتییەکەزۆرجار بیری لە ڕیمباو دەکردەوە(هەرچەندەبەتوانج و دڕدۆنگییەوە) و خۆی بەئەو بەراورد دەکرد. ڕیمباو نەک هەر بە ئارەزووی خۆی وازی لەشێعر هێنا، بەڵکو لەوەودواش خۆی بۆ کارێک تەرخان کرد کەلاقرتێکردن بەشێعر بوو: دەڵێن ئەو لە ئەفریقا قاچاخچییەتیی چەک و تەنانەت کۆیلەشی کردووە. ڕەنگەئەم دەنگۆیەتۆمەتێکی بێبنەما بێت، بەلام هەر چی بێت، وەک قسەیەکی زێدەڕۆیانەبۆ پیشاندانی ڕق و نەفرەتی وێرانکاریی ڕیمباو لەڕابوردووی هونەریی خۆی، قسەیەکی بێجێ نییە. ڕەنگەڕوبەنسیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر بەرەو کاروباری ئابووری و پشک و بۆرسەچووبێت، چونکەئەم چالاکییە(بە ڕاست، یان بە هەڵە) بە لای ئەوەوەلەگەڵ خەونەکانی بۆ

پیشەهونەرییەکەی نەدەگونجا و ناتەبا بوو. ڕۆژێک ڕوبەنس، لەو کاتەدا کە«ن»ی هاوپۆلی جارانی ناوبانگی دەرکردبوو، ئەو تابلۆیەی فرۆشت کە سەردەمێک «ن» بە دیاری پێی دابوو. ئەو بەم کارەنەک هەر کەمێک پارەی دەستکەوت، بەڵکو ڕێگەیەکیشی بۆ بەڕێچوونی خۆی لە داهاتوودا بینییەوە: ئەو تابلۆی نیگارکێشیی هونەرمەندانی هاوچەرخی (کەسووکایەتیی پێ دەکردن) بە ساماندارەکان (کەبە سووکی دەزانین) دەفرۆشت.

بێگومان لەدنیادا زۆر کەس بەفرۆشتنی تابلۆی نیگارکێشی بەرێدەچن و هەرگیز لەئاڵۆزترین خەون و خەیاڵەکانیشیاندا، بۆ ئەو پیشەهەست بەشەرمەزاری ناکەن. تازەمەگەر ڤلاسکوز، ڤەرمیر و ڕامبراندیش فرۆشیاری تابلۆی نیگارکێشی نەبوون؟ ئەڵبەت ڕوبەنس ئەوەی دەزانی، بەڵام ئەگەرچی دەیتوانی خۆی بەڕیمباوی تاجری کۆیلەبەراورد بکات، هەرگیز خۆی بەو شێوەکارەگەورانەی فرۆشیاری تابلۆ بەراورد نەدەکرد. ڕوبەنس تەنانەت بۆ ساتێکیش بڕوای بەبێسوودبوونی پیشەکەی فەرامۆش نەدەکرد. لەسەرەتادا خەمبار دەبوو، خۆی بۆ ئەو بەدڕەوشتییەی سەرکۆنەدەکرد، بەڵام دواتر بەخۆی دەگوت: بەسوودبوون یەعنی چی؟ دنیای ئەمڕۆ، بەم شێوەکەهەیە، هەڵگری کۆمەڵێک سوودی هەموو سەردەمەکانە. ئەمەواتە: بانترین ئاستی ڕەوشت بریتییەلە بێسوودبوون.

## ٨

دوازدەساڵ پاش جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی، ڕۆژێک ژنێک بەناوی «ج» سەردانی کرد. ژنەکەپێی گوت کەماوەیەک لەوەوپێش پیاوێک ئەوی بردووەتەوەبۆ ماڵی خۆی و لەوێ بۆ ماوەی دەخولەک بەئەنقەست لەژووری دانیشتنەکەجێی هێشتووەو گوتوویەتی دەیەوێت لەژوورەکەی دیکەتەلەفۆنێکی گرینگ بکات. پێدەچێت ئەو پیاوە وای نواندبێت کە گوایەتەلەفۆن دەکات، بەڵام لەڕاستیدا بەتەمابووبێت ژنەکەسەیری گۆڤارە ڕووت و پۆرنۆگرافییەکانی سەر مێزی قاوەخواردنەکەبکات. «ج» بەم ڕستەکۆتایی بە چیرۆکەکەی هێنا و گوتی: «ئەگەر من گەنجتر بوومایە، ئەگەر حەفدەساڵم تەمەن بوایە، بێگومان سەیری ئەو گۆڤارانەم دەکرد. ئەو تەمەنەتەمەنی خەیاڵاتی شێتانەیەکە مرۆڤ ناتوانێت لە بەرامبەر هیچ شتێکدا خۆی ڕابگرێت.»

ڕوبەنس بە هۆشپەرتییەوەگوێی بۆ «ج» شلکردبوو، تا ئەوەکەدواهەم وشەکانی دایانچڵەکاند. ئەو لەمەودوا چارەنووسێکی ئاوای دەبێت: هەرکەس شتێکی پێ بڵێت پێی وایەسەرکۆنەی دەکات، شتێکی بیر دەهێنێتەوەکەلەدەستی داوە، لێیان سەندووە، یان لەچنگیان دەرهێناوەو توانای گەڕاندنەوەی نییە. کاتێک «ج» باسی ئەو دەمەی کرد کەحەفدەساڵی تەمەن بووەو لە بەرامبەر هیچ

هەڵفریواندێک خۆی پێ نەگیراوە، ڕوبەنس بیری ژنەکەی کەوتەوەکەکاتێک بۆ یەکەم جار بینیویەتی حەفدەساڵی تەمەن بوو. بیری ئەو ئوتێلەکەوتەوەکەبەر لەهاوسەرگیرییەکەیان ماوەیەک لەوێ بووبوون. ئەوان، لەکاتێکدا هاوڕێکەیان لە ژوورەکەی پەنایاندا خەوتبوو، جووت بووبوون. ژنە گەنجەکەی ڕوبەنس چەند جار بەگوێیدا چرپاندبووی: «هاوڕێکەت گوێی لەدەنگمان دەبێ!» ئەو ئێستا (کەبەرەوڕووی «ج» دانیشتووەو ئەویش باسی خەیاڵاتی شێتانەی کچانی حەفدە ساڵەی بۆ دەکات) دەزانێت کەئەودەمەژنەکەی لەهەمیشەزیاتر دەنگی هەڵبڕیوەتا هاوڕێکەیان بیبیستێت. دواتر ژنەکەی بەردەوام ئەو شەوەی بیردەکەوتەوەو دەیگوت: «ئەرێ بەڕاست تۆ پێت وا نییەگوێی لەدەنگمان بووبێت؟» ئەودەمە ڕوبەنس پێی وابوو ژنەکەی لەشەرمان و لەترسی حەیای خۆی ئەوەی لێ دەپرسێت و هەوڵی دەدا دڵنیای بکات کەخەوی هاوڕێکەی قورسە. (ئێستا کەسەیری «ج»ی دەکرد، یادەوەریی ئەو گەمژەییەگەنجانەی خۆی تا بناگوێی سووردەکردەوە.)

## ٩

ڕۆژی دوایی ڕوبەنس بۆ ئەنجامدانی کارێک بەفڕۆکە چوو بۆ ڕۆم. سەعات چواری دوانیوەڕۆ کارەکەی کۆتایی هات. خەمێکی قورس باڵی بە سەردا کێشا، بیری ژنەکەی کەوتەوە، نەک هەر ژنەکەی، هەموو ئەو ژنانەکە تا ئەودەمەدیبوونی لەپێشچاوی بە ڕیز بوون. پێی وابوو هەموویانی لە کیس چووە و ئەوەندەی کە دەبوایە لەگەڵیان نەبووە. بۆئەوەی ئەم خەم و داخەلە بیر خۆی بباتەوەچوو بۆ گالەرییەکی شێوەکاری لەکۆشکی باربرینی (ئەو بۆ هەر شارێک بچوایەسەردانی گالەرییەکانی دەکرد)، پاشان چوو بۆ مەیدانی ئیسپانیا و بە پلیکانەپانەکاندا بەرەو پارکی "ڤێلا بۆرگێز" هەڵگەڕا. ڕیزی دووروردرێژی پەیکەرەی مەرمەڕی ئیتالییەناودارەکان، کەلەسەر پایەداندرابوون، ئەمبەراوبەری شەقامەپڕ لەدارودرەختەکانیان ڕازاندبووەوە. ڕوخساری پەیکەرەکان، کەلە دواهەم فیگەریاندا ڕچیبوون، وەک شیلەی ژیانیان دەردەکەوت. ڕوبەنس هەمیشەبەرامبەر بەلایەنی گاڵتەجاڕیانەی پەیکەرەکان هەستیار بوو. بزەی هاتێ. بیری ئەفسانەیەکی سەردەمی منداڵیی کەوتەوە. جادووگەرێک لەئاهەنگێکدا میوانەکان جادوو دەکات، میوانەکان لەحاڵەتی ئاسایی خۆیاندا، لەکاتێکدا دەمیان کراوەتەوەو بە هۆی جووینی پارووەکانەوە ڕوومەتیان خواروخێچ بووەو ئێسقانی کرۆستراوەیان بەدەستەوەیە، وشک دەبن. یادەوەرییەکی دیکە: ئەو خەڵکەکەلە شاری سۆدۆم هەڵدەهاتن، نەدەبوایەئاوڕ

لەدواوە بدەنەوە، چونکەدەبوون بەستوونی خوێ. چیرۆکی کتێبی پیرۆز بەئاشکرا ئاماژەبەوە دەکات کەهیچ ترس و تۆقین و سزایەک لەوەقورستر نییەکەساتێک ئەبەدی بکەیت و کەسێک لەڕەوتی زەمەن بخەیتە دەر و لەمیانەی جووڵەی سروشتیی خۆیدا ڕای بگریت. ڕوبەنس کەلەم بیرۆکانەی خۆیدا نوقم بووبوو (کە ساتێک دواتر فەرامۆشیشی کردن) لەپڕێکدا ئەوی بەرەوڕووی خۆی بینی. نا، هاوسەرەکەی نەبوو (ئەوەنەبوو کەچونکەدەیزانی هاوڕێکەیان لەو ژوورەی تر گوێی گرتووە، دەنگی هەڵدەبڕی) کەسێکی دیکەبوو.

هەموو شتێک لەساتێکدا دیاری کرا. کاتێک ئەو دوانەشان بەشانی یەکتر بوون، ڕوبەنس ناسییەوە. تەنیا یەک هەنگاو بەس بوو تا بۆ هەمیشەلەیەکتر داببڕێن. ڕوبەنس دەبوایەخێرا ڕاوەستێت و ئاوڕ بداتەوە(ئەویش وەک ڕوبەنس ئاوڕی دایەوە) و بانگی بکات.

ڕوبەنس هەستی کرد کەدەڵێی هەموو ئەم ساڵانەتاسەی بینینی ئەوی کردووەو هەموو دنیای لێ گەڕاوە. چەندسەد مەترێک بەولاترەوەکافەیەکی لێ بوو کەمێزەکانی لە بن دارەکان و ئاسمانێکی ئێجگار شیندا داندرابوون. ئەوان بەرەوڕووی یەکتر دانیشتن.

ئەو چاویلکەی ڕەشی لەچاودا بوو. ڕوبەنس بەنووکی پەنجەی چاویلکەکەی گرت و بەئارامی لایبرد و لەسەر مێزەکەدانا. ئەو بەری پێ نەگرت. ڕوبەنس گوتی:

«بەهۆی ئەم چاویلکەوەخەریکبوو نەتناسمەوە.»

ئاوی کانزاییان خواردەوە. نەیاندەتوانی چاو لەیەکتر بتروکێنن. ئەو ژنەلەگەڵ مێردەکەی هاتبوو بۆ ڕۆم و تەنیا سەعاتێک دەرفەتی بوو پێکەوەبن.

ناوی چی بوو؟ ناوی بچووکی چی بوو؟ ڕوبەنس لە بیری چووبووەوەو بێگومان نەشیدەپرسی. ئەو پێی گوتبوو (ڕاستگۆیانەش پێی گوتبوو) لەهەموو ئەم ماوەدا کەیەکتریان نەبینیوە، هەستی کردووەبەردەوام چاوەڕێی بووە. کەواتە چۆن دەیتوانی پێی بڵێ ناوی نازانێت؟! گوتی:

«دەزانی چ ناوێکم لێ نابوویت؟»

«نا، نازانم.»

«عودژەن.»

«عودژەن؟»

«ئەرێ، چونکەوەک عود ناسک بوویت. من ئەو نازناوەم بۆ دانایت.»

ئەرێ، ڕوبەنس بۆی دانابوو. ئەڵبەت نەک ساڵانێک لەوەوپێش و لەو ماوە کورتەی ئاشنایەتیاندا، بەڵکو هەر ئێستا و لەو پارکەی "ڤێلا بورگێنز"، چونکەپێویستی بەوەبوو کەبە ناوێک بانگی بکات و ئەو ناوەش لەبەر ئەوەبوو کەوەک عود ناسک و نیان بوو.

# ١٠

ڕوبەنس چیی لەو ژنەدەزانی؟ شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی. بەحاستەم لە بیری مابوو کەلەمەیدانی تێنیس چاوی پێی کەوتبوو (ئەودەمەڕوبەنس نزیکەی بیستوحەوت ساڵێکی تەمەن بوو، ئەو ژنەش دە ساڵێک لەخۆی گەنجتر بوو)، هەروەها جارێکیش بۆ کلووپێک دەعوەتی کردبوو. ئەودەمەجۆرەسەمایەک باو بوو کەژن و پیاو بەمەودای هەنگاوێک بەرەوڕووی یەکتر ڕادەوەستان، ناوقەدیان دەجووڵاند و بە نۆبەدەستێک و پاشان دەستەکەی تریان بەرەو دۆی سەماکەیان دەبردەپێش. هەر ئەم جووڵەبوو کەوێنەی ئەو ژنەی لەزاکیرەی ڕوبەنسدا تۆمار کرد. ئەو چ شتێکی تایبەتیی هەبوو؟ یەکەم، هەرگیز سەیری ڕوبەنسی نەدەکرد. ئەی سەیری کوێی دەکرد؟ سەیری شوێنێکی چۆڵ. هەموو سەماکەرەکان دەستیان لەئانیشکەوەدەنووشتاندەوەو بەرەوپێش و دوایان دەبرد. ئەویش ئەم جووڵەی بەتۆزێک جیاوازییەوەدەکرد: کاتێک دەستی دەبردەپێش، قۆڵی ڕاستی بەلای چەپدا و هاوکات قۆڵی چەپیشی بەلای ڕاستدا بازنەیەکیان دەکێشایەوە. وەک ئەوەبوو کەئەم جووڵەبازنەییانەبۆ شاردنەوەی ڕوومەتی بێت. وەک ئەوەبوو کەبیەوێت ڕوومەتی ون بکات. ئەودەمەئەم سەمایەیان بەنەشیاو دەزانی و وەک ئەوەبوو کەئەو کچەبیەوێت بەشێوەیەکی نەشیاو سەما بکات و هاوکاتیش نەشیاوییەکەی بشارێتەوە. ڕوبەنس شەیدای بووبوو! دەتگوت تا ئەو کاتەهەرگیز شتێکی لەو ژنە ناسکتر

و جوانتر و ورووژێنەرتر نەدیبوو. پاشان مۆسیقاکەبوو بەمۆسیقای سەمای تانگۆ. ئەو نەیتوانی لەبەرامبەر هاندەرێکی کتوپڕیدا بەر بەخۆی بگرێت و دەستی لەسەر مەمکی دانا. بۆخۆشی لەم جووڵەی خۆی تۆقا. ئەو کچە دەیتوانی چی بکات؟ هیچی نەکرد و لەکاتێکدا دەستی ڕوبەنس لەسەر مەمکی بوو، درێژەی بەسەماکردنەکەی دا و ڕاستەوخۆ سەیری پێشی خۆی کرد. ڕوبەنس کەدەنگی دەلەرزی لێی پرسی:

«ئایا تا ئێستا کەس دەستی لەمەمکت داوە؟»

ئەویش دەنگی دەلەرزی (وەک ئەوەبوو کەسێک بەحاستەم دەستی لەسیمەکانی عودێک دابێت) وەڵامی دایەوە:

«نەخێر.»

ڕوبەنس دیسان دەستی لەسەر مەمکی دانا و وشەی «نەخێر» وەک جوانترین وشەی دنیا لە گوێیدا دەنگی دایەوە؛ هۆشی لای خۆی نەمابوو؛ پێی وابوو خەریکەلەنزیکەوەسەیری شەرم و حەیا دەکات. شەرم و حەیای، بە هەمان شێوەکە«بوو»، دەدی و دەیتوانی دەستی لێ بدات، دەیتوانی ڕایمووسێت.

بۆ ئیتر نەیدیبووەوە؟ هەرچی بیری لێ کردەوە، تێنەگەیشت. بیری نەدەکەوتەوە.

## ١١

ئارتور شنیتسلەر، نووسەری خەڵکی ڤیەننا، لەسەرەتای ئەم سەدەدا چیرۆکێکی جوانی بەناوی «ئێلسا خاتوون» نووسی. پاڵەوانی ئەو چیرۆکەژنێکی گەنج و پاکیزەیەکەباوکی زۆر قەرزدارەو خەریکەمایەپووچ دەبێت. خاوەن قەرزەکەی بەڵێن دەدا ئەگەر کچی قەرزدارەکەبەڕووتی خۆی پیشان بدات لەقەرزەکەی خۆش ببێت. ئێلسا پاش شەڕ و کێشەیەکی قورس و دووردرێژی دەروونی لەگەڵ خۆی، لەئەنجامدا مل بەو خواستەی کابرا دەدات، بەڵام ئەوەندەشەرم لەڕووتبوونەوەی دەکات، کەشێت دەبێت و دەمرێت. بە هەڵە تێمەگەن، ئەمەحەقایەتێکی ئەخلاقی بۆ پڕۆتستۆکردنی ساماندارەخراپ و گەندەڵەکان نییە! نا، ئەمەچیرۆکێکی ئێرۆتیکییەکەپشووتان لێ دەبڕێت. لەڕێگەی ئەم چیرۆکەوەپەی بەو هێز و توانایەدەبەن کەسەردەمانێک ڕووتیی لەشی ژن هەیبوو. ئەمەواتەپارەیەکی زۆر بۆ خاوەن قەرزەکەو شەرمەزارییەکی ئەوەندەزۆریش بۆ کچەکەکەلەئەنجامدا کوشتی.

چیرۆکەکەی "شنیتسلەر" ساتەوەختێکی گرینگ لەڕووپەڕەی ئەوروپامان پیشان دەدا. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەی پاکسروشتدا، هێشتا تابۆ سێکسییەکان زۆر بەهێز بوون، بەڵام سست و لاوازبوونی ئەخلاق، ئارەزوویەکی بەهەمان ئەندازەبەهێزی بۆ پێشێلکردنی ئەو تابۆیانەبەئاگا کردەوە. شەرم و بێشەرمی، ئەو دەمەکەهەردووکیان هێزێکی یەکسانیان بوو، بەر یەکتر کەوتن و

یەکتریان بڕی. ئەوەساتێک بوو لەکێشەیەکی سێکسیی سەیروسەمەرە. ڤیەننا لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا بەرەوڕووی ئەم کێشەبووەوە.

شەرم بە مانای خۆڕاگرییەلە بەرامبەر شتێک کەئارەزووی دەکەین. کاتێک ئارەزووی شتێک دەکەین کەدەبێت لە ئاستیدا خۆ ڕابگرین، هەست بەشەرمەزاری دەکەین. ڕوبەنس یەکێک لەو دواهەم خەڵکەئەوروپییانەبوو کەشەرمی دەناسی، بۆیەکاتێک دەستی لەسەر مەمکی کچەکە دانا و شەرمەزاری کرد، ئەوەندەورووژا. ئەودەمەکە هێشتا لە قوتابخانەدەیخوێند، ڕۆژێک خۆی بەهۆڵێکدا کرد کەدەیتوانی لە پەنجەرەکانیەوەسەیری کچەهاوپۆلە نیوەڕووتەکانی بکات کەچاوەڕێی وێنەگرتن بەئەشەعەی ئێکس بوون. یەکێک لەکچەکان چاوی پێی کەوت و زریکاندی. ئەوانی دیکەش پاڵتۆکانیان لە بەر کردەوەو بەهەراوهاوار بەرەو هۆڵەکەهەڵاتن و شوێن ڕوبەنس کەوتن. ڕوبەنس بۆ ساتێک تۆقا. لەپڕ کچەکان لەبەرگی هاوڕێ و هاوپۆل و هاوکارەکانی جارانی هاتنەدەر کەحەزیان دەکرد گاڵتەی لەگەڵ بکەن، ڕوومەتیان پڕ بوو لەڕق و تووڕەیی، ڕق و تووڕەییەکی بەکۆمەڵ بۆ شوێنکەوتن و ئازاردانی. ڕوبەنس هەڵات، بەڵام ئەوان وازیان لەشوێنکەوتنی نەهێنا و نامەیەکیشیان بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەکەنووسی و شکایەتیان لێ کرد. بەڕێوەبەریش لە پێشچاوی پۆلەکەدا ڕوبەنسی تەمێ کرد و بەزمانێکی پڕ لەسووکایەتی، بە چاولەوەڕێن ناوی برد.

ڕوبەنس کەتەمەنی بوو بەچل ساڵ، ژنان مەمکدانەکانیان لە دۆلابەکاندا دادەنا و بە ڕووتی بە کەنار ئاوەکاندا دەسووڕانەوەو خۆیان پیشان هەموو دنیا دەدا. ئەویش لەقەراغ ئاوەکەپیاسەی دەکرد و نیگای لەڕووتیی چاوەڕواننەکراوی ژنەکان دەشاردەوە،

چونکەهێشتا ئەو فەرمانەکۆنەی لە گیاندا مابوو کە کەس نابێت دەستدرێژی بۆ سەر شەرمی ژنان بکات! ئەو کاتێک بەرەورووی ناسیاوێک، یان هاوکارێک، یان ژنەهاوڕێیەکی ڕووتی دەبووەوە، سەری لەوەسووڕدەما کەتێدەگەیشت ئەوەژنەکان نین کەلەو دیدارەشەرمەزار دەبن، بەڵکو خۆیەتی. ئەوسا دەخەجڵا و نەیدەزانی چاو و نیگای بەکامەلادا بگێڕێت. هەوڵی دەدا سەیریان نەکات، بەڵام ئەوەش نەدەکرا، چونکەپیاو ئەگەر تەنانەت سەیری دەست، یان نێوچاوانی ژنانیش بکات، هەر سنگ و مەمکیان دەبینێت. بۆیەهەوڵی دا ئەوەندەئاسایی و سروشتی سەیری سنگ و مەمکیان بکات کەگوایە خەریکەسەیری ئەژنۆ و نێوچاوانیان دەکات، بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەش، ئەو پێی وابوو کە سنگ و مەمکەکان تاوانی ئەوەی دەدەنەپاڵ کە هێشتا بەقەدەر پێویست لەگەڵ ڕووتبوونیان نەگونجاوەو هەستی دەکرد ئەو ژنانەکەلە قەراغی دەریا دەیانبینێت وەک ئەوانەن کەبیست ساڵ لەوەوپێش بە تاوانی چاولەوەڕاندن لای بەڕێوەبەری قوتابخانەشکایەتیان لێ کردبوو. هەروەها ئەمانیش وەک ئەوان توورەو یەکگرتوو بوون و بەجنێودان داوایان لێ دەکرد ددان بەمافی ڕووتبوونەوەیاندا بنێت.

ئەو لەئەنجامدا کەم، یان زۆر بەو دۆخەڕاهات، بەڵام نەیدەتوانی چاو لەو هەستەی بپۆشێت کەدیسانەوەشتێکی جیددی ڕوویداوە. لەسەر ڕووپەڕەی ئەورووپا زەنگی کاتژمێرێکی تر لێدراوە، شەرم و حەیا باری کردووە، شەرم و حەیا نەوەک هەر ون بووە، بەڵکو ئەوەندەبەکتوپڕی و تەنانەت لەیەک شەودا فەوتاوەکە گوایە هەرگیز نەبووە؛ کەگوایە ئەوەپیاوان بوون (کاتێک بەرەورووی ژنان بوونەتەوە) شەرم و حەیایان داهێناوە؛ گوایە شەرم و حەیا وەهمی پیاوان بووە، خەونی شەهوانیی ئەوان بووە.

## ١٢

هەروا کە گوتم، کاتێک ڕوبەنس لەهاوسەرەکەی جودابووەوە، لەپڕێکدا بۆ هەمیشەخۆی «لەدەرەوەی سنووری عەشق» بینییەوە. ئەو ئەم دەستەواژەی پێ خۆش بوو، زۆرجار (هەندێک جار بەخەم و هەندێک جاریش بەشادییەوە) لای خۆی دووبارەی دەکردەوە: من «لە دەرەوەی سنووری عەشق» درێژەبەژیانم دەدەم.

بەڵام هەرێمێک کەئەو بە«دەرەوەی سنووری عەشق»ی دەزانی، ساباتی باخ و حەساری لەبیرچووەوەی کۆشکێکی گەورەی جوان (کۆشکی عەشق) نەبوو، نەخێر، بەڵکو ناوچەیەکی بەربڵاوی جوان، بەپیت، ئێکجار جۆراوجۆر و بگرە جوانتر و گەورەتر لە کۆشکی عەشقیش بوو. لەنێو ئەو هەموو ژنانەداکەلەم هەرێمە دەژیان، حەزی لە هەندێکیان نەبوو، هەندێکیان سەرقاڵیان دەکرد و هەندێکیشیانی خۆشدەویست. کەواتەپێویستەلەم پارادۆکسە ئاشکرایەبگەین: لەودیو سنووری عەشقیشەوە ئەوین و دڵداری هەیە.

ئەوەی چیرۆکە دڵدارییەکانی ڕوبەنسی فرێدایە «دەرەوەی سنووری عەشق»، نەبوونی هەستیاری نەبوو، بەڵکو ئەوەبوو کە دەیویست ئەو چیرۆکانەلەبازنەی عەشقی جەستەیی و سێکسی دەرنەچن و هیچ کاریگەرییەک لەسەر ژیانی دانەنێن. جیا لەوەی کەئێمەچۆن عەشق پێناسەدەکەین، عەشق بابەتێکی بنەڕەتییەکەژیان

دەکاتە چارەنووس. ئەو ڕووداوانەکە«لەدەرەوەی سنووری عەشق» ڕوودەدەن، هەرچەندە جوانیش بن، وەک ڕێکەوتێک دەردەکەون.

دیسان دووبارەی دەکەمەوە، ژنەکانی ڕوبەنس ئەگەرچی بۆ «دەرەوەی سنووری عەشق»، بۆ هەرێمی ڕووداوە لاوەکییەکان ڕاونرابوون، بەڵام لەم میانەدا هەندێک ژنیش بوون کەڕوبەنس خۆشی دەویستن و بەردەوام بیری لێ دەکردەنەوە، کاتێک لێی دوور دەکەوتنەوە دەڕنجا و مادام لەئەو زیاتر گرینگییان بە کەسێکی دیکەبدایەهەستی بە ئێرەیی دەکرد. بەزمانێکی تر، تەنانەت لە دەرەوەی سنووری عەشقیش، عەشق هەبوو، چونکە وشەی «عەشق» یاسا بوو، ئەو عەشقانەشاراوەو سەرنجڕاکێشتر بوون.

ئەو، کاتێک لەباخی کافەکەی "ڤێلا بورگێز" بەرەوڕووی ژنێک دانیشتبوو کەبە عودژەن ناوی دەبرد، خێرا تێگەیشت کەئەو ژنە«خۆشەویستی دەرەوەی سنووری عەشق»ی دەبێت. ئەو دەیزانی کەگوێ بەژیان و هاوسەرگیری و دڵەخورپەکانی نادات، دەیزانی کەتەنیا جارجار یەکتر دەبینن و لە هەمان کاتیشدا دەیزانی کەبە شێوەیەکی سەیروسەمەرەخۆشی دەوێت. ڕوبەنس پێی گوت:

«ئەو ناوەی دیکەشم لەبیرەکەلە تۆم نابوو. پێم دەگوتی خانمی گوتیک.»

«من؟ خانمی گوتیک؟»

ڕوبەنس هەرگیز بەوە ناوەبانگی نەکردبوو. ساتێک لەوەوپێش، کاتێک لەشەقامەوەبەرەو کافەکەدەچوون، ئەم وشانەی بە مێشکدا هاتبوو. ئەو ژنەبە ڕێگەڕۆشتنەکەیدا ڕوبەنسی بیری نیگارەکانی گوتیک خستبووەوەکە ئەو دوانیوەڕۆیە، لە کۆشکی باربرینی بینیبوونی. ڕوبەنس درێژەی بەقسەکانی دا:

«ژن لەنیگارەکانی گوتیکدا بەسکی هەڵماسیویانەوەبەڕێگەدا دەڕۆن و سەریان بەرەو زەوی دانەواندووە. بەڕێگەڕۆشتنەکەی تۆ وەک بەڕێگەڕۆشتنی خانمێکی گوتیکە. سکت ڕووی لەئاسمانەو سەرت لە پووچی و بێهوودەیی هەموو شتێک گەیشتووەو سەیری زەوی دەکات.»

ئەو دووانەبە پیاسەکردن بەو شەقامەدا گەڕانەوەکەئەمبەراوبەری پەیکەر بوو، یەکتریان لێ بینیبوو. سەری بڕاوی پیاوەناودارەکان، کەلەسەر سەکۆکان داندرابوون، ئێجگار لووتبەرز دیار بوون.

ژنەکەلەبەر دەرکەی پارکەکەماڵاوایی لەڕوبەنس کرد. بڕیاریان دا ڕوبەنس لەپاریس سەردانی بکات. ئەویش ناو و (ناوی هاوسەرەکەی) و ژمارەتەلەفۆنەکەی دایەو پێی گوت کەلە چ کاتێکدا لەماڵەوەبەتەنیایە. پاشان بەبزەیەکەوەچاویلکەڕەشەکەی بۆ چاوی بردەوەو گوتی:

«باشە، بڵێی بێت؟»

ڕوبەنس گوتی: «بەڵێ» و ماوەیەکی زۆر سەیری دوورکەوتنەوەی ژنەکەی کرد.

# ١٣

دەردی دووری کەبەیادەوەریی جیابوونەوەلەهاوسەرەکەی هەڵیدەکوتایەسەر گیانی، جێی بۆ عودژەن و بیرکردنەوەلە عودژەن چۆڵ کرد. ڕوبەنس پاش چەند ڕۆژیش بەردەوام بیری لەو ژنەدەکردەوە. دیسانەوەهەوڵی دەدا ئەو شتانەی بیر بێتەوەکەلە خەیاڵیدا مابوو، بەڵام تەنیا ئەو ئێوارەی کلووپەشەوانەکەی بیر دەهاتەوە. بۆ سەدەمین جار ئەم وێنەی بە خەیاڵدا هات: ئەوان لەناو قەرەباڵغیی جووتەسەماکارەکاندا بوون و ئەو هەنگاوێک لەڕوبەنسەوەدوور بوو، لە پشتیەوەسەیری بۆشاییەکی دەکرد. وا دیار بوو کەنەیەوێت هیچ لە دنیای دەرەوەببینێ و بەتەمابێت لە خۆیدا نوقم ببێت. وا دیاربوو کە ئەوەی هەنگاوێک لێی دوور بوو، ڕوبەنس نەبێت، بەڵکو ئاوێنەیەکی گەورەبێت کە تیایدا سەیری خۆی دەکات. سەیری ناوقەدی خۆی دەکرد کەبەردەوام بەرەوپێش و دواوەوە دەجووڵا؛ سەیری دەستی خۆی دەکرد کەلە ئاست سنگ و ڕوومەتی بازنەی دەکێشایەوەو پێدەچوو بەتەمابێت بە دەست بیانشارێتەوە. دەتگوت دەیەوێت ونیان بکات. دەتگوت بەردەوام ونی دەکردن و دیسان دەری دەخستنەوە. ئەو لە کاتێکدا لە شەرموحەیای خۆی هەژابوو، لەو ئاوێنە خەیاڵییەدا سەیری خۆی دەکرد. سەماکردنەکەی نواندنی بێدەنگیی شەرم بوو، ئاماژەیەکی بەردەوام بەڕووتییەکی شاراوە.

حەفتەیەک پاش دیدارەکەیان لەڕۆم، لەلۆبی ئوتێلێکی گەورەی پاریس یەکتریان بینییەوەکەپڕ بوو لەژاپۆنی و بوونی ئەو ژاپۆنیانەهەستێکی خۆشی غەریبی و نەناسراوەیی پێ دەبەخشین. کاتێک چوون بۆ ژوورێکی ئوتێلەکە، ڕوبەنس دەرکەکەی داخست و لێی نزیک بووەوە، ئەوسا دەستی بۆ مەمکی برد و گوتی:

«ئەودەمەش کەپێکەوەسەمامان کرد، من هەر ئاوا دەستم لێ دایت. لەبیرتە؟»

گوتی: «بەڵێ.»

دەنگی وەک ئەوەبوو کەکەسێک بەحاستەم دەستی لەعودێک دابێت. ئایا ئەو ئێستاش وەک پازدە ساڵ لەمەوپێش شەرمی دەکرد؟ ئایا بێتینا شەرمی کرد کاتێک گۆتەلە ئاوەگەرمەکەی تەپلیتز دەستی بۆ مەمکی برد؟ ئایا شەرمەکەی بێتینا خەون و خەیاڵی گۆتەبوو؟ ئایا شەرمەکەی عودژەن خەون و خەیاڵی ڕوبەنس بوو؟ ڕاستییەکەهەرچی بووبێت، ئەم شەرمە، تەنانەت ئەگەر وەهمی شەرم، یان یادەوەریی وەهمی شەرمیش بووبێت، ئامادەبوو. شەرم لەو ژوورەبچووکەی ئوتێلەکەئامادە بوو. شەرم بە سیحری خۆی هەردووکیانی سەرخۆش کرد و مانای بە هەموو شتێک بەخشی. ڕوبەنس ژنەکەی ڕووت کردەوە. دەتگوت گەنجێکەکەتازەئەوی لە کلووپی شەوانەوەهێناوەتەوە. ئەوان جووتبوون و ڕوبەنس سەیری سەمای ژنەکەی کرد، ژنەکە لە ئاوێنەیەکی خەیاڵیدا سەیری خۆی دەکرد و لە پشت جووڵەی بازنەیی دەستەکانیەوە ڕوومەتی خۆی دەشاردەوە.

ئەوان، بە خۆشییەوە، خۆیان بەڕەوتی گەڕیانێک سپارد کەبەناخی هەموو ژن و پیاوێکدا دەگەڕێت؛ گەڕیانی سیحراویی خەون و خەیاڵەقێزەونەکان، کەهەموو ژنەکان لەودا وەک یەک

هەڵسوکەوت دەکەن، بەڵام ڕوومەتێکی جیاواز وزەو هێزێکی جیاوازیش بەو خەون و خەیاڵاتە قێزەونانەدەبەخشێت. ڕوبەنس گوێی لەهەموو قسەکانی عودژەن دەگرت، گوێی لەهەموو قسەکانی خۆشی دەگرت. ئەو لە ڕوومەتی ناسک و دەمولێوی جوانی کچێکی گوتیک ورد بووبووەوەکەقسەی ناحەز و قێزەونی دەکرد و بەردەوام سەرخۆشتر دەبوو.

لە لایەنی ڕێزمانییەوە، زەمەنی خەون و فانتازییەقێزەونەکانیان زەمەنی داهاتوو بوو. «جارێکی دیکەتۆ ئاوا و ئاوا دەکەیت... ئێمەئاوا و ئاوا بۆ یەکتر دەوەستین...» ئەم زەمەنی داهاتووەخەیاڵەکانی دەکردەبەڵێنێکی هەمیشەیی (بەڵێنێک کەلەکاتی وشیاریدا ناڕاست و بێمانایە، بەڵام چونکەهەرگیز لە بیر ناچێتەوە، وەک بەڵێنێک بەردەوام دووپات دەبێتەوە). پاشان ڕۆژێک وا ڕێدەکەوێت کەڕوبەنس، کاتێک لەگەڵ «م»ی هاوڕێیەتی، ژنەکەدەبینێت. ئەوان، سێ بەسێ، پێکەوە دەچن بۆ ژوورێکی نهۆمی سەروو، لەوێ بەدەم خواردنەوەوەقسەدەکەن؛ پیاوەکان ژنەکەڕووت دەکەنەوەو کاتێک مەمکدانەکەشی بۆ دادەکەنن، ئەو دەستی دەخاتەسەر مەمکەکانی و هەوڵ دەدا بە بەرەدەستی دایانپۆشێت. ئەوسا پیاوەکان (لە کاتێکدا کەئەو هەر شۆرتەکەی لە پێدایە) دەیبەنەبەر ئاوێنە(کەبەسەر دەرکەی کەنتۆرەکەوەیە) و ئەو کە دەستی ڕاستی لەسەر مەمکی ڕاست و دەستی چەپی لەسەر مەمکی چەپی داناوەو لەنێوان دوو پیاوەکەدا ڕاوەستاوە، وەک ئەوەی سیحر کرابێت، لەخۆی ورد دەبێتەوە. ڕوبەنس بە ئاشکرا چاوی لێیە کەلەو کاتەدا ئەوان سەیری ژنەکەدەکەن (سەیری ڕوومەت و دەستەکانی سەر مەمکی)، ژنەکەئەوان نابینێت، بەڵکو وەک هیپنۆتیزم کرابێت، تەنیا لە خۆی دەڕوانێت...

## ١٤

له کتێبی «پۆتیکا»ی ئەریستۆتالسدا "ئەپیزۆد"، یان ڕووداوی لاوەکی چەمکێکی گرینگە. ئەو ڕووداوە لاوەکییەکانی پێ خۆش نەبووە. وەک خۆی دەڵێ، ڕووداوەلاوەکییەکان لەڕوانگەی شیعرییەوەخراپترین جۆری ڕووداون. ڕووداوی لاوەکی نەبەرئەنجامی ئەو شتەیەکەپێشتر ڕوویداوەو نەهۆکاری ئەو شتەش کەلەداهاتوودا ڕوودەدات. ئەم جۆرەڕووداوەلە دەرەوەی زنجیرەی ڕووداوەکانەکەبونیادی چیرۆکیان لەسەر داندراوە. ڕووداوی لاوەکی، یان ئەپیزۆد، ڕووداوێکی نەزۆکەکەدەکرێت بێ ئەوەی چیرۆکەکەتووشی ساتمەو قرتان ببێت وەلای بنێین و ناتوانێت کاریگەرییەکی هەمیشەیی لەسەر ژیانی کەسایەتییەکان دابنێت.

تۆ سواری میترۆ دەبی تا سەردانی ئەو ژنەبکەیت کەژنی ژیانتە، بەڵام بەر لەوەی بگەیتەوێستگەی میترۆکە، کچێک کەپێشتر نەتناسیوەو سەرنجی ڕانەکێشاویت (چونکەتۆ دەچیت بۆ سەردانی ژنی ژیانت و گرینگی بەهیچی تر نادەیت) لەپڕ هەست بە سستی دەکات و خەریکەدەکەوێت، بەڵام چونکەتۆ لەلایەوەڕاوەستاوی دەیگریت و بۆ ماوەیەکی کورت، تا ئەو کاتەکە چاوی بکاتەوە، باوەشی پێدا دەکەیت و یارمەتیی دەدەیت لەسەر ئەو کورسییە دابنیشێت کەکەسێکی دیکەبۆی چۆڵکردووە. لەو کاتەدا قەتارەکەخەریکەڕادەوەستێت و تۆ بۆ ئەوەی بتوانی لێی دابەزیت و

بەرەو ژنی ژیانت بڕۆی، خێرا وازی لێ دەهێنی و ئانوسات ئەو کچەت لە بیر دەچێتەوەکەساتێک لەوەوپێش باوەشت پێدا کردبوو. ئەم ڕووداوە، ڕووداوێکی لاوەکیی ئاساییە. هەروا کە دۆشەک پڕەلە خوری، ژیانیش پڕە لەڕووداوی لاوەکی، بەڵام شاعیر (بەبۆچوونی ئەریستۆتالس) لیفەدروو نییەو دەبێ هەموو شتەزیادەکان لە چیرۆکەکەی بسڕێتەوە، هەرچەندەژیان لەخۆیدا هیچ نییە جگەلەو شتەزیادانە.

بینینی بێتینا بۆ گۆتە ڕووداوێکی لاوەکیی ئاسایی بوو؛ لەباری چەندییەوەبێتینا تەنیا بەشێکی بچووکی لەژیانی گۆتەداگیر کردبوو. ویڕای ئەوەش، گۆتەزۆری هەوڵ دەدا کەنەهێڵێت بێتینا دەورێکی هۆکاریی لەژیانیدا ببێت و دەیویست لەژیاننامەو سەربوردەی خۆی دەری هاوێژێت، بەڵام لێرەدایەکەئێمەپەی بەڕێژەییبوونی چەمکی ڕووداوی لاوەکی دەبەین، ئەو ڕێژەییبوونەکەئەریستۆتالس بەتەواوی بیری لێ نەکردبووەوە، چونکە هیچکەس ناتوانێت گەرەنتیی ئەوەبکات کەڕووداوێکی لاوەکی ئەو هێزەپێویستەی نەبێت کە ڕۆژێک لەڕۆژان، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، ببێتەهۆی سەرهەڵدانی ڕووداوی دیکە. کە دەڵێم ڕۆژێک لەڕۆژان، مەبەستم ئەوەیەکەڕەنگەتەنانەت لەپاش مردنی کەسەکەش بێت؛ بۆ نموونەوەک سەرکەوتنەکەی بێتینا، چونکەبێتیناش لەپاش مردنی گۆتەبوو بەبەشێک لەسەربوردەی ژیانی.

ئێمە دەتوانین پێناسەکەی ئەریستۆتالس بۆ ئەپیزۆد تەواو بکەین و بڵێین: هیچ ئەپیزۆدێک لەسەرەتاوە لە چارەی نەنووسراوەکەبۆ هەمیشەوەک ڕووداوێکی لاوەکی بمێنێتەوە، چونکەهەموو ڕووداوێک، هەرچەندەزۆر بچووکیش بێت، پێدەچێت درەنگ، یان زوو ببێتەهۆکاری کۆمەڵێک ڕووداوی دیکە و چیرۆک، یان

سەربوردەیەکی لێ ساز بکرێت. ڕووداوەلاوەکییەکان وەک "مین"ی چێندراون، زۆربەیان هەرگیز ناتەقنەوە، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەیەکەڕۆژێک لەڕۆژان یەکێک لەو ڕووداوە ئاساییانەببێت بە چیرۆکێک کەبە لاتانەوەچارەنووسساز بێت. ڕەنگەتۆ بە شەقامێکدا تێپەڕیت و لەپێش خۆتەوەچاوت بەکچێک بکەوێت کەبەرەوڕووت دێت و هەرچەندە هێشتا لێت دوورە، بەڵام وەها لێت ورد بووەتەوەکەپێت وایەشێت بووە. ئەو کچەکاتێک لێت نزیک دەبێتەوەهەنگاوی شل دەکات و ڕادەوستێ و پێت دەڵێ: «ئەرێ بەڕاست ئەوەتۆی؟ ئای کە چاوەڕوانت بووم!» ئەوسا دەستی لە دەوری ملت دەئاڵێنێت. ئەو هەمان کچەکەلە میترۆ، کاتێک کەتۆ بۆ سەردانی ژنی ژیانت دەچوویت کەئێستا مارەت کردووەو منداڵیشت لێی هەیە، لە هۆش خۆی چوو، کەوتە ناو باوەشتەوە، بەڵام ئەو کچەکەبەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو یەکترتان بینیوە، بڕیار دەدا عاشقی ئەو پیاوەببێت کەفریای کەوتووەو ئەم دیدارەبەرێکەوتەش بە ئاماژەی دەستی چارەنووس دەزانێت. ئەو لەوەودوا ڕۆژی پێنج جار تەلەفۆنت بۆ دەکات، نامەت بۆ دەنووسێت، دەچێت بۆ لای ژنەکەت و پێی دەڵێ عاشقی تۆ بووەو تۆ بەهی خۆی دەزانێت، تا ئەوەی کە ژنەکەت تەواو بێزار دەبێت و لە داخان دەست لەگەڵ سپووری گەڕەکەکەتان تێکەڵ دەکات و پاشان لە ماڵەوەهەڵدێ و منداڵەکەش لەگەڵ خۆی دەبات. ئەوسا تۆش بۆ دەربازبوون لە دەست ئەو کچەعاشقە، کەلەم ماوەدا هەموو کەلوپەلی ناو دۆلابەکانی هێناوەبۆ ماڵەکەت، هەڵدێیت و بۆ شوێنێکی دوور سەری خۆت هەڵدەگریت و لەوپەڕی نائومێدی و داماویدا دەمریت. ئەگەر ژیانی ئێمەوەک ژیانی خواوەندەکان هەتاهەتایی بوایە، چەمکی ڕووداوی لاوەکی هیچ مانایەکی نەدەبوو، چونکە لەبێکۆتادا هەموو

ڕووداوێکی بچووکیش، لەئەنجامدا کاریگەرییەک دادەنێت و چیرۆکێک ساز دەکات.

ئەو عودژەنەش بۆ ڕوبەنس، کەلەتەمەنی بیستوحەوت ساڵیدا سەمای لەگەڵ کردبوو، ڕووداوێکی لاوەکی بوو، بەلام کاتێک پاش پازدەساڵ بە ڕێکەوت لە پارکێکی شاری ڕۆم چاوی پێی کەوتەوە، ئەو ڕووداوەفەرامۆشکراوەلاوەکییەلەپڕێکدا بوو بەچیرۆکێکی بچووک، بەڵام تەنانەت ئەم چیرۆکەش، بەنسبەت ژیانی ڕوبەنسەوە، وەک ڕووداوێکی لاوەکی مایەوە. ئەم ڕووداوەلاوەکییەبەختی ئەوەی نەبوو کەببێت بەبەشێک لەژیاننامەو سەربوردەی ڕوبەنس.

ژیاننامە: زنجیرەی ئەو ڕووداوانەیەکەلە ژیانماندا بە گرینگیان دەزانین، بەلام لەژیاندا چی گرینگەو چی گرینگ نییە؟ چونکەبۆخۆمان نایزانین (هەرگیزیش بیر لەوەناکەینەوەکەپرسیارێکی ئاوا گەوجانەلە خۆمان بکەین) شتێک بە گرینگ دەزانین کەخەڵک بەگرینگی بزانن؛ شتێکی وەک ئەو فۆرمانەکەخاوەنکارەکان دەیدەنەدەستمان و ئێمەش پڕی دەکەینەوە. بەرواری لەدایکبوون، پیشەی باوک و دایک، ئاستی خوێندەواری، گۆڕینی پیشە، شوێنی نیشتەجێبوون، هاوسەرگیری، تەلاق، لەدایکبوونی منداڵەکان و نەخۆشییە گرینگەکان.

ئەوەشتێکی ناخۆشە، بەلام ڕاستە، ئێمەوا ڕاهاتووین کەوەک فۆرمێکی پیشەیی، یان حکوومی سەیری ژیانی خۆمان بکەین، بۆیەبەسەرچڵیی دەزانین کەژنێکی جگەلە ژنەیاساییەکەی خۆمان بهێنینەناو ژیاننامەکەمانەوە و کاتێک دەتوانین مل بەم سەرچڵییەئاوارتەیەبدەین کەئەو ژنەدەورێکی ئێجگار دیاری لەژیانماندا بووبێت. بێگومان ڕوبەنس نەیدەتوانی بۆ ئەو ژنەعودژەنەشتی وا بڵێت. عودژەن بەڕواڵەت و ڕەفتاریدا لەگەڵ

بیرۆکەی "ژن ـ ڕووداو" دەگونجا. ئەو ژنێکی ناسک بوو، بەڵام خۆی نەدەنواند. جوان بوو، بەڵام کەسی سەرسام نەدەکرد. حەزی لەنزیکی و جووتبوون بوو، بەڵام شەرمن بوو. ئەو بەگێڕانەوەی وردەکارییەکانی ژیانی تایبەتیی خۆی، ڕوبەنسی بێزار نەدەرکرد. هەرگیز ئەو بێدەنگییەبەپارێزەی خۆی دراماتیزەنەدەکرد و نەیدەکرد بە ڕاز و نهێنییەکی ترسناک. ئەو شازادەخانمی ڕاستەقینەی ڕووداوێکی لاوەکی بوو.

بوونی عودژەن لەگەڵ دوو پیاو لە ئوتێلێکی پاریس وروووژێنەر بوو، بەڵام ئایا ئەو سیانەپێکەوەخەوتبوون؟ با ئەوەشمان لە بیر نەچێتەوە کە عودژەن بۆ ڕوبەنس «خۆشەویستی ئەو دیوی سنووری عەشق بوو». لەکۆنەوە دەڵێن کەپێویستەڕەوتی ڕووداوەکان لەنزیکی و جووتبووندا ئەوەندە خێرا و بەپەلە نەبێت کەماندوویان بکات. ڕوبەنس بەرلەوەی عودژەن ڕووت بکاتەوە، داوای لە هاوڕێکەی کردبوو لەژوورەکەبچێتە دەر.

لە کاتی نزیکی و جووتبووندا قسەو وتوویژەکانیان، بەسەرنجدان بەزەمەنی داهاتووی ڕێزمانی، جارێکی دیکەش وەک بەڵێنێکی لێ هات کەهەرگیز نەدەهاتەدی. زۆری نەخایاند کە «م»ی هاوڕێی، لە ئاسۆی بینینی ڕوبەنسدا ون بوو، پێکەوەبوونی وروووژێنەری ئەو ژن و دوو پیاوەبوو بە ڕووداوێکی لاوەکیی بێئەنجام. ڕوبەنس، هەر کاتێک دەرفەتی چوون بۆ پاریسی بۆ بڕەخسایە، ساڵی دوو سێ جار عودژەنی بەتەنیا دەبینی. پاش ماوەیەک ئەو دەرفەتەش بڕا و جارێکی دیکەعودەژەن لەمێشکی ڕوبەنس سڕدرایەوە.

## ١٥

پاش چەند ساڵ، ڕۆژێک ڕوبەنس لەشارۆچکەیەکی بناری کێوی ئالپ لەسویس، کەلەوێ دەژیا، لەگەڵهاوڕێکەی لەکافەیەک دانیشتبوو. لەمێزەکەی پەنایدا چاوی بە کچێک کەوت کەخەریکبوو سەیری دەکرد. کچەکەدڵڕفێن و دەمولێوێکی شەهوانیی بوو (کەڕوبەنس حەزی دەکرد بەدەمی بۆقی بشوبهێنێت. ئەڵبەت ئەگەر بۆق بەجوان بزانین)، دەتگوت ڕێک ئەو ژنەیەکەهەمیشەبەئاواتی خواستووە. ئەو تەنانەت لەمەودای سێ چوار مەتریشەوەلەشولارەکەی زۆر پێ جوان بوو، حەزی لە ڕامووسینی دەکرد. کچەکەوەها لە ڕوبەنس ورد بووبووەوەکەهۆشی لەلای قسەکانی هاوڕێکەی نەمابوو، تەنیا بیری لەو شتەناخۆش و بەئازارەدەکردەوەکەدەبێت پاش چەند خولەکێکی تر لەو کافەیەبچێتەدەر و بۆ هەمیشەدەست لەو کچە دابشوات.

بەڵام ڕوبەنس دەستی لەکچەکەدانەشت، چونکەلەو کاتەدا کەپارەی قاوەکانی دەدا ئەویش هەستا و تا ئەوبەری شەقامەکە، بەرەو ئەو بینایەکە مەزاتخانەی بەرهەمی هونەری بوو، شوێنیان کەوت. کاتێک ڕوبەنس و هاوڕێکەی لەشەقامەکەدەپەڕینەوە، ئەو کچە ئەوەندەلێی نزیک بووبووەوەکەڕوبەنس نەیدەتوانی نەیدوێنێت. کچەکەبەشێوەیەک ڕەفتاری کرد کەدەتگوت چاوەڕێی دەرفەتێکی ئاوا بووە. ڕوبەنس سەری قسەی لەگەڵ کردەوەو تەواو لەهاوڕێکەی، کەبێدەنگ تا مەزاتخانەکەشوێنیان کەوتبوو، دابرا. کاتێک مەزات کۆتایی هات، ئەوان دیسان گەڕانەوەبۆ کافەکەی پێشوو؛ چونکەکەمتر

لەنیو سەعات کاتیان هەبوو، دەیانویست بە پەلەچییان لە دڵدایەبەیەکتری بڵێن، بەڵام زۆری نەخایاند کە بۆیان دەرکەوت شتێکی ئەوتۆیان نییەکە بەیەکتری بڵێن و ئەو نیوسەعاتە لەوەزیاترەکە چاوەڕێیان دەکرد. کچەکەخوێندکارێکی ئوسترالیایی بوو، یەک لەچوار بەشی بە ڕەگەز خۆجێیی بوو (کەئەوەی زۆر لێ دیار نەبوو، هەر چەندەخۆی بەئاسوودەیی باسی دەکرد)، لە لای پرۆفیسۆرێکی خەڵکی زوریخ «نیشانەناسیی شێوەکاری» دەخوێند و ماوەیەکیش بە نیوەڕووت لەکلووپێکی شەوانەدا سەمای کردبوو، بەو کارەبژێویی ژیانی دەست کەوتبوو. هەموو ئەمانەسەیر و سەرنجڕاکێش و بە لای ڕوبەنسەوەغەریب بوون (بۆچی لە ئوسترالیا بە نیوەڕووتی سەمای کردووە؟ بۆ لەسویس نیشانەناسی دەخوێنێت؟ باشە، نیشانەناسی چییە؟) لەبری ئەوەی کەئەم زانیارییانەکونجکۆڵییەکەی بورووژێنێت، لەوەبێزار بوو کە دەبێ بەهەموو ئەم شتانەبزانێت، بۆیەکاتێک ئەو نیوسەعاتە کۆتایی هات، هەستی بەئاسوودەیی کرد. ئەڵبەت هێشتا حەز و ئارەزووەکەی پێشووی مابوو (تەنانەت یەک تۆزقاڵیش مەیل و ئارەزووی بۆ ئەو کچەکەم نەبووبووەوە) و بەڵێنیپێدا ڕۆژی دواییش دیسان بیبینێتەوە.

ئەو ڕۆژەهەموو شتێک تێکچوو؛ بەسەرئێشەوەلە خەو هەستا، نامەبەر دوو نامەی ناخۆشی بۆ هێنا و کاتێک تەلەفۆنی بۆ فەرمانگەیەک کرد، دەنگێکی وەڕسی ژنانەڕێی پێ نەدا باسی داخوازییەکەی بکات. کاتێک کچەخوێندکارەکەلەدەرکەوەهاتەژوور، پێشبینییەدڵتەزێنەکەی ڕووبەنس هاتەدی. بۆچی جلوبەرگێکی زۆر جیاواز لە جلوبەرگی دوێنێکەی پۆشیبوو؟ کچەکەجووتێک پێڵاوی زۆر گەورەی تێنسی لەپێدا بوو، بەژوور پێڵاوەکانەوەگۆرەویی ئەستوور دیار بوو، بەسەر گۆرەوییەکەشیەوەپانتۆڵێکی خۆڵەمێشی

کەبەشێوەیەکی سەیر بەژنی بچووک دەردەخست و بەسەر پانتۆڵەکەشدا «باگر»ێکی لە بەر کردبوو. تەنیا لەپاش سەیرکردنی جاکەتەکەی، لە ئەنجامدا بەخۆشییەوەچاوی بەدەمی وەک بۆقی کچەکەکەوت کەهێشتا وەک پێشوو جوان بوو. ئەڵبەت زۆری حەز دەکرد بیتوانیایەهەموو شتێک لەخوار دەمییەوەبسڕێتەوە.

جواننەبوونی جلوبەرگەکەی شتێکی زۆر گرینگ نەبوو (نەیدەتوانی هیچ لەو ڕاستییەبگۆڕێت کەکچێکی جوانە) ئەوەی ڕوبەنسی لەهەموو شتێک زیاتر نیگەران دەکرد ئەوەبوو کەلە کچەکەنەدەگەیشت؛ بۆ دەبێت کچێکی جوان و دڵڕفێنی وەک ئەو کەدەچێت بۆ لای پیاوێک و حەزیش دەکات پێکەوەبن، جلوبەرگێکی وا نەپۆشێت کە پیاوەکەپێی خوش بێت؟ ڕەنگەبیەوێت پیشانی بدات کەجلوبەرگی بە لاوەزۆر گرینگ نییە؟ یان ڕەنگەئەو "باگر" و پێڵاوە گەورانەی بە لاوەجوان و دڵڕفێن بووبێت؟ یان ڕەنگە گرینگی بەو پیاوەنەدات کەبەتەمایەبیبینێت؟

ڕوبەنس، ڕەنگەلەبەر ئەوە کەئەگەر ئەو! دیدارەلە ئاستی چاوەڕوانییدا نەبوو بیانوویەکی بەدەستەوەبێت، دەستبەجێ بەکچەکەی‌گوت کەڕۆژێکی ناخۆشی تێپەڕاندووە و لەکاتێکدا هەوڵی دەدا بەشۆخی و گاڵتەوەبدوێت، هەموو ڕووداوەناخۆشەکانی ئەو ڕۆژەی بۆ گێڕایەوە. کچەکەبە لێوەجوان و باریکەکەی زەردەخەنەی بۆ کرد: «عەشق عیلاجی هەموو بێبەختییەکانە.» ڕوبەنس بەبیستنی وشەی «عەشق» کەلەمێژ بوو بە زمانیدا نەهاتبوو، داچڵەکی. نەیدەزانی مەبەستی لەم وشە چییە. ئایا مەبەستی نزیکی و جووتبوونە، یان هەستێکی ڕۆمانسییانە؟ لەو کاتەدا کەئەو بیری لەم قسانە دەکردەوە، کچەکەخێرا لەسووچێکی ژوورەکەخۆی ڕووت کردەوەو خزایە ژێر لێفەکەوە. ئەو شەرواڵەکەی لەسەر مێزەکەو

پێڵاو و گۆرەوییەئەستوورەکانیشی لەبن مێزەکەدانابوو. (ئەو پێڵاوەتێنسانەی، بەدرێژایی ئەو ماوەکەسەردانی زانکۆی ئوستراليا و شارەکانی ئەوروپای کرد، لەماڵی ڕوبەنس مانەوە.)

نزیکی و جووتبوونەکەیان بەشێوەیەکی سەیر ئارام و بێدەنگ بوو. دەکرێ‌بڵێم ڕوبەنس دەستبەجێ گەڕایەوەبۆ قۆناغی بێدەنگیی وەرزشکارانەی، بەڵام وشەی وەرزشکارانەتەواو لە جێی خۆیدا نییە، چونکە لەمێژ بوو کەلووتبەرزیی قۆناغی گەنجیەتیی بۆ باڵادەستیی جەستەیی و سێکسی نەمابوو. وادیار بوو ئەو چالاکییەیان زیاتر سەمبولیک و هێماییین بێت تا وەرزشکارانە. هەرچۆنێک بێت، ڕوبەنس نەیدەزانی کەجووڵەکانیان هێمای چی بوو. سۆز؟ خۆشەویستی؟ تەندروستی؟ شادیی ژیان؟ گوناه؟ هاوڕێیەتی؟ بڕوابوون بە خودا؟ داوای تەمەنی درێژ؟ (کچەکەنیشانەناسیی شێوەکاریی دەخوێند. ئایا وا چاک نەبوو کە ئەویش هەندێک شتی لەبارەی نیشانەناسیی عەشقی جەستەیی پێ بڵێت؟) جووڵەی ڕوبەنس بێمانا بوو. ئەو، یەکەم جار بوو لەوە دەگەیشت کەبۆخۆشی نەیدەزانی چی دەکات.

کەپشوویەکی کورتیان دا (ڕوبەنس بیری کردەوە کەبێگومان مامۆستای نیشانەناسییەکەشی لەماوەی دوو سەعات وانەگوتنەوەی، دەخولەکێک پشوو دەدا) کچەکە(دیسان بەو دەنگ و ئیقاعەئارامەی پێشووی) شتێکی گوت و وشەی ناڕوونی «عەشق»ی دووبارەکردەوە. بە خەیاڵی ڕوبەنسدا تێپەڕی: نموونەی جوانیی ڕەگەزی مێ لەقووڵایی گەردوونەوە دێنەسەر عەرز کەلەشیان وەک لەشی مرۆڤەزەوینییەکانە لەوپەڕی کامڵیدا، چونکەلەئەستێرەکەی خۆیان نەخۆشی نییەو لەشیان لە هەموو خەسار و نوقسانییەک پارێزراوە، بەڵام ئەو پیاوەزەوینییانە کەدەیانبینن شتێکی ئەوتۆ

لەڕابوردووی گەردوونیی ئەوان نازانن، بۆیەناتوانن تێیان بگەن. ئەو پیاوانەقەت ناتوانن پێشبینی پەرچەکرداری ئەوان بۆ قسەو ڕەفتاری خۆیان بکەن. ئەوان هەرگیز لەو هەستەناگەن کە لەپشت ڕوومەتی جوانی ئەو ژنانەوەشاردراوەتەوە. ڕوبەنس بیری کردەوەکە مومکین نییەپیاو بتوانێت لەم ژنەغەریبانە نزیک ببێتەوە. پاشان ئاوا بە خەیاڵەکەی خۆیدا چووەوە: ڕەنگە پەیوەندیی سێکسی ئێمەئەوەندەئۆتۆماتیکی بووبێت کە بتوانین تەنانەت لەژنانی گەردوونییش نزیک ببینەوە، بەڵام ئەوە نزیکییەکەبەبێورووژان و خۆشی، کردەیەکی عاشقانەیەکەبووەبەچالاکییەکی وەرزشی بەبێ هەست و گوناه.

پشووەکەکۆتایی هات، بەشی دووهەمی وانەی عەشق ئێستا نا ساتێکی دیکەدەستی پێ دەکردەوەو ڕوبەنس دەیویست شتێک بڵێت، شتێکی بوێرانە کە ئاسوودەیی کچەکەبشێوێنێت، بەڵام دەیزانی ناتوانێت ئەوەبکات. هەستی دەکرد وەک پیاوێکی غەریبەکەلە باس و بابەتێکەوە گلاوەو دەبێت بەزمانێک بدوێت کەچاک نایزانێت، تەنانەت نازانێت جنێوێشی پێ بدات، چونکە بەرامبەرەکەی بەئەدەبەوەلێی دەپرسێ: «مەبەستت لەو وشەچی بوو بەڕێز؟ من تێنەگەیشتم چیت گوت!» ئەو هیچی خراپی پێ نەگوت و بە ویقار و لەسەرەخۆ دیسان لێی نزیک بووەوە.

پاشان ڕوبەنس تا بەر دەرکەکەبەڕێی کرد (نەیدەزانی کەئەو کچەڕازییە،یان بێئومێد، هەرچەندە تا ڕادەیەک ڕازی دیار بوو) و بڕیاری دا ئیتر هەرگیز نەیبینێتەوە؛ دەیزانی کەئەوەکچەکە زویر دەکات، چونکە ئەم بێدەربەستییەکتوپڕەی (بێگومان هێشتا لە بیری مابوو کە دوێنێکەڕوبەنس چۆن شەیدای بووبوو!) بەلاوەشکستێکی بەئازارتر بوو، چونکەبە هۆکارەکەی نەدەزانی. ڕوبەنس دەیزانی

ئەگەر پێڵاوەتێنسەکانی ئەو کچەبەهەنگاوی خەمبارانەتر لەجاران بەدنیادا بسووڕێنەوە، ئەو تاوانبارە. ڕوبەنس ماڵاوایی لێ کرد و لەو کاتەدا کەکچەکەلەپێچی شەقامەکە تێدەپەڕی، خەمێکی قورس بۆ ژنەکانی ڕابوردووی لە گیانی نیشت. ئەم خەمەوەک نەخۆشییەکی کتوپڕی و بێوادە، قورس و چاوەڕواننەکراو بوو.

ڕوبەنس وردەوردەلە کێشەکەگەیشت. میلی کاتژمێرەکە گەیشتبووەژمارەیەکی نوێ. گوێی لەزەنگی کاتژمێرەکەبوو، چاوی لێبوو پەنجرەیەک کرایەوەو لەسایەی میکانیزمی سەیروسەمەرەی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، ژنێک بەپێڵاوی گەورەی تێنسەوەلێی هاتە دەر. بە ڕواڵەتی ژنەکەدا دیار بوو کەئارەزووی ڕوبەنس گۆڕاوە. ئیتر حەز لەژنی تازەناکات، دڵی لەلای دۆستەکانی جارانیەتی، ئیتر لە ئێستا بەدواوەئارەزووی ڕابوردوو دەکات.

ئەو ژنەجوانانەی دەبینی کەبەشەقامدا دەگەڕان و پێی سەیر بوو کەبۆ سەرنجیان ناداتێ. من تەنانەت پێم وایە ژنەکان سەرنجیان دەدایەو ئەو نەیدەزانی. پێشتر هەر بەدوای ژنانی تازەوەبوو. ئەوەندەی حەز لەژنی تازەبوو کەلەگەڵ هەندێکیان تەنیا جارێک خەوتبوو. ئەو کە گوایەئێستا دەیویست قەرەبووی ئارەزووی بۆ شتەتازەکان و بێدەربەستیی بەرامبەر بەشتەنەگۆڕەکان بکاتەوەو واز لەو بێسەبرییەگەوجانەی بێنێت کەبەرەو پێشیان دەبرد، بەتەمابوو بگەڕێتەوەبۆ دواوەو دۆستەکانی ڕابوردووی بدۆزێتەوە؛ دیسان وەک جاران دەستیان لەگەڵ تێکەڵ بکاتەوەو سوود لەهەموو ئەو شتانە وەربگرێت کەپێشتر وەری نەگرتبوو. ئەو دەیزانی کەلەمەودوا دەبێ لەڕابوردوودا بۆ هەیەجان و وروژانە گەورەکان بگەڕێت و ئەگەر بەتەمای هەیەجان و وروژانی تازەشە، دەبێ ئاوڕ لەڕابوردووی بداتەوە.

## ١٦

کاتێک ڕوبەنس زۆر گەنج بوو، شەرمی دەکرد و دەیویست لە تاریکیدا جووت ببێت. بەڵام لەتاریکیشدا چاوی دەکردەوەو بەهیوا بوو لە بەر تیشکی ئەو نەرمەڕۆشناییە کەلەپشت پەردەوەدەهاتە ژوور، تا ڕادەیەک ببینێت.

لەوەودوا نەک هەر بەڕۆشنایی ڕاهات، بەڵکو پێشی خۆش بوو. کاتێک دەیدی دۆستەکەی چاوی دەبەستێت، ناچاری دەکرد بیکاتەوە.

پاشان ڕۆژێک بە سەرسوورمانەوەزانیی کەخەریکەلە ڕۆشناییدا نزیکی دەکات، ئەڵبەت بەچاوی بەستراوە. ئەو لەکاتێکدا هەندێک یادەوەریی کۆنی دەهێنایە پێشچاوی خۆی، جووت دەبوو.

تاریکی بەچاوی کراوەوە.

ڕۆشنایی بە چاوی کراوەوە.

ڕۆشنایی بە چاوی بەستراوەوە.

ڕووپەڕەی ژیان.

## ١٧

ڕوبەنس پەڕەیەک کاغەزی بە دەستەوە گرت و هەوڵی دا ناوی هەموو ئەو ژنانەبنووسێت کەلە ژیانیدا بوون، بەڵام هەر لە سەرەتاوەشکستی هێنا. تەنیا چەند کەسێکیانی بەهەردوو ناوی بچووک و گەورەوەبیرکەوتەوە و ناوی زۆربەیانی لە بیر نەمابوو. ژنەکان (وردەوردە و بەهێمنی) بووبوون بە ژنی بێناو. ڕەنگەئەگەر جاروبار نامەی بۆ ئەو ژنانەبنووسیایە، چونکەدەبوایەناویان لەسەر پاکەتی نامەکان بنووسێت، لە بیری بمایە، بەڵام هیچ نامەیەکی عاشقانە«لەدەرەوەی سنووری عەشق» نانووسرێت. ئەگەر بەوەڕاهاتبایەکەهەموویان بە ناوی خۆیانەوە بانگ بکات، لەبیری نەدەکردن، بەڵام لە پاش ئەو ڕێکەوتەناخۆشەی شەوی زەماوەندەکەی، بڕیاری دابوو هەموو ژنەکان بەنازناوی عاشقانەی ئاساییەوەبانگ بکات، تا هەرکامیان، هەرکاتێک پێیان خۆش بێت ئەو نازناوەبەناوی خۆیان بزانن.

ڕوبەنس نیوەی لاپەڕەیەکی پڕ کردەوە(پێویست نەبوو پێڕستەکەتەواو بێت) لەباتی هەندێک ناوی لەبیرکراو، هەندێک تایبەتمەندیی ژنەکانی دەنووسی (خاڵ و بەڵەک، یان مامۆستا، یان شتی دیکە) و هەوڵی دەدا نوسخەیەک لەژیاننامەی هەر ژنێکی بیر بێتەوە. بۆ ئەوەش شکستی خوارد! بۆیەئەرکی خۆی سادەکردەوەو کارەکەی لەپرسیارێکدا کورت کردەوە: دایکوباوکیان کێ بوون؟

جگەلە یەک کەس (ئەو بەر لە ناسینی هەر کچێک لەگەڵ باوکی ئاشنا دەبوو) هیچ شتێکی لەدایکوباوکی ئەوانی دیکەلەبیر نەمابوو. بەڵام بەو حاڵەش، دەبێت دایکوباوک لەژیانی هەر کامەیاندا دەورێکی دیاریان بووبێت! بێگومان ئەوان زۆر شتیان لەبارەی دایک و باوکیانەوەبەئەو گوتبوو! ئەگەر ئەو نەیدەتوانی تەنانەت ئاساییترین زانیاریی ژیانی ئەو ژنانەشی بیربێتەوە، ئەی کەواتە چ بەهایەکی بەژیانیان دابوو؟

ڕوبەنس (دیارەبەکەمێک پەرۆشییەوە) پێی لەوەنا کەئەو ژنانەبۆ ئەو تەنیا ئەزموونێکی ئێرۆتیکی (جەستەیی) بوون؛ ویستی لانیکەم ئەو ئەزموونەی بیربێتەوە. بەڕێکەوت لەسەر ژنێکی (بێناو) کەپێی دەگوت دکتۆر، هەڵوەستەی کرد. یەکەم نزیکییەکەیان چۆن بوو؟ بیری ئاپارتمانەکەی خۆی لەو کاتەدا کەوتەوە. پێکەوەچووبوون بۆ ئاپارتمانەکەو ژنەکەخێرا بەرەو تەلەفۆنەکەچووبوو، ڕوبەنس گوێی لێ بوو کە بەکەسی ئەوبەر هێڵەکەی گوت: کتوپڕ تووشی کارێک بووەو ناتوانێت بچێت بۆ لای. هەردووکیان بەو قسەی پێکەنین و پاشان جووت بوون. سەیر بوو، هێشتا ئەو پێکەنینەلەگوێیدا دەزرینگایەوە، بەڵام جووتبوونەکەی لە بیر نەمابوو. لەکوێ کردبوویان؟ لەسەر فەرشەکە؟ لەسەر چرپاکە؟ لەسەر موبلەکە؟ ژنەکەلەناو چەرچەفەکاندا لەچی دەچوو؟ لەوەودوا چەند جاری دیکە یەکتریان دیبوو؟ سێ، یان سی جار؟ بۆچی ڕوبەنس ئیتر نەیبینیەوە؟ ئایا ڕوبەنس بەشێک لەو وتووێژەیانی لە بیر مابوو کەپێدەچێت بیست، یان سەد سەعاتی خایاندبێت؟ ئەو بەلێڵی بیری کەوتەوەکەژنەکەزۆرجار باسی دەسگیرانەکەی بۆ کردووە(ئەڵبەت لەبیری نەماوەکەچیی گوتووە) سەیرە! ئەوەی کەلەبیری ماوەتەنیا دەستگیرانەکەیەتی و هیچی دیکە. بە لای ڕوبەنسەوە

جووتبوونەکەیان لەکەرکردن و لەو وردەکارییە گەوجانە کە گوایە ژنەکەلەبەر ئەو کەسێکی دیکەی فریوداوە، کەمتر گرینگ بوو.

ڕوبەنس، بەئێرەییەوە، بیری کازانۆڤای کەوتەوە. نەک بیری ڕابواردنەکانی کەهەموو پیاوێک دەتوانێت بیکات، بەڵکو بیری زاکیرەکەمونێنەکەی کەوتەوە. ئەو نزیکەی سەدوسی ژنی بە ناو و ڕوخسار و جووڵەکانیانەوەلەبیر مابوو! کازانۆڤا، یۆتۆپیای زاکیرە. کارنامەی ڕوبەنس بەبەراورد لەگەڵ کازانۆڤا زۆر بچووک بوو. ئەو جارێک لەسەرەتای گەنجیدا کەوازی لەشێوەکاری هێنا، بەو بیرۆکەیە دڵخۆشیی خۆی دەدایەوەکەگوایە فێربوونی خودی ژیان لەتێکۆشان لەپێناوی هێز و دەسەڵات گرینگترە. ژیانی هاوکارەکانی کەشوێن سەرکەوتن کەوتبوون، نەوەک هەر بە لایەوەپڕ بوو لەگرژی و توندوتیژی، بەڵکو یەکجۆر و بۆشیش بوو. بەباوەڕی ڕوبەنس چیرۆک و ڕووداوەسێکسی و ئێرۆتیکیەکان ڕاستەوخۆ بەرەو دڵی ژیان، ژیانێکی پڕ و ڕاستەقینەو بەپیت، ژیانێکی پڕ لەڕەمزوڕاز و سێحراویان دەبرد، کە بەئاواتی دەخواست، بەڵام ئێستا لەپڕێکدا دەیدی کەبە هەڵەچووە؛ وێڕای ئەو هەموو ڕووداوەعاشقانەی، ئێستاش بەقەدەر ئەو کاتانە کە پازدەساڵی تەمەن بووە خەڵک دەناسێت. ئەو، بەدرێژایی هەموو ئەو ماوە، بەوە دڵخۆشیی خۆی دابووەوەکەگوایە ژیانێکی دەوڵەمەند و بەپیتی تێپەڕاندوە، بەڵام دەستەواژەی «ژیانی بەپیت» تەنیا فرمۆڵێکی ئابستراکت و تەجریدی بوو؛ کاتێک هەوڵی دا پەی بە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ئەم دەوڵەمەندی و بەپیتییەببات، جگەلەبیابانێکی چۆڵوهۆڵ، کەبا پیایدا دەسووڕایەوە، هیچی دیکەی نەدی.

میلی سەر ڕووپەڕەکەتیی گەیاند کەلەمەودوا تەنیا بیر لە ڕابوردوو دەکاتەوە، بەڵام چۆن دەکرێت تەنیا بیر لەڕابوردوو

بکاتەوە، لەکاتێکدا ئەو ڕابوردووەبیابانیکی چۆڵەکەبا چەند یادەوەرییەکی تێدا دەهێنێت و دەبات؟ ئایا ئەمەبەو مانایەیەکە ئەو تەنیا بەو چەند پارچەیادەوەرییەوەی دەنووسێت؟ ئەرێ. مرۆڤ دەتوانێت تەنیا بەچەند پارچەیادەوەرییەوەبنووسێت. هەرچۆنێک بێت، با زێدەڕۆیی نەکەی؛ ئەو هەرچەندە نەیدەتوانی هیچ شتێکی گرینگ لەو دکتۆرەگەنجەی بیربێتەوە، ژنەکانیدیکەبەخێرایی لە زەینیدا دەردەکەوتن.

کاتێک دەڵێم لە زەینیدا دەرکەوتن، ئایا دەزانن لە لای خۆم چۆن وێنای ئەم دەرکەوتنەدەکەم؟ ڕوبەنس پەیی بەبابەتێکی زۆر سەرنجراکێش برد: زاکیرەی مرۆڤ تەسویر ناکات، بەڵکو ڕەسم دەگرێت. ئەوەی لە هەرکام لەو ژنانەلەبیری مابوو چەند ڕەسم و وێنەیەکی زەینی بوو. ڕوبەنس جووڵەی بەردەوامی ژنەکانی لە بیر نەمابوو، تەنانەت جووڵەکورتەکانیشی نەدەدی، بەڵکو تەنیا ساتەوەختێکی ڕچیوی بێ بزووەی دەدی. یادەوەرییە سێکسی و ئیرۆتیکییەکەی ئەلبۆمێک وێنەی ڕووتی تێدا بوو، نەک فیلمێکی پۆرنۆگرافی. ئەڵبەت ئەلبۆمێک وێنە زێدەگۆییە، چونکەکۆی ئەو وێنانەلە حەوت، یان هەشت دانەتێنەدەپەڕین: ئەم وێنانە جوان و دڵڕفێن بوون، بەڵام بەداخەوەزۆر کەم بوون. حەوت، یان هەشت دانەکە هەرکامەیان لەچرکەیەکی ئەو ژیانەسێکسی و ئیرۆتیکییەکەمتر بوون کەبۆی مابووەوە و سەردەمانێک بڕیاری دابوو هەموو توانا و بەهرەی خۆی بۆ تەرخان بکات.

من چاوم لەڕوبەنسەکەلەپشت مێزێک دانیشتووەو دەستی کردووەبەستوونی چەناگەی و وەک پەیکەرەی ڕۆدین کەوتووەتەبیرەوە. بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئەگەر خۆی ساغ کردبێتەوەکەهەموو ژیانی بووەتەکۆمەڵێک ئەزموونی ئیرۆتیکی و

ئەم ئەزموونانەش لەحەوت وێنەی بێگیان تێناپەڕن، لانیکەمی بەهیوایە لەکەلوکونی زاکیرەیدا وێنەی هەشتەم و نۆهەم و تەنانەت دەهەمیش بدۆزێتەوە؛ بۆیە ئاوا دانیشتووەو دەستی کردووەبەستوونی چەناگەی. ئەو دیسان هەوڵەدا کەیەکەیەکەی ژنەکانی بیربێتەوەو بۆ هەرکامەشیان وێنەیەکی لەبیرکراو ببینێتەوە.

ئەمەبەرەو بابەتێکی سەیری دیکەی دەبات؛ هەندێک لەدۆست و دڵدارەکانی لەجووڵەشەهوانییەکانیاندا زۆر گورخ و لە ڕواڵەتیشدا زۆر جوان و دڵڕفێن بوون، کەچی بەو حاڵەش کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر گیانی دانەناوەو وێنەی ورووژێنەریان لەپاش خۆیان جێنەهێشتووە. ڕوبەنس زیاتر سەرنجی بۆ لای ئەو ژنانە ڕاکێشرابوو کەلەکاتی جووتبووندا کەمجووڵەو بە ڕواڵەتیش ئاسایی بوون، واتە ئەو ژنانەکەدەیویست بەهایەکی کەمتریان بداتێ. دەتگوت یادەوەری (و فەرامۆشیش) بووەتەهەوی ئەوەکەجارێکی تر بەبەهاکانیدا بچێتەوەو بە شێوەیەکی بنەڕەتی لێیان بکۆڵێتەوە. ئەوەی لەژیانی سێکسییدا بە خواست و ئیرادەو نەخشەو پلانی پێشوەخت بوو، بەهای نەمابوو، بەڵام ئەو ڕووداوە شەهوانییە چاوەڕواننەکراوانەکەهیچ شتێکی سەیروسەمەرەیان تێدا نەبوو، لە یادەوەریی ئەودا زۆر ئازیز و بەنرخ بوون.

ڕوبەنس بیری لەو ژنانەدەکردەوەکەیادەوەرییەکەی بەهایەکی زۆری پێدابوون: یەکێک لەو ژنانەکە هێشتا ڕوبەنس حەزی دەکرد ببینێتەوە، بێگومان ئێستا پیر بووبوو؛ ئەوانی دیکەش لە هەلومەرجێکدا دەژیان کەبەگران دەیتوانی بیانبینێتەوە. بەڵام عودژەن لەوێ بوو. هەشت ساڵ بوو کەنەیدیبوو. دوو وێنەی ئەوی بیرکەوتەوە. لەوێنەی یەکەمدا عودژەن هەنگاوێک لەولای ڕوبەنسەوەڕاوەستابوو، بەجووڵەیەک کەپێدەچوو بۆ شاردنەوەی

ڕوومەتی بێت، دەستی هێنابووەپێش. وێنەکەی دیکەش ئەو ساتەی تۆمار کردبوو کەڕوبەنس، لە کاتێکدا دەستی خستبووە سەر مەمکی، لێی دەپرسی ئایا تا ئێستا کەس ئاوا دەستی لێداوە و ئەویش بەدەنگێکی ئارام و لەسەرخۆ، لە کاتێکدا چاوی لە پێشی خۆی بڕیبوو، وەڵامی دەدایەوە: «نا». لەکۆتاییدا ڕوبەنس (لەوێنەیەکدا کە لەوانی دیکە وروورژێنەرتر بوو) عودژەنی لەگەڵ دوو پیاو بینی کەلە ناویاندا دەستی بەسنگ و مەمکی ڕووتی خۆیەوەگرتبوو، شاردبوویەوە. ئەوەسەیر بوو کەئەو لە هەر سێ‌وێنەکەدا جوان بوو، بە هەمان شێوەش لە پێشی خۆی ورد بووبووەوە.

ڕوبەنس خێرا سەیری ژمارەتەلەفۆنەکەی کرد کەسەردەمێک لەبەری کردبوو. عودژەن بە شێوەیەک لەگەڵ ڕوبەنس دوا کەدەتگوت دوێنێکەلە یەکتر جودا بوونەتەوە. ڕوبەنس سواری فڕۆکەبوو چوو بۆ پاریس و (ئەمجارەپێویست بەبیانووی تر نەبوو، ئەو بەتایبەت بۆ لای عودژەن دەچوو) لەو ئوتێلە چاوی پێی کەوت کەچەند ساڵ لەوەوپێش لەوێ‌لە بەر ئاوێنەیەک لەنێوان دوو پیاو ڕاوەستابوو، بە بەرەدەستی سنگ و مەمکی داپۆشیبوو.

## ١٨

عودژەن وەک جاران بەژنوبالای جوان و جوولەی دلرفێن بوو، هیچ لەو دۆخەنەجیبانەی ئەو دەمانەی نەگۆڕابوو. تەنیا یەک شت گۆڕابوو: ئێستا ئەو پێستەلەنزیکەوەتەری و تازەیی جارانی نەمابوو. ڕوبەنس بەچاوی خۆی ئەم گۆڕانەی دەدی، بەلام سەیر ئەوەبوو ئەو ساتانەکەسەرنجی بەم گۆڕانەدەدا ئێجگار کورت بوون و بە گران لە چەند چرکە تێدەپەڕین. دوای ئەوەدیسان عودژەن دەگەڕایەوەبۆ وێنەکەی جارانی، کەزۆر لەمەوپێش لەیادەوەریی ڕوبەنسدا هەلکۆلدرابوو، ئەو خۆی لەپشت وێنەکەی خۆیەوە شاردبووەوە.

وێنە: ڕوبەنس لەمێژەلە مانای وێنەدەگات. ئەو لەپۆل، لەپشت هاوپۆلەکانیەوە، کەلەسەر مێزەکانی پێشەوەی دانیشتبوون، خۆی شاردبووەووەو بەدزییەوەکاریکاتێری مامۆستاکەی کێشابووەوە. پاشان سەری لەسەر کێشانەوەکەی هەلبڕیبوو، لەدوورترەوە سەیری کردبوو. ئەندامەکانی ڕوومەتی مامۆستا بەردەوام دەجوولان و هیچ شتێکیان لەو وێنەیەنەدەچوو کەئەو کێشابوویەوە، بەلام کاتێک مامۆستا لەبەرچاوی ون دەبوو، ئەو (نەئەوسا و نەئێستاکەش) نەیدەتوانی مامۆستاکەی لە هیچ شکلێکی دیکەی جگەلەو کاریکاتێرەدا ببینێتەوە؛ مامۆستاکەی بۆ هەمیشەلەپشت وێنەکەی خۆیەوە ون بوو.

ڕوبەنس لە پێشانگەی وێنەگرێکی بەناوبانگ، چاوی بەوێنەی پیاوێک کەوت کەبە ڕوومەتی خوێناوییەوەبەئارامی لەسەر شۆستەکە هەڵدەستا. وێنەیەکی ڕەمزاوی کەلە بیر نەدەکرا! ئەو پیاوەکێ بوو؟ چیی بەسەر هاتبوو؟ ڕوبەنس لە بەر خۆیەوەگوتی ڕەنگەلەشەقام کەوتبێت بەعەرزدا، هەنگاوێکی هەڵەو کەوتن و ئامادەیی کتوپڕی وێنەگرێک. ئەوسا کابرا، کەهەستی بەهیچ شتێکی نائاسایی نەکردووە، هەڵدەستێتەوە، لە کافەیەکی ئەو نزیکانەڕوومەتی خۆی دەشوات و بۆماڵەوەبۆ لای ژنەکەی دەگەڕێتەوە. لەهەمان کاتدا وێنەکەی، خۆشحاڵ لە لەدایکبوونی، خۆی لێ جودا دەکاتەوەو بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا شوێن چیرۆک و چارەنووسی خۆی دەکەوێت.

مرۆڤ ڕەنگەخۆی لەپشت وێنەکەیەوەبشارێتەوە، دەشێت بۆ هەمیشەلەپشت وێنەکەی خۆیەوەون ببێت و دەتوانێت بەتەواوی لێی جودا ببێتەوە. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت وێنەی خۆی بێت. تەنیا لەبەر ئەو دوو وێنەزەینییەبوو کەڕوبەنس لەپاش هەشت ساڵ نەبینینی عودژەن تەلەفۆنی بۆ کرد. باشە، ئەی کەواتەعودژەن لەدەرەوەی وێنەکەی خۆی کێیە؟ ڕوبەنس لەم بارەوەشتێکی ئەوتۆ نازانێت و حەزیش ناکات کەبیزانێت. ئێمەدەتوانین لەپاش هەشت ساڵ دووری، ئاوا سەیری دیدار و چاوپێکەوتنەکەیان بکەین: ئەوان لەپاریس، لە لۆبیی ئوتێلێک بەرەوڕووی یەکتر دادەنیشن. باسی چی دەکەن؟ باسی هەموو شتێک، جگەلەژیانی خۆیان، چونکەئەگەر لە نزیکەوە، ئاگاداری ژیانی یەکتر بوونایە، دیوارێک زانیاریی بێسوود لەنێوانیاندا ساز دەبوو کە ئەوانی لەیەکتر جودا دەکردەوە. ئەوان زانیارییەکی زۆر کەم و ئاساییان لەبارەی یەکترەوەهەیەو شانازی بەوەوەدەکەن کەژیانیان لەپشت سێبەرەکانیانەوەشاردووەتەوە، تا

دیدارەکەیان لە دەرەوەی سنووری کات و هەلومەرجی ڕۆژانە، لە هەمیشەزیاتر بدرەوشێتەوە.

ڕوبەنس تەڕی سۆز و خوشەویستی لەعودژەن ورد بووەتەوەو خۆشحاڵەکەهەرچەندەتا ڕادەیەک پیر بووە، بەڵام هێشتا زۆر لە وێنەکەی دەچێت. ئەو بەجۆرێک ڕەشبینیی خەمبارانەوەبەخۆی دەڵێ: "گرینگیی ئامادەیی جەستەی عودژەن لەوەدایەکەهێشتا دەتوانێت وەک هەمیشەتێکەڵ بەوێنەکەی خۆی ببێت".

ئەوسا چاوەڕێی ئەو ساتەنزیکەدەبێت کەعودژەن لەشی زیندووی خۆی بەم وێنەیەدەبەخشێت.

## ١٩

ئەوان دیسان وەک ڕابوردوو ساڵی دوو سێ جار یەکتریان دەبینی. ساڵانێکی دیکەش تێپەڕی و ڕۆژێک ڕوبەنس تەلەفۆنی بۆ عودژەن کرد و گوتی بۆ ماوەی دوو هەفتەدەچێت بۆ پاریس. عودژەن پێی گوت کاتی نییە. ڕوبەنس گوتی:

«دەتوانم بۆ ماوەی هەفتەیەک سەفەرەکەم دوا بخەم.»

« ئەو دەمەش هەر کاتم نییە.»

«کەواتەکەی بۆ تۆ باشە؟»

عودژەن کە دیار بوو شەرم دەکات، گوتی:

«ئێستا نا، تا ماوەیەکی زۆر نا...»

«بۆ مەگەر شتێک ڕوویداوە؟»

«نا، هیچ ڕووینەداوە.»

هەردووکیان شەرمیان دەکرد. لەوەدەچوو عودژەن حەز نەکات ئیتر ببینێت و بۆی دژوار بێت کەبە ڕاشکاوی ئەوەی پێ بڵێت. ئەم ئەگەرەئەوەندەنابەجێ بوو (چونکە دیدارەکانیان هەمیشەجوان بوو، هیچ شتێکی ناخۆشی تێدا نەبوو) کەڕوبەنس بۆ پەیبردن بە هۆکارەکەی بەردەوام پرسیاری لێ دەکرد، بەڵام چونکەپەیوەندییەکەیان هەر لەسەرەتاوەلەسەر بنەمای نەرمونیانی و دوور لەگرژی، دوولایەنەبوو، کەمەجالی بەهیچ پرکێشییەک نەدەدا، ڕوبەنس ددانی بەجەرگی خۆیدا گرت و لەوەزیاتر بە پرسیارەکانی ئازاری نەدا. تەنیا لەکۆتایی وتووێژەکەیاندا گوتی:

«دەتوانم تەلەفۆنت بۆ بکەم؟»
«بێگومان، ئەی بۆ ناتوانی؟»
دوای مانگێک تەلەفونی بۆ کرد:
«هێشتا ناتوانی بمبینیت؟»
عودژەن گوتی:
«لێم قەڵس مەبە. پەیوەندیی بەتۆوەنییە.»
ڕوبەنس وەک جاری پێشو لێی پرسییەوە:
«باشە، شتێک ڕوویداوە؟»
عودژەن گوتی:
«نا، هیچ ڕووینەداوە.»
ڕوبەنس بێدەنگ بوو. نەیدەزانی دەبێ چی بڵێت. بەزەزدەخەنەو دەنگێکی خەمبار لە تەلەفۆنەکەدا گوتی:
«زۆر ناخۆشە.»
«ئەوەشتێک نییەکەپەیوەندیی بەتۆوەبێت. دڵنیابەهیچ پەیوەندییەکی بەتۆوەنییە. تەنیا پەیوەندیی بەخۆمەوەهەیە.»
ڕوبەنس هەستی کرد ئەم وشانەڕۆچنەیەکی هێوای لێ دەکەنەوە.
«کەواتەئەم قسانەهیچوپووچن! ئێمەدەبێ یەکتر ببینین.»
عودژەن ملی نەدا:
«نا.»
«ئەگەر لەوەدڵنیا بوومایەکەئیتر حەز ناکەیت بمبینیتەوە، هیچم نەدەگوت. بەڵام تۆ دەڵێی پەیوەندیی بەخۆتەوەهەیە. چی ڕوویداوە؟ ئێمەدەبێ یەکتر ببینن! من دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم.»
لێ هەر لەو کاتەدا کەڕوبەنس ئەم قسانەی دەکرد، بەخۆی دەگوت: نا، بەداخەوە، ئەو کەسێکی بەپارێزە، بۆیەباسی هۆکارەکەی

ناكات کەپێدەچێت زۆر سادەش بێت. ئەو ئیتر ڕوبەنسی خۆشناوێت. لەبەر ئەوە کەکچێکی زۆر چاکەبەئاشکرا نایدرکێنێت و سەری لەخۆی شێواندووە، بۆیەئەو نابێ هەوڵ بدات ڕازیی بکات و خۆی بەسەردا بسەپێنێت. ئەگەر وا بکات لە لای ئەو کچەناشیرین دەبێت و پێشێلی ئەو بەڵێنەنەنووسراوەش دەکات کەنابێ داوای شتێکی لێ بکات کەپێی خوش نییە، بۆیە کاتێک عودژەن جارێکی دیکەش گوتی: «تکایەنا...» ئیتر پێداگریی نەکرد.

ڕوبەنس تەلەفۆنەکەی دانا و لەپڕێکدا بیری ئەو خوێندکارەئۆسترالیاییەکەوتەوەکەپێڵاوی گەورەی تێنیسی لەپێ دەکرد. ئەویش خوێندکارە ئۆسترالیاییەکەی لەبەر هۆیەک ڕەتکردەوەکەنەیدەزانی چییە. ئەگەر ئەو خوێندکارەش دەرفەتی بەڕوبەنس بدایە، ئەویش بەم وشانەدڵخۆشیی دەدایە و دەیگوت: «ئەمەبەو مانایە نییەکەلەگەڵ تۆ نەگونجێم. هیچ پەیوەندییەکی بەتۆوەنییە. تەنیا پەیوەندیی بەخۆمەوەهەیە.» ئەوسا کتوپڕ هەستی کرد چیرۆکەکەی لەگەڵ عودژەن کۆتایی هاتووەو هەرگیزیش نازانێت بۆچی. ڕێک وەک ئەو خوێندکارەئۆسترالیاییەکەهەرگیز نەیزانی بۆچی چیرۆکەکەی کۆتایی هات. ئێستا ئیتر پێڵاوەکانی ڕوبەنسیش، وەک پێڵاوەگەورەکانی ئەو ئۆسترالیاییەگەنجە، بەخەمێکی گرانتر لە ڕابوردوو بەدنیادا دەسووڕێنەوە.

## ٢٠

قۆناغی بێدەنگیی وەرزشکارانە، قۆناغی خوازەکان، قۆناغی ڕاستییەقێزەونەکان، قۆناغی چپەچپی چینی و قۆناغی عیرفانی، هەموویان بە مەودایەکی زۆر لەدوایەوەبوون. میلەکانی سەر ڕوپەڕەکە، سوورێکی تەواو بەژیانی سێکسییدا سوورڕابوونەوە. ئەو خۆی لەدەرەوەی زەمەنی ڕوپەڕەکەی دەبینی. ئەگەر کەسێک خۆی لەدەرەوەی زەمەنی ڕوپەڕەکەی ببینێتەوە، ئەوەبەو مانایە نییەکەکۆتایی هاتووە، یان مردووە. لەسەر ڕوپەڕەی شێوەکاریی ئەورووپی زەنگی دوانزەی نیوەشەویش لێ درابوو، بەڵام شێوەکارەکان لەکارەکەیان بەردەوام بوون. بوون لە دەرەوەی زەمەنی ڕوپەڕەکە بەو مانایەیەکەئیتر شتێکی تازەو گرینگ ڕوو نادات. ڕوبەنس لەسەیرکردنی ژنان بەردەوام بوو، بەڵام گرینگییەکی ئەوتۆی پێ نەدەدان. لەهەموویان زیاتر ژنێکی گەنجی دەبینی بەناوی «ج» کەگرینگترین تایبەتمەندییەکەی ئەوەبوو لەکاتی وتووێژدا وشەی قۆڕ و ناحەزی بەکار دەهێنا. زۆربەی ژنەکان ئەوەیان دەکرد. بووبوو بە باو. ئەوان بەم شێوەخۆیان وا پیشان دەدا کەگوایەئیتر سەر بەنەوەی کۆن و ڕەفتاری خۆپارێزانەو بەئەدەبانەی ئەوان نین؛ واتەئازاد و سەربەست و مۆدێرنن. بەڵام هەرجارێک کەڕوبەنس دەستی بۆ «ج» دەبرد، ئەو چاوی لەبنمیچەکەدەبڕی و دەبوو بەفریشتەیەکی بێدەنگ. نزیکی و جووتبوون لەگەڵ «ج» هەمیشەدوورودرێژ و تا ڕادەیەک بێکۆتایی بوو، چونکە ئەو تەنیا لەپاش هەوڵدانێکی زۆری ئارەزوومەندانەئاسوودەو ڕەحەت دەبوو.

ئەو بەقەفاوە ڕادەکشا، چاوی دەبەست و لە کاتێکدا هەموو لەشی سەر ئارەق دەنیشت، خەریک دەبوو. ئەمە، کەم، یان زۆر، ئەو ئازاری مردنەیەکە ڕوبەنس وێنای دەکرد: ئێمەبۆ ماوەیەکی زۆر دەورووژێین و دەسووتێین تا کۆتایی بێت و نایەت. سەرەتا ڕوبەنس هەوڵی دەدا بەچرپاندنی هەندێک وشەی ناحەز و قێزەون بەگوێیدا، کارێک بکات زووتر ئاسوودەببێت، بەڵام چونکەئەو هەمیشەبەناڕەزایەتیەوە سەری دەسووڕاند، ناچار بێدەنگ دەبوو. ژنەکە، هەرچۆنێک بێت، پاش بیست سی خولەک عەشقبازی، بێئۆقرەو بێزار دەیگوت: «توندتر! توندتر! زیاتر! زیاتر!» لەو کاتەدا ڕوبەنس دەیزانی کەناتوانێت بەردەوام بێت، دەیزانی کەکوتەکانی لەوەتوندتر بووەکەبتوانێت توندتری بکات، بۆیەئیتر وازی لەکوتپێوەدان هێنا و شێوازێکی گرتەبەر کەلەباری تەکنیکییەوەئەوەندەپسپۆڕانە بوو دەبوایەتۆمار بکرێت: ڕوبەنس دەستی بۆ ناو گەڵی ژنەکەبرد و بەهەموو هێز قامکی تێهەڵسوو، کانیی ئاوی گەرم تەقییەوەو هەموو شتێکی تەڕ کرد. ژنەکەباوەشی پێدا کرد و بارانێک وشەی ناسک و میهرەبانانەی بەسەردا باراند.

سەیر ئەوەبوو کەئەو دووانە نەیاندەتوانی سەعاتی دەروونیان پێکەوەهاوکات بکەن؛ کاتێک ڕوبەنس ناسک و میهرەبان دەبوو، ئەو بەگرژی دەدوا، کە ڕوبەنسیش حەزی دەکرد بە گرژی بدوێت، ئەو بێدەنگ دەبوو. کاتێک ڕوبەنس حەزی لە ئاسوودەیی و خەوتن بوو، ئەو لەپڕ میهرەبان دەبوو، فرەوێژیی دەکرد.

ئەو زۆرجوان بوو، لەڕوبەنسیش گەنجتر بوو! ڕوبەنس (بەتەوازوعەوە) پێی وابوو «چ» تەنیا لەبەر ئەوە، کە بە تەلەفۆنکردنێک دەچێت بۆ لای. سپاسگوزاری «چ» بوو کەڕێگەی پێ دەدا لەو مەودا دووورودرێژانەی بێدەنگیدا، بەچاوی بەستراوەوەلەخەیاڵاتی خۆی ڕۆبچێت.

# ٢١

ڕوبەنس ئەڵبۆمێکی کۆنی وێنەی "جان کەنەدی" سەرۆککۆماری دەست کەوت. وێنەکان ڕەنگی بوون و لانیکەم پەنجا دانەدەبوون کەلە هەموویاندا (بەبێ ئاوارتە هەموویان) سەرۆککۆمار پێدەکەنی. زەردەخەنەنا، پێکەنین! دەمی کرابووەوەو ددانەکانی دیار بوون. ئەوەشتێکی زۆر سەرنجڕاکێش نەبوو، هەموو وێنەیەکی ئەم سەردەمەبەو شێوەیەیە، بەڵام ئەوەی کە کەنەدی لەهەموو وێنەکاندا پێدەکەنی و تەنانەت لەیەک وێنەشدا دەمی نەبەسترابوو، ڕوبەنسی ناچار بە تێڕامان کرد. ئەو چەند ڕۆژ دواتر چوو بۆ فلۆرانس و لەپێش پەیکەری داوودەکەی مایکل ئانجێلۆدا ڕاوەستا و هەوڵی دا ئەو ڕوخسارەمەڕمەڕە، وەک کەنەدی، بەدەم پێکەنینەوەبهێنێتەپێشچاوی خۆی. پەیکەری داوود، ئەم نموونەبەرزەی جوانیی پیاوانە، لەپڕێکدا وەک پیاوێکی گێل دەرکەوت! ڕوبەنس لەوەدوا زۆرجار لەخەیاڵی خۆیدا هەوڵی دەدا دەستکاریی ڕوخساری تابلۆ بەناوبانگەکان بکات و دەمیان بهێنێتەپێکەنین. ئەزموونێکی سەیر بوو؛ پێکەنین هەموو جۆرەنیگارێکی زایە دەکردا بیهێنەپێشچاوی خۆتان کە ئەو بزەلێڵ و نادیارەی مۆنالیزا ببێتەپێکەنین و ددان و پووکی دەربکەوێت!

ئەگەرچی ڕوبەنس کاتێکی زۆری لە گەلەرییەکان تێدەپەڕاند، بەڵام ئەوەوێنەکانی کەنەدی بوون کەئەم ڕاستییەسادەیان تێگەیاند.

شێوەکار و پەیکەرتاشەبەناوبانگەکان، لەسەردەمی کلاسیکەوەتا ڕافائیل و ڕەنگەتا ئینگرەش ئامادەنەبوون پێکەنین و تەنانەت زەردەخەنەش بکێشنەوە. ئەڵبەت ڕوخساری هەموو پەیکەرەئەتروسکاییەکان بەزەردەخەنەڕازاوەتەوە، بەڵام ئەم زەردەخەنەیەوەڵامدانەوەی دۆخێکی تایبەت و ئانوساتی نییە، بەڵکو حاڵەتێکی هەمیشەیی ڕوخسارەکەیەکەشادییەکی هەتاهەتایی دەردەبڕێت. پەیکەرتاشەکلاسیکییەکان و هەروەها شێوەکارەکانی چەرخەکانی دواییش، تەنیا لەبێجووڵەییدا وێنای ڕوخسارێکی جوانیان دەکرد.

ئەو کاتەکەشێوەکارەکان ویستیان خراپەپیشان بدەن، ڕوخسارەکان لەو بێجووڵەییەقوتار بوون و دەمەکان کرانەوە، یان ئەو کاتەکەویستیان خراپیی ئازار پیشان بدەن، بۆ نموونە: ڕوخساری ئەو ژنانە کەبەسەر لەشی مەسیحدا نەویونەتەوە، یان دەمی کراوەی دایک لەتابلۆی "کوشتاری بێتاوانەکان"ی پوسین، یان خراپیی تاوان، بۆ نموونە: "ئادەم و حەوا"ی بەرهەمی هۆلبین. (لەو تابلۆیەدا) حەوا ڕوومەتی شیرینەو دەمی نیوەکراوەیەو ددانەکانیشی تازەگازیان لە سێوەکەگرتووە. ئادەم لەلای ڕاوەستاوە، پیاوێکی هێشتا بێگوناهە: جوانە، ڕوومەتی ئارام و دەمی بەستراوە. لە"تەمسیلەکانی گوناه" بەرهەمی کۆرەجیۆ هەموویان بزەیان هاتووەتێ! شێوەکار بۆ دەربڕینی گوناه دەبێ ئارامیی بێگەردی ڕوومەتەکان بشێوێنێت، دەم بە کراوەیی بکێشێتەوەو بەزەردەخەنە ئەندامەکانی ڕوومەتیش بگۆڕێت. لەو وێنەدا تەنیا ڕوومەتێکی دەمبەپێکەنین دەبیندرێت: کۆرپەیەک! بەڵام ئەم پێکەنینەش بە هۆی شادییەوەنییە، واتەبەو شێوەکەلەپرۆگرامی ڕیکلام بۆ "پووشەک" یان

شوکولات کۆرپەکان دەکێشنەوە! لەوانەدا کۆرپە چونکە گەندەڵە پێدەکەنێت!!

تەنیا لەلای شێوەکارەهۆلەندییەکان پێکەنین بێگەردانەیە. بۆ نموونە"قەشمەر"، یان "قەرەچ" بەرهەمی هالز. لەبەر ئەوەی کەشێوەکارەکانی لقی هونەریی هۆلەند لەجوملەی یەکەم وێنەگرەکان دێنەئەژمار، ئەو ڕوومەتانەکەئەوان کێشاویانەتەوەدوورن لە جوانی، یان ناحەزی. ڕوبەنس کەبەگالەریی هۆلەندیدا دەگەڕا عودژەنی بیرکەوتەوە: عودژەن نەیدەتوانی مۆدێلی هالز بێت، ئەو دەبوو بەمۆدێلی ئەو شێوەکارانەکەتەنیا لەڕوخساری بێجووڵەی مرۆڤدا لە جوانی دەگەڕان. پاشان چەند کەس لەبینەرەکان شانیان لەڕوبەنس کوتا. هەموو مۆزەخانەکان وەک باخچەکانی جارانی ئاژەڵان پڕ بوون لەبینەر. موسافیرەتینووەکانی شتەسەرنجڕاکێشەکان، وەها لە وێنەکان ورد بوونەتەوەکەدەڵێی لەئاژەلی ناو قەفەسەکان ورد بوونەتەوە. ڕوبەنس لای خۆی بیری کردەوەکە لەم سەردەمەدا، نەشێوەکاری هەست بەئاسوودەیی دەکات، نەعودژەن. عودژەن هی دنیایەکەلەمێژەفەوتاوە، هی جیهانێک کەجوانی تیایدا پێنەدەکەنی.

بەڵام ئێمە چۆن دەتوانین شەرحی ئەوەبکەین کەبۆچی شێوەکارەگەورەکان پێکەنینیان لەهەرێمی جوانی سڕیوەتەوە؟ ڕوبەنس لەبەر خۆیەوە دەڵێ: بێگومان هەموو ڕوومەتێک ئەو کاتەجوانەکە فیکری خاوەنەکەی پیشان دەدات، لێ خۆ مرۆڤ لەکاتی پێکەنیندا بیر ناکاتەوە. ئایا ئەمەڕاستە؟ ئایا پێکەنین فیکرێکی برووسکەئاسا نییەکەلەئانوساتێکدا پەی بەبابەتێکی گاڵتەجاڕی بردبێت؟ ڕوبەنس بیر دەکاتەوە، نا، مرۆڤ لەو کاتانەدا کە پەی بەبابەتی گاڵتەجاڕی دەبات پێناکەنێت، پێکەنین لەوەودوا، وەک پەرچەکردارێکی سروشتی، وەک شڵەژاوییەک کەهیچ فیکرێکی تێدا

نییە، دەردەکەوێت. پێکەنین بریتییەلە شڵەژانی ڕوومەت و کەسی شڵەژاویش بەسەر خۆیدا زاڵ نییە، شتێک حوکمی بەسەردا دەکات کەنە ئیرادەیەو نەئاوەز. هەر بۆیەپەیکەرتاشەکلاسیکییەکان پێکەنینیان نەدەنواند. خۆ ناکرێت مرۆڤێک (مرۆڤێک لەوپەڕی ئاوەز و ئیرادەوە) کەبەسەر خۆیدا زاڵ نییەبەجوان بزانین.

ئەگەر ئەم سەردەمەی ئێمە، بەپێچەوانەی گیانی شێوەکارەگەورەکان، پێکەنینی کردووەبەدۆخێکی شاز و مومتازی ڕوومەتی مرۆڤ، ئەوەبەو مانایەیەکەنەبوونی ئیرادەو ئاوەز بووەتەدۆخێکی ئایدیالی بۆ مرۆڤ. دەکرێت بەگلەییەوە بڵێین، چونکەئەو شڵەژاوییەکەلە وێنە فۆتۆگرافییەکاندا دەنوێندرێت دەستکردە، کەواتەپەیڕەوی لەئاوەز و ئیرادەدەکات. پێکەنینەکەی کەنەدی لە بەرچاوی کامێرادا، پەرچەکردارێکی (بێئیرادە) نییەبەرامبەر بەدۆخێکی گاڵتەجاڕی، بەڵکو ئەو زۆر بە وشیارییەوەدەمی پان کردووەتەوەو ددانەکانی پیشان داوە، بەڵام ئەمەش تەنیا ئەوەدەسەلمێنێت کەشڵەژاویی پێکەنین (دۆخێک لەوپەڕی ئاوەز و ئیرادە)، لە لایەن مرۆڤی هاوچەرخەوە تا ئاستی وێنەیەکی ئایدیالی کەخەڵک بڕیاریان داوەخۆیانی لەپشت بشارنەوە، بەرز بووەتەوە.

ڕوبەنس لەبەر خۆیەوە دەڵێ: پێکەنین دیمۆکراتیکترین دۆخی ڕوومەتە. ئێمەبەهۆی ئەندامەبێجووڵەکانی ڕوومەتمانەوەلە یەکتر جودا دەکرێینەوە، بەڵام لەپشێوی و شڵەژاویدا هەموومان وەکو یەکترین.

کەس ناتوانێت وێنای پێکەنین لەسەر ڕوومەتی پەیکەرەکەی ژولیۆس سێزار بکات، بەڵام سەرۆککۆمارەکانی ئەمەریکا لەپشت شڵەژاویی دیمۆکراتیکی پێکەنینەوە، بەرەو نەمری دەڕۆن.

## ٢٢

ڕوبەنس جارێکی دیکەگەڕایەوەبۆ ڕۆما. ماوەیەکی زۆری لە هۆڵی پیشانگەی شێوەکاریی گوتیک بەسەر برد. یەکێک لە تابلۆکان وەها کە سیحری کردبێت، ڕای وەستاند. کەسێک لە خاچ درابوو. ئەو چی بینی؟ لەباتی عیسای مەسیح ژنێکی بینی کەتازەلەخاچیان دابوو. ئەویش وەک مەسیح تەنیا کوتێک قوماشی لەناوقەدەوەپێچرابوو؛ قاچی لەسەر کوتێک داری ئەستوور بوو، هاوکاتیش جەللادەکان مەچەکی پێیان بەپەتی ئەستوور بە تیرەکەوەبەستبووەوە. خاچەکەیان لەسەر گردێک دانابوو کەلە دوورەوە دیار بوو. کۆمەڵێک سەرباز و خەڵکی سەیرکەری ناوچەکەدەوری خاچەکەیان دابوو، پێکڕا لەژنێک ورد بووبوونەوەکەبەرەوڕوویان لەخاچ درابوو. ژنەکەعودژەن بوو. عودژەن هەستی بە نیگای خەڵکەکەکرد و بە بەرەدەست سنگ و مەمکی خۆی داپۆشی. دوو خاچی دیکەش لەملاولایەوەبوون کەهەر یەکەو تاوانبارێکیان پێوەبوو. یەکەمیان بەرەو عودژەن نەوییەوەو دەستی گرت و لەسەر سنگ و مەمکی لایبرد و ئەوەندەڕایکێشا تا پشتەدەستی کەوتەسەر داری ئاسۆیی خاچەکە. تاوانباری دووهەم دەستەکەی دیکەی گرت و وەک ئەوی یەکەم ڕایکێشا. ئێستا عودژەن دەستی لێک بڵاوکردبوو. ڕوومەتی هەروا بێجووڵەبوو. چاوی لەدوور بڕیبوو، بەڵام ڕوبەنس دەیزانی کەسەیری ئەو دوورانەناکات، بەڵکو سەیری ئاوێنەیەکی خەیاڵیی گەورەدەکات

کەلەبەرامبەری، لە مابەینی زەوی و ئاسمان داندراوە. ئەو چاوی بەوێنەی خۆی کەوت، وێنەی ژنێکی لەخاچدراو کەبەسنگ و بەرۆکی ڕووتەوەدەستی لێک بلاوکردووەو لەگەڵ ئەو خەڵکەدڕندەو دەمبەهاوارە، بەجۆشوخرۆشەوە لەخۆی ورد بووەتەوە.

ڕوبەنس نەیدەتوانی چاو لەم دیمەنەهەڵبگرێت. کاتێک لەئەنجامدا توانیی، بەخۆی گوت: "دەبێ ئەم ساتەوەختە لە مێژووی ئاییندا، بەناوی "خەونی ڕوبەنس لەڕۆما" تۆمار بکرێت. ئەم ساتەوەختە پڕ لەڕاز و نهێنییەتا ئێوارەکاری تێ کرد. ئەو چوار ساڵ بوو تەلەفۆنی بۆ عودژەن نەکردبوو، بەڵام ئەو ڕۆژەئیتر نەیتوانی بەر بەخۆی بگرێت، هەر کەگەڕایەوەبۆ ئوتێل ژمارەکەی عودژەنی گرت. لەودیو هێڵەکەوەگوێی لە دەنگی ناناشنای ژنێک بوو. ڕوبەنس بەشک و گومانەوە، لەکاتێکدا بەناوی مێردەکەیەوەناوی دەبرد، گوتی:

«دەکرێ لەگەڵ خاتوو... قسەبکەم؟»

دەنگی ئەوبەری هێڵەکەگوتی:

«بەڵێ، خۆمم.»

ڕوبەنس ناوی بچووکی عودژەنی بەزماندا هات و دەنگی ژنەکەی ئەوبەر هێڵەکەگوتی ئەو خاتوونەکە تۆ دەتەوێ مردووە.

ڕوبەنس بەهەناسەبڕکێ گوتی:

«مردووە؟»

«بەڵێ، ئەگنێس مردووە. تۆ کێیت؟»

«من یەکێک لە هاوڕێکانی ئەوم.»

«دەکرێ ناوی خۆتم پێ بڵێیت؟»

«نا.»

ئەوەی گوت و تەلەفۆنەکەی دانا.

## ٢٣

کاتێک کەسێک لەسەر پەردەی سینەما دەمرێت، دەستبەجێ مۆسیقای پرسەبڵاودەکرێتەوە، بەڵام کاتێک کەسێک دەمرێت کەلەژیانی واقیعیماندا ناسیومانە، گوێمان لەهیچ مۆسیقایەک نابێت. تەنیا چەند مردنێکی دەگمەن، دوو یان سێ، نەک زیاتر، دەتوانن تووشی شۆکێکی قووڵمان بکەن. مردنی ئەو ژنەکەبۆ ڕوبەنس ڕووداوێکی لاوەکی بوو دایچڵەکاند و خەمباری کرد، بەڵام تووشی شۆکی نەکرد؛ بەتایبەت چونکەچوار ساڵ بوو لە ژیانی ڕوبەنس چووبووەدەر و ئەو بە ناچاری بەو دۆخەڕاهاتبوو.

هەرچەندەنەبوونی عودژەن لەژیانی ڕوبەنسدا دیارتر و بەرهەستتر لەجاران نەبوو، بەڵام مردنەکەی هەموو شتێکی گۆڕی. هەرجارێک کەبیری دەکەوتەوە، دەیهێنایەپێشچاوی خۆی کە لەشی چیی بەسەر هاتووە. ئایا لەناو تابووتدا ناشتوویانە؟ ئایا لەشیان سووتاندووە؟ ئەو ڕوومەتی بێجوولەی عودژەنی هێنایەپێشچاوی کەلە ئاوێنەیەکی خەیاڵیدا، بەچاوی تەواو کراوەوە، سەیری خۆی دەکرد. ڕوبەنس دەیبینی کەپێڵووی چاوەکانی بە ئارامی لەسەر یەک دەنیشتن و ڕوومەتەکەی لەپڕێکدا مرد، بەڵام چونکەئەو ڕوومەتەزۆر ئارام بوو، تێپەڕینی لەژیانەوە بۆ نەمان خێرا و هاواهەنگ و جوان بوو. پاشان هێنایە پێشچاوی خۆی کە چی بەسەر ئەو ڕوومەتە هاتووە و ئەوەش زۆر ترسناک بوو.

«چ» هات بۆ لای. ئەوان وەک هەمیشەبە بێدەنگی جووتبوون و لەو ساتەوەختەبێکۆتاییەدا دیسان ڕوبەنس، بە خەیاڵ وێنەی عودژەنی هێنایەوە پێشچاوی خۆی. ئەو وەک هەمیشەبەسنگ و مەمکی ڕووتەوەلە بەر ئاوێنەڕاوەستابوو، ڕاستەوخۆ لەپێشی خۆی وردبووبووەوە. لەو ساتەدا ڕوبەنس بیری کردەوەکەڕەنگەدوو ساڵ لەمەوپێش مردبێت، ڕەنگەتا ئێستا پرچی بە کاسەڵەی سەریەوە و چاوی لەقاپیلکەکەیدا نەمابێت. دەیوست زۆر زوو لەم وێنەیە ڕزگاری ببێت، چونکەدەیزانی ئەگەر وا نەبێ ناتوانێت لەجووتبوونەکەی بەردەوام بێت. ئەو هەوڵی دا خەیاڵی عودژەن لە مێشکی خۆی بکاتە دەر و هۆش لەسەر «چ»، لەسەر هەناسەزیندووەکەی ئەو کۆبکاتەوە، بەڵام مێشکی بەقسەی نەدەکرد و بەڕقەوەوێنەی وای چێ دەکرد کەئەو نەیدەویست بیبینێت. کاتێک مێشکی لە ئەنجامدا ئامادەبوو بە قسەی بکات و واز لە پیشاندانی عودژەن لەنێو تابووتەکەبێنێت، ئەوی لەنێو بڵێسەی ئاگردا، بەو شێوەکەپێشتر بیستبووی، پیشان دا؛ لەشی گڕگرتووی عودژەن (بەتوانایەکی سەیر کەئەو فامی نەدەکرد) هەستا و لەناوەڕاستی کوورەکەدا دانیشت. ڕوبەنس لەنێو وێنەی ئەم لەشەگڕگرتووەدا، لەپڕ دەنگێکی ناڕازی و هاندەری بیست: «توندتر! توندتر! زیاتر! زیاتر!» ئەو ناچار بوو واز لە«چ» بێنێت، بۆیەگوتی حاڵی باش نییەو داوای لێبوردنی لێ کرد.

پاشان لە بەر خۆیەوە گوتی: 'دوای ئەو هەموو ڕووداوەی ژیانم، تەنیا شتێک کەبۆم مابێتەوەیەک وێنەیە و پێدەچێت ئەم وێنەش شتێکی ئێجگار تایبەتی و خۆشەویستی تێدا بێتکەئاوا خۆی لەقووڵایی ژیانی سێکسیمدا شاردووەتەوە، شتێکی تەواو جەوهەری. ڕەنگەلەم ساڵانەی دواییدا لەبەر ئەوەجووت بووبێتم کە ئەم وێنەلە

زەینی خۆمدا بژیەنمەوە. ئێستا ئەم وێنە گڕی گرتووەو ئەو ڕوومەتەجوان و بێجووڵەخەریکەلۆچ دەبێت، گرمۆڵەدەبێت، ڕەش هەڵدەگەڕێت و لە ئەنجامدا دەکەوێتەناو خۆڵەمێشەوە.

بڕیار وابوو «چ» حەفتەی دواییش دیسان ڕوبەنس ببینێتەوە و ڕوبەنس پێشوەختە لەوەدەترسا کەئەو وێنانەلە کاتی نزیکی و جووتبووندا ئازاری بدەن. بەتەمای ئەوەکەعودژەن لەزەینی خۆی دەربباوێت، جارێکی دیکەش لەپشت مێزەکەی دانیشت و سەری خستەناو بەرەدەستی و لەیادەوەرییدا بە شوێن پاشماوەی ئەو وێنانەی ژیانی سێکسییدا گەڕا، تا بتوانێت لەباتی وێنەی عودژەن دایان بنێت. ئەو چەند وێنەیەکی دۆزییەوە و چونکەهەروا جوان و وروژێنەر مابوون بە خۆشییەوەسەری سووڕما، بەڵام لەناخی خۆیدا لەوەدڵنیابوو کاتێک لەگەڵ «چ» جووت ببێت، یادەوەرییەکەی، ئەو وێنانەی پیشان نادەن، بەڵکو وەک گاڵتەیەکی ترسناک، وێنەی عودژەنی پیشان دەدەن کەلەنێو ئاگر دانیشتووە. ڕوبەنس هەڵەی نەکردبوو؛ جارێکی دیکەش لە کاتی جووتبوونیاندا ناچاربوو داوای لێبوردن لە«چ» بکات.

ئەو بەخۆی گوت ئەگەر پەیوەندی لەگەڵژنان مەودایەکیشی بەین بکەوێت، زۆر گرینگ نییە؛ وەک دەڵێن: ئەمجارە نا، جارێکی دیکە، بەڵام ئەم مەودایە حەفتەلەدوای حەفتەو مانگ لەدوای مانگیشی خایاند، تا ئەوەی کەڕۆژێک تێگەیشت کە ئیدی «جارێکی دیکە» نەماوە.

# ١

لەیانەی تەندروستی، دەمێک ساڵە ئاوێنەکان جووڵەی قاچ و دەستەکان دەنوێننەوە. شەش مانگ لەمەوپێشیش ئاوێنەکان، بەپرکێشی ئیماگۆلۆگەکان، تەنانەت هێرشیان بۆ مەلەوانگەکەش هێنا. ئێمەلەسێ لاوەکەوتبووینەوەگەمارۆی ئاوێنەکان و لای چوارەمیش پەنجەرەیەکی گەورەبوو کەبە سەربانی ماڵەکانی پاریسدا دەیڕوانی. ئێمەبەجلی مەلەوە، لەپشت مێزێکی قەراغ مەلەوانگەکەڕاوەستابووین. مەلەوانگەکە پڕ بوو لەو مەلەوانانەکەسەریان دەخستەژێر ئاوەکە و بەرزیان دەکردەوەو بەقرموقاڵ هەناسەیان هەڵدەمژی. شووشەیەک شەراب، کەمن بۆ جەژنی ساڵوەگەریک داوام کردبوو، لەسەر مێزەکەداندرابوو.

ئاڤەناریوس تەنانەت عەزیەتی ئەوەی نەکێشا کەلێم بپرسێ بۆچی ئەو جەژنەم گرتووە، چونکەبیرۆکەیەکی تازەی بە مێشکدا هاتبوو:

«بیر لەوەبکەرەوەکەدوو شانسیان پێ دابێتی: شەوێک لەگەڵ ژنێکی جوان و بەناوبانگی جیهانی، کەسێکی وەک بریژیت باردۆ، یان گێرتا گاریۆ بخەویت، بەو مەرجەکەکەس نەزانێت، یان ئەوەی کە دەست بخەیتەگەردنی ئەو ژنەو بەشەقامی سەرەکیی شاردا پیاسەبکەیت، بەو مەرجەکەهەرگیز لەگەڵی نەخەویت. زۆر حەز دەکەم بزانم لەسەدا چەندەی خەڵک ئەم، یان ئەو

شانسەهەڵدەبژێرن. ئەڵبەت ئەوەپێویستی بەتوێژینەوەیەکی ئامارییە، بۆیەسەردانی چەند ڕێکخراوەیەکم کرد کەکاری ئامار و گشتپرسی دەکەن، بەڵام هیچکامیان ئامادەنەبوون یارمەتیم بدەن.»

«ناتوانم لەوەتێبگەم کەپرۆژەکانی تۆ چەندەجیددییە.»

« من هەرکارێک دەکەم دەبێ بەجیددی وەربگیرێت.»

من درێژەم پێدا:

«بۆ نموونەهەوڵ دەدەم لەو کاتەدا بتهێنمەپێشچاوی خۆم کەخەریکی لە لای لایەنگرانی ژینگەباسی پرۆژەکەت بۆ فەوتاندنی ئۆتۆمبێلەکان دەکەیت. دڵنیام بۆخۆشت بەهیوا نەبوویت قسەکانت بەجیددی وەربگرن!»

بۆ ساتێک ڕاوەستام. ئاڤەناریوس هەروا بێدەنگ بوو.

«نەکا پێت وابووبێت چەپڵەت بۆ لێدەدەن؟»

ئاڤەناریوس گوتی:

«نا، پێم وانەبوو.»

«ئەی بۆ ئەو پێشنیارەت کرد؟ بۆ ئەوەی ڕووی ڕاستەقینەیان دەربخەیت، یان دەتویست پێیان بسەلمێنیت کەوێڕای ئەو هەموو نارەزایەتییە، لەڕاستیدا ئەوانیش بەشێک لەو شتەن کەتۆ پێی دەڵێی شەیتان؟»

ئاڤەناریوس گوتی:

«هیچ لەوەبێهوودەتر نییەکەهەوڵ بدەیت شتێک بەخەڵکی گەمژەبسەلمێنیت.»

«کەواتەهەر یەک شت دەمێنێتەوە: تۆ دەتویست گاڵتەیان لەگەڵ بکەیت، بەڵام بۆ ئەمەش پێم وایەئەو ڕەفتارەت نالۆژیکی بووە. بێگومان تۆ چاوەڕوانی ئەوەنەبوویت کەئەوان لەقسەکانت بگەن و پێبکەنن!»

ئاڤەناریوس بە نیشانەی "نا" سەری لەقاند و تا ڕادەیەک بەخەمەوەگوتی:

«نا چاوەڕوانی ئەوەنەبووم. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شەیتان ئەوەیەکەهەستی گاڵتەو جەفەنگی نییە. بابەتی کۆمیدی، تەنانەت ئەگەر هێشتا مابێتیش، وەک شتێکی نادیاری لێ هاتووە. گاڵتەو جەفەنگ ئیتر بێمانا بووە.»

پاشان درێژەی پێدا:

«ئەم دنیایە هەمووشتێک بەجیددی وەردەگرێت، تەنانەت منیش. ئەمەواتەهەموو شتێک تەواو بووە.»

«من پێم وایەکەس هیچ بەجیددی وەرناگرێت! هەموو دەیانەوێ خۆیان سەری خۆیان قاڵ بکەن!»

«ئەمەش دەگەڕێتەوەبۆ هەمان شت. کاتێک ئەو "کەرێکی تەواوە" ناچار دەبێ لەپرۆگرامی هەواڵەکاندا ڕای بگەیەنێت کەشەڕێکی ئەتۆمی سەری هەڵداوە،یان بوومەلەرزەیەک پاریسی خاپوور کردووە، بێگومان هەوڵدەدا خەڵک سەرقاڵ بکات. ڕەنگەئەو هەر لە ئێستاوەبۆ هەلومەرجێکی ئاوا بەدوای نوکتەو قسەی خۆشدا بگەڕێت. ئەڵبەت ئەمە پەیوەندیی بەقسەخۆشییەوە نییە؛ چونکەهەروا کەهەموو کەس لە کاتێکی ئاوادا دەیەوێت خەڵک بێنێتەپێکەنین، ئەویش بۆ ڕاگەیاندنی بوومەلەرزەبەدوای نوکتەو قسەی خۆشەوەیە. کەسێک کەبۆ ڕاگەیاندنی بوومەلەرزەبەدوای نوکتەو قسەی خۆشدا دەگەڕێت، بێگومان کارەکەی خۆی زۆر بە لاوە جیددییە و هەرگیز بەخەیاڵیشیدا نایەت کەکەسێکی گاڵتەجاڕە. قسەخۆشی تەنیا ئەو کاتە بوونی هەیەکەخەڵک هێشتا بتوانن سنووری نێوان گرینگ و ناگرینگ لێک جودا بکەنەوە، ئێستا ئەم سنوورەلێک جودا ناکرێتەوە.»

من هاوڕێکەم چاک دەناسم و زۆرجار خۆم بە لاساییکردنەوەی شێوەی قسەکردن و دەربڕینی بیرکردنەوەکانی سەرقاڵ دەکەم، بەڵام ئەو هێشتا شتێکی لەدەروونداپە کەمن نازانم چییە. من شێوەی ڕەفتاریم پێ خۆشە، بە لامەوەسەرنجڕاکێشە، بەڵام ناتوانم بڵێم کەبەتەواوی تێی دەگەم. ماوەیەک لەمەوپێش پێم گوت کەتەنیا بەیارمەتیی خوازەدەکرێت لەسروشتی کەسێک بگەین، بەیارمەتیی تیشکی ئاشکراکەری خوازە، بەڵام لەوەتەی ئاڤەناریوس دەناسم هەرگیز نەمتوانیوەخوازەیەک بدوزمەوەکەشەرحی ئەو بکات و بە یارمەتیی ئەو خوازەیە بتوانم تێی بگەم.

«کەواتە ئەگەر لەبەر خۆشی و سەرقاڵی نەبوو، بۆچی باسی ئەو پلانەت کرد؟ بۆ؟»

بەرلەوەی وەڵامی من بداتەوە، هاوارێکی سەیر قسەکانی پێ بڕین:

«پرۆفیسۆر ئاڤەناریوس! ئەوەتۆیت؟»

پیاوێکی بەژنوباڵا جوانی پەنجا شەست ساڵە، بەجلی مەلەکردنەوە، لەدەرکەوەبەرەو ئێمەدەهات. ئاڤەناریوس هەستایەسەر پێ. هەردووکیان خۆشحاڵ بوون و ماوەیەکی زۆر دەستی یەکتریان گووشی.

ئاڤەناریوس ئێمەی بەیەکتر ناساند و زانیم کەبەرەوڕووی پاول بوومەتەوە.

## ٢

ئەو لەلای ئێمەدانیشت و ئاڤەناریوس بەئاشکرا ئاماژەی بەمن کرد و گوتی:

«تۆ ڕۆمانەکانیت نەخوێندووەتەوە؟ «ژیان لەشوێنێکی دیکەیە»! دەبێ بیخوێنیتەوە! هاوسەرەکەم دەڵێ زۆر خۆشە!»

لەپڕ بۆم دەرکەوت کە ئاڤەناریوس هەرگیز ئەو کتێبەی منی نەخوێندووەتەوە. ماوەیەک لەوەوپێش کەبەپرکێشییەوەداوای نوسخەیەکی ئەو کتێبەی لێ کردم، بۆ ئەوەبوو کەهاوسەرەکەی تووشی بێخەوی بووبوو، پێویستی بەتەبارێک کتێب بوو کەلەناو جێدا هەڵیانلووشێت. ئەمەمنی خەمبار کرد. پاول گوتی:

«هاتووم بۆ ئێرەو بەهیوام ئاوەکەیفم ساز بکات.»

پاشان کەچاوی بەشووشەی شەرابەکەلەسەر مێزەکەوت، ئاوەکەی لە بیر چووەوە.

«ئەوە چی دەخۆنەوە؟»

شووشەکەی هەڵگرت و بە وردی سەیری بەرچەسپەکەی کرد. ئەوسا درێژەی پێدا

«لەبەیانییەوەتا ئێستا خەریکی خواردنەوەم.»

ئەرێدیار بوو. سەرم سووڕما. من هەرگیز پێم وانەبوو کەئەویش بخواتەوە. هەرام لەپێشخزمەتەکەکرد تا پەراخێکی دیکەمان بۆ بێنێت.

دەستمان بە قسەکردن لەبارەی هەموو شتێکەوە کرد. ئاڤەناریوس چەند جاری دیکەش باسی ڕۆمانەکانی منی کرد کەبۆ خۆی نەیخوێندبوونەوە و پاول ناچار بوو شتێک بڵێت کەگرژیی گوتنەکەی دایچڵەکاندم:

«من ڕۆمان ناخوێنمەوە. بیروەری، یان ژیاننامە، ئەمانەزیاتر سەرقاڵم دەکەن و شتیان لێ فێر دەبم. ئەم ماوەکتێبێکم لەبارەی سالینجەر، ڕۆدین و دڵدارییەکانی فرانتس کافکا خوێندووەتەوە. هەروەها ژیاننامەیەکی زۆر چاکیشم لەبارەی هەمینگوایەوەخوێندووەتەوە. ئای کەئەو پیاوە ساختەچییە، ئای کەدرۆزنە، ئای کەخۆبەزلزانە!»

پاول بەخۆشییەوەپێکەنی.

«ئای کەسست و بێتەکانە. سادیستە. پیاوسالارە، شێتی سێکسە، دژەژنە!»

من لێم پرسی:

«مادام تۆ وەک پارێزەرێک ئامادەیت تەنانەت بەرگری لەپیاوکوژەکانیش بکەیت، بۆ بەرگری لە نووسەران ناکەیت کەجگەلەکتێبنووسین هیچ تاوانێکی دیکەیان نییە.»

«چونکەئەوان عەسەبیم دەکەن.»

پاول بەخۆشییەوەئەم وەڵامەی دایەوەو کەمێک شەرابی لەو پەرداخەکرد کە پێشخزمەتەکەبۆی هێنابوو. ئەوسا درێژەی بە قسەکانی دا:

«هاوسەرەکەم مالەر دەپەرستێت. ئەو پێی گوتم کەمالەر دوو حەفتەلەپێش ڕابەرایەتیکردنی سەمفۆنیای حەوت، دەرکەی ژوورێکی پڕ لەدەنگەدەنگی ئوتێلەکەی لەخۆی داخستووە و لەئێوارەوەتا بەیانی خەریکی نووسینەوەی ئۆرکستراکەی بووە.»

من سەرم بۆ لەقاند:

«بەڵێ، لە پراگ، ساڵی ١٩٠٦. ناوی ئوتێلەکەش ئەستێرەی شین بوو.»

پاول کەنەیهێشت قسەکانی پێ ببڕم بەردەوام بوو:

«دەیهێنمەپێشچاوی خۆم کەلەژووری ئوتێلەکەدانیشتووەو بە دەوری خۆیدا کاغەزی دەستنووسی هەڵڕشتووە. ئەو دڵنیا بووەئەگەر میلۆدیی موومانی دوو، لەباتی ئۆبوئا بەکلارینێت بژەندرێت، هەموو کارەکەتێکدەچێت.»

«من کەبیرم لە ڕۆمانەکەم دەکردەوە، گوتم:

«بێگومان وایە.»

پاول بەردەوام بوو:

«بە ئاواتەوەم ڕۆژێک ئەم سەمفۆنیایە، سەرەتا بەو شتانەوەکەلەو دوو حەفتەیەدا پێی زیاد کردوون و پاشان بەبێ ئەو شتانە، بۆ کۆمەڵێک گوێگری پسپۆڕ و خەڵکی تایبەتمەند بژەندرێت. گرەو دەکەم کەکەس ناتوانێت بەجیاوازیی نێوان ئەو دوو ژەندنەبزانێت. بەهەڵەتێمەگەن، ئاشکرایەئەو موتیفەکەلە موومانی دووهەمدا بە ڤیالۆن دەژەندرێت، لە موومانی کۆتاییدا بە فلوت دەژەندرێت. دیارە هەموو شتێکیش کاری لەسەر کراوە، بیری لێ کراوەتەوەو هەستی پێ کراوە. هیچ شتێک بەڕێکەوت نەسپێردراوە. ئەم کامڵبوونەمەزنەسەرسامان دەکات. لەتوانای زاکیرەو تێڕامانمان تێدەپەڕێنێت، وەها کەتەنانەت دەمارگرژترین گوێگرەکانیش ناتوانن لەسەدا یەک زیاتری تێبگەن و بە دڵنیاییەوەمالەریش گرینگییەکی ئەوتۆی بەم لە سەدا یەکەنەداوە.»

پاول کەیفی بەو بۆچوونەی خۆی دەهات کەتەواو ڕاستیش بوو، بەڵام من خەمبار و خەمبارتر بووبووم. ئەگەر خوێنەرێک یەک

ڕستەلەکتێبەکەی من پشتگوێ بخات، ناتوانێت لەهیچ شتێکی بگات، بەڵام لە کوێی ئەم دنیایەخوێنەریک دەبینینەوەکەچاوپۆشیی لەڕستەیەک نەکردبێت؟ ئایا بۆخۆم لەهەموو کەس زیاتر باز بەسەر ڕستەو دێڕەکاندا هەڵنادەم؟ پاول بەردەوام بوو:

«من حاشا لە کامڵبوونی ئەم سەمفۆنیایەناکەم؛ تەنیا حاشا لەگرینگیی ئەم کەماڵەدەکەم. ئەم سەمفۆنیا زۆر چاکانەوەک کلێسەیەکی جامیعەبێسوودن، مرۆڤ ناتوانێت دەستی پێیان بگات؛ ئەوانەنامرۆیین. ئێمەلە بابەت گرینگیی ئەوانەوەزێدەڕۆییمان کردووە. ئێمەلەئاست ئەواندا هەستمان بە سووکبوون کردووە. ئەورووپا، ئەورووپای تا ئاستی پەنجا کاری پڕداهێنەرانەکەبۆخۆشی تێیان ناگات، دابەزاند. تەنیا سەیری ئەم نایەکسانییەقێزەونەبکەن: ملوێنەها ئەورووپی لەئاست پەنجا ناو کەهەمووشتێکن، هیچ نین. نایەکسانی چینایەتی لەبەرامبەر ئەم نایەکسانییەبانسروشتی و پڕ لەسووکایەتییەکەخەڵک دەکات بەڕیخ و مانای بوون بە هەندێک کەسی تر دەبەخشێت، خەسارێکی زۆر گەورە نییە.»

شووشەکەبەتاڵ بووبووەوە. من هەرام لەپێشخزمەتەکەکرد کەشووشەیەکی دیکەمان بۆ بێنێت. ئەمەهەودای قسەکانی لێ‌ون کرد. بیرم هێنایەوە:

« باسی ژیاننامەکانت دەکرد.»

بیری کەوتەوەو گوتی:

«ئۆی... بەڵێ.»

«لەوەخۆشحاڵ بوویت کەدەتتوانی نامەی تایبەتیی مردووەکان بخوێنیتەوە.»

پاول کەپێدەچوو بیەوێت پێشوەختە ڕەخنەو گازندەی بەرامبەرەکەی ڕەت بکاتەوە، درێژەی بەقسەکانی دا:

«دەزانم، دەزانم. دەزانم خوێندنەوەی نامەی تایبەتیی کەسێک، پرسینەوەلەدۆست و دڵدارەکانی پێشووی و دواندنی دکتۆرەکەی بۆ پەیبردن بەزانیارییەنهێنییەکان کاریکی نامرۆڤانەیە. ژیاننامەنووسەکان کەسانێکی هیچوپووچن و من هەرگیز حەزناکەم، وەک چۆن ئێستا لەلای تۆ دانیشتووم، لەگەڵ ئەوانیش لەسەر مێزێک دابنیشم. ڕۆبسپیەریش هەرگیز لەگەڵ ئەو کەسەهیچوپوچانەدانەدەنیشت کە چێژیان لەسەیرکردنی دیمەنی ئیعدامی بەکۆمەڵ دەبینی، بەڵام دەیزانی کەبەبێ ئەوان کارەکەی بۆ ناچێتە سەر. خەڵکی هیچوپووچ تەنیا ئامێری دادپەروەری و نەفرەتی شۆڕشگێڕانەن.»

من لێم پرسی:

«بەڵام نەفرەت لەهەمینگوای کەی شۆڕشگێڕانەیە؟»

«من باسی نەفرەت لەهەمینگوای ناکەم! من باسی کارەکەی دەکەم! من باسی کارەکانیان دەکەم! پێویستەبەدەنگی بەرز ڕایبگەیەنم کەپێم خۆشەلەخودی هەمینگوای زیاتر لەبارەی هەمینگوایەوەشت بخوێنمەوە. پێویستەئەوەپیشان بدرێت کە کاری هەمینگوای شکڵێکی فرمۆلەکراوی ژیانی هەمینگوایەو ئەم ژیانەش وەک ژیانی هەموومان هەژارانەو بێمانایە. پێویستەسەمفۆنیاکەی مالەر پارچەپارچەبکرێت و وەک مۆسیقای فیلمی ڕیکلام، بۆ کاغەز توالێت سوودی لێ وەربگیردرێت. لەئەنجامدا پێویستە کۆتایی بەتۆقان لەنەمرەکان بهێندرێت؛ دەسەڵاتی لووتبەرزانەی سەمفۆنیا نۆکان و فاوستەکان بڕووخێت!»

پاول سەرخۆشی وشەکانی خۆی، هەستایەسەر پێ و پەرداخەکەی بەرزکردەوە:

«دەخۆمەوەبەخۆشی کۆتاییهاتنی ڕۆژگارەکۆنەکان.»

## ٣

پاول لەو ئاوێنانەدا کە یەکتریان دەنواندەوەبیستوحەوت جار دەرکەوتبوو، ئەوانەی کەلەسەر مێزەکەی ئەولاتر دانیشتبوون بە کونجکۆڵییەوەسەیری دەستیان دەکرد کەپەرداخێکی بەرز کردبووەوە. دوو پیاوی قەڵەویش کەلە جەکووزییەکەهاتبوونە دەر، ڕاوەستابوون و لەو بیستوحەوت دەستەورد بووبوونەوە کەبەحەواوەوشک بووبوون. سەرەتا پێم وابوو پاول بۆ ئەوەی شکۆیەکی زیاتر بەوشەکانی ببەخشێت بەو دۆخەجووڵەی لەخۆی بڕیبوو، بەڵام دواتر ژنێکم بینی کە بە جلی مەلەوەتازەهاتبووە ژوور، ژنێکی چل ساڵانەی جوان و بەژنڕێک، بەڵام بە قاچی تا ڕادەیەک کورت و پاشێکی قوتی زلەوە کەوەک تیرێکی ئەستوور نیشانەی لە خوارەوەگرتبوو. ئەم تیرەبووە هۆی ئەوەی کەمن دەستبەجێ بیناسمەوە.

ژنەکەسەرەتا ئێمەی نەدی و ڕاستەوخۆ بەرەو مەلەوانگەکەچوو، بەڵام ئێمەوەها لێی ورد بووبووینەوەکەئاخرییەکەی سەرنجی ڕاکێشرا و سوور بووەوە. کە ژنێک لەشەرمان سوور دەبێتەوە، زۆر جوانە؛ لەو کاتەدا ئیتر لەشی هی خۆی نییە. ڕاستتان بوێت هیچ دیمەنێک بەقەد دیمەنی ئەو ژنەکەلە لایەن لەشی خۆیەوەدەستدرێژیی پێ کراوەجوان نییە! من وردەوردەبەلاوازیی ئاڤەناریوس لە لای لاورام زانی. چاوم بەرەو ئاڤەناریوس سووڕاند، جووڵەلەڕوومەتی بڕابوو. وا دیار بوو ئەم خۆڕاگرییەی

لەسووربوونەوەی ڕوومەتی لاورا زیاتر پەردەی لەنهێنییەکانی هەڵدەدایەوە.

لاورا بە خۆیدا هاتەوە، بزەیەکی دۆستانەی بۆ کردین و لە مێزەکەمان نزیک بووەوە. ئێمە هەستاینە سەر پێ و پاول ژنەکەی پێ ناساندین. من هەروا سەیری ئاڤەناریوسم دەکرد. ئایا دەیزانی کەلاورا ژنی پاولە؟ پێم وابوو نەیدەزانی، بەڵام لەوەش دڵنیا نەبووم؛ لەڕاستیدا لەهیچ شتێک دڵنیا نەبووم. ئەو کەدەستی لەگەڵ لاورا لێدایەوە، وەک ئەوەی کەیەکەم جار بێت لەژیانیدا لاورای دیبێت، سەری بۆ دانەواند. لاورا خێرا ئێمەیجێهێشت (من پێم وابوو لەوەخێراتر کەدەبوایە) و خۆی فڕێدایەناو ئاوی مەلەوانگەکەوە.

لەپڕ هەموو خۆشییەکی پاول بزر بوو، بە خەمەوەگوتی:

«خۆشحاڵم لاوراتان بینی. وەک دەڵێن ئەو ژنی ژیانی منە. دەبێ پیرۆزبایی لە خۆم بکەم. ژیان زۆر کورتەو زۆربەی خەڵک هەرگیز ناتوانن ژنی ژیانی خۆیان ببیننەوە.»

پێشخزمەتەکەشووشەیەکی دیکەی هێنا، لای خۆمان سەرەکەی هەڵپچڕی و هەموو پەرداخەکانی پڕ کرد. پاول دیسان قسەکانی لە بیر چووەوە. کاتیک پێشخزمەتەکەڕۆشت من بیرم خستەوە:

«باسی ژنی ژیانی خۆتت دەکرد.»

پاول گوتی:

«بەڵێ، ئێمەکچۆڵەیەکی سێ مانگانەمان هەیە. من کچێکی دیکەشم لەژنەکەی پێشووم هەیە. ئەو ساڵێک لەمەوپێش ماڵەکەی، تەنانەت بەبێ ماڵاواییش، جێهێشت. من خەمبار بووم، چونکە زۆرم خۆشدەویست. دەمێکبوو کەئاگام لێی نەبوو، تا ئەوەی کە دوو ڕۆژ لەمەوپێش گەڕایەوە، هاوڕێ کوڕەکەی وازی لێ هێناوەو

منداڵێکیشی خستووەتەباوەشیەوە، کچێکی بچووک. برادەران، من نەوەیەکیشم هەیە! ئێستا چوار ژن دەوریان داوم!»

وەها کەیادی چوار ژن هێزێکی زۆری پێ بەخشیبێت، درێژەی پێ دا:

«بۆیە لەبەیانییەوەتا ئێستا خەریکم دەخۆمەوە! بە خۆشیی پەیوەندیی دووبارەمان! بەخۆشی کچ و نەوەکەم!»

لاورا لە خوارەوەلەگەڵ دوو مەلەوانی‌تر خەریکبوو شلپەشلپی دەکرد، پاول زەردەخەنەی دەکرد. زەردەخەنەیەکی تایبەتی و ماندوو کەدڵم پێی دەسووتا. پێم وابوو کتوپڕ پیرتر بووبوو. کتوپڕ پرچەپڕ و خۆڵەمێشییەکەی وەک پرچی تەنکی پیرێژنێکی لێ هاتبوو. وەک بیەوێت بەئیرادەیەکی زۆرەوەلە ئاست شاڵاوی بێهێزی خۆی ڕابگرێت، دیسانەوەپەرداخەکەی بەرزکردەوەو هەستا.

لەو کاتەدا گوێمان لێبوو لاورا دەستی بەسەر ئاوەکەدا دەکوتا. سەری بەژوور ئاوەکەوەڕاگرتبوو، وەک ئەوەکەتازەفێری مەلەبووبێت، بەحەز و تا ڕادەیەکیش تووڕەییەوە مەلەی باسکەی دەکرد.

من پێم وابوو هەر زەربەتێکی دەستی لاورا، وەک ساڵەیەک لەدوای یەکەکان بەسەر سەری پاولدا دەکوترا. ڕوومەتی پاول بە ئاشکرا لەپێشچاوی ئێمەپیر دەبوو؛ ئێستا ئیتر بووبوو بەپیاوێکی حەفتا ساڵەو ساتێکی دیکەش دەبوو بەهەشتا ساڵە و وەک بیەوێت لە ئاست شاڵاوی ئەو ساڵانە بەرگری لەخۆی بکات، پەرداخەکەی بەرز کردبووەوەو ڕاوەستابوو، بە دەنگێک کەئانوسات هەموو هێزی داچۆڕابوو، گوتی:

«ڕستەیەکی بەناوبانگم لەسەردەمی گەنجییەوەلە بیر ماوە: "ژن داهاتووی پیاوە". کێ ئەوەی گوتووە؟ لەبیرم نەماوە. لینین؟ کەنەدی؟ نا. نا. شاعیرێک ئەوەی گوتووە.»

من گوتم: «ئاراگۆن.»
ئاڤەناریوس بە دڵنیشانەوەگوتی:
«یەعنی چی کەژن داهاتووی پیاوە؟ واتە پیاوەکان دەبن بەژن؟!
من لەم ڕستەگەمژانەیەناگەم!»
پاول قسەکەی پێ ناخۆش بوو، گوتی:
«ئەم ڕستەگەمژانە نییە! ئەمەڕستەیەکی شاعیرانەیە.»
من گوتم: «ئەدەبیات دەفەوتێت و ڕستەشاعیرانەگەمژانەکان بە دنیادا دەسووڕێنەوە.»
پاول گوێی بەمن نەدا. ئەو تازەبەوێنەکەی خۆی زانیبوو کەبیستوحەوت جار لەئاوێنەکاندا دەردەکەوت و نەیدەتوانی سەیریان نەکات. ئەو بەرەوپێش و دواوەنەوییەوە، ئاوڕی لەیەکەیەکەی وێنەکانی ناو ئاوێنەکەدایەوەو بە دەنگی کز و لاوازی پیرێژنێک گوتی:
«ژن داهاتووی پیاوە. ئەمەیەعنی دنیا کە سەردەمانێک لەشێوەی پیاودا ساز دەکرا، لە ئێستا بەدواوەشێوەی بۆ ژن دەگۆڕێت. دنیا هەرچەندە تەکنیکیتر، میکانیکیتر، ساردتر و ئاسنیتر دەبێت، بە هەمان ڕێژەش پێویستی بەو گەرمایەزیاتر دەبێت کەهەر ژن، دەتوانێت پێی ببەخشێت. ئەگەر بەتەمای ڕزگارکردنی دنیا بین، دەبێ‌لەگەڵ ژندا بگونجێین؛ بێڵین با ژن ڕابەرایەتیمان بکات، بێڵین با دڵڕفێنیی هەتاهەتایی ژن Ewigweibliche ڕەگاژۆی ناخمان بێت!»
پاول کەدەتگوت ئەم وتەپێغەمبەرانەهەموو توانای داچۆڕاندووە، کتوپڕ دە ساڵی دیکەش پیر بوو. ئێستا ئیتر بووبوو بەپیرەپیاوێکی تەواو لاواز و پەککەوتەکەتەمەنی لەنێوان سەدوبیست بۆ سەدوپەنجا ساڵ بوو، تەنانەت توانای ڕاگرتنی پەرداخەکەشی

نەمابوو؛ کەوتەسەر کورسییەکەی و پاشان لەناکاو و ڕاستگۆیانەگوتی:

«بێ ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوەگەڕایەوە. ئەو ڕقی لەلاورایەو لاوراش ڕقی لەئەوە. هەستی دایکانەهەردووکیانی شەڕانی کردووە. دیسانەوەدەنگی مالەر لەژوورێکەوەدێت و دەنگی جاز لەژوورێکی دیکەوە. دیسانەوەداوام لێ دەکەن لایەنگیرییان بکەم. دیسانەوەخەتونیشانم بۆ دەکێشن. لە ئێستاوە دەستیان بەشەڕکردووە و ژن کە دەست بەشەڕ دەکەن، ئیتر واز ناهێنن.»

پاشان بە نهێنی بەرەو ئێمەنەوییەوە:

«قسەکانم بە جیددی وەرمەگرن، هاوڕێیان. ئەوەی پێتان دەڵێم ڕاست نییە.»

وەک بیەوێت پەردەلەنهێنییەکی گەورەهەڵبداتەوە، دەنگی نزم کردەوە: «خۆشبەختانە تا ئێستا پیاوان ئیدارەی شەڕەکانیان کردووە. ئەگەر ژنەکان شەڕیان بکردایەئەوەندەبێبەزەیی و دڵڕەق بوون کە تەنانەت مرۆڤێکیش لەسەر ئەم گۆی زەوییەنەدەمایەوە.»

ئەوسا وەک بیەوێت ئێمەخێرا قسەکانی فەرامۆش بکەین، مستەکۆڵەی بەسەر مێزەکەدا کوتا و بە دەنگی بەرز گوتی:

«هاوڕێیان، خۆزگەمۆسیقا تیابچوایە. خۆزگەباوکی مالەر کاتێک دەیدی کوڕەکەی خەریکە دەستپەڕ دەکات، زللەیەکی وای لە بناگوێی بسرەواندایەکەگۆستاڤی بچووک بۆ هەمیشەکەڕ ببوایەو نەیتوانیایەدەنگی تەپڵ و ڤیالۆن لێک جودا بکاتەوە. خۆزگەسووڕی کارەبا لەگیتارەکان ببڕایەو بەو کورسیانەوەبلکایەکەمن بەم دەستانەی خۆم هەموو گیتارژەنەکانم پێیانەوەدەبەستەوە.»

پاشان بە دەنگێکی لەسەرخۆ درێژەی پێ دا:

«هاوڕێیان، خۆزگەمن دەئەوەندەی ئێستا سەرخۆش بوومایە.»

## ٤

پاول بەدڵشکاویی لەپشت مێزەکەدانیشت، ئەوەندەخەمبار بوو کەنەمانتوانی لەوەزیاتر سەیری بکەین. هەستاین، دەورمان گرت و دەستمان بە پشتیدا هێنا و لاواندمانەوە. کاتێک ئێمەئەومان دەلاواندەوە، کتوپڕ چاومان بە هاوسەرەکەی کەوت کەلە ئاوەکە هاتە دەر، بە لاماندا تێپەڕی و بەرەو دەرکەکەڕۆشت. وا خۆی دەرخست کەدەتگوت ئێمەهەر نیشین.

ئایا ئەوەندە لە پاول تووڕەبوو کەتەنانەت نەیدەویست سەیری ڕوومەتیشی بکات؟ یان لەو دیدارە چاوەڕواننەکراوەی لەگەڵ ئاڤەناریوس نیگەران بوو؟ هەرچی بووبێت، لەو کاتەدا کەبە لاماندا تێدەپەڕی شتێکی وەها بەهێز و دڵڕفێن لە هەنگاوەکانیدا بوو کەئێمەوازمان لە لاواندنەوەی پاول هێنا و هەرسێکمان نیگامان شوێن خست.

کاتێک لاورا گەیشتە دەرکە خولۆکەکە کە دەیگەیاندە ژووری جلەکان، شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا: لەپڕ سەری بەرەو مێزەکەی ئێمەسووڕاند و بە جووڵەیەکی ئەوەندە سووک و دڵڕفێن و ئاسوودەدەستی بەرزکردەوەکەبە لای ئێمەوەوەک ئەوەبوو تۆپێکی ئاڵتوونی لەسەر پەنجەکانی هاتبێتەدەر و لەسەر دەرکەکە لەنگەری گرتبێت.

لەپڕ بزەیەک نیشتە سەر ڕوومەتی پاول و توند دەستی ئاڤەناریوسی گرت:

«چاوت لێ بوو؟ چاوت لەو جووڵەی بوو؟»
ئاڤەناریوس گوتی «ئەرێ» و وەک من و پاول لەو تۆپەئاڵتوونییەڕاما کە بەسەر دەرکەکەوەدەدرەوشایەوە. من لێم ڕوون بوو کەئەو جووڵەی بۆ مێردەسەرخۆشەکەی نەبوو. ئەوەجووڵەیەکی ڕۆژانەی کاتی ماڵاوایی نەبوو، بەڵکو جووڵەیەکی ئاوارتەی پڕ لە مانا بوو. ئەو جووڵەی تەنیا بۆ ئاڤەناریوس بوو.
ئەڵبەت پاول گومانی لێ نەکرد، وەک ئەوەموعجیزەیەک ڕوویدابێت، ساڵەکان لەشیان بەجێهێشت و هەمدیسان وەک پیاوێکی سەرنجڕاکێشی پەنجا ساڵەی لێ هاتەوەکەشانازیی بەپرچەپڕ و خۆڵەمێشییەکەیەوەدەکرد. ئەو کەهەروا لە دەرکەکەو تۆپەدرەوشاوەکەورد بووبووەوە، دووبارەی کردەوە:
«ئاخ لاورا! ڕێک وەک خۆیەتی! ئاخ، ئەم جووڵە! ئەمەلاورایە!»
ئەوسا بەدەنگێکی پڕ لەهەیەجانەوەپێی گوتین:
«یەکەم جار کە جووڵەیەکی ئاوای بۆ کردم ئەو کاتەبوو کەبردبووم بۆ زاینگە. لەوەوپێش بەهیوای منداڵبوون دوو جار عەمەلیات کرابوو، کاتی منداڵبوونی هەموومان دەترساین. بۆ ئەوەی من نیگەران نەبم، نەیهێشت لەگەڵی بچم بۆ ژووری زاینگەکە، بۆیەلە لای ئۆتۆمبێلەکەڕاوەستام و ئەویش بەتەنیا بەرەو دەرکەکەچوو. کاتێک گەیشتە ناو دەرکەکەکتوپڕ سەری وەرچەرخاند و ڕێک وەک ساتێک لەمەوپێش، دەستی لێ بەرز کردمەوە. کە گەڕامەوەبۆ ماڵەوە ئێجگار نیگەرانی بووم و تاسەم دەکرد. بۆ ئەوەی لەخۆمی نزیکتر بخەمەوە، هەوڵم دەدا لاسایی ئەو جووڵەجوانەی بکەمەوەکە ئاوا شەیدای کردبووم. ئەگەر کەسێک چاوی پێم بکەوتایە، بێگومان پێم پێدەکەنی. پشتم لە ئاوێنەکەکردبوو، دەستم بەرز دەکردەوەو سەرم وەردەچەرخاند و لە ئاوێنەکەدا زەردەخەنەم بۆ خۆم کرد. سی تا

پەنجا جار ئەوەم کرد و بیرم لە ئەو کردەوە. من لەیەک کاتدا هەم لاورا بووم کەدەستم لەخۆم بەرز دەکردەوە و هەم خۆشم بووم کەسەیری لاورام دەکرد کەبەرەوڕووی خۆم دەستم لێ ڕادەوەشێنێت، بەڵام شتێکی تایبەت لەو جووڵەدا بوو: ئەو جووڵەلەمن نەدەهات. بەوپەڕی نائومێدییەوەلەئەنجامدانی ئەو جووڵەنەشارەزا و گاڵتەجاڕ بووم.»

هەستا و پشتی لەئێمەکرد. پاشان دەستی بەرزکردەوەو بە ژوورر شانیەوەئاوڕی لێ داینەوە. بەڵێ، ڕاستی دەگوت، گاڵتەجاڕ و قەشمەڕ بوو. ئێمەپێکەنین. پێکەنینەکەی ئێمەجورئەتی پێ بەخشی چەند جاری دیکەش ئەو جووڵەی دووپات بکاتەوە. لەپێشوو زیاتر گاڵتەجاڕ بووبوو. پاشان گوتی:

«دەزانن، ئەمەجووڵەی پیاو نییە، جووڵەی ژنە. ژن بەم جووڵەبەرەو خۆی ڕاتان دەکێشێت. دەڵێ: وەرە، شوێنم بکەوە. نەئێوەدەزانن بۆ کوێ و نەبۆخۆشی، بەڵام ئەوەندەبەدڵنیاییەوەبانگتان دەکات کە دەهێنێت بۆ هەموو کوێ شوێنی بکەون. لەبەر ئەوەیەکە من پێتان دەڵێم: یان ئەوەکەژن دەبێتەداهاتووی پیاو، یان ڕەگەزی مرۆڤ دەفەوتێ، چونکەتەنیا ژن دەتوانێت لە ناخی خۆیدا هیوای بێهوودەگۆش بکات و بەرەو داهاتوویەکی گوماناوی ڕامان کێشێت، داهاتوویەک کە ئەگەر ژنان نەبوونایەلەمێژ بوو بڕوامان پێی نەمابوو. من بە درێژایی ژیانم هەوڵم داوەشوێن دەنگی ئەوان بکەوم، تەنانەت ئەگەر ئەو دەنگەش شێت بێت و خۆ من هەرچییەک بم شێت نیم. هیچ شتێک لەوەجوانتر نییەکەسێک کەخۆی شێت نییە، بەشوێن دەنگێکی شێتدا پێ بنێتە ناو دنیایەکی نەناسراوەوە.»

ئەوسا دیسان بە ویقارەوەڕستەیەکی بەزمانی ئاڵمانی دەربڕی: «Ewigweibliche zieht uns hinan Das»، کەمەندی هەتاهەتایی ژن بەدوای خۆیدا ڕامان دەکێشێت!»

شێعری گۆتەوەک قازێکی سپیی لووتبەرز لەبن گومەزی مەلەوانگەکەباڵی کوتا و پاول کەلەئاوێنەسیانییەکاندا دەرکەوتبوو، بەرەو ئەو دەرکەخولۆکەکەتۆپی شادی بەردەوام لەوێ دەدرەوشایەوە، سەر ڕێ کەوت. ئەوەیەکەم جار بوو کەدەمدی لە ناخی دڵیەوەشاد و خۆشحاڵە. چەند هەنگاوی هەڵێنایەوە، سەری بە ژوور شانیەوەبەرەو ئێمەوەرچەرخاند و جارێکی دیکەش دەستی لێ ڕاوەشاندین. پێکەنی. دیسانەوەسوڕێکی دیکەی دایەوەو دووبارەدەستی لێ ڕاوەشاندین. پاشان بۆ دواجار، وەک پیاوێکی نەشارەزالاسایی ئەو جووڵەجوانەژنانەی کردەوە و لەودیو دەرکەکەوەون بوو.

# ٥

من گوتم:

«ئەو لەبارەی ئەو جووڵەوەزۆر چاک قسەی کرد، بەڵام پێم وابێت بە هەڵەچووبوو. لاورا کەسی بۆ داهاتوو بانگ نەدەکرد، دەیویست لە تۆ بگەیەنێت کەلێرەیەو لەبەر تۆش هاتووەبۆ ئێرە.»

ئاڤەناریوس بێدەنگ بوو. ڕوومەتی بێ هەستوخوست بوو. بە سەرزەنشتەوەپێم گوت:

«بەزەییت بە پاولدا نایەت؟»

گوتی:

«بۆ نا؟ بەزەییم پێیدا دێت. من بەڕاست ئەوم خۆش دەوێت. پیاوێکی هوشیارە. پیاوێکی شۆخە. پیاوێکی ئاڵۆزە. پیاوێکی خەمبارە. بەتایبەت نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت کە زۆری یارمەتی داوم!»

پاشان بۆ ئەوەی وەلامی سەرزەنشتەکەی منیشی دابێتەوە، سەری لێ خوار کردمەوەو گوتی:

«من پێشنیارم بە تۆ کرد کەبا خەڵک بەرەوڕووی ئەم هەڵبژاردنەبکەینەوە: کێ دەیەوێت بەدزییەوەلەگەڵ ڕیتا هایوۆرس، یان گێرتا گاربۆ بخەوێت و کێ دەیەوێت لە بەرچاوی خەڵکدا پیاسەی لەگەڵ بکات؟ ئەنجامەکان پێشوەختە ڕوون و ئاشکران: هەمووکەس، تەنانەت کڵۆڵترین مرۆڤەکانیش بە درۆ دەڵێن حەزدەکەن لەگەڵیان بخەون، چونکەهەموویان دەیانەوێت لەلای

خۆیان، له لای هاوسەرەکانیان، تەنانەت لەلای ئەو فەرمانبەرەکەچەڵەش کەچاودێریی هەڵبژاردنەکەدەکات وەک کەسێک دەربکەون کەحەزیان لە ڕابواردنە. بەڵام ئەمەخۆفریودانە، نمایشێکی گاڵتەجاڕییە، ئێستا ئیتر کەس حەزی لە ڕابواردن نەماوە.»

ئەو دواهەم ڕستەکەی بەجەختێکی زۆرەوەدەربڕی و بە بزەیەکەوەگوتی:

«جگەلەمن.»

ئەوسا درێژەی پێ دا:

«گرینگ نییەئەوان چی دەڵێن، ئەگەر بەڕاست شانسی ئەوەیان ببوایە، هەموویان، دووبارەی دەکەمەوەهەموویان، ئەوەیان بە لاوەخۆشتر بوو کەلەشەقامدا پیاسەیان لەگەڵ بکەن، چونکەهەموویان پێیان خۆشەستایش بکرێن، نەک چێژ وەربگرن. حەزیان لە نواندنەنەک لە ڕاستی. ئێستا ئیتر ڕاستی بۆ کەس مانای نەماوە، بۆ هیچکەس، بۆ پارێزەرەکەی من کەهیچ مانایەکی نەماوە.»

پاشان بەلوتفێکی تایبەتەوەگوتی:

«بۆیە بەڵێنت پێ دەدەم کەپاول ئازار ناکێشێت. ئەو شاخانە کەئێستا بە سەریەوەڕوواون، هەروا بەنەبیندراوی دەمێننەوە. ئەو شاخانەلەکاتی هەواخۆشیدا دەبن بەشینیی ئاسمانی و لە کاتی بارانبارینیشدا دەبن بە خۆڵەمێشی.»

پاشان درێژەی پێدا:

«هەرچۆنێک بێت، هیچ پیاوێک دڵ لەو کەسە پیس ناکات کەگوایەدەڵێن ویستوویەتی بە هەڕەشەی چەقۆ دەستدرێژی بۆ سەر ژنێک بکات، هیچ پیاوێک پێی وا نییەکەسێکی وا دۆستی ژنەکەی بێت. ئەم دوو وێنەپێکەوە ناگونجێن.»

من گوتم:

«ڕاوەستەبزانم. پاول بەڕاست پێی وایە کە تۆ ویستووتەدەستدرێژی بۆ سەر ژنان بکەیت؟»
«خۆ من باسی ئەوەم بۆ کردوویت!»
«پێم وابوو گاڵتەدەکەیت.»
«بێگومان، خۆ من نهێنیی خۆمم ئاشکرا نەدەکرد.»
درێژەی پێ دا:
«بەهەرحاڵ، من ئەگەر ڕاستییەکەشم پێ بگوتایەئەو بڕوای پێ نەدەکردم و ئەگەر بڕواشی بکردایەئیتر گوێی بە بابەتەکەی من نەدەدا. من تەنیا وەک کەسێکی دەستدرێژیکەر بە لای ئەوەوە گرینگم. ئەو سۆزێکی زۆر سەیری بەمن دا کەوا دیارە پارێزەرەگەورەکان بەتاوانبارە گەورەکانی دەدەن.»
«ئەی چۆن باسی شتەکانت بۆ کرد؟»
«من باسی هیچم بۆ نەکرد. لەبەر نەبوونی بەڵگەبەریاندام.»
«مەبەستت لەنەبوونی بەڵگەچییە! ئەی ئەو چەقۆیە؟»
ئاڤەناریوس گوتی:
«حاشا لەوەناکرێت کە کاریکی زۆر دژوار بوو.»
من زانیم کەهیچی زیاتری لێ تێناگەم، ماوەیەک بێدەنگ بووم و پاشان گوتم:
«کەواتەتۆ بەهیچ شێوەیەک نەدەچوویتەژێر باری تایەدڕاندنەکە؟»
ئاڤەناریوس بە نیشانەی "نا" سەری لەقاند. بەشێوەیەکی سەیر کاری تێ کردبووم:
«تۆ بۆ ئەوەی ئەو گەمەیەت ئاشکرا نەبێت، ئامادەبوویت وەک دەستدرێژیکەر بگیرێیت؟»

لەو کاتەدا ئاخرییەکەی تێی گەیشتم، ئەگەر ئێمەنەتوانین ددان بەگرینگیی جیهاندا بنێین، جیهانێک کە خۆی بەگرینگ دەزانێت؛ ئەگەر پێکەنینی ئێمەلەم جیهانەدا دەنگ نەداتەوە، تەنیا یەک هەڵبژاردەمان بۆ دەمێنێتەوە: ئەویش ئەوەیەکەجیهان بەگشتی، وەک بابەتێکی گاڵتەجاڕی وەربگرین، واتەبیکەین بەلیستۆک و کەرەسەی یاری. ئاڤەناریوس یاری دەکا و بە لای ئەوەوەیاریکردن تەنیا شتێکی گرینگی ئەم جیهانە ئاساییەیە، بەڵام ئەو بۆخۆی دەزانێت کەکەس بەیارییەکەی پێناکەنێت. ئەو کاتێک پێشنیارەکەی پێشکەش بەلایەنگرانی ژینگە کرد، بەتەمای سەرقاڵکردنی کەس نەبوو، ئەو دەیوست خۆی سەرقاڵ بکات. من گوتم:

«تۆ وەک منداڵێکی خەمۆک کە برای بچووکی نییە، لەگەڵ دنیا یاری دەکەیت.»

بەڵێ، ئەوەبە لای ئاڤەناریوسەوە خوازەیەکی شیاو بوو! لەوەتەی دەیناسم بەدوای شتێکی ئاوادا گەڕاوم.

ئاڤەناریوس وەک منداڵێکی خەمۆک بزەی هاتێ و گوتی:

«من برای بچووکم نییە، بەڵام تۆم هەیە.»

ئەوسا هەستا. منیش هەستام. پێدەچوو لەپاش ئەو دواهەم قسانەنی، هیچ کارێکمان نەبێت جگەلەوەی کەباوەش بە یەکتردا بکەین. بەڵام دیمان کە مایۆمان لە بەردایەو کاتێک بیرمان لەلێکهەڵسوونی سکەڕووتەکانمان کردەوە، تۆقاین. بە پێکەنینەوەوازمان لەباوەشپێداکردنهێنا و چووین بۆ ژووری جلەکان. لەوێ کە گوێمان لەدەنگێکی ناسکی ژنانەی تێکەڵ بەدەنگی گیتار بوو، ئیتر ئارەزووی قسەکردنمان نەما. سواری مەسعەدەکەبووین. ئاڤەناریوس بەرەرو پارکینگەکە دەچوو کە ئۆتۆمبێلە مارسدسەکەی لێ ڕاگرتبوو، من لەنهۆمی یەکەم لێی جودا

بوومەوە. لە هۆڵەکە پێنج ڕوومەتی جیاواز بە ددانی سپی چونیەکەوە، لەنێو پێنج تابلۆی گەورەداکەبە دیوارەوەهەڵواسرابوون، پێم پیدەکەنین. ترسام کەگازم لێ بگرن، بۆیەخێرا بەرەرو شەقامەکەڕۆشتم.

شەقام پڕ بوو لەو ئۆتۆمبێلانەکەبەردەوام سیگناڵیان لێ دەدا. ماتۆڕسیکلەتەکان دەهاتنە ناو پیادەڕۆکەوە و بەناو ڕێبوارەکاندا دەڕۆشتن. بیری ئەگنێس کەوتمەوە. ڕێک دوو ساڵ لەمەوپێش بوو کەلە نهۆمی سەرووی یانەی تەندروستی، کاتێک لەسەر مۆبلەکەپاڵم دابووەوەو چاوەڕێی ئاڤەناریوس بووم، وێنای ئەگنێسم کرد. لەبەر ئەوەبوو کەئەمرۆ داوای شووشەیەک شەرابم کردبوو. من کۆتاییم بەنووسینی ڕۆمانەکەم هێنابوو، دەمویست لەو شوێنەکەیەکەم جار بیرۆکەی ڕۆمانەکەسەری هەڵدابوو، بەشانازییەوەجەژن بگرم.

ئۆتۆمبێلەکان بەردەوام سیگناڵیان لێ دەدا و گوێم لەدەنگی توورەی خەڵکەکەبوو. لەهەلومەرجێکی ئاوادا بوو کەئەگنێس حەزی دەکرد گوڵێکی "لەبیرم مەکە"، لقێک گوڵی "لەبیرم مەکە" بکڕێت؛ پێی خۆش بوو وەک دوانیشانەی جوانی، کە بە دەگمەن دەبیندرێت، لە بەرچاوی خۆی ڕایبگرێت.



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
Sardam Printing & Publishing House
2015

هەندێک لەو بابەتانە کە لە «نەمری»دا ئاوڕیان لێ دراوەتەوە، چ ئەو بابەتە گشتییانە کە پەیوەندییان بە بوون و شوناسی مرۆڤ، مانای ژیان، پەیوەندی، عەشق، سێکس، شەرم و گوناهەوە هەیە، چ بابەتی تایبەتیتری وەک:
دەور و کاریگەریی وێنە و وێنەسازی لە ژیانی ئەمڕۆماندا، هەموویان بە شێوەیەک لە تانوپۆی چیرۆکدا چندراون و بە زمانی چیرۆک دەردەبڕدرێن کە تەنانەت خوێنەری لاساری بێزار لە خوێندنەوەی بابەتی تیۆریکی و تەجریدیش بە شوێن خۆیدا ڕادەکێشێت